کورد لە سەرچاوە مێژووییەکاندا

# کورد و کوردستان

## لە دیدی گەڕیدە و وڵاتناسانی موسڵمان

(٢٣٢ - ٦٢٦ک _ ٨٤٦ - ١٢٢٩ز)

د. حەکیم ئەحمەد خۆشناو

وەرگێڕانی: شوکر سلێمان

٥





# كورد و كوردستان

## له ديدی گەڕيده و وڵاتناسانی موسڵمان

"٢٣٢ - ٦٢٦ك" ـ "٨٤٦ - ١٢٢٩ز"



# کورد و کوردستان

## له دیدی گەڕیده و وڵاتناسانی موسڵمان

(٢٣٢- ٦٢٦ك ـ ٨٤٦ - ١٢٢٩ز)



د. حەکیم ئەحمەد خۆشناو

وەرگێرانی

شوکر سلێمان

هەولێر – ٢٠١٤




**پرۆژەی هاوبەش**




**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە** **کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان**

**کورد لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ـ (٥)**

# • کورد و کوردستان لە دیدی گەڕیدە و وڵاتناسانی موسڵمان

**(٢٣٢ - ٦٢٦ك ـ ٨٤٦ - ١٢٢٩ز)**


• دکتۆر حەکیم ئەحمەد خۆشناو

• وەرگێڕانی: شوکر سلێمان

• سەرپەرشتیاری پرۆژە: رابیعە فەتاح شێخ محەمەد

• نەخشەسازی ناوەوە: دیاکۆ

• بەرگ: رێمان

• نرخ: (٥٠٠٠) دینار

• چاپی یەکەم : ٢٠١٤

• تیراژ: ١٠٠٠ دانە

• چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

• **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(١٢٦) ساڵی (٢٠١٣)ی پێ دراوە**

**زنجیرەی کتێب (٨٣٥)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## پێشەکی ...

لێکۆڵینەوەی وڵاتناسی گرینگییەکی تایبەتی لەنێو جۆرەکانی دیکەی زانیاری دەستەبەر کردووە، زانستی وڵاتناسیش پێوەندییەکی راستەوخۆی بە زانستی مێژووەوە هەیە، لەبەرئەوەی برای یەك دایك و باوکن و لەیەکدیی جیانابنەوە، هەر یەك لەوانە هەوڵ دەدات بۆ خزمەتکردنی ئەوەی دیکە، هەروەها لە رووی سەرهەڵدانیشەوە نەك هەر هاوکاتن، بگرە هەندێ لە مێژوونووسان لە هەمان کاتدا وڵاتناسیش بوونە.

لەبەرئەوەی ئیشکردنی هەر مێژوونووسێك و وڵاتناسێك تەواوکاری ئەوەی دیکە بووە، ئەوەندە بەس نەبووە، کە یەکێك کارێکی ئەنجام دابێت، بۆ پێشکێشکردنی دیمەنێکی روون لە هەموو لایەکەوە، لەبارەی ژیانی رابردووی کۆمەڵگەیەك بەبێ ئەوەی کە پێویستی بەوەی دیکە نەبووبێت، بۆیە زانستی مێژوو جەخت لە پێشکەوتنە سیاسی و سەربازی نەتەوەکان و کۆمەڵگەکان لەسەردەمە جیاجیاکان دەکاتەوە، زۆر بە کەمیش دەچێتە سەر کاروباری لایەنەکانی دیکەی ژیان لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئاوەدانی و چەندان رووی دیکە لە سیستەمە شارستانییەکان کە ئەوە لە تایبەتمەندی وڵاتناسییە. هەر ئەوەش وادەکات لێکۆڵینەوەی وڵاتناسی گرینگییەکی مەزنی مێژوویی تایبەت بە خۆی هەبێت.

لە لایەکی دیکەوە کورد یەکێك لە دیارترین رەگەزەکانی مرۆڤایەتی بووە رۆژهەڵاتی ئیسلامییان پێکهێناوە، کە لە دەیەی دووەمی سەدەی یەکەمی هیجری رۆڵیان هەبووە و بوونی خۆیان سەلماندووە، واتە لە ماوەی هەڵمەتەکانی فتوحاتی ئیسلامی کە لەو کاتەدا سەرەتاکەی گەیشتووەتە وڵاتەکانیان و، رۆڵیشیان بە پێی رۆیشتنی کات بەرزبۆتەوە و، پشکدارییان لە بواری سەربازی و سیاسی و شارستانی لەسەردەمەکانی ئیسلامیدا (راشدی و ئەمەوی و عەباسی) زیادی کردووە، کە هەمیشە ئەو هەوڵانەیان

به شێوەیەك لە شێوەكان لە خزمەت خەلافەتی ئیسلامی و شارستانییەتەكەیدا بووە، هەروەها ولاَتەكەشیان خاكەكەی بە پیت و بەركەت بووە، كەوای كردووە داهاتەكانی گەنجینەی دەوڵەت چەندجارە زیاد بكات، ئەمەش بەهۆی ئەو هەموو چالاكییە ئابوورییەی تێدا ئەنجام دراوە.

بێگومان پێداچوونەوە بە سەرچاوە ولاَتناسییەكان رێگەكەمان بۆ ئاسان دەكات بۆ تێگەیشتن لە راستی بارودۆخی ئابووری و كۆمەلاَیەتی و ئاوەدانی ئەو كاتی ولاَتی كوردستان لە رابردوودا، بەبێ ئەوە هاتنەدی ئەو كارە ئەستەمە، هەر وەكو ئەو لێكۆڵینەوەیە یارمەتیمان دەدات بۆ هەڵوەستەكردن لەوەی كە تاچەند كۆمەڵگەی كوردی شارستانی بووە، —وەكو یەكێك لە كۆمەڵگە موسڵمانەكان- لە دووتۆی ئەو تۆژینەوەیەدا. جا ئەگەر پەڕتووكی ولاَتناسان نەبوایە، ئەوا بەشێكی گرینگی مێژووی شارستانییەتی كورد بە نادیاری و ونبوونی دەمایەوە.

لەبەر ئەو هۆكارانە و، لەبەر نەبوونی لێكۆڵینەوەی ولاَتناسی كەپێشتر باسی كوردی كردبێت بە شێوەیەكی گشتگیر، بە شێوەیەك كە سەرجەم هەرێمەكانی ولاَتی كوردستانی گرتبێتەوە لەسەردەمی ئیسلامدا، بۆیە ئەو بابەتەمان هەڵبژارد. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئارەزووی توێژەر لە لێكۆڵینەوە لەو بابەتەدا كە خاوەن چەند رەهەندێكی شارستانییە.

ئەو لێكۆڵینەوەیە چوارچێوەیەكی زەمەنی بۆ دیاری كراوە، ماوەی نێوان نیوەی یەكەمی سەدەی سێیەمی كۆچی/ سەدەی نۆی زاینی دەگرێتەوە، كە بە سەرەتای سەرهەڵدانی زانستی ولاَتناسی دادەنرێت، هەتا نیوەی یەكەمی سەدەی حەوتەمی كۆچی/ سێزدەمی زاینی، ئەوەش بە روانگەیەكی تایبەت وەرگیراوە لە دیاری كردنی رەهەندی ولاَتناسی نەك سیاسی، لەبەر سروشتی بابەتەكە كە دوورە لە رەهەندە سیاسییەكانەوە.

ئەو لێكۆڵینەوەیە بە شێوەیەكی ورد و دیاریكراو لە ساڵی (٢٣٢ك/٨٤٦ز) دەست پێدەكات، - دوا ساڵی سەردەمی خەلیفە واسیقە- ئەو ساڵەیە كە ئیبن خوردازەبە رەشنووسی یەكەمی پەڕتووكی (ئەلمەسالك و ئەلمەمالیك)ی نووسیوە، كە یەكەم ولاَتناس بووە پەڕتووكەكەی لەبەر دەستدا ماوەتەوە، كۆتایی ئەو لێكۆڵینەوەیەش لە ساڵی (٦٢٦ك/ ١٢٢٨ز)كۆتایی پێ دێت، ئەوەش ئەو ساڵەیە كە مێژووی مردنی یاقوتی حەمەوی ولاَتناسی فەرهەنگییە، كە بە پەڕتووكە ولاَتناسییەكانی گەیشتە لووتكە لە

رووی مەزنی و بەرفراوانی و جۆراوجۆریەتی ئەو زانیارییانەی فەرهەنگەکەی لەخۆی گرتبوو. هەر ئەوەش وای کرد ببێتە سەرچاوەیەکی بەنرخ بۆ ئەو وڵاتناسانەی، کە لە دوای ئەوەوە دەرکەوتن. لە لایەکی دیکەوە ئەو ماوەیەی کە یاقوت تێدا کۆچی دوایی کردووە جۆرێك لە وەستاوی بێدەنگی بەخۆوە بینیوە لەسەرجەم بوارەکانی زانیاریی لەدوای کەوتنی بەغدا.

ئەم لێکۆڵینەوەیە پێشەکییەك و چوار بەش لەخۆ دەگرێت، ئەمە سەرەڕای گرینگترین ئەنجامەکانی، کە لێتوێژ پێی گەیشتووە لە ماوەی لێکۆڵینەوەکەیدا. پێشەکییەکەی وەکو دەروازەیەك باس لە زانستی وڵاتناسی دەکات لە دووتوێی پێناسە و چۆنییەتی سەرهەڵدان و پێوەندییەکانی بە زانستی مێژوو، دواتر کورتەیەك لەبارەی دیارترین پاڵنەرەکانی سەرهەڵدانی پەڕتووکە وڵاتناسییەکان و مەسالیك و مەمالیك و گەڕان لە جیهانی ئیسلامیدا. بێگومان ئەو پێشەکییە زۆر گرینگ و بەسوود و پێویست بووە، لەبەر پێداویستیی سروشتی بابەتەکە.

بەشی یەکەم باس لە کەرتێکی ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە دەکات، کە باسێکی کورتی ژیانی دیارترین وڵاتناسان و گەڕیدە موسڵمانەکانی ماوەی لێکۆڵینەوەکە لەخۆ دەگرێت، هەروەها پەڕتووکە وڵاتناسەکانیان، لەگەڵ جەختکردنەوە لە هەندێ لایەنی گرینگی ژیانیان، وەکو ئەو پرسانەی پێوەندییان بە شوێنی لە دایکبوون و گواستنەوەیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنکی دیکە و چالاکییە زانیارییەکان و کار و پیشەیان و چەندین لایەنی دیکە، کە کاریگەری بەسەر ئەو پەڕتووکانەوە هەبووە، کە لەبارەی وڵاتان و مەسالیك و مەمالیك و گەڕان نووسیویانە، هەر ئەوە بەها و گرینگی ئەو پەڕتووکانە و جۆری ئەو زانیارییانەی لەخۆی گرتووە دیاری دەکات لەگەڵ ئەوەی تا چەند ئەو پەڕتووکە ورد و پوخت و، هەروەها شێواز یان ئەو میتۆدانەی هەر وڵاتناسێك پێڕەوی کردووە لە نووسینەکەیدا. بە دەستەواژەیەکی دیکە ناتوانین جیاوازیی لە نێوان کەسایەتیی نووسەر، کە خاوەن رەهەندی جیاوازە لەگەڵ بەرهەمە زانستییەکانی بکەین.

لە کۆتاییدا ئاماژە بە هەر یەك لەو وڵاتناسانە کراوە، کە تا چەند گرینگیان بە کورد داوە، بە دیاری کراویش ئاماژە بۆ ئەوە کراوە، کە چەند جار بێژەی (کورد)یان بەکار هێناوە، بەبێ چوونە سەر لایەنەکانی دیکەی ئابووری و کۆمەڵایەتی کە لە بەشەکانی دواتردا باسییان کراوە.

بەڵام بەشی دووەم جەخت لە رواڵەتە جوگرافی و کارگێڕییەکانی وڵاتی کوردستان دەکاتەوە وەکو ئەوەی وڵاتناسە موسڵمانەکان باسیان کردووە، لە رووی ناو و پێگە و شوێنیان لە نێو حەوت هەرێمەکەدا، هەروەها هەرێمە جوگرافی و کارگێڕییەکان کە کوردیان بەسەردا دابەش بووە، لەگەڵ پێناسەی دیارترین زاراوەی کارگێڕی، کە وڵاتناسە موسڵمانەکان راهاتوون لەسەری و بەکاریان هێناوە لە باسکردنی وڵاتی کوردستاندا، هەروەها گرینگترین دەرکەوتە و بارودۆخی سروشتی وڵاتی کوردستان، ئەوەی وای کردووە سەرنجی وڵاتناسان رابکشێت بۆ خۆی لە چیا و رووبار و کەشوهەوا، لەگەڵ جیاوازی نێوانیان لەوەی کە چەند گرینگیان پێداوە. ئەمەش واتای ئەوە نییە، باس لە هەموو ئەو چیا و رووبارانەی هەیە کرابێت لە وڵاتی کوردستان، وەکو پەراوێزێك لەبەر دووبارە بوونەوەی ئەوانەی لێتۆژانی پێشتر باسیان کردووە.

بەشی سێیەم تایبەتە بە دەرکەوتەکانی ئاوەدانی، کە لە پەڕتووکە وڵاتناسییەکان و پەڕتووکەکانی گەشت باسکراوە، ئەوەش چەندان مەڵبەندی ئاوەدانی شار و گوندی کوردستان دەگرێتەوە، بە تایبەتی لە هەرێمی جەزیرە و چیای رۆژئاوادا، دواتر ئەو هۆکارانەی یارمەتی رابوونی نیشینگە مرۆییەکانی داوە لە وڵاتی کوردستان، هەروەها ئەو هۆکارانەی بوونەتە هۆی نەمانی رۆڵیان و کەمبوونەوەی کاروباریان لەو بارەیەوە، کە وڵاتناسەکان سەرنجیان لێداوە وەکو ئەوەی پێوەندیی بە پێگە و شوێن و سەرچاوە ئاوییەکان و بازرگانی و سیاسەت بووە. هەروەها لەو بەشەدا باس لە هەندێك لە دەرکەوتە ئاوەدانییەکان لە وڵاتی کوردستان کراوە لە قەڵا، قوللە، شوورە، مزگەوت، بازاڕ و...هتد، هەروەسا پرد و پردۆلکە و قەنتەرە و چەندان چتانی دیکە، ئەمە سەرەڕای ئاماژەدان بەو کەرەستە تەلارسازییانەی بەکارهێنراوە لە ئاواکردنی ئەو ئاپارتمان و شوێنانەی کە وڵاتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان لە پەڕتووکەکانی خۆیاندا باسیان کردووە.

بەشی چوارەم دابەش دەبێت بۆ دوو بەش: یەکەم، بارودۆخی ئابووری وڵاتی کوردستان وەکو وڵاتناسەکان و گەڕیدەکان باسیان کردووە، ئەوەش چالاکی کشتوکاڵی و پیشەسازی و بازرگانی و گرینگترین بەرهەمە کشتوکاڵییەکان و ئەو کەرەستانەی چێکراون و بازرگانیان پێوەکردووە، هەروەها کانزاکاری و سەرچاوەی ئاوە کانزاییەکان کە بڵاوبوونەوەتەوە لە چەندین شوێنی وڵاتی کوردستان، بە تایبەتی لە هەرێمی جەزیرە

و چیاکاندا، ئەمە سەرەڕای باسکردنی بازاڕ و نرخ و دراو بە پێی ئەو پرسەی کە لە لای ولاّتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان باسیان لێوەکراوە.

دووەم: بارودۆخی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە کە ولاّتناس و گەڕیدە کوردەکان تیشکێکیان خستووەتە سەر، ئەوەش بەو بیروڕایانە دەست پێدەکات لەبارەی بنچینە و رەچەڵەکی کورد، کە مەسعودی بەراوردی دەکات بەوانی دیکەوە، کە هەندێ لە ولاّتناسان کە لەدوای ئەوەوە دەرکەوتوون ئەوەیان گواستووەتەوە، لەگەڵ باسکردنی خێڵ و تیرە و دەستە کۆمەڵایەتییەکانی کورد وەکو لە پەڕتووکە ولاّتناسیەکاندا هاتووە، بەبێ ئەوەی بچێتە سەر باسکردنی ناوەرۆکێکیان لە ناو و رەچەڵەك و پاشماوەکانیان کە لە پێشتردا ئەوە لە لێکۆڵنەوەیەکی دیکەدا باسکراوە و لە بابەتەکانیدا ئاماژەی بۆ کردووە.

هەروەها لەو بەشەدا باس لە گرینگترین ئۆل و بیروباوڕی ئاینی و ئاینزا باوەکان لە نێوان دانیشتووانی ولاّتی کوردستان کراوە، کە ولاّتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان باسیان کردووە، لەگەڵ چەندین پەسن و نەریتی گشتی کوردان.

بەلاّم لە بەشی پێنجەمدا کە ئەوەیان کۆتاییە هەندێ لایەنی سەربازی و رووگەی سیاسی لە خۆگرتووە کە پێوەندییان بە کوردەوە هەیە، کە ولاّتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان سەرنجیان داوە، بە تایبەتی ئەوەی پێوەندیی بەهەواڵی فتوحاتی ئیسلامی لە ولاّتی کوردستان و هەڵوێستی کوردانەوە هەیە، کە لێرەدا شاد دەبین بە هەندێ لەو دەقە تایبەتییانەی بەلازری باسی کردوون، لەوەی پێش خۆی گواستووەتەوە یاخۆ پشتی بە سەرچاوەی زانیاریی دیکە بەستووە، دواتر مێژوونووس و ولاّتناسەکانی دیکە گواستویانەتەوە. بەلاّم لە رووی سیاسییەوە بە کورتی هەندێ زانیاریی لەبارەی قەوارەی سیاسی کورد و هەندێ لەسەرکردەکانیان لە ماوەی تۆژینەوەکەدا باسکراوە، ئەمە سەرەڕای ئەو زانیارییانە زۆر کەم و دەگمەنن، بەلاّم گرینگییەکی مەزنی مێژوویان هەیە. لە کۆتاییدا کورتەی دیارترین ئەو ئەنجامانەی تۆژینەوەکە پێی گەیشتووە خراوەتەڕوو.

بەلاّم سەبارەت بە سەرچاوە و بلاّوکراوە بەکارهێنراوەکان لە ئامادەکردنی ئەو تۆژینەوەیەدا، پێویستە جەخت لەوە بکەینەوە کە پەڕتووکی ولاّتناسی بە تایبەتی ئەوانەی دەکەونە نێو ماوەی ئەو لێکۆڵینەوەیە، کرۆکی ئەو بابەتانەیە کە تیایاندا بووە، لەبەرئەوەی پێوەندیی راستەوخۆیان بە ناونیشانی بابەتەکەوە هەیە، لەبەرئەوەی ئەوە

ئەو تەوەرەیەیە کە سەرجەم لایەنەکانی ئەو بابەتەی لەدەور دەخولێتەوە، بۆیە وەستان لەسەر ئەو سەرچاوە وڵاتناسیانە و خوێندنەوەی ناوەرۆکی ئەو پەڕتووکانە پێویستییەکی زانستییە ناکرێت پشتگوێ بخرێت، کە پێویست بوو بەشێکی تەواو تەرخان بکرێت لەو لێکۆڵینەوەیە لەبارەی سەرچاوەکان و شیکردنەوە و جەختکرنەوە لە دیارترین ئەو رەگەزانەی تێیاندایە، هەروەها ئەوەی تایبەتە بە ژیانی وڵاتناسەکان و گەڕیدە موسڵمانەکان بە شێوەیەکی گشتی، کە زانیاریی لەبارەی ئەوانە زۆر کەمە بە هەر هۆیەك لە هۆیەکان بێت کە لە پێشەکی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا ئاماژەی بۆ دەکەین، هەروەها ئەو تۆژینەوەیە زۆر سوودی لە پێشەکی پەڕتووکە وڵاتناسییەکان وەرگرتووە، ئەمە سەرەڕای لە پەڕتووکەکانیان ئاماژەی جۆراوجۆریان کردووەلەپاڵ ئەو جووڵانەوە و چالاکییانەی کە لە بەشە جیاوازەکانی پەڕتووکەکانیان ئاماژەیان بۆ کردووە، کە ئەوانە گرنکی تایبەتیان هەبووە بۆ ئەوەی لەوێوە تیشك بخەینە سەر چەندان لایەنی نادیار لە ژیانیاندا.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی دیارترین سەرچاوە کە ئەو لێکۆڵینەوەیە لە بەشی یەکەم سوودی لێ وەرگرتبێت پەڕتووکی (الفهرست) ئیبن نەدیمە (لەدایکبوون ٣٨٣ك/٩٩٣ز) کە پەڕتووکەکەی بە کورتەیەکی گشتی و گشتگیر دادەنرێت لەبارەی سەرجەم جۆرەکانی زانیاری لە زانست و هونەر و ئەدەب، ئەو پەڕتووکانەی کە پۆلێن کراوە لەو بارەیەوە. لە راستیدا ئیبن نەدیم تاکە کەسە کە باسی لەو زانیارییانە کردووە کە تایبەتن بە ژیانی وڵاتناسان، کە کەس پێش ئەو نەکەوتووە لەوەدا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە باسی کردووە چەند زانیاریەکی کورتە، بەڵام گرینگی تایبەتیان هەیە. لە سەرچاوەکانی دیکەش، کە ئەو لێکۆڵینەوەیە پشتی پێ بەستووە، پەڕتووکی (معجم الادبا)ی یاقوتی حەمەوی فەرهەنگناسە، هەروەها پەڕتووکی (وەفیات الاعیان)ی ئیبن خەلەکانە (لەدایکبوون ٦٨١ك/١٢٨٢ز) کە لە لایەن هەندێ لە نوێنەرانی وڵاتناسان و چەندان زانای بەناوبانگی دیکە وەرگێڕدراوە، کە چەندان زانیاری بە سوودی لەبارەی ئەوانەوە تێدایە، هەروەها سەفدی (لەدایکبوون٧٦٤ك/١٣٦٣ز) لە پەڕتووکەکەی بەناوی (الوافی بالوفیات) و (فوات الوفیات) و ئیبن تەغری بەردی (لەدایکبوون ٨٧٤ك/ ١٤٧٠ز) لە پەڕتووکەکەی (النجوم الزاهرە).

بەڵام ئەوەی تایبەتە بە ناوی پەڕتووکە پۆلێنکراوەکان و ڕیژەکەیان، دیارە پەڕتووکی (کشف الظنون)ی حاجی خەلیفە (لەدایکبوون ١٠٦٧ك/ ١٦٥٣ز) و (اچاح المكنون فی الزیل علی کشف الظنون) ی ئیسماعیل پاشای بەغدادی لە گرینگترین ئەو سەرچاوانە بوونە کە پشتیان پێ بەستراوە و گەڕاوینەتەوە بۆ نووسین و نووسەرەکانیان.

هەروەها پێویست بووە بگەڕێینەوە بۆ هەندێ سەرچاوەی مێژوویی، بە تایبەتی ئەوەی پێوەندیی بە زانیاری سەربازی و سیاسییەوە بووە کە هەندێ لە وڵاتناسەکان باسیان کردووە، لەو سەرچاوانە پەڕتووکی (تاریخ الرسل والملوك)ی تەبەری (لەدایکبوون ٣١٠ك/٩٢٢ز) و پەڕتووکی (الکامل فی التاریخ)ی ئیبن کەسیر (لەدایکبوون ٦٣٠ك/١٢٣٢ز) چەندانی دیکە.

لە ڕاستیدا سروشتی ئەو لێکۆڵینەوەیە وای خواستووە، یەکەم، پشت بە سەرچاوەی وڵاتناسی ببەستین، دووەم، لێکۆڵینەوە نوێکان ئەوانەی باس لە وڵاتناسی و میتۆدەکانیان و هەموو ئەوانەی پێوەندییان پێوە هەیە بکەین. دواتر (پەڕتووکی ئەدەبی جوگرافیای عارەبی) زانای ڕووسی کراچکۆفسکی، لە پێشەوەی ئەو پەڕتووکانە بووە کە بۆی گەڕاینەتەوە، کە ئەوە بە درێژی باس لە ژیانی وڵاتناسان و گەڕیدە موسڵمەنەکان و میتۆدەکانیان دەکات، هەروەها لەگەڵ ئەو تایبەتمەندیانەی کە هەر سەردەمێك پێی دەناسرێتەوە.

لە سەرچاوەکانی دیکە کە پشتمان پێ بەستووە لە باسکردنی ژیانی وڵاتناسەکان و میتۆدەکانیان، پەڕتووکی (جوگرافیناسەکان و گەڕیدە موسڵمانەکان)ی ڕۆژهەڵاتناس مینۆرسکییە، هەروەها پەڕتووکی (وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی خەلافەت)ی لسترەنگ و، پەڕتووکی (لەبارەی جوگرافیای عارەبی)ی نووسەر: شاکر خەسباك و، پەڕتووکی (مێژووی جوگرافیا و جوگرافیناسان لە ئەنەدەلوس)ی نووسەر حوسێن مۆئەنەس و، پەڕتووکی (گەڕیدە موسڵمانەکان لەسەردەمی ناوەڕاست)ی نووسەر زەکی حوسێن و پەڕتووکی (ئەدەبی گەڕان لای عارەب)ی نووسەر عەلی حوسێن مال الله و چەندان سەرچاوەی دیکە کە لە لیستی سەرچاوەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا ناویان هاتووە.

هەروەها ئەو لێکۆڵینەوەیە سوودی لە چەندان سەرچاوەی فارسی و کوردی و ئینگلیزی وەرگرتووە، کە گرنکی خۆیان هەبووە سەبارەت بە بەش و پاژەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیە، لە کۆتاییدا دەڵێم ئەو لێکۆڵینەوەیە بەدەر نییە لە هەندێ کەموکورتی و

هەڵەشەیی و ساتمەیەك كە هەموو تۆژینەوەیەك تێی دەكەوێت، بەڵام من هەوڵەكانی خۆم خستەگەڕ و توانیم بگەمە ئەنجامێك كە كارم لە پێناویدا كردووە، هیوادارم كە من لەو كارەمدا سەركەوتوو بووبم لەو هەولانەی كە ئەنجامم داوە، لێرەدا وام پێ باشە وتەیەكی نووسەری ئەسفەهانی (عیماد) باس بكەم كە دەڵێت: (من بینیم مرۆڤ پەڕتووك لە رۆژی خۆیدا نانووسێت، تەنیا رۆژی دواتر نەبێت، ئەگەر ئەمە بگۆڕێت ئەوا باشتر دەبێت، ئەگەر شتێكیشی بۆ زیاد بكات، ئەوا چاك دەكرێت، ئەگەر ئەوە پێش بخات ئەوا باشتر، ئەگەر ئەوە جێبێڵێت ئەوا جوانتر دەبێت، ئەوە باشترین پەندە و، ئاماژەیە بۆ دەست بەسەرداگرتنی كەموكورتییەكانی تەواوی مرۆڤایەتی). خودا رێ پیشاندەرمانە لە پێناوی چاكەكردندا. سوپاس بۆ خودای پەروەردگار.

**دكتۆر حەكیم...**

## بەرایی..

### زانستی وڵاتناسی.. سەرهەڵدان و گەشەکردنی:

دەرکەوتنی پەڕتووکە وڵاتناسییەکان دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی سەدەی سێیەمی کۆچی/ نۆیەمی زاینی، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە زمانەوانییەکان دەبینین وشەی (وڵاتان) لە وشەی (وڵات) وەرگیراوە، کە (هەر ناوچەیەك یان پارچەیەك لە شوێن دەگەیەنێت، کە خاوەنداریەتی خۆی هەبێت جا ئاوەدان بێت یان ئاوەدان نەبێت).[1] ئاوەهاش لە فەرهەنگی )ئەلوەسیت(دا هاتووە (شار) یان (شارۆکە) بە واتای (شوێنێکی دیارکراو، کە کۆمەڵە کەسانێك تێیدا نیشتەجێن، ئەو شوێنە فرەوانەش لە زەوی بە وڵات ناوی دەبن).[2] خودای گەورەش دەفەرموێ (والبلد الگیب یخرج نباته باژن ربه)[3] یان دیسان دەفەرموێ (انما امرت ان اعبد رب هژه البلده الژی حرمها)[4]

وڵاتان، کۆی وشەی (وڵات)ـــە، ناوێکە بەسەر ناوچەیەکدا دەبرێت کە برێتییە لە (رەگەزی شوێن وەکو عێراق و شام، شاریش بەشێکی تایبەتە لە وڵات، وەکو بەسرە و دیمەشق).([5]) تاش کوبرا زادە زانستی وڵاتناسی بە زانستی رێگەکان و وڵاتان و شارەکان ناودەبات و، بەم شێوەیە پێناسەی دەکات کە: (زانستێکە لە بارودۆخی رێگەکان دەکۆڵێتەوە کە لە نێوان وڵاتاندایە، جا ئەوە وشکاییە یان دەریایی، ئاوەدانە یان وێران،

---

١ - ابن منظور، لسان العرب، بيروت، ١٩٦٨، مج٣، ل٩٤، الفيروز ابادي، القاموس المحيط، بيروت، ١٩٨٣، ج١، ل٢٢٨.

٢ - مجمع اللغة العربية المعجم الوسيط، القاهرة، ١٩٨٥، ج١، ل٦٨.

٣ - سورة الاعراف، الاية ٥٨.

٤ - سورة النمل الاية ٩١، والمقلود بالبلدة في الاية الكريمة مكة المكرمة.

٥ - ابن منظور، المصادر نفسة، مج٣، ل٩٤.

دەشتاییە یان چیایی، راستە یان هەوراز و نشێوە، هەروەها ئەو ئاماژە و نیشانانەیە بۆ ئەو ڕێگەیانە لە چیاکان و نموونەی ئەوانە و چەندان زانیاری لەبارەی ئەو ڕێگەیانە لەوەی تا چەند مەترسیدارن لە رووی ئاژەڵەکان یان رووەکییەکان یان ئاژەڵە دڕندەکان و چەندان نموونەی لەوانە، دیارە سوودی ئەو زانستەش لەکەس شاراوە نییە.[١]

هەروەها تاش کوبرا زادە زانستی وڵاتناسی و مەسالیك و مەمالیك لە یەکتری جیاکردووەتەوە، ئەوەی دووەم بە زانستی ڕێگە و دووری و ماوە ناودەبات کە لە نێوانیاندا هەیە، پێناسەشی دەکات بەوەی (زانستێکە بۆ ناساندنی هەندێك لە ڕێگەکانی نێوان شارەکان جا ئەوە بە فرسەخ یان میل دیاری کرابێت، یان ئەو دوورییە بە مانگ کەمتر یان زیاتر دیاری بکرێت. ئەمەش وەکو زانستێکی پێشکەوتوو سوودی هەبووە).[٢]

ئیبن حوقەل کاتێ باسی ئەو زانستە دەکات و دەڵێت: زانستێکە لە هەرێم و هەموو ئەو شتانەی پێوەستنن پێیەوە لە لایەنی سروشتی و مرۆیی و ئابوورییەوە دەکۆڵێتەوە، کاتێ باس دەکات و دەڵێت: (زانستێکە بەتەنیا لە پاشاکان و رامیارییەکان و هاووڵاتییەکانی، لە هەموو ئەو چین و توێژانەی کە لەژێر دەستی ئەو دەسەڵاتدارانە دایە، دەدوێت).[٣]

کراچۆفسکی دەڵێت: (المسالك والممالك) بە جوگرافیای پەسنی دەگوترێت، ئەو حاڵەتانەش کە باسەکانی لە دەوروبەری قۆناخەکانی ڕێگەکان بە شێوەیەکی تایبەت دەسووڕێتەوە، ئەوە ناوی زانستی (برد)[٤] یان بەسەردا دەبرێت، بەڵام ئەگەر لایەنی کۆزمۆگرافی cosmographic واتە زانستی گەردوونناسی) بەسەردا زاڵ بوو، واتە بە

---

١ - مفتاح السعادة وملباح السيادة في موضوعات العلوم، (بلاد/ت) ج١، ل٣٨٤.

٢ - االمصادر نفسة، ج١، ل٣٨٤، طاش كبرى زادة، كشف الظنون عن اسامي الكتب والفنون، اعادة طبعه بالاوفسيت مكتبة المثنى، بغداد، د/ت، مج ١، ل ٢٣٧.

٣ - صورة الارض، ل١٠.

٤ -برد: کۆی بەریدە برێتییە لە چوار فرسەخ، زانستێکە دنیای ڕێگەکان و شارمان پێدەناسێنێ لە رووی دووری بە فرسەخ و میلەوە، جا ئەوە دوورییەکەی مانگێك یان کەمتر یاخۆ زیاتر بێت، یان ئەوەی کە هەندێك بە بەشێك لە زانستی دەستە وەکو بە مەسالیك و مەمالیك ناودەبرێت، بڕوانە: لديق بن حسن القنوجي لبجد العلوم، الوشي المرقوم في بيان احوال العلوم، بيروت:د/ت، ج١، ل١٢٧ بکە.

روونی باسی شته سەرسام و نامۆکانی دەکرد، کە تەنیا بەکارهێنانی ناوی (زانستی شتە سەرسامەکانی ولاّتانە).[1] لە کاتێکدا مینۆرسکی رای دەگەیەنێت کە کۆمەلێك پەرتووك هەیە هەلّگری ناونیشانی (المسالك والممالك)ن، لە زمانی یۆنانی ئەوانە کۆزمۆگرافیایان زیاتر لە دەستەواژەی (جوگرافیا).[2] پیێ دەگوترێت.

بەو شێوەیە دەکریێ بلّێین جوگرافیای پەسنی و هەریمایەتی کە ناوی (المسالك والممالك)ی هەلّگرتووە، دیارترین لایەنی جوگرافیا دەنوێنێت لای موسلّمانەکان.[3] بۆیە کراچۆفسکی راستییەکە دەپێکی کاتیێ دەبێژێت (میتۆدی جوگرافیای پەسنی ئەوەیە کە بە چڕی دەڕوانێتە ماددەکەی، ئەوەی کە زالّ دەبێت بەسەر ئەدەبی جوگرافیای عارەبی و بەرگێکی تایبەتی بە بەردا دەکات و شێوەیەکی تایبەتی پیێ دەبەخشێت کە زۆر ئەستەمە نموونەی ئەوە ببینینەوە لە ئەدەبی نەتەوەکانی دیکەدا.[4]

بەلاّم ولاّتناس گرینگی بە هەوالّی ولاّتان دەدات، جوگرافیناسەکان و گەڕیدەکان بە ولاّتناسەکان هەلّدەدەن، مەبەستیش لەوان ئەو کەسانەن کە لە ریێگەی گەشتەکان و گەڕانەکانیاندا شارەزای دەریاکان و هەوالّی ولاّتانی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوا و باشوور و باکوور بوونە، (واتە پەڕتووکەکانیان پڕیەتی لە باسی سەرجەم ریێگەکان و باس و هەوالّی ئەو ریێگەیەی بەو ولاّتەدا گوزەری کردووە، هەروەها باسی هەر هەریمێك لە هەریمەکانی ئەو دەولّەتەدا کە ریێژەی باج و سەرانەی تیێدا چەند بووە.[5]

یەکێك لە لیێکۆلّەانەکان وای دەبینیێ کە واتای راستەقینەی جوگرافیای ئیسلامی (المسالك والممالك)ــە یان (ئەلبرد)ــە، بە دانانی ئەوەی هێلّێکی دروستە لەسەر بنەمای گەڕان و بینین و پرسیارکردن دروست دەبێت کە ئاڕاستەی خەلّکی ئەو ولاّتانە دەکرێت و بەدواداچوون بۆ ئەو زانیاریانە دەکرێت کە وەری دەگرن و بە زانیاری دیکە

---

١ -تاريخ الادب الجغرافي العربي، موسكو، لينينغراد ١٩٧٥، ق١، ل٢٠.

٢ -الجغرافيون والرحالة المسلمون، الكويت، ١٩٨٥، ل٧.

٣ - شاكر خصباك، في الجغرافية العربية، بغداد ١٩٣٥، ل٣٠.

٤ - تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١، ل١٨.

٥ -لسترنج، بلدان الخلافة الشرقية، بغداد ١٩٥٤، ل٢٦.

بەراوردی دەکەن و، لێکۆڵینەوە لەبارەی پەڕتووکەکانی پێشخۆیان دەکەن و، دەیخەنە بەر باری سەرنجی رەخنەوە.[1]

ئەوەی جێگەی سەرنجە دەرکەوتنی شێوەی پەڕتووکی وڵاتناسی، هاوکاتە لەگەڵ سەرهەڵدانی مێژووی جیهانی لە لای موسڵمانەکان، دیارە یەکەم کەسێك کە پەڕتووکی وڵاتناسی دانابێت، ئەحمەد کوڕی ئەبی یەعقوبی کوڕی وازحە کە ناسراوە بە یەعقوبی، کە دانەری پەڕتووکی مێژووی جیهان لای مسوڵمانەکان بووە، لەو ئاڕاستەیەوە دەبینین پێوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان جوگرافیا و مێژوو هەیە لە لای موسڵمانەکاندا.[2] لەو ئاڕاستەیەوە ئەدەبی گەڕان بووە لقێکی تایبەت کە بە لایەنێکی گرینگی جوگرافیای ئیسلامی دادەنرێت، چونکە گەڕیدە وڵاتناسێکی گەڕۆکە، ئەوەی گەڕیدەش باسی دەکات، سەرچاوەیەکە تا رادەیەکی زۆر باوەڕپێکراو و بەڵگەدارە بۆ ئەو زانیارییانەی کە وڵاتناس کۆی دەکاتەوە.[3]

سەرهەڵدانی پەڕتووکەکانی گەڕان و گەشەکردنی ئەدەبەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێیەمی کۆچی/ نۆیەمی زاینی، وەکو ئەوەی زۆرێك لە لێکۆڵڤان و لێتۆژان و پسپۆران بۆی دەچن.[4]

لە ڕاستیدا ئەوەی نووسەرانی موسڵمان نووسیویانە لە نێوان سەدەی سێیەم و نۆیەمی کۆچی/ نۆیەم و پازدەی زاینی، لەبارەی گەڕان و گەشتەکان زۆرن، بەڵام ئەو پەڕتووکانەی گەشت و گەڕان کە بەدەست ئێمە گەیشتوون، کەمن.[5] هۆکارەکەیشی ئەوەیە گەڕیدەکان رووداوی گەشتەکانی خۆیان لە پەڕتووکێکی سەربەخۆدا تۆمار نەکردووە، تەنیا کەمێك نەبێت، واتە زۆربەیان هەموو قسەکانی خۆیان لەبارەی ئەو

---

١ - حسين مؤنس، تاريخ الجغرافية والجغرافيين في الاندلس، مدريد ١٩٦٧، ل٨.

٢ - حسين مؤنس، المصادر نفسة، ل٨.

٣ - هەمان المصادر نفسه، ل٩.

٤ - بڕوانە: نقولا زيادة، الجغرافيون والرحلات عند العرب، بيروت، ١٩٦٢، ل١٤٨ بکە. کراتشۆفسکی، المصادر نفسه، ق١، ل١٢٤.

٥ - احمد ابو سعد، ادب الرحلات، بيروت، ١٩٦١، ل٢٠. بەڵام رایەکی دیکە هەیە کە ئەدەبی گەڕیدەیی لای مووسڵمانەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دووەمی کۆچی و پێشکەوتنی لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا، بڕوانە: علي حسين مال الله، ادب الرحلات عند العرب، بغداد ١٩٨٧، ل٣١، بکە.

گەشتانەوە لە پەڕتووكی مێژوو یان وڵاتناسی تۆماركردووە، وەكو یەعقوبی و مەسعودی و[1] چەندانی دیكە، یان هەندێ لە نووسەران ئاماژە بۆ گەشتەكانی كەسانی دیكە دەكەن، بەڵام هیچ شتێك لە نووسینی ئەو نووسەرانە بە ئێمە نەگەیشتووە لەوەی خاوەنەكانیان بەخۆیان دایان نابێت. لەسەرووی هەموو ئەمانەشەوە ئەو گەشتانەی دەریاوانە بازرگانەكان ئەنجامیان داوە، هەموو باسەكانیان بەهەدەر چووە و خاوەنەكانیان هیچ شتێكیان تۆمار نەكردووە.[2]

ئەوەش واتای ئەوەیە ئەو پەڕتووكانەی گەڕیدەكان و ئەوەی ماوەتەوە لەو نووسراوانە، تەنیا بەشێكی زۆر كەمە بە بەراورد بەو هەموو گەڕان و گەشتانەی ئەنجامیان داون، ئەوەی جێگەی ئاماژە بۆكردنە شكۆمەندی ئەو چەند پەڕتووكەی وڵاتناسی و مەسالیك و مەمالیكەی هەیە كە گەڕیدەكان لەبارەی وڵاتان و شارەكان كۆیانكردوونەتەوە، جا ئەوە بە ئامانجی ئاینی یان ئیداری یان بازرگانی یان چەند شتێكی دیكە بووە، بە دانانی ئەوەی گەڕان چاوی جوگرافیای بینینە.

دەكرێ گەشتەكانی كەلتووری ئیسلامی دابەش بكەین بۆ سێ بەش:

– گەشتە جوگرافییەكان، وەكو گەشتەكانی ئیبن فەزلان (لەدایكبوون ٣٠٩ك/٩٢١ز)[3] و گەشتەكانی ئیبن حوقەل (لەدایكبوون ٣٣١ك/٩٤٣ز)[4] و گەشتەكانی مەقدەسی (لەدایكبوون ٣٣٦ك/٩٤٧ز)[5] و گەشتەكانی ئەبی دەلف

---

١ - السيد عبدالعزيز سالم، تاريخ المؤرخون العرب، الاسكندرية ١٩٧٨، ل٢١٤.

٢ - زكي حسين، الرحالة المسلمون في العلور الوسطى، ل١٤. ينظر ايضا: امينة احمد امام الشوربجي، رؤية الرحالة المسلمين للاحوال المالية والاقتلادية لملر في العلر الفاطمي، ٣٥٨-٥٦٧ه/٩٦٩-١١٧١م) القاهرة١٩٩٤، ل٢٦.

٣ - ابن فضلان: ناوی ئەحمەد كوڕی فەزلان كوڕی عەباس كوڕی راشد كوڕی حەمادە یە، لە سەردەمی موقتەدر باللە (٢٥٩-٣٢٠ك/٩٠٨-٩٣٢ز) چۆتە مەملەكەتی بولگار، لەوێدا رابووە بە ئامادەكردنی نامەیەك لەبارەی باسكردنی گەشتەكەی كە تێدا شرۆڤەی چەمكەكانی ئاینی ئیسلامی بۆ وڵاتی بولگار روونكردووەتەوە لە رووی ئابووری و كۆمەڵایەتی و لایەنەكانی دیكە، بڕوانە: دائرة المعارف الاسلامية مادة (ابن فضلان) القاهرة: د/ت/ج١، ل٣٦٤. بكە

٤ - في كتابة صورة الارض.

٥ - في كتابة احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ينظر: الفلل الاول من هذه الدراسة.

(لەدایکبوون ٣٩٠ك/١٠٠٠ز)[١] و گەشتەکانی عەبدولەتیف ئەلبەغدادی (٥٥٧ك/١١٦٢ز)[٢] چەندانی دیکە.

– گەشتە زانستییەکان وەکو گەشتەکەی بەیرونی (لەدایکبوون ٤٤٠ك/١٠٤٩ز)[٣] و گەشتەکەی ئیبن بەتلان (لەدایکبوون ٤٥٨ك/١٠٦٦ز)[٤].

– گەشتی مێژوویی وەکو گەشتەکەی ئەلمەسعودی (لە دایکبوون٣٣٢ك/٩٤٣ز)[١] و گەشتەکەی ئەلهەروی (لەدایکبوون٦١١ك/١٢١٥ز)[٢].

---

١ - لە هەردوو نامەی یەکەم دووەم، ئەوەی یەکەم بزربووە کە باسی گەشتەکەی بۆ چین دەکات، بەلاّم یاقوت هەندێ دەقی لێ گواستۆتەوە، بەلاّم دووەم باسی گەشتەکەی بۆ ولاّتی فارس و ئازەربایجان و ئەرمینیا دەکات، بڕوانە بەشی یەکەمی ئەو لێکۆڵینەوەیە بکەن.

٢ - عەبدوللەتیف بەغدادی: یەکێك لە گەورە زانیانی ئەنسکلۆپیدیا بووە، گەشتی بۆ میسر کردووەو ماوەیەك لەوێ نیشتەجێ بووە، دواتر چۆتە قودس، لە گەشتەکەی بەردەوام بووە بۆ دیموشق و حەڕان و ولاّتی رۆم و حیجاز، لەبارەی گەشتەکەی و ئەوەی بینویەتی لەبارەی میسر نووسیویە، بەلاّم لەبارەی ولاّتانی دیکە کە سەردانی کردوون کە لەژێر چاودێری سەلاحەدین و پاشاکانی ئەیوبی بووە، ناوی پەڕتووکەکەی ناوناوە (الافادة والاعتبار في الامور المشاهدة والحوادث المعانية بارض ملر) بڕوانە: الزركلي، الاعلام، بيروت ١٩٧٩، ج٤، ل٦١، محمد رضا كحالة، معجم المؤلفين، بيروت١٩٥٧-١٩٧٥، ج٦، ل١٥، كراتشؤفسكي، المصادر نفسه، ق١، ل٣٤٦، عبدالرحمن حميدة، المصادر نفسه، ل٢٤٤. بكة.

٣ - ئەبو ریحان بەیرونی لە خوارزم لە ساڵی (٣٦٢ك/٩٧٣ز) گرینگی بە چەندان لایەنی زانستی داوە کە پەڕتووکی لەبارەی کیمیا،فیزیك، مێژوو، جوگرافیا و گەردوونەوە هەبووە. لە دانراوەکانی (الاثار الباقية في قرون الخالية) وەکو باسی دەکەن نموونەی نەبووە (کە وێنەی نەبووە لە هەموو ئەدەبی ڕۆژهەلاّت) بۆ ماوەی نیو سەدە بەردەوام بووە لە دانانی پەڕتووکەکانی کە سەرەتاکەی لەبارەی هیندستانەوە دەست پێدەکات بەناوی (تحرير ما للهند من مقولة مقبولة في العقل او مرذولة) کە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبووە لە نێوەندی زانستی ڕۆژائاوادا، بڕوانە: كراتشكؤفسكي المصادر نفسه، ق١، ل٢٤٥-٢٥٥، حسين سعيد، الموسوعة الثقافية، القاهرة ١٩٧٢، ج١، ل٢٥٥.بكە.

٤ -ئیبن بەتلان: پزیشك و گەڕیدەیەکی مەسیحی بووە، لە بەغدا لەدایك بووە، گەشتەکەی لە ساڵی (٤٤٠ك/١٠٤٩ز) دەست پێکردووە بۆ حەلەب و لەوێوە بۆ ئەنتاکییە و لازقییە و لە میسر گیرساوەتەوە، لە دانراوەکانی (تقويم اللحة) ابن ابي اليبعة، عيون الانباء في طبقات الاطباء، بيروت، د/ت/ل٣٢-٣٢٨، دائرة المعارف الاسلامية، مادة ابن بطلان، ج١، ل٢٢١.

ئەوەی بۆ ئێمە لە هەموویان زیاتر گرینگە لەو لێکۆڵینەوەیەدا گەشتە جوگرافییەکانە، کە تێیدا باسی شار و گوند و ڕێگە و دووری نێوانیان دەکات، واتە مەسالیك و مەمالیك و هەڵوەستەکردن لەسەر دیاردە سروشتییەکان لە چیا و دەریا و ڕووبار و چەندانی دیکە، هەروەها لایەنی مرۆیی لە چالاکییە ئابوورییە جۆراوجۆرەکان و سروشتی خەڵکەکەیی و داب و نەریت و...هتد، بەڵام لێرەدا جیاوازییەکی ئاشکرا هەیە لە نێوان گەڕیدەکان لە گرینگیدانەکانیان بەو لایەنە یان لایەنێکی دیکە لە رووی سروشتی ئەو بابەت و ماددانەی لەبارەیەوە نووسیویانە، ئەمە سەرەڕای ئەو دابەشکردنەی پێشتر، بەڵام لێرەدا جۆرە جیاکردنەوەیەك هەیە لە نێوان ئەو دوو جۆر گەڕیدانەدا، بەشێکیان گەشتەکەیان بۆ وڵاتان بە ئامانجی زانستی بووە، لەگەڵ ئەوەش زانیارییە جوگرافی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانیان بە شێوەیەکی راست و دروست و ورد تۆمار کردووە، دەکرێ ئەوانە ناوبنێین بە (جوگرافییە زانستییەکان)[3] بەشەکەی دیکە لە نێوان شارەکاندا و وڵاتەکان گەشتیان کردووە بە مەبەستی رامیاری یان بازرگانی یان ئاینی، دواتر سەرنج و تێبینیەکانی خۆیان لەو بارەیەوە تۆمارکردووە، ئەو بەشە سەر بە گەڕیدەی ئەدیبەکان بوونە، واتە ئەوانە (سروشتی ئەدەبی) بەسەر جۆری گەشتەکانیاندا زاڵ بووە[٤]،

---

١ - مەسعودی هەواڵ و چاوپێکەوتن و گەشتەکانی لە پەڕتووکێك تۆمار کردووە بەناوی (مروج الذهب والتنبیە والاشراف) بڕوانە بەشی یەکەمی ئەو لێکۆڵینەوەیە .

٢ - ناوی ئەبو بەکری کوڕی عەلی هرویيە، گەڕیدەیەکی بەناوبانگ بووە، ریشەی خێزانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هورات لە ئەفگانستان، لە مووسڵ لەدایك بووە، لە حەلەب نیشتەجێ بووە، لەنێوان شام و دورگەی عارەبی و میسر و وڵاتی رۆم و دروگەکانی دەریای ناوەڕاست گەشتی کردووە، زۆر حەزی لە گەشتکردن و سەردانی گۆڕی پیاو چاکان بە تایبەتی ئەوەی لە پەڕتووکەکەیدا هاتووە (الاشارات الی معرفة الزیارات) کە گەشتەکانی تێدا دیاری کردووە، بڕوانە: الزرکلي، الاعلام، بیروت ١٩٧٩، ج٥، ل٧٣.حسین سعید، الموسوعة الثقافیة، القاهرة، د/ت، ج٢، ل١٠٢٥.

٣ - شاکر خصباك، في الجغرافیة العربیة، ل٢٣٩، محمد رشید الفیل، اثر التجارة والرحالة في تطور المعرفة الجغرافیة عند العرب، الکویت ١٩٧٩، ل١٤.

٤ -شاکر خصباك، المصادر نفسة، ل٢٣٩.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی بەرهەمەکانی هەردوو جۆر لە گەڕیدەکان لە کۆتاییدا بۆتە پانتاییەك لە زیادبوون و بەدەستهێنانی زانیاری جوگرافی زیاتر، بەڵام وەکو دیارە چەند جیاوازییەکی گەوهەری لە نێوان ئەو هەڵوێستانەدا بەدی دەکرێ، چونکە نووسینەکانی گەڕیدە جوگرافییەکان لە دووتۆی خۆیدا تۆوی (تۆژینەوەی زانستی) هەڵگرتبوو، کە دواتر توێژنەوە و لێکدانەوەی بەدوای خۆیدا هێنا، لەو سەرنج و تێبینیانەی لە هەموو لایەنێکی وڵاتەکان تۆمارکراوە، جا ئەوە سروشتی بووبێت یان مرۆیی.[1] لە کاتێکدا نووسینەکانی گەڕیدە ئەدیبەکان پانتاییان سنووردارە و لە تۆمارکردنی بینینی وەرگیراو و تێبینی جیاجیا تێپەڕ ناکات، لەبەرئەوەی پشت بە دەستنیشان کردن دەبەستێت[2]، بۆیە راست نییە گەڕیدە یەکسان بکەین بە جوگرافیناس، کە ئەمەیان پێویستی بە لێ وردبوونەوەی زانستی و ڕاستی قووڵ هەیە، بە پێچەوانەوە هەموو ئەو شتانەی لە گەڕیدە داواکراوە برێتییە لە راستگۆیی و دەستپاکیی لە گواستنەوەی ئەو دیاردانەی سەرنجی لێدراوە، کە رەنگە ئەوەش سوودی زانستی خۆی هەبێت.

سەبارەت بە سەرهەڵدانی زانیاری جوگرافی و ئەو پێشکەوتنەی بەخۆوەی بینیوە لای موسڵمانەکان بە شێوەیەکی گشتی، کە ئەبا جەعفەر محەمەدی کوڕی موسای خوارزمی (لە دایبکوون٢٣٢ك/٨٤٥ز) بە یەکەم دانەری بەردی بناخەی زانستی جوگرافی ئیسلامی دادەنرێت، کە تا رادەیەکی زۆر کاریگەر بوو بە جوگرافیای بەتلیمۆسی گەردوونناس، پەڕتووکەکەی بەتلیمۆس ناسراوە بە (جوگرافیای ئاوەدان و باسی زەوی).

بەڵام ئەحمەدی کوڕی سەرخەسی (لەدایکبوون نێزیکەی ساڵی ٢٨٦ك/٨٩٩ز) ئەوەش لەنێو زانایە موسڵمانە پێشینەکان دادەنرێت، کە لە بواری جوگرافیا دانراوی هەبووە و هەڵگری ناونیشانی (المسالك والممالك)[3] بووە، ئەو ناونیشانەی کە زۆر بڵاوبووە لەنێو وڵاتناسانی سەدەی سێیەمی کۆچی/ نۆیەمی زاینی و سەدەکانی دواتر. وەکو سەرنج دەدەین گرینگی پەڕتووکەکەی سەرخەسی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە وڵاتناسێکی زۆری موسڵمان پشتی بەو بەستووە، (یاقوت ئەلحەمەوی) چەند جارێك ناوی سەرخەسی

---

١ -هەمان المصادر نفسە، ل٢٣٩.

٢ - السيد عبدالعزيز سالم، المصادر نفسة، ل٢١٤.

٣ - المسعودي، مروج الذهب ومعادن الجوهر، بيروت، ١٩٦٦، ج١، ل١٤.ابن النديم، الفهرست، ل١٤٩.

هێناوە لە قسەکردنی لەبارەی ڕێگەکانی وڵاتان، هەروەها ئیبن نەدیمیش بە (بە ئەدەبەترین ئەدیب و زۆرترین گێڕانەوە) باسی دەکات[1].

بەڵام ئەبو عەباس جەعفەر کوڕی ئەحمەدی مروزی (لەدایکبوون نێزیکەی ساڵی (٢٧٤ك/٨٨٧ز) کە ئیبن نەدیم وا باسی دەکات، یەکەم کەس بووە لەبارەی مەسالیك و مەمالیك پەڕتووکی داناوە[2]، هەروەها یاقوتیش ئەو رایەی چەند جارێك دووبارە کردووەتەوە[3]، ئەمە سەرەڕای ئەوەی مروزی لە ئەهواز لەو کاتدا بە چارەنووسی خۆی گەیشتبوو، هەر لەو کاتەدا ئیبن خوردازەبە رەشنووسی یەکەم و دووەمی پەڕتووکەکەی (المسالك والممالك)ی تەواو کردبوو[4]، هەروەها بارتۆلد گەیشتووە بەو دەرئەنجامەی کە مروزی کۆچی دوایی کردووە، پێش ئەوەی پەڕتووکەی بەناوی (المسالك) تەواو بکات، بۆیە دانراوە تایبەتیەکانی گوازراوەتەوە بۆ بەغدا لە دوای مردنی و لەوێدا فرۆشراوە[5].

بۆیە مێژوونووسان و خاوەن پەڕتووکە وەرگێڕدراوەکان زۆر لەبارەی پەڕتووکەکانی مروزیەوە نازانن، بۆ ئەوەی بزانن کە بە سەرخەسی کاریگەر بووە یان بە کەسانی دیکەی وەکو ئەو، یان ئەو پەڕتووکە دەچێتە نێو ئەو سەرچاوانەی کە وڵاتناسە موسڵمانەکان لە سەدەی چوارەمی کۆچی سوودیان لێ وەرگرتبێت، بە تایبەتی ئەوانەی (مەسالیك و مەمالیکیان) پۆلێن کردووە وەکو ئەبی زەیدی بەلخی و ئەستەرخی و ئین حوقەل و کەسانی دیکە.

لەسەر ئەو بنەمایانەی پێشەوە کە باسمان کرد پەڕتووکی مەسالیك و مەمالیکی ئیبن خوردازەبە هەر بە یەکەم پەڕتووك دەمێنێتەوە کە لەو بوارەدا دانراوە، کە دانەیەکی

---

١ -الفهرست، ل١٤٩.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل١٥٠.

٣ - معجم البلدان، ج٢.

٤ - كراتشكوفسكي، المصادر نفسه، ج١، ل١٣١.

5- Hudud al- alam translated v. minorsky, (London:1937)p.12.

کورتکراوەی پێمان گەیشتووە[1]، وا پێشبینی دەکرێ دانەیەکی دیکەی دوور و درێژتری لەوە هەبوو بێت، بەڵام ون بووە[2]،

دێرینترین رەشنووسی ئەو پەرتووکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (**٢٣٢ك/٨٤٦ز**)، هەروەها لێرەدا رەشنووسێکی دیکەی دووەم هەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (**٢٧٢ك/٨٨٦ز**)[3].

بەڵام پەرتووکی وڵاتانی یەعقوبی کە بە پەرتووکێکی هاوچەرخ دادەنرێ بۆ ئیبن خوردازەبە، مێژووی پۆلێنکردنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نێزیکەی ساڵی (**٢٧٨ك/٨٩١ز**) واتە دوای کۆتایی هاتنی ئیبن خوردازەبە لە دانانی پەرتووکەکەی لە دوای چەندین ساڵ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی سەرچاوە مێژووییەکان سەلماندوویانە کە بەرواری کۆچی دوایی یەعقووبی پێش کۆچی دوایی ئیبن خوردازەبە بووە.

بەو شێوەیە موسڵمانەکان هەر لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە دەستیان کردووە بە دانانی پەرتووك لەبارەی رۆژژمێری وڵاتان و رێگەکان و شار و ناوچەکان، بەڵام لە نیوەی دووەم بەرهەمیان باشتر و زۆرتر بووە، هەروەها لەبارەی پەرتووکی گەشت و گەڕانەوە کە هەردەم لە خزمەت زانیاری وڵاتناسی بووە، بۆیە ناتوانین قسەی لەسەر یەکێکیان بکەین و یەکێکی دیکە یان ئەوانی دیکە پشتگوێ بخەین.

سەدەی چوارەمی کۆچی رۆڵێکی تەواوی بینیوە،[4] لەبارەی دانانی پەرتووکی وڵاتناسییەوە، کە زنجیرەیەك پەرتووك دەرکەوتن کە باس لە گرینگی رێگەکان و شارەکان و جوگرافیای پەسنی و هەرێمایەتی دەکات، دانەرانی ئەو پەرتووکانە وەکو جەیهانی و بەلخی و ئەستەرخی و ئیبن حوقەل و مەقدەسی و مەسعودین، کە تا رادەیەکی زۆر پابەندی بنەمای میتۆدی زانستی بوونە لەسەر بنەمای شێوازی

---

١ - لە بەشەکانی داهاتوو بە درێژی باسی دەکەین.

٢ -بڕوانە: كراتشكوفسكي، مرجع سابق، ق١، ل١٥٦.و Hudud al- alam translated v. minorsky, (London:1937)p.13-14.

٣ - محمد محمود محمدين، نلول تراثنا الجغرافي بين الاقتباس والاختلاس، مجلة كلية الادابن جامعة الرياض١٩٨١، مج٨، ل١٧٥-١٧٦.

٤ - ئەوە هەمان ئەو شێوازەیە کە زانایان لە سەردەمی نوێ لە نووسینی جوگرافیای پەسنی پەیرەوی دەکەن

چاوپێکەوتن و بینین و لێکۆڵینەوەی کەسایەتی[1] و بەراوردکردن لە نێوان زانیاریی بەدەستهێنرا و خوازرا و لە گەشت و گەڕاندا.

ئەوەی لە وردی و گرینگی ئەو زانیاریانەی زیادکردووە، کە وڵاتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان باسیان کردووە، ئەمە سەرەڕای ئەزموون و چاوپێکەوتنی خودی خۆیان، کە ئەوان سەربە وڵاتانی جۆراو جۆر بوونە، جۆرێك لە کێبرکێ لە نێوانیاندا دروست بووە لەبەدەستهێنانی زانیاریدا.[2]

ئەو قۆناخە بە (جوگرافیای کلاسیکی) ناسرا.[3] وەکو سەرنج دەدەین پێشەنگانی یەکەم لەوانە موسڵمانە فارسەکان بوونە، وەکو جەیهانی و بەلخی و ئەستەرخی، هەر لە سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زایندا، سەرەتای دەسپێکی داهێنان و پێگەیشتن بووە جێگەی گرینگی پێدانی وڵاتناسەکان لە هەر سێ سەدەکانی دواتردا، کە خۆی لە سێ تەوەرەی سەرەکی دەنوێنێت[4]: یەکەم گرینگیدان بە هەرێمەکانی جیهانی ئیسلامی و هەرێمەکانی دەوروبەر، لەوانە بەلخی و ئەستەرخی و ئیبن حوقەل و مەقدەسی و، هەروەها بەیرونی لە پەڕتووکەکەی لەبارەی هیندستان. دووەم: پسپۆڕی لە وڵاتێکی دیاری کراو، وەکو پەڕتووکەکەی هەمەدانی لەبارەی (پەسنی دوورگەی عارەبی)، هەروەها ئەوەی بەیرونی دەتوانرێ ناوبنرێت بە جوگرافیای تایبەت. سێیەم: بە فەرهەنگی وڵاتان دانرا، کە لە سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەمی زاینی دەست پێدەکات، کە سروشتێکی زمانەوانی وەرگرت، وەکو پەڕتووکەکەی بەکری بەناوی (معجم ما استعجم)، لەپاش ئەوە ئەو لایەنە پێشخرا، کاتێك یاقوتی حەمەوی (معجم البلدان)ی دانا، ئەویش وەکو کۆگەیەکی زانیاری وابوو کە ئەدەب و زانست و مێژووی لەخۆ دەگرت، ئەمە سەرەڕای نووسینێکی بەرفرەوان لەبارەی زانیاری وڵاتانەوە.

لەبەر گرینگی ئەو پەڕتووکە وڵاتناسیانە و ئەوانەی لە دەور و خولی ئەو بابەتە دەخولێنەوە لە رووی زانیارییەوە، بارتۆڵد باس دەکات و ئەمە بە جێگەی شکۆمەندیی و (بەنرخترین پاشماوەی شارستانییەتی ئیسلامی لە هەردوو سەدەی چوارەم و پێنجەمی

١ - شاكر خصباك، المصادر نفسه، ل١٢٧.

٢ - احمد سوسة، الشريف الادريسي في الجغرافية العربية، بغداد ١٩٧٤، ج١، ل١٤٥.

٣ - محمد رشيد الفيل، المصادر نفسه، ل٩. المكتبة الجغرافية، ل٢٤٣.

٤ -تاريخ الحضارة الاسلامية، نقله من التركية الى العربية حمزة طاهر، ملر، د/ت/ل٥٠.

کۆچی)ناو دەبات. ئەویش جەخت لەوە دەکاتەوە و بەوە دەربڕینی لێدەکات کە (بەڵگەداری پێوەندییە شارستانییەکانە)[1]، هەر وەکو گەواهیدانی هەردوو ڕۆژهەڵاتناس جان سۆفاجیە و کلود کاین بەوەی کە موسڵمانەکان ڕۆڵێکی پێشەنگیان گێڕاوە لە گرنیگدان بە بواری جوگرافیاوە، وەکو دەڵێن: (هەتا سەردەمی دۆزینەوەکان زانستی جوگرافیا بە گشتیی لە لایەن موسڵمانەکانەوە دەستی بەسەردا گیرابوو، سەرەڕای ئەوەی هەموو ئەوانەی هەیە هەتا ئێستە هەر هی جوگرافیناسانی موسڵمانەکانە بە تایبەتی جوگرافیای سەردەمی زێڕین (سەدەی چوارەمی کۆچی/دەیەمی زاینی) کە گرینگییەکی بێوێنەی هەیە لای زانایانی ڕۆژئاوا[2].

پەڕتووکە جوگرافییە پەسنییەکانی هەرێمەکان کە بە پەڕتووکی (وڵاتان) و (المسالك والممالك) دادەنرێت، بە شێوەیەکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ جۆرێك لەو پەڕتووکانەی هەبووە لای زانا موسڵمانەکان لەسەرجەم بوارەکان و لایەنەکانی زانیاری لەو کاتدا، کە هیچ جۆرێك لە جۆرەکانی پسپۆری دیاری کراو بەو چەمکە نوێیەی ئێستە نەبوو، بۆیە هەندێك لە وڵاتناسەکان، مێژوونووسیش بوون لەو کاتدا، وەکو یەعقوبی و مەسعودی و ئەبی فیدا، بۆیە پەڕتووکەکانی وڵاتناسان خاڵی نەبووە لە زانیاری مێژوویی، بەڵام بە شێوەی جۆراوجۆر، لەوانە هەیە گرینگی زۆری بە بوارەکانی دیکەی زانست داوە، وەکو ئەبی دەلف مەسعەری کوڕی موهەلهەل ئەلخەزرەجی و بەیرونی، کە یەکەمیان گرینگی بە بواری کیمیاگەری و پزیشکی داوە، دووەمیشیان لە بواری گەردوون و کانزاکاری و بەرد چەندان پەڕتووکی داناوە.

لە لایەکی دیکەوە سەلماندنی زانستی تا ئەوەندە بڕی نەکردووە لە ڕووی باوەڕەوە، بۆیە کە سەرنجی پەڕتووکە وڵاتناسییەکان دەدەین، چەندان هەواڵ و زانیاری هەیە خۆی لەبەردەم ئاوەز و لۆژیك ناگرێت.

لەسەر ئەو بنەمایانەی لە پێشەوە باسمان کرد ستەمێکی گەورەیان لێ دەکەین ئەگەر میتۆدی زانستی نوێ بەسەر پەڕتووکە وڵاتناسییەکانیاندا جێبەجێ بکەین، بۆیە ئەوە مافی ئێمە نییە داوای پێشکێشکردنی باسێکی دوور و درێژ و قووڵ لەبارەی وڵاتە

١ -ملادر دراسة التاريخ الاسلامي، بيروت ١٩٨٨.ل٧٠.

٢ - بڕوانە: ابن رستة، الاعلاق النفيسة، بيروت ١٩٨٨، ل٢٨، ابن الفقيه الهمذاني، مختلر كتاب البلدان، بيروت ١٩٨٨، ل٢٥١-٢٥٦. المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ل٢٤٩-٢٥٠.

جۆراو جۆرەکان بکەین، چونکە ئەوە شتێکی ئەستەمە لەسەردەم و لەو ساتەی کە ناسراوە بە سەرەتایی لە ئامرازەکانی گەیاندندا، ئەمە سەرەڕای ئەوان هەوڵی ئەوەیان داوە شتێ لەبارەی ئەو شوێنانە بزانن کە تێیدا گوزەرانیان کردووە یان نێزیك بووە لە ناوچەی نیشتەجێ بوونیانەوە، واتە چەندە لە ناوچەکەی خۆیانەوە دوورکەوتبنەوە، ئەوەندە چارەسەرییەکان لاواز و زانیارییەکانیان ورد نەبووە، ئەوەش شتێکی ئاسایی بووە.

هەروەها هەندێ لەو نووسینانە بە پلەی یەکەم زیاتر لە خزمەت پیاوانی ئیدارە و دەسەڵاتدار و بازرگانان بووە، نموونەی لەو جۆرە نووسینانە پێوسست بە لێکۆڵینەوەی قووڵ و فرەوان ناکات، دەکرێ بڵێین ئەو درێژدادرییەی لە پەڕتووکە وڵاتناسییەکاندا هاتووە باسی چەندان پرس و بابەتی جۆراوجۆر دەکات لەوەی جەختیان لێ کردووەتەوە، دەکرێ لەو چەند خاڵەی خوارەوەدا کورتیان بکەینەوە:

أ- تۆژینەوەی ڕێگەکانی هاتوچۆ لە رووی ئاڕاستە و کەشوهەوا و شارەکانەوە کە بەسەریاندا هاتووە، هەروەها دووری نێوانیان کە تا چەند ئەو ڕێگەیانە خۆش و پڕ ئاسایش بوونە.[1] بێگومان ئەو جۆرە پرسانە گرینگی تایبەتی خۆیان هەبووە لە رووی ئابووری و سەربازی و ئا ینیەوە.

ب- کە باسی شارەکانیان کردووە ئەوەندەی لەدەستیان هاتبێت باسێکی وردیان کردووە، لەگەڵ پێشکێشکردنی چەردەیەك لە مێژوو و شێوە و ناوەکەیی و جۆری بینایەکان و دانیشتووانەکەی[2]. دیارە ئەو گرینگیدانە گەورەیە بە تۆژینەوەی شارەکان وای کردووە موسڵمانەکان ببنە پێشەنگ وەکو ناودەبرێت بە جوگرافیای شارەکان.

ت- گرینگیدان بە باسی دیاردە تۆبۆگرافییەکان و جەختکردنەوە بە تایبەتی لە رووبار و دەریا و دەریاچەکانەوە[3].

---

١ - بۆنموونە بڕوانە: ابن خرداذبة، المسالك والممالك، بيروت ١٩٨٨، ل٣٨-٥٣-٥٩-٦٣ بكة، ابن رستة المصادر نفسه، ١٤٩-١٥٤.

٢ - بۆ نموونە بڕوانە: المقدسی، احسن التقاسيم في معرفة الاقاليم، ط١، بيروت ١٩٨٧. ل١١٢، ١٣٤، ٢١١، ٢٨٠، ٢٨٧، ٢٨٩. ياقوت الحموي، معجم البلدان، ط١، بيروت ١٩٩٧.

٣ - بڕوانە الطخري، المسالك والممالك، تحقيق محمد جابر عبد العال الحسينى، القاهرة ١٩٦١، ل٢١، ٣٠، ٧٠، ٧١، المسعودي، مروج الذهب، ج١، ل١٧٤-١٨٥.

پ- گرینگیدان بە بوارەکانی ئابووری وەکو کشتوکاڵ و پیشەسازی و کانزاکاری و بارودۆخی بازاڕەکان و چەندانی دیکە[1].

ج- باسکردنی زانیاری مێژوویی کە هەندێ جار پێوەندیی بە وڵاتان و شارەکان و دەسەڵاتدارانییەوە هەبووە ، زۆرجاریش ئەو زانیاریانە شتێکی نوێ نەبووە لەبارەی دانیشتووانی وڵاتەکان و باوەڕ و داب و نەریت و رەفتارەکانیانەوە[2].

گرینگیدانی وڵاتناسە موسڵمانەکان بە شێوەی جۆراوجۆر بەو لایەنانەی باسمان کرد لەیەکتر جیاوازە، هەیە گرینگی بەیەك لایەن داوە زیاتر لە لایەنەکانی دیکە وەکو ئیبن خوردازەبە کە تەنیا گرینگی بە رێگە و دووری ماوەی نێوانیان داوە، هەیە گرینگی بە دوو لایەن داوە زیاتر لە لایەنەکانی دیکە، وەکو ئیبن حوقەل و مەقدەسی کە ئەوانە جەختیان لە بوارەکانی ئابووری و نێوەندی شارنشینی کردووەتەوە زیاتر لە لایەنەکانی دیکە.

لە دووتۆی خوێندنەوەی دەقەکانی وڵاتناسانەوە ئەوەمان بۆ دەرکەوت جەختکردنەوە لە چەند خاڵێك زیاتر لەوانی دیکە، دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی ئەو پەڕتووکە وڵاتناسیانە کە بەخۆیانە دیتووە بە درێژایی سەردەمەکان، بە تایبەتی ئەوانەی دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچی لە لایەك و، جۆری ئەو پێوەندییەی وڵاتناسەکە هەیبووە بە شێوەکانی پەڕتووکی وڵاتناسی پەسنی و هەرێمایەتی لە لایەکی دیکەوە.

بە پشت بەسەتن بە باسەکانی پێشەوە دەکرێ بڵێین گرینگیدانی وڵاتناسە پەسنییەکان یەکەمجار لەسەر پرسی دیاری کردنی دووری نێوان رێگەکانی ناوچەکان و شار و شارۆچەکە دیارەکان و پێوانەی باج و خەراج بەسەر بەروبوومە جۆربەجۆرکاندا بووە، باشترین نموونەش بۆ ئەو ئاڕاستەیە ئیبن خوردازبە بووە لە (المسالك والممالك)[3] و قودامەی کوڕی جەعفەر بووە لە (الخراج وصناعە الکتابە)[4] و هەندێکی دیکەش

---

١ - بڕوانە: البلاذری، فتوح البلدان، بیروت١٩٨٣، ل١٩٣، ١٩٤، ١٩٩، ٢٠٩، ٣٠٠، ٣٠٤، ٣١٧، المقدسي، المصادر نفسه، ل٢٥٧، ٢٦٢، ٢٩١، ٢٩٩، ٣٠٢، ٣٠٦

٢ - بڕوانە: الطخري، المسالك والممالك، ل٥٣، ٥٨، ٧٧، ١١٠، ١١٩، ١٢٠. و ابن حوقل، صورة الارض، بیروت١٩٧٩، ل١٩٧، ٢٠٠، ٢٠٢، ٣١٠. بکة.

٣ - بڕوانە:ل٢١، ٢٨، ٤٦، ٥١. بکة.

٤ - بڕوانە:ل١٢٧، ١٢٩، ١٦٩، ١٨٤.

رۆڵیان هەبووە، بەڵام بە شێوەیەکی پێشکەوتووتر وەکو ئیبن رستە لە (الاعلاق النفسیە)[1] و ئیبن فەقێی هەمەدانی لە (مختصر كتاب البلدان)[2] و یەعقوبی لە (بلدان)[3]دا.

وەکو سەرنج دەدەین لە نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچی گرینگیدانەکانی وڵاتناسان جۆراو جۆربووە، هەر تەنیا لە ناوی مەمەلکەت و شار و دیاری کردنی دووری رێگەکان نەدەوەستایەوە، بگرە گرینگیدان بە لایەنەکانی سروشتی و بارودۆخی ئەوکات لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئیداری بە شێوەی بەش بەش و جەختکردنەوە لە لایەنەکانی شارستانی بە تایبەتی لای ئیبن حوقەل و مەقدەسی.

بەڵام سەبارەت بە جۆراو جۆری لە نووسینی وڵاتناسی، ئەویش بەپێی تێپەڕبوونی کات چەند جۆرێك بووە، واتە دوای پەڕتووکە وڵاتناسییەکان باسیان لە ناوی وڵاتان و هەرێم و شار و رێگەی هاتوچۆ و دووری نێوانیان دەکرد، ئەوە بە پەڕتووکی (المسالك والممالك) ناسرا، دواتر ئەوە گوازرایەوە بۆ گرینگیدان بە لایەنەکانی سروشتی و مرۆیی وەکو لەو پەڕتووکانەی هەڵگری ناونیشانی (صورە الارچ) و (الاقالیم) و (احسن التقاسیم فی معرفە الاقالیم) بوون، دواتر پەڕتووکی (صفە الجزیرە العرب)ی هەمەدانی[4] و پەڕتووکی (وصف الهند)ی بەیرونی و پەڕتووکی (الفادە والاعتبار)ی عەبدول لەتیفی بەغدادی وەکو لە پێشەوە باسمان کردن دێت.

لە قۆناخەکانی دواتردا گرینگیدانی وڵاتناسەکان فرەوانتر بووە، کە پەڕتووکەکانیان زیاتر سروشتێکی گشتگیری بەخۆوە بینی، کە ئەویش نووسین بوو لەسەر وڵاتانی ئیسلامی و نا ئیسلامیەوە، وەکو لە (نزهە المشتاق فی اختراق الافاق)ی ئیدریسی بەدیار

---

١ - بڕوانە:ل١٤٩، ١٦٩.

٢ - بڕوانە: ل١٠٤، ١٠٩، ١١٨٥، ١٨٩. بکە.

٣ - بڕوانە ل٣٨، ٤٥. بکە.

٤ - ئەبو حەسەن هەمەدانی ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە هۆزەکانی باشووری دوورگەی عارەبی، زانیاریی لە بارەی ئەو کەسە زۆر کەمە، بەڵام لە سەنعا لەدایکبووە و گەورە بووە، سەردانی مەکەی کردووە و لە ساڵی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) کۆچی دوایی کردووە، وڵاتناس و ڕەچەڵەکزان بووە، لە دانراوەکانی (لفة جزيرة العرب) و كتاب (الاكليل) بڕوانە: كراتشكوفسكي، المصادر نفسه، ق١، ل١٧٢.بكة..

دەکەوێت[1]. سەرەڕای ئەوەی ئەمە بەو واتایە نییە کە وڵاتناسەکانی پێشوو هەرگیز باسی وڵاتانی غەیرە ئیسلامیان نەکردبێت.

بەدیارکەوتنی جۆرێکی دیکە لە پەڕتووکی وڵاتناسی کە خۆی لە فەرهەنگ دەبینیەوە، کە مەبەستەمان بە پلەی یەکەم (معجم ما استعجم)ی ئەبی عوبەیدی بەکری و (معجم البلدان)ی یاقوتی حەمەوییە، هەروەها پێویستە ئەوەش لەیاد نەکەین بوونی جۆرێکی دیکەی پەڕتووك هەبوو ئەگەرچی گرینگیان لەوانەی پێشەوە کەمتر بوو کە خۆی لە پەڕتووکەکانی کۆزمۆگرافی دەنواند کە باسیان لە شتە سەرسامەکان و نامۆکان دەکرد لەوەی کە خاوەن پەڕتووکەکە بنیوبەتی یان گوێی لێ بووە، لە بابەتەکانی خورافات و ئەفسانە وەکو پەڕتووکی (تحفه الالباب ونخبه الاعجاب)ی غەرناتی.[2]

هەروەها ئەوەی پێوەندیی بە شێوازی پەڕتووکەکانی وڵاتناسی و شێوازی نووسینەکانیانەوە هەیە، ئەوەش جۆراوجۆر بووە بە پێی جۆری مەبەستەکەیان، بۆ نموونە پەڕتووکە ئەنسکلۆپیدییەکان لەوانە پەڕتووکی مەسعودی کە زانیاری جوگرافی پەسنی گشتی لەخۆ دەگرێت بەبێ ئەوەی پابەند بێت بە پرەنسیپە جوگرافییە دیاری کراوەکان، واتە هەندێ جار زانیاری مێژوویی[3] بەسەریدا زاڵ بووە و، هەندێ جاریش چیرۆکی ئەدەبی و هەقایەت.[4] هەر وەکو کە باسی وڵاتێك یان شارێکی دیاری کراو دەکات بە شێوەیەکی دوور و درێژ[5] لە یەکێکی دیکە بە کورتی[6]، هەر بەو شێوەیە لەبارەی

---

١ - دواتر دێنە سەر باسی ئەمە.

٢ - ئەبو حامد غەرناتی ئەندەلوسی (٤٧٣-٥٦٥ك/١٠٨٠-١١٧٠) یەکێك بووە لە گەڕیدەکانی ئەندەلوس، هەر لە ساڵی (٥٠٨-١١١٤) دەستی بە گەشت و گەڕان کردووە چەندان وڵاتی وەکو میسر و هەندێ دورگەی دەریای سپی و وڵاتی ئێران و پشت دەریاکان و بەلقان گەڕاوە، رۆژانی کۆتایی تەمەنی لە بەغدا و مووسڵ و دیمەشق بەسەر بردووە و هەر لەوێ مردووە، دانانی پەڕتووکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٥٥٧ کۆچی لە مووسڵ بەناوی (تحفة الالباب) پەرتووکەکەی دابەش دەبێتە سەر پێنج بەش، هەموو بەشەکانی باس لە شتە سەرسوورمانەکانی دنیا دەکات لە دەریا و وشکانی و مرۆڤ و جنۆکە و ئاژەڵ و رووەك و شتە بێگیانەکان.

٣ - بۆ نموونە بڕوانە: مروج الذهب، ل٥٣، ٥٤، ٢٠٤، ٢١٠، ٢٣١، ٢٣٥. بکە.

٤ -المصادر نفسة، ل٨٢، ٨٩، ٢١٣، ٢٢٢، ٢٧٩، ٣٨٥.

٥ -المصادر نفسة، ٢٣٠، ٦٥، ٦٩، ١٢٧.

٦ -المصادر نفسة، ل١٣١، ١٣٥، ١٨٣.

دەریاکان و رووبارەکانەوە[1]، هەر چۆنێك بێت دەکرێ بڵێین ئەو پەڕتووکانەش زانیاری تایبەت بە جوگرافیای گشتییان لەخۆ گرتووە.

بەڵام پەڕتووکە فەرهەنگییەکان ئەوانیش وەکو ئەوانی دیکە بە درێژی باسی وڵاتان و شار و دەرکەوتە سروشتیەکان و لەگەڵ گرینگیدان بە رووداوە مێژووییە دیارەکاندا کردووە، لە کاتێکدا پەڕتووکە کۆزمۆگرافییەکان جەختیان لە دیاردە و پرسە تایبەتیەکانی بە هەندێ لە وڵاتان و ناوچەکان داوە، کە زۆرجار تێپەڕی سنووری زانست و لۆژیکیان کردووە، وەکو ئەوەی خۆیان لە قەرەی ئەفسانە و جادو و شتی پڕوپووچ دابێت، دیارە ئەوەش واتای ئەوە نییە کە ئەو پەڕتووکانە ڤاڵایە لە زانیاریی تەدروست لەبارەی هەندێ دەڤەرەوە.

لە دواجاردا گومانمان لەوە نییە کە ئەرکی وڵاتناس و گەڕیدەکان لەسەر ئاستی هەموو زانیارییەکاندا مەزنە، بۆیە گرینگی پەڕتووکەکانیان وا دەکات پێویست بکات چەندان تۆژینەوەی لەبارەوە بکرێت لەلایەن لێتۆژان لە بواری مێژوویی و ئابووریی یان سیستەمی رامیاریی یان مێژووی کۆمەڵایەتیی نەتەوەکانی ئیسلامی لەوانەش کوردەکان کە ئامادەییەکی دیارییان هەبووە لە رووی رامیاری و شارستانییەوە لەسەرجەم سەردەمەکانی مێژووی ئیسلامییەوە، بۆیە هەر ئەوەندە لە توانی لێتۆژ دایە کە راستییەکان بەدیار بخات و زانیارییەکان پۆلێن بکات، بە شێوەیەك کە دڵنیابێت لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی، بەتایبەتی ئەگەر رەزامەند نەبوایە لەسەر تۆژینەوەی زانیارییەکان کە باسکراوە لەبارەی تیژبینی و چاوی رەخنەگرانەوە.

پاڵنەرەکانی گرینگیدانی موسڵمانەکان بە گەشت و تۆژینەوەی وڵاتناسییەوە بەرفرەیی پەڕتووکە وڵاتناسییەکان و زۆری گەشتەکان، کە موسڵمانەکان پێی رابوون، پاڵنەرمان دەبن لەوەی بزانین پاڵنەرە ناوەکییەکانی پشت ئەمە چییە، بە تایبەتی ئەگەر بزانین وڵاتناس و گەڕیدەکان مەبەست و نیازی تایبەتییان هەبووە لە پەڕتووکەکانیان،

---

١ - المصادر نفسة، ج١، ل١١١، ١٤١.

جا ئەوە ئاینی یان ئابووریی یان رامیاریی یاخۆ زانستی و...هتد بووبێت، بۆیە لێرەدا دیارترین هۆکارەکان بە کورتی باس دەکەین[1]:

١- ئیسلام زانستی لە باوەش گرتووە و هەوڵ دەدات بڵاوی بکاتەوە و سوودی بۆ هەموو لایەك هەبێت، وەکو دەزانین لە قورئانی پیرۆز چەندان ئایەتی تێدایە بانگەشەی وێنانکردن و رامان و چۆنییەتی دروستبوونی زەوی و ئاسمان دەکات، هەروەها ژیانی زەوی و گەڕان لە وڵاتان بۆ زانینی بارودۆخیان و چارەنووسی نەتەوەکانیان، هەروەها تێدا باسی چەندان وڵات و نەتەوە و شار کراوە، لەگەڵ دیاردەی سروشتی لە چیا و رووبار و چەندانی دیکە لە ئایەت و فەرمودەی پەیامبەرەوە باسکراوە.

٢- دەستبەسەرداگرتنەکانی ئیسلامی کاریگەری زۆری هەبووە لە گرینگیدان بە وڵاتان و شار و رێگەکان و چۆنییەتی زانینیان و زانینی نەتەوەکانیان، هەروەها زانینی جۆری گرتنەکەیان، واتە گرتنەکە بە ئاشتی و رێککەوتن بووە یان بە شەڕ، چونکە بۆ هەموویان حوکمی تایبەت هەیە لە شەریعەتی ئیسلامیدا، لە چارەنووسی خۆشویستن و وەرگرتنی باج و سەرانە و چەندانی دیکە لەو کاریگەریانەی لە ئەنجامی دەستبەسەرداگرتنەکە هاتوونەتە کایەوە، لەسەر ئەو بنەمایە دەسەڵاتی ناوەندی کە خۆی لە دەوڵەتی خەلافەت دەنواند سوور بوو لەسەر تۆژینەوەی بارودۆخی وڵاتانی دەوروبەر کە لەژێر دەسەڵاتی خەلافەت کۆببوونەوە، ئەوەش خۆی لە دیاری کردنی باج بە شێوەیەکی ورد و بوونی سیستەمێکی حوکمی تەندروست دەبینیەوە.

٣- فرەوانی سنووری دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمە جۆر بە جۆرەکاندا بە تایبەتی کاریگەریی بەسەر چالاکییەکانی دەستبەسەرداگرتندا بووە هۆی فرەوانکردنی چوارچێوەی بازرگانی و بڵاوبوونەوەی لە وڵاتانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و باشوور و باکوورییەوە، دواتریش ئەوە بووە هۆی زیاتر یارمەتی بۆ گرینگیدان بەو وڵاتانەی بازرگانییان لەگەڵ دەکرد، هەروەها ئەو رێگە بازرگانییانەی رێگەی داگیرکەران و شەڕکەرانیان دەگۆڕی.

---

١ -بۆ زیاتر روونکردنەوە بڕوانە: رضا کحالة، التاریخ والجغرافیة في العلور الاسلامیة، دمشق، ١٩٧٩، ل٢١٦، ٢١٧، احمد سوسة، الشریف الادریسي في الجغرافیة العربیة، بغداد ١٩٧٤نل١٠٥، ١٠٦، محمد لبحي عبد الحکیم و طاهر عبد الحمید الیثي، علم الخرائط، مکتبة الانکلو ملریة، ١٩٦٩نج١، ل١٩-٢٢.

٤- خۆشەویستی گەڕیدەکان لە بەدەستهێنانی ئەو زانستانەی لەنێو موسڵمانانیدا بوونی هەبوو، یارمەتیدەر بوو بەسەر پێشکەوتنی زانیاریی جوگرافییەوە، ئەمەش بووە هۆی هاتنە کایەی چینێکی تایبەت خودان زانیاری و پەڕتووکی جوگرافییەوە، بێ ئەوانە هیچمان نەدەزانی لەبارەی وڵاتان و هیچ هەواڵێکی ئەوانەمان گوێ لێ نەدەبوو کە لە گەڕیدەکان و بازرگان و حاجیەکان و ئەهلی ژیاننامە و شوێنەوارەکانیان وەرگیراون و گوازراونەتەوە. دواتر زانایانی ڕۆژژمێری وڵاتان پەڕتووکی جوگرافییان لەبارەوە داناوە، لەوانەی مەبەستیان بووە پەڕتووکەکانیان باسی وڵاتە بەناوبانگەکان و شوێنە ئاوەدانەکان بکات، هەشبووە مەبەستی بووە پەڕتووکەکەی ناوچە وشك و بێ ئاوەکان، کە شوێنگەی عارەب بووە لە هەواڵ و زانیارییەکان باس بکات، هەشبووە لەبارەی جوگرافیای پەسنییەوە باسی مەملەکەت و وڵات و ناوچە و وڵاتانی ئیسلامی زیاتر لە وڵاتانی خاچهەڵگران بکات، کە زۆر جار ڕێگرییان نەدەکرد لە هاتنی گەڕیدەکان بۆ تێگەیشتن لە داب و نەریتی خەڵکەکەیی و زانینی بارودۆخ و سروشتی ئەو نەتەوانە، ئەوەی لەدووتۆی ئەوانەدا هاتووە لە هەندێ بابەتدا دژ بە ڕاستی بووە، لەبەرئەوەی بە زمانی ئەو نەتەوە و میللەتانە بووە و، ئەو گەڕیدە و وڵاتناسانە توانای ئەوەیان نەبووە لەگەڵیان تێکەڵاوبن لەبەر چەندین هۆکار.

٥- گەشتکردن بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج گرینگترین هۆکار بووە لە ئەنجامدانی گەشت و گەڕان و پێشکەوتنەکانی، وەکو دەزانین موسڵمانەکان ساڵانە لەسەرتاپای جیهانی ئیسلامی ڕوویان کردۆتە مەکە و مەدینە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی فەریزەی حەج، بۆیە هەندێ حاجی لە کاتی گەڕانەوەیاندا بۆ وڵاتەکانیان ئەوەی بینیویانە تۆماریان کردووە و باسی ئەو وڵاتانەیان کردووە کە پێیدا تێپەڕ بوون.

دەرکەوتنی ئەو بارودۆخانە لە نووسینی گەڕیدەکان زۆرە، نموونە ناسر خەسرە و کە باسی چەندان شارمان بۆ دەکات کە پێیدا تێپەڕیوە، هەروەها هەندێ جار زۆر بە وردی بەراوردی نێوان بارودۆخی ئەو وڵاتانە لەگەڵ یەکتر دەکات، لەگەڵ باسکردنی سروشت و کاروباری ئابووریی و دارایی و بارودۆخی کۆمەڵایەتیی و چەندان لایەنی دیکە، هەر ئەوەش بەدی دەکرێت لە ئیبن جەبیر و ئیدریسی کە لە دواتر و لە بەشەکانی دوایی بە درێژی باسیان دەکەین.

# بەشی یەكەم

## وڵاتناس و گەڕیدە موسڵمانەكان و بەرهەمە وڵاتناسییەكانیان و پێگەی كورد لەو بەرهەمانەدا

لەم بەشەدا باس لە دیارترین وڵاتناس و گەڕیدەی موسڵمانان دەكەین بە تایبەتی ئەوانەی قەدەر وای كرد بەرهەمەكانیان لەبەرامبەر زەبری رۆژگار بمێنێتەوە و، هەروەها لایەنی گرینگ و دیار لە ژیاننامەكانیان و دڵنیابوون لە گەڕان و گەشتەكانیان، لەوەی پێی رابوونە لەگەڵ جیاكردنەوەی وڵاتناس و گەڕۆكەكان لە یەكتری، واتە پەڕتووكەكەی لەسەر بنەمای گەشتەكان و كۆكردنەوەی زانیارییەكان داناوە، یان تەنیا وڵاتناس بووە و بەس، یان دانانی پەڕتووكەكەی بە پشت بەستن بە قسە و وتەی وڵاتناس و گەڕیدەكانی پێش خۆی بووە.

دەكرێ لێرەدا ئاماژە بەوە بكەین ئەو زانیارییانەی لەبارەی وڵاتناس و گەڕیدەكان لە پەڕتووكەكانی ژیاننامە و وەرگێڕاندا هەیە بە شێوەیەكی گشتی زۆر كەمە، ئەگەر بەراوردی بكەین بەوانەی خاوەن زانست و زانیاری بوونە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی چەندانیان لەمانە نەك هەر وڵاتناس نەبوونە، بگرە گرینگیان بە لایەنێكی دیكەی زانیاری داوە كە لە دواتر دا بۆمان روونده‌بێتەوە، رەنگە ئەمانە مەبەستیان نووسینی ژیاننامە و وەرگێڕان بووبێت و جەختیان لە نووسینی ژیاننامەی ئەوانە كردبێتەوە كە لە بواری زانستی ئاینی دانانیان هەبووە، واتە گرینگیان زیاتر بەوانە داوە كە لەبواری زانستی قورئان و فەرموودە و فیقه دانان یان شارەزاییان هەبووە لە لایەك و، لەبەر

گەورەیی ئەو زانستانە لە لایەکی دیکەوە، هەروەها زۆر گەشت و گەڕانی ئەو وڵاتناس و گەڕیدانە لە نێوان ئەو ناوچە و وڵات و گەڕان و هاتوچوونیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بە بەردەوامی، ئەمە ڕۆڵێکی گرینگی هەبووە لەوەی ئەو هەموو شتانە تۆمار نەکرێن و هەندێکیان لەبیر بکرێن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زۆرێك لەو نووسینانەی وڵاتناسان و ئەوانی دیکە بەهەر هۆیەکەوە بێت لەناوچووە، یان بەلایەنی کەمییەوە لە ئێستەدا دوورە و دەستمان نایانگاتێ، بێگومان ئەگەر پارێزراو بوونایە، ئەوا هیچ نەبوایە زانیاری دیکەمان دەستدەکەوت لەبارەی  لایەنە نادیار و شاراوەکانی ژیاننامە و مێژوو و بەرهەمەکانیان.

ئەمەش واتای ئەوە نییە هەرچی لەو زانیارییانەی مابێتەوە لە سەرچاوە جۆراو جۆرەکانی ئەو وڵاتناسانە، بە تایبەتی ئەوەی دەچێتە ژێر باری ئەو لێکۆڵینەوەیە، لەگەڵ ئەوەی ئەگەر بەراورد بکرێت بە خاوەن زانیارییەکانی دیکە هەژار و کەم زانیارییە، بەڵام زۆر لەوە بەرفرەوانترە کە تەنیا یەك لێکۆڵینەوە بیگرێتە خۆی، لەبەرئەوە ئێمە پەل بۆ لایەنی گرینگ دەبەین و ئاماژە بە لایەنی دیاری ژیاننامەیان دەکەین، بەبێ ئەوەی بچینە نێو باسێکی درێژدادڕییەوە، هەروەها سەبارەت بە بەرهەمەکانیشیان ئێمە زیاتر جەختمان لە وڵاتناسییان کردووەتەوە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی هەندێ لە ناوەڕۆك و هێڵە گشتییەکان و پاڵنەرەکانی دانانی ئەو پەڕتووکانە.

لە لایەکی دیکەوە لەو پاژەدا تێبینی جۆرێك لە پێکچوونی چەندایەتی دەکەین لە دووتۆی چارەسەکردنی وڵاتناسان و بەرهەمەکانیان، ئەگەر گرینگی هەر وڵاتناسێك و بەرهەمەکەی لەبارەی وڵاتانەوە بە سەرنج و تێبینی وەربگرین.

لە دووتۆی گەڕان و لێوردبوونەوەمان دەرکەوت ژمارەیەکی زۆری وڵاتناسان ئەوانەی ئەو تۆژینەوەیە دەیانگرێتەوە، فارس بوونە، بگرە یەکەم وڵاتناس کە بەرهەمەکەی مابێتەوە و لە کورتەیەکی ئەو بەرهەمی (مەسالك و مەمالك)دا باسکراوە، فارس بووە، کە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی کۆچی، کە ئەوەش سەرەتای ئەو چوارچێوە کاتییەی ئەو تۆژینەوەیە دیای دەکات.

ڕەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەو بەرفرەوانییە شارستانییەی فارسەکان لە رووی رەگەز و وڵاتەوە، کە ئەوان پێش ئیسلام یەکێك بوونە لەو دوو زلهێزە گەورەیە و، پێگەیەکی بەرزیان هەبووە لەسەرجەم بوارەکانی زانیارییدا، کاتێ ئیسلام چووە نێو وڵاتەکانیانەوە

لەگەڵ دەرکەوتەی نوێی شارستانی و هزری نوێ کەوتنە کارلێکردن، کە ئەمەش پشکدارییەکی کارابوو لە بنیاتنانی شارستانییەتێکی نوێ، کە ئەمە تەنیا بەسەر نەتەوەیەك دانابڕی بەبێ نەتەوەکانی دیکە، یان رەگەزێك بەبێ ئەوانی دیکە، بگرە بوارەکە کراوەیە بۆ هەمووان کە هەر یەك بەپێی توانای خۆی داهێنان بکات، بەڵام فارسەکان پێشینەیەکی شارستانیان هەبووە، کە لە توانایاندا هەبوو کاریگەرییان هەبێت بەسەر جومگەکانی شارستانییەتی ئیسلامی، لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزوویەکی باشیان هەبوو لە کارلێکردن و کاریگەری و کاریگەربوون بەوەی کە عارەب لەگەڵ خۆیدا هێنای و توانی شێوازی ژیانیان لە رەگەوە بگۆڕێت، ئەویش به هەڵگرتنی پەیامی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی لە هەموو ناوچەکەدا، دیارە پەرچەکرداری فارسیش بە شێوەیەکی گشتی ئەرێنی بووە لە رووی شارستانییەوە، بۆیە سەر لەنوێ تێهەڵچوونەوە و خزمەتێکی گرانبەهایان پێشکێش بە شارستانییەتی ئیسلامی کرد، کە هەموو ئەو گەل و رەگەزانەی کۆکردەوە کە باوەڕیان بە ئیسلام هێنابوو.

بەڵام کورد، هەر لەو کاتەی هاتنە نێو ئیسلامەوە کارلێکردنێکی ئەرێنیان لەگەڵ ئەو ئاینە نوێیەدا کرد و، داهێنانی تازەیان پێشکێش بە شارستانییەتی ئیسلامی کرد، کە چەندین زاناو گەورە ئەدیبی تێدا دەرکەوت، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ فارسەکان ئەوان درەنگتر، چونکە زۆربەی وڵاتی کوردستان پێش ئیسلام لەژێر دەسەڵاتی فارسەکاندا بووە لە رووی (رامیاری و شارستانییەوە)، بۆیە توانا شارستانییەتیەکانیان لە دەستدا بوو، یان نادیارتر و لاوازتر بوو لەوەی کە لەنێو شارستانییەتی دیکە بتوێتەوە.

ئەوەی پێوەندیی بەو پاژەوە هەبێت ئێمە هیچ وڵاتناس و گەڕیدەیەکی کورد نابینین کە ناویان هێنرابێت، یان بەرهەمە وڵاتناسییەکانیان بەدەست ئێمە گەیشتبێ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کورد گرینگی بە گەڕان نەداوە، لەبەرئەوەی سروشتی وڵاتەکەیان لە رووی جوگرافییەوە کە هەر هەمووی چیاییە، ئەوەش وای کردووە ئاستەنگی زۆری بۆ چێ بکات لە پێوەندییکردن بە کەسانی دیکەوە، هەروەها پێوەندییە مرۆییەکان و کۆمەڵایەتییەکان و ئابوورییەکانیشی گەمارۆداوە لە چوارچێوەیەکی بەرتەسك، ئەمەش وای کردووە ئارەزووی لە گەشت و گەڕان و ئەحواڵپرسینی کەسانی دیکە و وڵاتان نەبێت، بێگومان ئەو جۆرە ئارەزووەش هۆکارێکی بنچینەیی بووە

لەسەرهەڵدانی وڵاتناسان، ئەمە سەرەڕای پێداویستی پێوەندییکردن بە کەسانی دیکە سەبارەت بە کورد ئەو دوو هۆکارەی نەبووە.

لە کۆتایی باسکردنی هەر وڵاتناسێك چەند جارێك ئاماژە بە وشەی (کورد) لە نووسینەکانیاندا کراوە بەبێ ئەوەی بچنە نێو وردەکاریەکانەوە. کە دواتر لە بەشەکانی دیکە دەیبینین.

بەڵام سەرچاوەکانی وڵاتناسان و گەڕیدەکان لەبارەی کورد و وڵاتەکەیان، ئەوە لە نێوان بینین و پرسیارکردن دەخولێتەوە، هەروەها پرسین و گوێگرتن و خوێندنەوەی پەڕتووك و لە کۆتاییدا تۆماری فەرمی کە بەردەستی هەندێك کەس کەوتوون، ئەوانەی خەریکی کاری وەزیفە و ئیداری بوونە وەکو کابن خوردازەبە و ئیبن رستە و جەیهانی و ئەوانی دیکە.

ئەوە شتێکی ئاساییە وڵاتناسی گەڕیدە کە دەنووسێ پشت ببەستێ بە بینین و لێکدانەوەکانی خۆی لەکاتی گەڕانیدا بەنێو هەرێم و شارەکاندا، لە دواییدا وڵاتانسی گەڕیدە ئەستەمە زانیارییەکان تەنیا لە ڕێگەی گوێگرتن و گواستنەوەدا کۆبکەنەوە، بگرە دەبێت لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەرزی واقیع و باوەڕپێکرا و ئەمە بکەن، ئەمەش پێویستی بە گەشتی مەیدانی و ورد هەبووە، بۆیە پێغەمبەر (د.خ) دەڵێ: هەواڵ وەك بینینی نییە" مەسعودیش لەو لایەنەوە جەخت لەوە دەکاتەوە بە قسەیەك و دەڵێ: فێربوون کاری نەتەوەکانە بە بینین، عارفیش تایبەتمەندیی هەرێمەکانە بە لێوردبوونەوە"[1].

هەروەها مەقدەسی رایدەگەینێ ئەو زانیارییە زۆرەی لە پەڕتووکەکەی ئەودا پانتاییان هەیە و داڕژاوە لە بەرئەنجامی گەڕان و ئازار چەشتنی زۆرەوە بووە، بە قسەی خۆی دەڵێ: (هەفتەم لێ تەواو نەدەبوو تەنیا لە گەڕان و سووڕانم لە وڵاتان و چوونم بۆ نێو هەرێمەکانی ئیسلام نەبێت، پانتایی هەرێمەکانیشم بە فرسەخ پێواوە هەتا شارەزایان بووم، خولانەوەم بەسەر تخوبەکانیەوە بووە تا نووسیومەتەوە، چوومە نێو ناخیانەوە تا فێری بووم، لە هەموو مەزهەبەکانم کۆڵیەوە تا شارەزای بووم، وردبوونەوەم لە زمان و رەنگەکان تا بە باشی زانیم، کەوتم بە زەویدا تا لێکم جیاکردنەوە، گەڕانم بەدوای

---

١ - مروج الذهب، ج١، ل١٠

دەروازەیەك هەتا بەدەستم هێنا.)[1]. دیارە پرسیار و وردبوونەوە یەکێکە لە سەرچاوەکانی زانیاری وڵاتناسی، وەکو لە پێشەوە باسمان کردن، لەو بارەیەوە مێژوونووس و وڵاتناس یەعقوبی دەڵێ: (من کاتێ پیاوێکم بدیبایە لەو وڵاتانە پرسیارم لەبارەی وڵات و شارەکەیەوە لێ دەکرد، ئەگەر شوێنی ماڵەکەی پێ بگوتبام، ئەوا پرسیاری وڵاتەکەیم لێ دەکرد کە چی دەچێنن، دانیشتووانەکەی کێن عارەبن یان عەجەم،.. هەتا پرسیارم لەبارەی جل و بەرگیان و ئاین و وتارەکانیان دەکرد.. دواتر ئەوەم دەسەلماند کە ئایا ئەوەی پێم دراوە راستگۆیی تێدا بووە)[2]. سەبارەت بەو وڵاتناسانەی نەگەڕاون و پەڕتووکێکیان نووسیوە، پشتیان بە زانیاری پەڕتووکی پێش خۆیان بەستووە، ئەو شتانەیان دەستنیشان کردووە کە خۆیان پێیان باش بووە، درێژیان دەکردەوە یان کورت، یان پیت بە پیت هەندێ لەو زانیارییانەیان دەگواستەوە لە نموونەی ئەوانە: قودامەی کوڕی جەعفەر و خاوەنی پەڕتووکی (حدود العالم) و بەکری و ئەوانی دیکە.

ئەوەش واتای ئەوە نییە گەڕیدەکان هەرگیز سوودیان لەو پەڕتووکانە وەرنەگرتووە و، تەنیا پشتیان بەهەندێ سەرچاوە بەستەوە کە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد، بێگومان بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەوان سوودیان لەو پەڕتووکانە وەرگرتووە کە پێشتر هەبوونە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەموو هەوڵەکانیان پشتبەستن بووە بە بینین و چاوپێکەوتن و لێکدانەوەی خۆیان لەبارەی وڵاتان و ئەوەی دەیان بینی، لێرەدا لەبارەی ئەو وڵاتانس و گەڕیدانە دەدوێین کە ئەو لێکۆڵینەوەیە لەخۆی گرتووە.

---

١ - احسن تقاسم، ل١٦.

٢ - البلدان، ل٥.

## یەکەم: وڵاتناس و گەڕیدەکانی سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی:

### - ئیبن خوردازەبە (لە دایکبوون نێزیکەی ٣٠٠ك ـ ٩١٣ز)

ناوی تەواوی ئەبو قاسم عەبیدەڵا کوڕی ئەحمەدە ناسراوە بە ئیبن خوردازەبە[١]، لەسەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچی لەدایك بووە، کە دەکاتە سەدەی نۆیەمی زاینی، باپیرەی ئاگرپەرست بووە، بگرە یەکێك بووە لەسەرکردەکانیان[٢]، لەسەر دەستی بەرمەکییەکان[٣]، ئیسلام بووە، باوکیشی خاوەن پلە و پایەیەکی گەورە بووە لە ویلایەتی تەبرستان[٤]، لەسەردەمی ئەودا چەندین ناوچە ئازادکران لە وڵاتی دەیلەم و، هەروەها لە چیاکانی جرجان کە دەکەوێتە نێوان تەبرستان و خوراسان، ئەوەش لە ساڵی (٢٠١ك-٨٦٠ز) بووە.[٥]

---

١ -ابن الندیم، الفهرست (بیروت:د:ت) ل١٤٩، البغدادي، هدیة العارفین (استنبول:١٩٥١) اعادت طبعه بالاوفست منشوارت مکتبة المثنی (بغداد، د/ت) مج١، ل٦٤٥.

٢ - عباس العزاوي، تاریخ الجغرافیة او الکتب البلدان، مخطوطة موجودة في دار لدام للمخطوطات تحت رقم ٣٢، ورقة ١٤.

٣ -بەرمەکییەکان: بنەماڵەیەکی فارسی بوونە، نێزیك بوونە لە بنەماڵەی خەلیفەی عەباسی هارون رەشید (١٧٠-١٩٣ك/٧٨٦-٨٠٨ز) لە دیارترین سەرکردەکانیان یەحیا کوڕی خالید و کوڕەکانی بووە، کە فەزل و جەعفەر و موسا و محەمەد بوون، کە ئەوانە پۆستی گەورە و گرینگیان لە دەوڵەت وەرگرتووە و خزمەتێکی باشییان بە عەباسییەکان کردووە، بەڵام دوای رەشید کودەتایان لەسەر دەکات جەعفەری کوڕی یەحیا دەکوژێت و یەحیا و کوڕەکەی زیندانی دەکات و موڵك و سامانیان دەستبەسەردا دەگرێت، کە ئەمەیان لەبەر چەند هۆکارێك بووە گرینگترینیان ترسانی بووە لە دەسەلاتیان، بڕوانە : الطبري، تاریخ الرسل والملوك (بیروت، ١٩٦٧)ج٨، ل٢٣٠) محمود شاکرن تاریخ الاسلامي، (بیروت، ٢٠٠٠)ج٥، ل١٤٧-١٤٨. بکة.

٤ - تەبرستان: ناوچەیەکی بەرزی چیایە، سەرجەمیان ئەمڕۆ پێی دەگوترێت چیای بەرز، کە درێژ دەبێتەوە بە دەشتاییەکانی باشووری قەزوین، لسترنط، بلدان الخلافة الشرقیة، (بغداد:١٩٥٤)ل٤٠٩.

٥ - الطبري، المصادر نفسه، ج٨، ل٥٥٦.

پەڕتووکەکانی ژیاننامە و وەرگێڕان و مێژوو، زانیارییەکی وامان پێنابەخشن لەبارەی ئەو وڵاتناسە پێشەنگە، تەنیا ئەوە نەبێت کە خاوەن پلەو پایەیەکی گەورەی ئیداری بووە لە هەرێمی چیاکان، ئەویش پیشەی (خاوەن نامەبەری و هەواڵ)[1] بووە، بەڵام بەبێ ئەوەی ماوە و ساڵی ئەو پیشەیە دیاری بکات کە ئەو تێیدا خەریکی ئەو پیشەیە بووە[2]، بەڵام لەبارەی نووسینەکانی، ئیبن ئەلندیم چەند پەڕتووکێکی لە بوارەکانی زانیاری جۆراو جۆر تۆمار کردووە، ئەویش پەڕتووکی (ادب السماع) و پەڕتووکی (جمهره انساب الفرس والنوافل) و پەڕتووکی (الطبیخ) و پەڕتووکی (اللهو والملاهی) و پەڕتووکی (الشراب) و پەڕتووکی (الانواو) و پەڕتووکی (الندماو والجلساو)(١) هەروەها مەسعودی ئاماژە بەوە دەکات کە پەڕتووکێکی لەبارەی مێژووە هەبووە، کە هەواڵی نەتەوەکانی پێش ئیسلامی تێدا بووە[3].

لە بەدبەختی، هیچ پەڕتووکێك لەمانە نەماوە، تەنیا پەڕتووکی (المسالك والممالك) نەبێت، وەکو مەسعودی وتارێکی لەبەردەم موعتەمەد پێشکێش کردووە لەبارەی ئامێرەکانی مۆسیقا و گۆرانی و تەپڵ و گۆڤەندەوە[4]. فێربوونی مۆسیقاش گەورەیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هاوڕێیەکی خۆشەویستی باوکی کە ناوی (ئیسحاق مەوسڵی)بووە[5].

وەکو لە پێشەوە باسمانکرد پەڕتووکی (المسالك والممالك) تاکە پەڕتووکە توانراوە بدۆزرێتەوە، کە ئەوە یەکەم پەڕتووکی ئیسلامییە کۆمەڵێك وتاری جوگرافی لەخۆ

١ - ابن ندیم، المصادر نفسه ، ل١٤٩، نیقولا زیادة، الجغرافیة والرحلات عند العرب، ل١٨.

٢ - نیقولا زیادة، الجغرافیة والرحلات، ل١٨، احمد رمضان احمد، الرحلة والرحالة المسلمون، القاهرة:د/ت، ل٥٥، دائرة المعارف الاسلامیة، مادة ابن خرداذبة، ج١، ل٢٦٨.

٣ -افهرست، ل١٤٩.

٤ -مروج الذهب، ج١، ل١٤.

٥ - ئیسحاق مەوسڵی: ناوی ئیبن ئیبراهیم مەوسڵی بووە، باشترین گۆرانیبێژ بووە لە سەردەمی عەباسییەکاندا، لە سەدەی سێیەمی کۆچی ـ هەشتەمی زایینی ژیاوە، کارەکانی پاك بووە، زانای دنیای گۆرانی و رێگەکانی ریتم بووە، شیعر و ئاوازی دادەنا، خاوەن ئاوازی زۆرە.

گرتووه و، به دێرینترین پەڕتووکی جوگرافی دادەنرێت که به زمانی عارەبی نووسرابێت[1].

(دی گۆیه) که ئەو پەڕتووکەی بڵاوکردووەتەوە وای دەبینێ که ئیبن خوردازەبه پەڕتووکەکەی له ساڵی (٢٣٢ك/٨٤٦-٨٤٧ز) داناوە، که ئەوەش ساڵی کۆتایی حوکمی خەلیفه ئەلواسیقه (٢٢٧-٢٣٢ك/ ٨٤٢-٨٤٧ز) ئەمه وا مایەوە و هەندێ شتی بۆ زیاد کرد، تا دانەی دووەمی له ساڵی (٢٧٢ك/٨٨٥-٨٨٦ز) دەرکەوت، ئەوەش رای زۆربەیه[2].

دی گۆیه پێی وایه ئەو پەڕتووکەی لەبەردەستمانه نموونەی پەڕتووکه تەواوەکه نییه، بگره نموونەی کورتکراوەیەکه، که له ئەنجامی تەنیا دوو دەستنووسەوە دۆزراوەتەوە[3].

له راستیدا هیچ پەڕتووکێکی وڵاتناسی بەرفرەوان و بەربڵاو له کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی باشتر لەو پەڕتووکه نەبووە[4]، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین ئەو شتانه دیاری بکەین که لەو پەڕتووکه وەرگیراوە لەبەرئەوەی دانه رەسەنەکەی ون بووە[5].

گرینگی ئەو پەڕتووکه لەوەدایه که خاوەنەکەی پشتی به بەڵگەی فەرمی و تۆماری دیوان و زانیاریی بەرفره بەستووە له دیوانی خەلیفەکانەوە، به حوکمی پێگه و پۆستەکەی که خاوەنی نامەبەری بووە، لێرەوەیه ئەو شتانەی دەستی کەوتووە به شێوەیەکی گشتیی زۆر ورد بووە، به تایبەتی ئەوەی پێوەندیی به ماوەی نێوان شار و ناحییەکانەوەیه، هەروەها ئەوەی پێوەندیی به کاروباری داراییەوە هەیه، که مەقدەسی به گوتەیەك جەخت لەوە دەکاتەوە: که ئیبن خوردازەبه وەزیری خەلیفه بووە و کەسێکی دەستڕۆیشتوو بووە له گەنجینه و سامانی ئەمیری ئیمانداران[6].

---

١ - حسن ابراهيم حسن، تاريخ الاسلام، (القاهرة ١٩٦٤)ج٢، ل٣٥١.

٢ -كراتشكوفسكي، المصادر نفسه، ل١٥٦. مينورسكى، الجغرافيون والرحالة المسلمون، ل٨. دائرة المعارف الاسلامية (مادة ابن خرداذبة) ل٢٦٨، لسترنج، المصادر نفسة، ل٢٦-٢٧.

٣ - كراتشكوفسكى، المصادر نفسه، ق١، ل١٥٦.

٤ - ابراهيم شوكت، الجغرافية العربية حتى القرن العاشر الميلادي، بغداد١٩٩٠، ل٨٢.

5- hudud al – alam,p13.

٦ - احسن التقاسيم، ل٩-٢١.

ئەوەش بە دوور نازانرێ کە ئیبن خوردازەبە سوودی لە پەڕتووکێکی مێژوویی فارسی وەرگرتبێ کە لەبارەی ئێرانی کۆنەوە بووە و، خۆیشی فارسی و دەوڵەمەندیش بووە[1].

بە روانین بۆ گرینگی ئەو پەڕتووکە وای کرد ببێتە جێگەی سەرنجی وڵاتناسانی دوای خۆی، وەکو سەرچاوەیەکی بنچینەیی بۆ زانیاری پشتیان پێ بەستووە و لە پەڕتووکەکانی خۆیاندا باسیان کردووە لەوانە (یەعقوبی) و (ئیبن رستە)و (ئیبن حوقەل) و (ئەلمقدەسی)و (ئەلجەیهانی) و (ئەلمسعودی) و هیدیکەش، (ئیبن خوردازەبە پێشەوا بوو لە دانانی پەڕتووکدا، پێڕەوی ئەویان کردوە و پشتیان بەو بەستووە، هەندێ شتیان لەو وەرگرتووە، شوێنەواری ماوە[2]، لە پەڕتووکە دانسقە و دیارەکانی، پەڕتووکی (المسالك والممالك)و ئەوانی دیکەیە، کە ئەگەر داوای بکەی دەیدۆزیەوە و ئەگەر بۆیشی بگەڕێی ستایشی دەکەی[3].

بەڵام مەقدەسی ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، لە کاتی خوێندنەوەی پەڕتووکی ئەلجەیهانی ئەوەی بینیوە کە (هەموو بنەماکانی بنچینەیی ئیبن خوردازەبەی تێدایە)[4]، بەڵام لە هەمانکاتدا لە پەڕتووکەکەیی و لە بابەتێکی دیکە دەبینین لە شان و شکۆی پەڕتووکەکەی ئیبن خوردازەبە و جاحیز کەم دەکاتەوە و دەڵێ: (بەڵام جاحیز و ئیبن خوردازەبە پەڕتووکەکانیان زۆر کورتە و ناتوانرێ زۆر سوودیان لێ وەربگیرێ)[5].

سەبارەت بەوەی پێوەندیی بە گرینگی ئیبن خوردازەبە و، هەروەها گرینگی پەڕتووکەکەیەوە هەیە مینۆرسکی پێی کاریگەر بووە، لەو بارەیەوە دەڵێت: (ناکرێت هیچ جوگرافیناسێك کە لەدوای ئیبن خوردازەبەوە هاتبێ و توانیبێتی لەژێر کاریگەری ئەو دەرچووبێت)[6]، هەروەها کراچکۆفسکیش بەو شێوەیە باسی دەکات: (خاوەن گرینگییەکی گەورەیە)[7]، چینەریش دەڵێ: ئیبن خوردازەبە مافی خۆیەتی بە باوکی

---

١ -جمال الفندي، الجغرافيا عندة العرب، بيروت١٩٨٢، ل١١٨.

٢ -مروج الذهب، ج١، ل١٣.

٣ - التنبيه والاشراف، ل٧٥.

٤ - احسن التقاسيم، ل٢١.

٥ - االمصادر نفسة، ل٢٢.

٦ - الجغرافيون والرحالة المسلمون، ل٨.

٧ - تاريخ الادب الجغرافي، ق١، ل١٥٨.

جوگرافیناسان ناوزەد بکرێت، لەبەرئەوەی شێوە و شێوازی بۆ جوگرافیا داناوە، بە تایبەتی کە پەڕتووکەکەی زانیاری مێژوویی دانسقەمان لە سەرچاوەکانی فارسی پێش ئیسلام پێ دەبەخشێ)[1].

هەروەها (یەکێك لە لێتۆژانی فەرەنسی) ئاماژە بە پەڕتووکی (المسالك و الممالك) دەکات و لە پەڕتووکەکەیدا چەندین دەقی بەکارهێناوە، ئەمەش بەڵگەیە بۆ گرینگی ناوەرۆکی پەڕتووکەکە[2].

لە پێشەکی پەڕتووکەکەدا ئەوە بەدیار دەکەوێ کە ئەو پەڕتووکەی وەك پێداویستییەکی دەوڵەت و لەسەر داواکاری و پرسیار و راسپاردەکانی خەلیفە دانابێ، وەکو تێدا هاتووە: (خوا تەمەن درێژت بکات ئەی نەوەی چاکەکاران و پێشەوا پاکەکان، کۆڵەگەی ئاین و باشترین خەلقەندەی خودا لە هەر کوێیەك ئەوانەی دروستی کردوون، خودا بەردەوام کامەرانت بکات و خێرت بەسەردا ببارێنێ، بەردەوام لەو چاکانەت بۆ زیاد بکات، خودا دەست بە باڵتەوە بگرێت لە پێناوی چاکەکاران و وات لێ بکات لە کارەکانت رەزامەند بیت و کاروبارت چاك بکات، خودا شادیت بەردەوام بکات و خێر و چاکەکانت زیاد بکات و هەردەم سەرکەوتوو بیت بۆ کاری چاکە و لەو کەسانەبیت کاری چاکە دەکەن و هەمیشە بار و گوزەرانت باش بکات، تێ بگە لەو کەسەی لێت دەپرسێ کە خودا هەموو کارە پڕ خێر و چاکەکانی تێ گەیاندووی و دڵخۆشی کردووی هەتا مردن، خودا لە هەردوو دنیا دڵخۆشت بکات و هەمیشە بەشی تۆ زیاد بکات و[3] بەرچاوت رووناك بکاتەوە لە وێناکردنی رێڕەوەکان و زەوی موڵکەکان لە پەسنی و دووری و نێزیکیدا[4]، لە ئاوەدانکردنەوە و وێرانکردنیدا، رێکردن لە نێوان ئەوانەی بە بیابان بوون، بەو شێوەیەی کەسە پێشکەوتووەکان وێنایان کردووە، بەتلیمۆس[5] بینی، سنوورەکانی بۆ دیاری کرد و، مەبەستەکانی بۆ

---

١ - دائرة المعارف الاسلامية، مادة جغرافيا، ج١٢، ل١١٨.

٢ -بلاشير منتخبات من اثار الجغرافيين في القرون الوسطى مع نظرة اجمالية في الجغرافية عند العرب (باللغة الفرنسية) باريس ١٩٥٧، ل١٨-٢١-٢٥.

٣ -قاموس المحيط/ مج٤، ل٣٧٥.

٤ -بطرس البستاني محيط المحيط، ل١٢١.

٥ -بەتلیمۆس، لە دوای ساڵی ١٦١ زایینی لەدایکبووە، زانای گەردوون و بیرکاری و جوگرافیا و فیزیا و مێژوونووسی یۆنان و میسر بووە، لە ئەسکەندەریە گەورە بووە، دۆزەرەوەی سیستەمی جوڵەی مانگ بووە،

ڕوونکردەوە بەپێی ئەو پەسنە و بە زمانێکی بیانی، لە زمانی ئەو گواستییەوە بە زمانێکی ڕاست و دروست بۆ ئەوەی لەسەری بوەستێت،[1] وێنەیەکی وای کێشا ڕاستی لەخۆ کۆدەکردەوە، لە هەموو هیوا و داواکارییەك کە حەزت دەکرد تاوانەکان دەڕەوێنەوە بە گوێرەی هیواکانت، وەکو بینەرێك کاتێ دوور دەکەوێتەوە و بە هەواڵێك نێزیك دەکەوێتەوە و پەڕتووکێکی لێ دروست دەکات.).[2]

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئیبن خوردازەبە ڕێگەیەکی لێکۆڵینەوەی ڕوونی نەگرتووەتە بەر لە ڕێکخستن و دابەشکردنی پەڕتووکەکەی، ئەوەش ئەوەمان پێ ڕادەیەگەیەنێت کە ئەو پەڕتووکەی لەبەر دەستان دایە، شتێك نییە تەنیا دانەیەکی کورتکراوەی ئەو پەڕتووکە ڕەسەنەیە کە بزربووە، ئەو کەسەش کە کورتی کردووەتەوە بابەتی جیاجیای هەڵبژاردووە و، زۆر کورتی کردووەتەوە، وەکو پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد.

پەڕتووکەکە زانیاری گشتگیری لەخۆگرتووە لەبارەی سیستەمەکانی فەرمانڕەوایی و دارایی بە شێوەیەکی تایبەتی، هەروەها وەکو ڕێبەرێکیش وابوو بۆ ئەو کەسانەی گەشتیان ئەنجام دەدا بۆ زانینی ڕێگەی ئاوی لەنێو دەریاکاندا، کە بە ڕێژگەی ئاوی ڕووباری دیجلە دەستی پێ دەکرد و تا دەگەیشتە هیندستان و چین، هەروەها ئامار و زانیاری گرینگی تێدایە لەبارەی داهات و سامانی وڵات و ڕێگەی نێوانیان، ئەمە سەرەڕای جۆرەها کەلوپەلی بازرگانی کە لە نێوان هەرێمەکان و شارەکاندا ئاڵوگۆڕی پێکراوە.[3]

ئەو پەڕتووکە تەنیا پەسنی ڕێگە و دیاری کردنی مەودای نێوانیان لەخۆ ناگرێت، بگرە چەندین بەشی دیکەی لەخۆ گرتووە لەبارەی بابەتی جۆراوجۆر، کە دواتر

---

ڕوانگەیەکی گرینگی جوڵەی ئەستێرەکان بووە، چەندین نووسینی لەبارەی گەردوون و جوگرافیا هەیەو سەرچاوەی بنچینەیی بوون هەتا ڕۆژانی کۆپەرنیکۆس، پەڕتووکەکەی (المجسطي) پرسەکانی شرۆڤەی ئەستێرەکانی ئاسمان و پێوەندییان بە زەویەوە لە خۆ دەگرێت، بڕوانە: حسين سعيد، المصادر نفسه ج١، ل٢١٧. كتاب بطليموس هذا هو الذي استخرج الخوارزمي الكتاب المعروف بصورة الارض، نسخة ولحه هانس فريك، فينا ١٩٢٦.

١ - ضياء الدين علوي، الجغرافية العربية في القرنين التاسع والعاشر الملاديين/ الثالث والرابع الهجريين، (الكويت:١٩٨٠) ل٦٣.

٢ - المسالك والممالك، ل١٣.

٣ - احمد رمضان احمد، المصادر نفسه ، ل٥٦.

خاوەنەکەی خستویەتییە سەر پەڕتووکەکەی لە ماوەی جیاجیادا، وەکو باسەکانی لەبارەی دابەشکردنی زەوی و شتە سەرسوڕمانەکانی دنیا لە رووی بینا و چیا و رووبار و ئەوانی دیکە، دواتر پەڕتووکەکە بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو کۆتایی دێت، ئەمەش وای کردووە لە میتۆدی راستەقینەی زانستی دوور بخاتەوە.

بە دەستەواژەیەکی دیکە دەکرێ بڵێین ئەو پەڕتووکە دوو بابەتی جیاواز لەخۆ دەگرێت، کە زۆر لەیەکدیی جیاوازن، یەکەمیان: خستنەڕووی بابەتە رەسمییەکەیە کە زۆر گرینگە، دووەمیان بابەتێك کە کۆمەڵێك شتی سەرسووڕمان و نامۆی جوگرافیای لەخۆ گرتووە بەبێ ئەوەی خوێنەر هەست بە بوونی هەوڵێك بکات بۆ توانەوەی ئەو مادەیە و وای لێبکات بیخاتە بۆتەی هاوچەشنییەوە.

سەبارەت بە کوردستانیش لەو پەڕتووکەدا بە راشکاوی ناویان نەهاتووە تەنیا سێ جار نەبێت.[١] بەڵام سەبارەت بە کۆچی دوایی ئیبن خوردازەبە حاجی خەلیفە دەیگێڕێتەوە بۆ نێزیکەی ساڵی (٣٠٠ك-٩١٣ ز).[٢]

### - بەلازری (لەدایکبوون٢٧٩ك-٨٩٢ز)

ناوی ئەحمەد کوڕی یەحیا کوڕی جابری کوڕی داودە بە بەلازری ناسراوە[٣] لە کۆتاییەکانی سەدەی دووەمی کۆچی لەدایك بووە، وەکو مێژوونووس و وڵاتاناس و رەچەڵەکناس ناسراوە.[٤]

بەلازری لە باوەشی خەلافەتی عەباسی دروستبووە، زانست و زانیاری لەسەر دەستی شێخەکان وەرگرتووە، هەروەها هەردەم ئامادەیی هەبوو لەو کۆڕ و کۆبوونەوە زانستییانەی لەبارەی فەرموودە و ژیاننامە و ئەدەبەوە سازدەکران.[٥]

---

١ -المسالك والممالك، ل٢٧-٥١.

٢ - كشف الظنون، مج٢، ل١٦٦٥.

٣ - ابن نديم، المصادر نفسه ، ل١١٣.، ياقوت، معجم الادباء، بيروت١٩٨٠، ج٢، ١٢٨.

٤ -ياقوت، معجم الادباء، ج٢، ل١٢٨. جغرافيون اسلاميون، مجلة الفيلل، الرياض ١٩٨٩. العدد ١٥٠، ل١٠٧.

٥ - العسقلاني، لسان الميزان (حيدر اباد الدكن:١٣٢٩ه) ج١، ل٣٢٢.

بەلازری وەکو قوتابییەکانی دیکە هەر بەوەندە نەدەوەستا، کە زانست لەسەر دەستی زانایانی بەغدا بەدەست بهێنێت، بگرە سوور بوو لەسەر ئەوەی بەرەو شام و شارەکانی دیکە هەنگاو هەڵگرێت و (سەری لە زۆرینەی ئەو شارانەدا کە کەوتبوونە باکووری شام، دواتر سەری کێشا بەو شارانەی کە کەوتبوونە نێوان دۆڵی دوو ئاوان کە ناسراوە بە جەزیرە، [1] لە دووتوێ ئەو گەڕانەیدا کەوتە کۆکردنەوەی ئەو بەسەرهاتانەی لە زاری ئەو خەڵکانەی ئەو ناوچانە گوێی لێ دەبوو، هەروەها بەراوردی دەکرد لەگەڵ ئەو قسانەی لەبەری کردبوو کە لە زانایانی بەغدای بیستبوو، [2] ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەو زانیارییانەی دەستی دەکەوتبوو سوودێکی زۆری لێ بینی بۆ پەڕتووکەی بەناوی (رزگارکردنی وڵاتان). [3]

لەو بارەیەوە یاقوت ئەلحەموی ئاماژە بە پێگەی زانستی و ئەدەبی دەکات کاتێ بە شێوەی زانایەکی گەورە و شاعیرێکی باش و شکۆدار پەسنی دەکات. [4] هەر ئەوەش دەری دەخات کە پێگەو شوێنەکەی وای کرد نێزیك بێتەوە لە کۆشکی عەباسییەکان و، دواتر ببێتە یەکێك لە قسەزان و زیرەك و دانای خەلیفە متەوکل (٢٣٢-٢٤٧ك/٨٤٦-٨٦١ز) هەروەها ببێتە کەسێکی نێزیکی (ئەلموستەعین (٢٤٨-٢٥٢ك/٨٦٢-٨٦٦ز) و، هەروەها پەیمانی بە موعتەز (٢٥٢-٢٥٥ك/٨٦٦-٨٦٨ز) دا ببێتە مامۆستای عەبدوڵای کوڕی کە شاعیرو ئەدیب بوو، [5] کە بووە خەلیفە بۆ ماوەی یەك ڕۆژ لەسەردەمی خەلیفە موقتەدیر بیللا.

لە شاکارەکانی بەلازری دوو پەڕتووك ماوەتەوە سەرەڕای گرینگییەکانیان، ئەوانیش (هەواڵی رەچەڵەکناسی) و (رەچەڵەکی خانەدانەکان)ن کە بە (مێژووی بەلازری) و (رزگارکردنی وڵاتان) دەناسرێت، بەڵام ئیبن ئەلنەدیم دوو پەڕتووکی دیکەی دەخاتە پاڵ ئەوانیش پەڕتووکی وڵاتە بچووکەکان و پەڕتووکی وڵاتە گەورەکان، کە نەیتوانێ لە

---

١ -لبن النديم، المصادر نفسه، ل١١٣.

٢ - االمصادر نفسة واللفحة.

٣ -للاح الدين المنجد، اعلام التاريخ والجغرافية، دار الكتب الجديد، بيروت، ١٩٦٣، ل٢٦.

٤ - معجم الادباء، ج٢، ل١٢٨.

٥ - كراتشكوفسكي، المصادر نفسة، ق١، ل١٦١.

ژیانی خۆیدا تەواویان بکات.[1] دووریش نییە ئەو دوو پەڕتووکە لەو جۆرانەی پەڕتووکی (مەسالك و مەمالك و پەڕتووکی وڵاتان بێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەندێ لە توێژەران پێیان وایە پەڕتووکی (رزگاری وڵاتان) شتێك نییە تەنیا کورتکراوەی پەڕتووکی (وڵاتە گەورەکان) نەبێت.[2]

ئەوەی لێرەدا گرینگ بێت بەلامانەوە پەڕتووکی (رزگاری وڵاتان)ــە کە بە دڵنیاییەوە مێژووی دانانی نازانرێ، بەڵام یەکێك لە توێژەران دەیگێڕێتەوە بۆ ساڵی (٢٥٥ك/٨٦٨ز)، کە ئەمە ساڵی کۆتایی دانانەکەیەتی و ئەو ساڵەیە کە خەلیفە موعتەز تێدا کوژراوە، چونکە دوای موعتەز ئاماژەی بە هیچ کەسێك نەکردووە کە شوێنی خەلافەتی ئەوەی گرتبێتەوە.[3]

سەرەڕای ئەوەی پەڕتووکی (رزگارکردنی وڵاتان) سروشتێکی مێژوویی بەسەریدا زاڵە، بەڵام لە راستیدا زۆرتر نێزیکە لە تۆژینەوەیەکی وڵاتناسی، کە بەلازری تا ئاستێکی زۆر وێنەیەکی روونی لەبارەی -دابەشکردنی کارگێڕی و سیاسی وڵاتی ئیسلامی خستووەتە روو، زۆرێکیش لە وڵاتناسانی دیکە زانیاری زۆریان لێ وەرگرتووە وەکو ئەلستەرخی و ئیبن حەقەل[4] و ئەوانی دیکە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی قودامە کوڕی جەعفەر کە بەلازری بە شێوەیەکی کورت سەبارەت بە رزگارکردنەکانی لە پەڕتووکی خەراج باسی کردووە، هەروەها ناوەڕۆکی پەڕتووکەکەیشی گرینگییەکی زۆری هەیە لەلایەنی جوگرافیاو مێژووییەوە.[5]

ئەو پەڕتووکە بە یەکێك لە سەرچاوە مێژووییەکان دادەنرێت کە جێگەی متمانە بێت سەبارەت بە فتوحاتەکانی ئیسلامی، بە تایبەتی پەڕتووکی (مەدائنی) کە بەلازری زانیاری و بەسەرهاتی زۆری لێوەرگرتووە و بە دەست ئێمە نەگەیشتووە،[6] کە

---

١ - الفهرست، ل١٢٦.

٢ -كراتشكوفسكى، المصادر نفسه ق١، ل١٦٢، احمد سوسة، الادريسي، المصادر نفسه ، ل٦٩، المنجد، المصادر نفسه، ل٢٦.

٣ - المنجد، المصادر نفسه ، ل٣١.

٤ -ابراهيم شوكت، الجغرافية العربية، ل٨٠.

٥ - كراتشكوفسكى، المصادر نفسه ، ق١، ل١٦١

٦ - المنجد، المصادر نفسه ، ل٣٦.

مەسعودی دەڵێت: (ئێمە نازانین لە پەڕتووکی (رزگاری وڵاتان) باشتر هەیە)[1] هەروەها هەندێ پێداویستی فیقهی و کارگێڕیش دەستەبەر دەکات.[2]

سەبارەت بە کورد و وڵاتەکەشیان بەلازری بەسەرهاتی زۆرو جۆراوجۆر لەبارەی رزگاری شارە کوردییەکان دەگێڕێتەوە جا بە ئاشتی بووبێت یان بە جەنگ، لەو بارەیەوە هەندێ شت بە دوور و درێژی باس دەکات.[3]

بەڵام سەبارەت بە مردنی، ئەوا دەیگێڕنەوە بۆساڵی (٢٧٩ك/٨٩٢ز).[4]

- **سەرخەسی: (ل٢٨٦ك/٨٩٩ز)**

ناوی تەواوی ئەحمەد کوڕی مەروان ئەلتەیب سەرخەسییە، بە رەچەڵەك دەگەڕێتەوە بۆ شاری سەرخەس کە سەر بە خوراسانە[5] یەکێك بووە لە قوتابییەکانی کیندی فەیلەسووف (٢٦٠ك/٨٧٣ز)[6] وا باسی دەکەن کە زۆر زانا بووە لە زانستی دێرین و عارەبکان، وەك زانیاری باش، بیری چاك، پۆلێنکردن و ناساندنی جوان، برین پێچێکی باش بووە، لە پۆلێنکردن و پێناسەدا زۆر باش بووە.[7] هەر وەکو یاقوت ئەلحەموی وەها باسی دەکات کە (یەکێك بووە لە زانا فیقهییەکانی رەوانبێژی باوەڕدار، لە زانستدا شوێنێکی فرەوان و دیاری هەبووە، لە زانستی رامیاریدا بیرێکی تیژو دەستی باڵای هەبووە.[8]

---

١ - مروج الذهب، ج١، ل٨.

٢ - الدوري، بحث في نشاة علم التاريخ عند العرب، بيروت ١٩٦٠، ل١٢٩.

٣ - بڕوانە بەشی کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیە بکە..

٤ - ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، القاهرة، ١٩٣٢، ج٣، ل٨٣.

٥ - ابن النديم، الفهرست، ل٣٢٠، ابن الاثير، اللباب في تهذيب الانساب، بيروت ١٩٨٠، ج٢، ١١٢.

٦ - ابن النديم، المصادر نفسه، ل٢٦١.

٧ - االمصادر نفسة واللفحة.

٨ -معجم الادباء، ج١، ل١٢٨.

یەکێك بووە لە کەسە نێزیکەکانی خەلیفەی عەباسی (ئەلموعتەزید)(٢٨٩ك/٩٠٣-٩١٣ز) پرس و راوێژی پێ کردووە لە کاروباری دەوڵەتدا و هاوڕێی گەشتەکانیشی بووە.[١]

ئیبن ئەلنەدیم ئەوەمان بۆ بەدیار دەخات لەبارەی سەرخەسییەوە کە گرینگی بە زۆر بوار داوە و بەو شێوەیە پۆلێنی دەکات کە لە دنیای فەلسەفە و رامیاری و ژمێریاری و مۆسیقا و شتی دیکەش زانیاری هەبووە.[٢]

بە تایبەتیش لە بواری ولآتناسیدا، کە وەکو مەسعودی لەبارەیەوە دەدوێ و دەڵێت پۆلێنی (پەڕتووکی مەسالیك و مەمالیك و دەریاو رووبارو  هەواڵی وڵاتان و شتی دیکەی بە چاکی رێکخستووە)[٣] کە ئەو پەڕتووکە بە (مەسالیك و مەمالیك) ناسراوە، کە یاقوت ئەلحەمەوی ناوی زۆر وڵات و پەسەنەکانی لەو وەرگرتووە، ئەوەی شایەنی ئاماژە بۆکردن بێت پەڕتووکەسەرێ کانیخەسی هەر هەموویان بزربوونە، لەوانەش پەڕتووکەکەی لەبارەی مەسالیك و مەمالیکەوە، هەتا ئێستە شوێنەواری دیار نییە بە وێنەی هەزاران پەڕتووکی دیکەی زانستی.

- **یەعقوبی (لەدایکبوون٢٩٢ك/٩٠٥ز)**

ناوی ئەحمەد کوڕی یەعقوب ئیسحاق کوڕی جەعفەر کوڕی وازح الخباری عەباسی بووە،[٤] ناسناوی کاتب بووە،[٥] بەڵگەی ئەوەش ناسناوەکانیەتی، ناسناوی ئەلئیخباری بووە، چونکە هەواڵێ گێراوەتەوە، عەباسییەکەیشی، چونکە بە رەچەڵەك سەر بە بنەماڵەی خەلیفەکان بووە، کە خەلیفە مەنسوور (١٣٦-١٥٨ك/٧٥٤-٧٧٥ز) پشتی بەو بەستووە، ناسناوی ئیبن وازحیش رەچەڵەکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ باپیرە گەورەی وازیح کە سەربە مەنسوور بووە، لەسەردەمی خەلیفەکانی عەباسیدا: مەنسوور و مەهدی و

١ - ابن النديم، المصادر نفسه، ل٢٦١.

٢ - ابن النديم، المصادر نفسه، ل٢٦١-٢٦٢.

٣ - التنبيه والاشراف، ل٦٥، ابراهيم شوكت، الجغرافية العربية، ل٨٥.

٤ - معجم الادباء، ج٥، ل١٥٣.

٥ - البغدادي، ايضاح الكنون في الذيل على كشف الظنون، ج١، ل٥٤، وج٢، ل٢٧٩.

هادی، چەندین پۆستی ئیداری وەرگرتووە، ناسناوی نووسەریشی بۆیە وەرگرتووە، چونکە خەریکی کاری نووسەری بووە،[١] یەعقوبی لە بەغدا لەدایك بووە،[٢] هەر لەو شوێنە ژیاوەو گەورە بووە، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ لەوێ نەماوەتەوە، بگرە گەشتی کردووە بۆ ئەرمینیا و سەردەمی گەنجیەتی لەوێ بەسەر بردووەو لە خزمەتی پیاو چاکەکان و تاهیریەکان بووە.[٣] هەروەها ماوەیەکی زۆر ژیانی لە میسر و مەغریب بەسەر بردووە لەسەردەمی حوکمی تۆلۆنیەکاندا، بە گەشتە بەرفرەوانەکانی بەناوبانگ بووە لە ئەرمینیا و خوراسان و هیندستان و فەلەستین و تورکستاندا،[٤] بۆیە مینۆرسکی زۆر سەرسام بووە بە وردی زانیارییەکانی یەعقوبی لەبارەی ئەو وڵاتانەوە.[٥]

بە وردی نازانرێ هۆکاری ئەو هەموو گەشتە بەرفرەوانەی چی بووە، بەڵام کراچکۆفسکی ئەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو پۆستە حکومییەی کە یەعقووبی هەیبووە، داوای لێکراوە گەشتی زۆر بکات، هەروەها باپیرەیی و باوکیشی لە گەورە فەرمانبەرانی پۆستە بوونە.[٦]

---

١ - كراتشكوفسكي، تاريخ الادب الجغرافي، ق١، ل١٥٨، معجم الادباء، ج٥، ل١٥٣-١٥٤. معجم البلدان، ج١، ل١٦١، شاكر خصباك، في الجغرافية العربية، بغداد ١٩٧٥، ل٣٦٦، ياسين ابراهيم علي الجعفري، اليعقوبي المؤرخ والجغرافي، بغداد ١٩٨٠، ل١.

٢ - وەکو ئەوەی لە پێشەکی پەڕتووکەکەیدا هاتووە، مشكالة الناس لزمانهم، ل٥، تاريخ الادب الجغرافي، ق١، ل١٥٨. شاكر خصباك، في الجغرافية العربية، ل٣٦٦.

٣ - تاهیرییەکان: لە خوراسان و سەرجەم وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی میرنشینیان دامەرزاندووە، بە سەرۆکایەتیی تاهیر کوڕی حوسێن لە سەردەمی خەلیفە مەئموون لەساڵی (٢٠٥ك/٨٧٢ز) لە دەسەڵات بەردەوام بوونە هەتا ساڵی ٢٥٩ك، پێوەندییان لەگەڵ خەلیفە زۆر باش بووە. ميسون هاشم مجيد، علاقة الخلافة العباسية بدويلات، المشرق في القرن الثالث الهجرى، وحتى نهاية القرن الخامس الهجري، رسالَة ماجستير منشورة، كلية الاداب، (جامعة المولل١٩٨٣) ل١٦-١٩.

٤ - كراتشكوفسكي، ق١، ل١٥٨. ملطفى شهابي، الجغرافيون العرب، ملر ١٩٦٢، ل٤٥. خصباك، في الجغرافية العربية، ل٣٦٦، احمد رمضان احمد، المصادر نفسه، ل٧١.

٥ - الجغرافيون والرحالَة المسلمون، ل٩.

٦ - تاريخ الادب الجغرافي، ق١، ل١٥٨.

ئەوەی جێگەی ئاماژە بۆکردنە لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەکان زۆرن، بەڵام زانیاری تەواومان پێ نابەخشن لەبارەی ژیانی ئەو مێژوونووس و گەڕیدەیە، هەروەها خۆیشی لەبارەی ژیانی زانستی و کرداری خۆیەوە شتێکی ئەو تۆی بۆ جێنەهێشتووین، پەڕتووکەکانی بە شێوەیەکی گشتی بە نموونەی سەرجەم زانایەکانی دیکە هیچ باسێك و هیچ رووناکییەکیان نەخستووەتە سەر ژیانی خۆیان یان پێیان شەرم بووە خۆیان مەدح و سەنای خۆیان بکەن.

سەبارەت بە بەرهەمە زانستییەکانی، چەند پەڕتووکێکی گرینگی بۆ جێهێشتووین لەوانە (پەڕتووکی وڵاتان و پەڕتووکی مێژوو، پەڕتووکی کێشەی خەڵك لە رۆژگارەکانیاندا[1]، ئەوانە بەدەست ئێمە گەیشتووە، هەروەها پەڕتووکی دیکەیشی دەخەنە پاڵی کە بەدەستمان نەگەیشتووە وەکو پەڕتووکی (لە هەواڵی نەتەوە شوێنکەوتەکاندا)[2] و پەڕتووکی (مەسالیك و مەمالیك) کە ئەبو فیدا ئاماژەی بۆ دەکات و، وەکو سەرچاوەیەکی گرینگیش پشتی پێ بەستووە لە پەڕتووکەکەی بەناوی (رۆژ ژمێری وڵاتان) و پەڕتووکی (رزگارکردنی مەغریب) و ئەوانی دیکە.[3]

لێرەدا ئەوەی گرینگە پەڕتووکەکەیەتی لەبارەی وڵاتناسییەوە کە بە یەکێك لە پەڕتووکە گرینگەکان دادەنرێت کە لە بابەتەکەیدا پۆلێناکاری کردووە، بەڵام سەرچاوەکان ئاماژەیان بۆ سەردەم و رۆژگاری دەرچوونی نەکردووە، بۆیە بە شێوەیەکی دیاری کراو ساڵی دەرچوونی ئەو پەڕتووکە نازانرێ کە یەعقووبی کەی ئەو پەڕتووکەی داناوە، بەڵام هەندێ لە ئاماژەکان بۆ رووداوەکانی نێوان ساڵانی (٢٥٩ك/٨٧٢ز) دەگێڕنەوە، هەندێك دەڵێن ئەو پەڕتووکە لەو ساڵەدا دانراوە یان هەندێك دواتر دانراوە.[4]

لە کاتێکدا هەندێك لە لێکۆڵڤانەکان دەی گەڕێنەوە بۆ ساڵی (٢٧٨ك/٨٩١ز) واتە لەو ساڵەدا پەڕتووکەکە لەدایکبووە،[5] لە کاتێ گێڕانەوەی ناوەرۆکی هەندێ لە

---

١ - ئەوە پەڕتووکێکی دانسقەیە بە شێوەی نامە کە زۆر بە کورتی باسی سەردەمی خەلیفەکانی راشیدین و ئەمەوییەکان و عەباسییەکان هەتا سەردەمی موعتەزید دەکات، بڕوانە مشاکلة الناس لزمانهم، ل٩.

٢ -کراتشکوفسکي، ق١، ل١٠٩، مشكالة الناس لزمانهم، ل٥.

٣ - الجعفري، المصادر نفسه، ل٤٩.

٤ - عبدالله بن يوسف، ملادر البكري ومنهجه الجغرافي، الكويت ١٩٧٤، ل٩٧.

٥ - كراتشكوفسكي، ج١، ل١٥٩، نفيس احمد، المصادر نفسه، ل٤٦.

بابەتەکاندا باسی ڕێگەیەك دەکات دەچێتەوە سەر سەردەمی ئیمبراتۆریەتی ئیسلامی و ئەوەی لەو دەوروبەرە بووە،[1] پەڕتووکەکە سەرجەمی لەبارەی نەخشەکانی وڵاتان و گەڕیدەییەوەیە، هەروەها ڕێکخستنی بابەتەکانیش هاوشێوەی بابەتەکانی ئیبن خوردازەبەیە.[2]

یەعوقی پەڕتووکەکەی بە پێشەکیەکی کورت لە عێراقەوە دەست پێدەکات بە تایبەتی بەغدا و گرینگی و گەورەیی پێگەکەی، کە لەسەرووی ناوچەکانی جیهانەوە دێت. دواتر بە پێی یاسایەك جیهان دابەشدەکاتە سەر چوار بەش بە پێی ئاڕاستەی چوارلاکە، لە هەر بەشێکدا ئەو ویلایەتانەی دیاری کردووە کە شار و گوند و دێهاتەکانی لەخۆ گرتووە، هەروەها دیارکردنی ماوەی نێوانیان.[3] ئەوەی لە پێشەکی ئەو پەڕتووکەدا هاتووە بۆمان دەردەکەوێت کە نووسەر ئارەزووەکانی پاڵی پێوەناوە بۆ رابوون بەو گەشتانەی ئەنجامیداوە، ئەوەش بە میتۆدی پەڕتووکەکەیەوە دیارە کە سەرچاوەکەی پتر گەشتە مەیدانییەکانی بووە، وەکو دەڵێت: (من هەر لەسەردەمی لاویمەوە ئازاری زۆرم چەشتووە هەتا ئەو کاتەی کە زانستی هەواڵی وڵاتان و ماوەی نێوان هەر وڵاتێك و وڵاتێك کەوتە کەڵلەمەوە، چونکە من گەشتەکانم درێژ و نامۆییشم بەردەوام، بۆیە هەر کاتێ چاوم بە پیاوێك کەوتبێت لە هەر یەکێك لەو وڵاتانە پرسیارم لەبارەی نیشتمان و ڕەچەڵەکەکەی لێکردووە، هەتا پرسیارم لە زۆر خەڵك لەو دنیایە و هەتا لە خەڵکانی ئێرە و ئەوێ کردووە، لە خەڵکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، هەولێیانم نووسیوە و ڕووداوەکانیانم گێڕاوەتەوە، هەروەها باسی ئەوەشم کردووە کە کام وڵات وڵاتی رزگار کردووە، چۆن شارە و شاری بە سەرباز کردووە لە خەلیفە و میرەکان و هەتا سامان و دارایییشیان و تا چەندیش پارەیان هەبووە، کە ئێستە بەردەوام نیم لە نووسینەوەی ئەو هەواڵانە، نووسینی ئەو پەڕتووکە ماوەیەکی دوور و درێژی خایاندووە، هەموو هەواڵێکم بۆ وڵاتەکە گێڕاوەتەوە، هەر شتێکم گوێ لێبووبێت لە خەڵکانی ئەو وڵاتانە بۆتە هۆی پێشکەوتنی زانیاری، لێرەوە زانیومە کە دروستکراو هەرگیز بە ئارەزووەکانی ناگات، تەمەنیشی بەشی ئەوە ناکات بگاتە کۆتایی، بەو قسەیەش

---

١ - جمال الفندي، المصادر نفسه ، ل١١٨.

٢ - المصادر نفسه، ل١١٩.

٣ - البلدان، ل٣٨، العلم عند العرب، ل٢٣١. ادم متز، الحضارة الاسلامية في القرن الرابع الهجري، نقله الى العربية محمد عبد الهادي ابو رية، بيروت ١٩٦٧، ج٢، ل٩.

مەبەستەکەی پشت راست دەکاتەوە و دەڵیٚ: (وەکو دەڵێن خاوەندارانی زانست لە زانستە و خاوەندارنی ئاینیش فیقهە، کورتەی پەڕتووکی فلان کەس فیقهە، یان دەڵێن ئەهلی ئەدەب لە پەڕتووکی ئەدەبدایە، کورتکراوەی ئەو پەڕتووکە ئەوەیە، بۆیە توانیمان لەو پەڕتووکەدا کورتەیەك لەبارەی هەواڵی ولاٚتان لیٚ هەڵێنجین، بۆیە ویستومانە هیچ کەسێك لەبەردەم هەواڵی هەر ولاٚتێکدا وەستانی نەبێت، بۆیە ئەو پەڕتووکەمان بەو شێوەیە چیٚ کردووە، مەبەستیشمان نییە بلێین باسی هەمووشتێك دەکات، وەکو حەکیم دەڵێت: (بەدوای زانستدا گەڕانم به مەبەستێك نەبووە لەسەرتاوە هەتا کۆتایی دەستی بەسەردا بگرم، بەلاٚم زانین ڕێگەی نەزانین ناکات، وەك چۆن دانایەك قبوولی نەزانین ناکات).[1]

ئەو پەڕتووکە بە هەندیٚ وردەکاری تایبەت دەناسرێتەوە لەبارەی هەندیٚ شاری سەرەکی لە عێراقیدا، هەروەها وردەکاری گرینگی لەبارەی ڕێگەکانی گواستنەوەی لە ولاٚتی فارس تێدایە، لەگەڵ هەندیٚ زانیاری مێژوویی دیکە، هەروەها زانیاری تۆبۆگرافی و ئەتنۆگرافی زۆر و زەبەندی لەبارەی شار و هەرێم و ولاٚتان تێدایە کە باسیان دەکات و لەبارەیانەوە دەدوێت.

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەبارەی پەڕتووکی ولاٚتان ئەوەیە کە ئەو پەڕتووکە تەواو نییە، بە پشت بەستن بەوەی هەردوو بەشی سێیەم و چوارەمی بزربووە، واتە لەو پەڕتووکەدا باسی ڕۆژهەلاٚتی عارەبی و خۆزستان و فارس و هیندستان و سەرجەم ولاٚتانی باکوور و سەرەتای ڕۆژهەلاٚتی تێدا نییە[2]،

هەروەها سەبارەت بە هەواڵ و دەنگ و باسی کورد لەو پەڕتووکەدا، تێدا باسی دووری نێوان شارە کوردییەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان و دەوروبەری کراوە.[3] لەو پەڕتووکەدا بێژەی کورد تەنیا شەش جار هاتووە.[4] ئەوەش لەدووتۆی قسەکردنی لەبارەی دانیشتووانی شارێك لە هەرێمی چیاکان، لە کاتێکدا ناوچەی جەزیرە لەو بەشەدایە کە بزربووە لە پەڕتووکەکەدا.

---

١ - البلدان، ل٥-٦.

٢ - کراتشکوفسکی، المصادر نفسه ، ق١، ل١٦٠.

٣ - البلدان، ل٣٨-٤٢.

٤ -الصادر نفسة، ل٣٩-٤٠-٤٤.

هەروەها لێکۆڵەرانەکان تێبینی ئەوەیان کردووە کە یەعقووبی هەر تەنیا باسی وڵات و شارە موسڵمانەکانی نەکردووە، بگرە وەکو دەرچوونێك باسی هەندێ وڵاتی کردووە لە دەرەوەی وڵاتانی ئیسلامی بوونە، بەوەش بۆتە یەکەمین کەسانێك کە لەبارەی جوگرافیای گشتییەوە نووسیویانە، هەروەها یەکەم کەس بووە لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەمی کۆچی لەبارەی وڵاتان شتی نووسیوە.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی تاکە کەس بووە لەبارەی بابەتەکانی جوگرافیا شتی نووسیوە کە پاك و بێگەرد و پوخت بووە، بۆیە پەڕتووکەکەی بەدەر لەو بابەتانەی کە بۆ هەندێ مەبەستی دیکەیە، تەنیا چەند تەوەرێك نەبێت کە نووسینەکەی بۆ خودی خۆیەتی، وەکو هەندێ شتی نامۆو سەیرو سەمەرەو هەندێ دێرە شیعرو و هەندێ شتی دیکە کە کەسانی پێش خۆیی و هەتا کەسانی سەردەم و لەدوای خۆیشی ئەوەیان کردووە.

بێگومان ڤاڵابوونی پەڕتووکەکەی لە شتی سەیر بە واتای ئەوەی نووسەر پتر بۆ شیکردنەوەی ئاوەزکی چووە، هەروەها شێوازی سادە و دوور لە رازاندنەوە و دروستکردن و شتی دیکەن، بۆیە پتر زانستیبوونی پەڕتووکەکە بەدیار دەخات.[1]

بەڵام مردنی یەعقووبی سەرەڕای ئەوەی زۆربەی سەرچاوەکان دەیگێڕنەوە بۆ ساڵی (٢٨٤ك/٨٩٣ز)[2] بەڵام ئاماژەیەك هەیە لە پەڕتووکەکەی کە دەگەڕێتەوە بۆ دوای ساڵی (٢٩٢ك/٩٠٥ز) وەکو دەڵێ: (کاتێ شەوی جەژنی رەمەزان بوو لە ساڵی دوو سەدو دوو، بیرم هاتەوە کە ئیبن تۆلۆن لەو شەوانەدا بە جلی باش و بە چەك و رەنگاوڕەنگی بەندەکان و دانایی و بە پۆشاکی نایاب و بە دەنگی تەپڵ و کەڕنای بلەز و زۆرەوە، سەرسامی کردم، بۆیە بیرم کردەوە و لە شەوی خۆمدا نووستم).[3]

---

١ -كراتشكوفسكي، المصادر نفسه، ق١، ل١٦١.

٢ - ياقوت، معجم الادباء، ج٥، ل١٥٣. البغدادي، المصادر نفسه ، ج١، ل٢، محمد شفيق غربال، الموسوعة العربية الميسرة، (القاهرة:د/ت) ل١٩٨٣، سركيس، معجم المطبوعات، ج١، ل١٩٤٨، كراتشكۆفسكين المصادر نفسه ، ق١، ل١٥٩.

٣ - البلدان، ل١٢٧-١٢٨.

هەروەها جەخت لەوەش دەکەنەوە کە یەعقووبی پەرتووکی (کێشەکانی خەڵك بۆ ڕۆژگاری خۆیان) لەسەردەمی خەلیفە ئەلموعتەزید (٢٨٩ك/٩٠٢). تەواو کردووە، لەبەرئەوەی باسی ئەوەی تێدا هاتووە.[١]

## – ئیبن رستە (لەدایکبوون ٢٩٠ك/٩٠٣ز)

ناوی تەواوی ئەبو عەلی کوڕی محەمەد کوڕی ئیسحاق ناسراوو بە ئیبن رستە، هەروەها سەرچاوەکان بیریان چووە باسی بکەن، بەڵام وەکو زانراوە بنەچەکەی فارسی بووە و لە ئەسفەهان لە دایکبووە.[٢]

هەروەها بە ئەنسکلۆپیدیایەك بەناوبانگە کە لە حەوت بەرگ پێکهاتووە و ناوی (الاعلاق النفیسە) کە مێژووی نووسینی بۆ دەوروبەری ساڵی (٢٩٠/٩٠٣ز) دەگەڕێتەوە، بەڵام تەنیا بەرگی حەوتەمی گەیشتووەتە دەست ئێمە کە ئەو بەشە تایبەتە بە جوگرافیا.[٣]

ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو بەشە تێکەڵێەکە لە زانیاری گەردوونی و ئەفسانە لەبارەی زانیاری کۆزمۆگرافی، لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوەیەکی گرینگە بووە بۆ زۆرێك لە وڵاتناسان کە لەدوای ئەوەوە هاتوون.[٤] هەروەها ئەو نووسەرە هەر تەنیا بە وڵاتی موسڵمانان نەوەستاوە، بگرە باسی وڵاتانی دیکەیشی کردووە، وەکو هیندستان و بولگاریا و رووس و هەندێکی دیکە،[٥] هەروەها پەڕتووکەکەی بە پێشەکیەکی گەردوونی دەست پێکردووە کە چەندین ئایەتی هێناوەتەوە کە دەربڕین لە گەورەیی خودای تاك و تەنیا و ئایەتەکانی لەبارەی ئاسمان و زەوییەوە دەکات.[٦]

١ - مشاكلة الناس لزمانهم، ل٣٥.

٢ - عزيز الله بيات، كليات جغرافياى طبيعي وتاريخي ايران، (تهران ١٣٧٣ه)ل٤٤٣.

٣ - كراتشكوفسكى، المصادر نفسه، ق١، ل١٦٤.

٤ -خصباك، في الجغرافية العربية، ل٣٦٨.

٥ -العلاق النفيسة، ل١٢٤-١٣٧.

٦ هەمان المصادر نفسه، ل٧-٩.

دواتر بەشێکی لەبارەی گەردوون و زەوی و مەکە و مەدینە بەشێوەیەکی نارێك و تێکەڵ نووسیوە، کە لە دابەشکردنەکەی پشتی بە دابەشکردنی حەوتەمی بەستووە بۆ هەرێمەکان، واتە سیستەمی بەتلیمۆسی، هەروەها پشتی بە دابەشکردنی چواریش بەستووە کە ئاماژە بە چوار لایەکە دەکات (باکوور و باشوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا).[١] دواتر بەشێکی لەبارەی بەشەکانی ئێرانشار و کۆرها نووسیوە، کە لە دووتۆی ئەمەدا کۆر جەبەل و کۆر جەزیرەی چواری تێدایە.[٢] دواتر باسی ئەو ڕێگەیانەی کردووە کە دەچێتە هەرێمەکان و ناوچەکان و ماوەی نێوانیان، هەروەها پەڕتووکەکەی باسی رووبار و دەریاشی لەخۆ گرتووە، لە کۆتایشیدا پەڕتووکەکە بەشێکی تایبەتی لەبارەی سەرسوڕهێنەرەکانی جیهان لەخۆ گرتووە لەبارەی ئاژەڵ و رووەك و شوێنەوار و ئاپارتمان و زانیاری مێژوویی جۆراوجۆری دیکە.[٣]

بەڵام سەبارەت بە کورد نووسەر لە پەڕتووکی (الاعلاق النفیسە) باسی کوردی نەکردووە، تەنیا دووجار نەبێت کە نووسەر لە دووتۆی قسەکردنی لەبارەی ڕێگە و ماوەی نێوان شارەکانی ڕۆژئاوای هەرێمەکانی چیا نەبێت.[٤]

هەروەها سەبارەت بە مێژووی مردنی ئیبن رستە بە شێوەیەکی دیاری کراو دیار نییە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو لە ساڵی (٢٩٠ك/٩٢٣ز) مردووە، ڕەنگە مردنەکەی لەسەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی بووبێت لە دەوروبەری ساڵی (٣١٠ك/٩٢٣ز)[٥]ـــە.

١ - المصادر نفسه ، ل٩٤-٩٦.

٢ - المصادر نفسه ل١٠٠-١٠٤.

٣ - المصادر نفسه ل٢٧-٣٥-٦٣-٨٣-١٩٢.

٤ - احمد سوسة، المصادر نفسه ، ل١٣٥.

٥ - عزيز الله بيات، المصادر نفسه ، ل٤٤٣.

## ئیبن فەقێی هەمەدانی (لە دایکبوون: کۆتایی سەدەی سێیەمی کۆچی)

ناوی ئەبو عەبدوڵا ئەحمەد کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمی هەمەدانییە،[1] هیچ سەرچاوەیەك لەبارەی ئەوە شتێکی نەنووسیوە، تەنیا ئیبن نەدیم نەبێ تاکە شتێکی لەبارەوە گوتوە: (ئەو کەسێك بووە لە خاوەندارانی ئەدەب، لەوە زیاتر شتێکی دیکەی لەبارەوە نازانین،[2] هەروەها یاقوتیش هەمان زانیاری دووبارە دەکاتەوە کە ئیبن نەدیم باسی لێوەکردووە، لەوە زیاتر شتێکی دیکەی نەگوتووە،[3] زۆربە واهەست دەکەن لە هەمەدان لەدایکبووبێت، بەڵام ئەستێرەی بەختی لە بەغدا درەوشاوەتەوە، هەروەها لەسەردەمی رۆژانی خەلیفە ئەلموعتەزیدی عەباسی ئەو یەکێك بووە لە وڵاتانسە دیارەکان،[4] چەندین پەڕتووکی هەبووە، لەوانە پەڕتووکێك کە تێیدا باسی شاعیرانی نوێ و رەوانبێژانی لێهاتوو دەکات، هەروەها پەڕتووکێکی دیکەی لەبارەی وڵاتناسییەوەیە، کە بریێتییە لە هەزار لاپەڕە کە لە پەڕتووکی خەڵکان و لە پەڕتووکی جەیهانی دایماڵیوە،[5] لەگەڵ ئەوەش کراچکۆفسکی لێی کۆڵیوەتەوە بە شێوەیەك کە ئیبن نەدیم بۆی نەچووە، کە بە دڵنیاییەوە ئیبن فەقێی هەمەدانی پەڕتووکەکەی پێشساڵی (٢٩٠ك/٩٠٣ز) نووسیوە، واتە پێش ئەوەی جەیهانی پەڕتووکەکەی بێتە دنیای بوونەوە،[6] ئەوەش ڕاستییەکەیە.

کەواتە پەڕتووکەکەی ئیبن فەقێ کورتکراوەی پەڕتووکە گەورەکەیەتی کە بە ناونیشانی (وڵاتناس)یە، کە پێنج بەرگ لەخۆ دەگرێت، کە نێزیکەی هەزار لاپەڕە بە

١ - یاقوت، معجم الادباء، ج٢، ج٤، ل١٩٩.

٢ - ابن الندیم، المصادر نفسه ل١٥٤.

٣ -معجم الادباء، ج٤، ل٢٠٠.

٤ -خصباك، في الجغرافیة العربیة، ل٣٦٧.

٥ -ابن الندیم، المصادر نفسه ، ل١٥٤.

٦ - تاریخ الادب الجغرافي، ق١، ل٢٢١، دائرة المعارف الاسلامیة، مادة ابن فقیه الهمذاني، ج١، ل٣٦٥.

لایەنی کەمیەوە دەبێت،[1] هەروەها کەسێك ئەو پەڕتووکەی کورت کردووەتەوە ناوی عەلی حسین شیرازی بووە لە دەور و بەری ساڵی (٤١٣ك/ ١٠٢٢ز).[2]

دەڵێن پەڕتووکەکەی ئیبن فەقیٚ وەکو سەرچاوەیەك لە لای وڵاتناسانی دوای خۆی بەکارهاتووە وەك مەقدەسی و یاقوت.[3] بۆیە مەقدەسی لەبارەی ئەو پەڕتووکەوە دەڵێت: (یان ئیبن فەقیٚ ڕێگەیەکی دیکەی هەڵبژاردووە، تەنیا باسی شارە گەورەکان دەکات، ئاماژە بە کۆر و سەربازەکان بکات، هەروەها لە پەڕتووکەکەی زیاتر لە زانستێك هەیە، جارێك دەست لە دنیا هەڵدەگرێت و جارێکی دیکە ئارەزووی دەکاتەوە، جارێك دەگری و لە هەندیٚ کاتیش پێدەکەنیٚ و سەما دەکات.[4]

لەبەرئەوەی پەڕتووکەکەی بە شێوەیەکی چڕو پڕ بابەتی جادوویی و داستان و زانیاری دوور لە میتۆدی زانستی لەخۆ گرتووە، بۆیە جۆرێك لە گەڕانەوەی بەخۆوە گرتووە لەوەی تایبەت بێت بە زانستی وڵاتناسی یان جوگرافیای زانستی.

هەندیٚ کەس وای دەبینن کە پەڕتووکەکە لە بابەتی جوگرافیا پۆلێن ناکرێت بە واتایەکی دیاری کراو، بگرە کۆمەڵێك بابەتی ئەدەبی لەبارەی وڵاتی ئیسلام کە بەشێکی زۆری شیعر و چیرۆك لەخۆ گرتووە،[5] کە ئەوەش لە رووی زانستیەوە لە شان وشکۆی پەڕتووکەکەی کەمکردووەتەوە.

لە پێشەکی پەڕتووکەکەدا هاتووە (پەڕتووکەکەم بابەت و هەواڵی وڵاتان و شتە سەرسوڕهێنەرەکانی شار و ئاپارتمانەکانی لە خۆ گرتووە، ئەگەر خاوەندارانی ئەدەب و زانیاری سەرنجی بدەن و بە چاوی روونەوە لێی بڕوانن، ئەوا بێگومان سەرنج و رای جوانیان دەبیٚ، ئەوا گومانەکان نامێنیٚ بەهۆی دانپێدانەکان و بەهەڵەداچوونی بڕیارەکانم، بۆیە من لەو پەڕتووکەدا ئەوەی درکم پێکردووە و لەبەرم کردووە و ئەوەی گوێم لێبووە لەو هەوڵ و قسە و وتانەی بینیومە، ئەوا تۆمارم کردووە.[6]

---

١ - کراتشکۆفسکي، المصادر نفسه ق١، ج١، ل٢٢١. دائرة المعارف الاسلامية، ج١، ل٣٥٦.

٢ - عزيز الله بيات، المصادر نفسه ل٣٣١.

٣ - االمصادر نفسة، ل٣٣١.

٤ -احسن التقاسيم، ل٢.

٥ - کراتشکوفسکي، المصادر نفسه ، ج١، ل١٦٣.

٦ - مختلر کتاب البلدان، ل٦.

وەکو تێبینی دەکرێت لەو قسەیەدا ڕاستگۆییەکی نووسەر هەست پێدەکرێت لەوەی کەوتبێتە هەڵە و پەلەوە، بە شێوەیەك کە مەبەستی نەبووە، هەر وەکو دەزانین لە نووسنی ئەو پەڕتووکەدا پشتی بەو شتانە بەستووە کە گوێی لێبووە یان لە پەڕتووکی دیکەی ئەدەبی و وڵاتناسی دیکە خوێندویەتیەوە وەکو پەڕتووکەکانی جاحیز و ئیبن خوردازەبە و بەلازری و ئەوانی دیکە.

سەبارەت بە کورد، لە پەڕتووکەکەیدا تەنیا لە دوو شوێن باسی کردوون، یەکەمیان لەکاتی باسکردنی شاری سیسەری کوردی.[1] دووەمیان کاتێ باسی کورد دەکات و دەیبەستێتەوە بە فارس کە لە ئیبن خوردازەبەی گواستووەتەوە.[2]

بەڵام سەبارەت بە مردنەکەی، ئەوا لێکۆڵەنان جیاوازیان لەبارەی بەرواری مردنەکەیەوە هەیە.[3]

## - قودامەی کوڕی جەعفەر (لەدایکبوون ٣١٠ك/٩٢٢ز، یان ٣٣٧ك/٩٤٨ز)

قودامەی کوڕی جەعفەر خاچ پەرست بووە و لەسەر دەستی خەلیفە ئەلموکتەفی بیللا (٢٨٩-٢٩٥ك/٩٠٢-٩٠٨ز) موسڵمان بووە.[4] خەتیب ئەلبەغدادی بەو شێوەیە باسی دەکات کە یەکێك بووە لە شێخەکانی نووسەران و زانایان و لە ئەدەب رایکردووە و بەرەو دنیای زانیاری چووە.[5] ئیبن نەدیم بەو شێوەیە باسی دەکات و دەڵێ: قودامە یەکێك بووە لە ڕەوانبێژان و زمان پاراو و، فەیلەسووفێکی گەورەی بواری لۆژیکزانی بووە لەوانەی ئاماژەی بۆ دەکرێت،[6] بە نووسینی حساب و لۆژیك و ڕەوانبێژی و

١ - االمصادر نفسة، ل٢٢٠.

٢ -االمصادر نفسة، ل١٨٨.

٣ - البغدادي، المصادر نفسه ، مج١، ل٦٤٥. خصباك، في الجغرافية العربية، ل٣٦٨. السيد عبد العزيز سالم، التاريخ والمؤرخون العرب، ل١٨٧.

٤ -ابن النديم، المصادر نفسه، ل١٣٠.

٥ -تاريخ البغداد، مج٧، ل٢٠٥.

٦ -الفهرست، ل١٣٠.

ڕەخنەی شیعری بەناوبانگ بووە،[1] یاقوتی حەمەوی دەڵێ: نووسەری ئیبن فورات بووە،[2] لە دیوانی زەمام،[3] هەروەها دەڵێ: بۆ بەنی مەعەزی دەولەی بویەهیشی نووسیوە.[4]

بەڵام بەرهەمەکانی زۆر و جۆراوجۆرە لەوانە: پەڕتووکی خەراج و فێربوونی نووسین، پەڕتووکی ڕەخنەی شیعری، پەڕتووکی سابوونی خەم، پەڕتووکی خەمۆکی، پەڕتووکی سورمەی دڵتەنگی، پەڕتووکی هزر، پەڕتووکی رامیاری، پەڕتووکی قسەی خۆشی دیوەخان و چەندا پەڕتووکی دیکە[5]، ئەوەی بەلای ئێمە گرینگ بێت پەڕتووکی باج و خەراجەکەیەتی، کە لایەنێکی تایبەتە بە وڵاتناسی، هەروەکو لە ناوەکەیەوە رادیارە، وەکو پۆلێن کراوە کە ئەوە سەرچاوەیەکە دەگەڕێتەوە بۆ کاروباری دەوڵەت و دیوان و نووسەری و کرێکاری باج و خەراج دانراوە بۆ ئاسانکاریی کارگێڕی دەوڵەت.

---

١ - قدامة بن جعفر، الخراج، مقدمة المحقق، ل٨.

٢ - ئیبن ئەلفرات: ناوی ئەبو حەسەن عەلی کوڕی محەمەد کوڕی موسا کوڕی فورات بووە، لە ساڵی ٢٤١کۆچی لەدایکبووە، سێ جار پۆستی وەزاری لە خەلیفە موعتەزید وەرگرتووە، چەندین جار بڕیاری دەستبەسەرکردنی بۆ دەرچووە و ماڵ و سامانی دەستی بەسەردا گیراوە، لەسەر دەستی پۆلیسی نازوك لە ساڵی ٣١٢ك/٩٢٤ز) کوژراوە، بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ابن خلكان، وفيات الاعيان، بيروت ١٩٩٨، مج٣، ل٣٦٨-٣٧٠. بكة.

٣ - دیوانی زەمام، لەسەردەمی خەلیفە مەهدی نوێکراوەتەوە لە ساڵی ١٦٢ك/٧٧٨ز، کارەکەیشی پشکنین و سەرپەرشتی ئیداری دیوانەکانی مەڵبەندی و چاودێری باری دارایی کردووە بە شێوەیەکی تایبەتی، بڕوانە: الجهشياري، الوزراء والكتاب، (القاهرة، ١٩٦٢).

٤ -مەعز ئەلدەولە: ناوی ئەبو ئەحمەد کوڕی بویەهی کوڕی فەنا خەسرەو بووە، ڕەچەڵەکی بۆ نەوەی سابوری زوئەلکتافی ساسانی دەگەڕێتەوە، لە پاشاکانی بویەهی لە عێراق، لە گەنجییەتی لە کرمان و سەجستان و ئەهواز لەگەڵ براکەی عماد ئەلدەولە ئەوانەیان بەڕێوەبردووە، دواتر بەغدا لە ساڵی ٣٣٤ك، لە سەردەمی خەلافەتی موستەکفی بیللا، لە ساڵی ٣٥٦ك/٩٦٧ز) مردووە، بڕوانە: ابن الاثير ج٨، ل٢٦٤-٣٢٤. ابن خلكان، المصادر نفسة، ج١، ل٣٦٩-٣٧٠.

٥ -معجم الادباء، ج١٧، ل١٢.

له دووتۆی ئەو پەڕتووکەدا دەردەکەوێت لە دوای ساڵی (٣١٦ك/٩٢٨ز) بە ماوەیەکی کەم نووسراوە، بە بەڵگەی ئەوەی قودامە لە دووتۆی پەڕتووکەکەی خۆیدا باسی هەڵمەتی ئەسفار دیلمی[(١)] دەکات بۆ سەر ناوچەی قەزوین لە هەمان ساڵدا.[(٢)]

ئەوەی بەدەست ئێمە گەیشتووە لەو پەڕتووکە تەنیا چوار بەشە، لەو هەشت بەشەی کە پەڕتووکەی لێ پێکهاتووە، ئەوەش نموونەی بەشی دووەمە.[(٣)] ئەو پەڕتووکە زانیاری جۆراوجۆری لەخۆ گرتووە لە رووی بیرکاری و دەروونناسییەوە، لەگەڵ گرینگیدانێکی زۆر بە باسکردنی چیا و رووبارە بەناوبانگەکان کە لەبارەی ئەو حەفت هەرێمەی باسی کردوون، بەڵام گرینگیدانی سەرەکیی پەڕتووکەکەی بە تایبەتی باسی رێگەی نامەبەری لە وڵاتانی ئیسلامی دەکات، لەگەڵ زانیارییەکی بەرفرە لەبارەی دابەشکردنی زەوی و باج و خەراج کۆکردنەوە لە هەرێمەکانی ئیسلامیدا، لێرەوە پەڕتووکی خەراج پێکچووی پەڕتووکەکەی ئیبن خوردازەبەیە یان درێژەپێدەری ئەوە.

ئەوەی راستی بێت ئەو سێ پەڕتووکە: رێگە و مەکۆی ئیبن خوردازەبە و ئیعلاقی ئیبن رستە و خەراجی قودامە، پێوەندییەکی توندوتۆڵیان بەیەکەوە هەیە، لە هەندێ دۆخدا هەروەکو یەکن، لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان پشت بە بەڵگەی فەرمی و بنچینەیی دەبەستن، هەروەها ئەو زانیارییانەی لە پەڕتووکەکانیشدا هاتوون خاوەن گرینگییەکی تایبەتن، چونکە نووسەرەکەی خاوەن پێگەی بەرزبووە لە دەوڵەتدا، دوا ساتەکانی ژیانیشی پۆستی نامەبەری هەبووە.

یەکێك لە لێکۆڵڤانەکان بەو شێوەیە باسی دەکات و دەڵێ: بۆ جاری یەکەمە پەڕتووکێکی نوێ دەبینم لە بابەت جوگرافیاوە ئەویش پەڕتووکی خەراجە، کە پەڕتووکێکە لەبارەی داهات، (لە باجی زەوی و کشتوکاڵییەوە) دیارە ئەو جۆرە کارە

١ - ئەسفار دەیلەمی، ئەوە ئەسفار کوڕی شێرەوەی سەرکردەی سوپای سامانی بووە، کە دەستی بەسەر وڵاتی تەبرستان و جرجان و رەیی و ناوچەکانی دەوروبەریدا گرت. ابن الاثیر، الکامل، ج٨، ل١٣١-١٣٤. ابن خلدون، تاریخ ابن خلدون، بغداد:د/ت، ج٤، ل٧٣٠.

٢ - قدامة، الخراج، مقدمة المحقق، ل١١-١٢.

٣ -االمصادر نفسة، ل١١.

کارێکی جوگرافی رووتە و لە چوارچێوە گشتییەکەیدا پشت بە رێگە و جێگە و وێستگەی نامەبەری دەبەستێت لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامییەوە.[1]

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو زانیارییانەی لەو پەڕتووکەدا هاتووە لەژێر زنجیرەی چەمکی جوگرافیای گەیاندن یان جوگرافیای ئابووری زیاتر لە چەمکی جوگرافیای هەرێمایەتی هاتووە.

بەڵام مەبەست لە پۆلێنکردنی پەڕتووکەکە، خاوەنەکەی بەو شێوەیە یاسی دەکات و دەڵێ: خاوەنی ئەو دیوانە (دیوانی نامەبەری) گەرەکی نییە پیاهەڵدان بکات کە پێویستی نەکردبێت بۆ هیچ کەسێك بگەڕێتەوە، هەروەها خەلیفەش پرسیاری نەکردووە لە کاتی پێویستی بەو کەسە بووە لە نەمانی سوپایەك کە لای ئەو گرینگ بووە، هەموو ئەوانە پێویستی بەوە کردووە لەبارەی زانستی رێگە بزانێ، بەهۆی ئەوەشەوە بینویەتی لە پێش خۆیدا کەسانێکی لێهاتوو و چاپووك هەبوونەو پێویستی بەوە نەکردووە کارەکەی خۆی بگۆڕێت.[2]

پەڕتووکەکەی گرینگییەکی گەورەی لەخۆگرتووە، کە پڕیەتی لە ئامار و زانیاری ورد، چونکە لە لایەن کەسێکەوە نووسراوە سروشتی کارەکەی نووسین بووە، کە کەسێك بووە فەرمانبەری باج و خەراج بووە، کە ئیبن حوقەل لە پەڕتووکی شێوەی زەوی پشتی پێ بەستووە.

بەڵام سەبارەت بە کورد، لە پەڕتووکەکەیدا چوار جار باسی کردووە، ئەویش لەکاتی کە قودامە باسی هێرشەکانی ئیسلامی بۆ سەر هەرێمەکانی جەزیرە و ئەرمینیا و ئازربایجان و خۆزستان دەکات،[3] کە ئەو زانیارییەش لە پەڕتووکەکەی بەلازری وەرگیراوە.[4]

وەکو سەرجەم وڵاتناسەکان ساڵی مردنی بە شێوەیەکی دیاری کراو دیار نییە، بەڵام بەزۆری دەیگەڕێننەوە بۆ نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی لەسەردەمی خەلیفەی

---

١ -كراتشكوفسكى، المصادر نفسه، ق١، ل١٦٥.

٢ - قدامة، الخراج، مقدمة المحقق، ل٧٨

٣ - االمصادر نفسة، ل٣٢٨-٣٨١-٣٨٥.

٤ -قارن: البلاذري، فتوح البلدان، ل١٩٩-٢٠٢-٣١٧-٣٢٥.

عەباسی ئەلموتیع لئەمریلا (٣٣٤-٣٦٣ك/٩٤٦-٩٧٤ز)[1] هەندێ لە لێکۆڵڤانەکانیش دەیگێڕنەوە بۆ نێوان سالآنی (٣١٠-٣٣٧ك/ ٩٢٢-٩٤٨ز)[2]

## – سوهراب:

بەشێکی زۆر لە ژیانی ئەو نووسەرە بە نادیاری و داپۆشراوی ماوەتەوە، ئەوەش وای لێکردووە ئەوەندە باسی خۆی نەکات، وەکو لە ناونیشانی پەڕتووکەکەیەوە دیارە (ئەفقر ئالۆری سوهراب) وەکو دیارە ئەو نووسەرە لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەم یان سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی ژیاوە،[3] هەندێ لە لێکۆڵڤانەکان وای بۆ دەچن کە ئەوە قبتیەکی میسری بووبێت، پەڕتووکێکی نووسیوە بەناوی (سەرسوڕهێنەرەکانی حەوت هەرێمەکە هەتا کۆتایی بنیاتنانی)[4] لە دەوروبەری سالّی (٣٣٤ك/٩٤٥ز) هەندێکیش وا مەزندە دەکەن لە دەوروبەری سالّی (٢٨٩ك/٩٠٢ز) نووسیبیەتی.[5]

وەکو نووسەر لە پێشەکی پەڕتووکەکەیدا باسی دەکات پشتی بە زۆر سەرچاوە بەستووە بەبێ ئەوەی ناوی هیچ کامێکیان بهێنێت وەکو دەڵێت: زۆر حەزم کردووە چاو بە پەڕتووکەکانی پێش خۆمدا بخشێنم و بەدوای هەموویاندا بگەڕێم لەوانەی باسی شێوەی زەوی دەکەن، لە زۆر لەوانەش ئەوەم بەرچاو کەوت کە بە دوورو درێژی شرۆڤەیان کردبوو، کارەکەیان دوور دەخستەوە، بۆیە حەزم کرد لەسەرجەم ئەو پەڕتووکانە پەڕتووکێکی کورت بەرهەم بهێنم کە نێزیك بێت لەوانە، هەروەها کارپێکردنی ئاسان بێت بۆ ئەوانەی گەرەکیانە شێوەی زەوی ئاوەدان ببینن و چۆنییەتی دەرهێنانی دەریاو

---

١ -قدامة، مقدمة المحقق، ل٨.

٢ -كراتشكوفسكي، المصادر نفسة، ق١، ل١٦٥.خصباك، في الجغرافية العربية، ل٣٧.

٣ - كراتشكوفسكي، المصادر نفسة، ق١، ل١٠٣-١٠٤، خصباك، في الجغرافية العربية، ل٣٦٩.

٤ -عجائب الاقاليم السبعة الى نهاية العمارة، تلنيف افقر الورى سهراب، تحقيق:هانز فؤن بريك، مطبعة ادولف هولر هوزن، (فينا:١٩٢٩).

٥ - خصباك، في الجغرافية العربية، ل٣٦٩.

چاوگەو رووبارو چیاو دۆڵ و لەگەڵ دەستنیشانکردنی رێگە بەناوبانگەکان و، رێگە ون و شوێن و جێگە و پێگە ناسراوەکان.[1]

ئەو پەڕتووکە (وەکو پەڕتووکێکی مەنهەجی زیاتر کاری لەسەر نەخشە کردووە([2]) کە لە دووتۆی خۆیدا زانیاری کرداری لەخۆگرتووە لەو بارەیەوە بەپێی حەوت هەرێمەکە، وەکو لە لای بەتلیمۆس و خوارزمییەوە هاتووە.

هەروەها پەڕتووکەکە زانیاری زیاتری لەبارەی شارو چیاو رووبارو دەریاو دەریاچە بەناوبانگەکان تێدایە بە پێی پێگە جوگرافییەکەیان لە حەوت هەرێمەکە، بەڵام بەراوری مردنی دیار نییەو نەزانراوە.

## - جەیهانی: (لەدایکبوون ٣٢٢ك/٩٣٤ز)

ناوی ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی نەسر ئەلجەیهانییە،[3] بە ئەبی عەبدوڵا ناسراوە،[4] لە وڵاتی سامانییەکان پۆستی وەزیری هەبووە لەسەردەمی ئەمیر نەسر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئیسماعیلی سامانی کە خاوەن میرنشینێك بووە لە خوراسان لەساڵی (٣١٠ك/٩٢٣ز) کە جەیهانی بەردەوام بووە لە پۆستەکەی هەتا ساڵی (٣٦٧ك/٩٧٧ز).[5]

جەیهانی چاوی بە گەڕیدەی بەناوبانگ ئیبن فەزلان کەوتووە لە کاتی دوا تێپەڕبوونی بەلای بوخاری لە کاتی گەڕانی بە وڵاتی خەزەر و بولغار لە ساڵی (٣٠٩ك/٩٢٢ز).[6]

جەیهانی گرینگییەکی زۆری بە وڵاتناسی و رێگەو ژیانی پاشا داوە، هەروەها پێگەو پۆستەکەی خۆی بەکارهێناوە بۆ گەشەدان بە مەیل و ئارەزووەکەی، بۆیە کەوتۆتە

---

١ -عجائب الاقاليم السبعة، ل١.

٢ - ابراهيم شوكت، الجغرافية العربية، ل١١٣.

٣ - ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ جیهان، کە ئەوە شارێکە دەکەوێتە لێواری رووباری خوراسان هروز، ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١٠١.

٤ - ابن النديم/ المصادر نفسة، ل٩٣.

٥ - ياقوت، معجم الادباء، ج٣، ل١٩١.

٦ - رسالة ابن فضلان، ل٧٦.

کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی هەموو دنیا، بە تایبەتی وڵاتەکانی دراوسێی خوراسان.[1] هەر ئەوەش یارمەتیدەری بووە بۆ نووسینی پەڕتووکێك بەناونیشانی (المسالك فی معرفه الممالك) یان (المسالك والممالك)[2] کە ئەویان بزربووە.

سەرەڕای ئەوەی بەراوری نووسینی ئەو پەڕتووکە دیار نییە، بەڵام یەکێك لە لێکۆڵڤانەکان دەڵێ لە ساڵی (٣١٠ك/٩٢٢ز)[3] تەواو بووە، کە وڵاتناسان پشتیان پێ بەستووە بە تایبەتی ئیدریسی کە کراچکۆفسکی لەبارەی ئەوەوە دەڵێت ئەو بابەتانەی کە جەیهانی کۆی کردوونەتەوە لەبارەی وڵاتانی دەوروبەری خوراسان بە تایبەتی دۆڵی سەند و هیندستان بەگشتی، بە تاکە سەرچاوە دادەنرێت یان هیچ نەبێت تاکە سەرچاوەی دەگمەنە لەو بارەیەوە، ئیدریسی خاوەن پەڕتووکێك بووە بەناوی (گەڕانێکی تامەزرۆ بۆ گەیشتن بە ئاسۆ) (نزهه المشتاق فی اختراق الافاق)[4]

هەروەکو مەسعوودیش لەوبارەیەوە دەڵێت: (ئەو پەڕتووکێکی لەبارەی پەسنی جیهان و هەواڵەکانییەوە نووسیوە، کە لەبارەی شتە سەرسوڕهێنەر و شار و ناوچە و دەریا و رووبار و گەل و نەتەوە و شوێنی نیشتەجێبوونیان و چەندان شتی دیکە لە رووی هەواڵی سەیر و سەمەرە و چیرۆك و سەرگوزەشتەی بەتام و چێژ دەدوێت.[5] هەروەکو دەڵێن جەیهانی شتەکانی خۆی لە پەڕتووکی (کورتەی پەڕتووکی وڵاتناسی) ئیبن فەقێی هەمەدانی وەرگرتووە.[6] بەڵام مەقدەسی رەخنەی ئەوە دەگرێت و دەڵێت: (بینیم باسی خانووی لەبیرکراو و قۆناخی وازلێهێنرا و دەکات، ئەو ناوچەکانی لەیەکتری جیانەکردووەتەوە، شتەکانی خۆی رێکنەخستووە و باسی شارەکان ناکات، هەتا توانای ئەوەی نەبووە باسێکیان لەبارەوە بکات، بگرە تەنیا باسی رێگەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا و باکوور و باشووری کردووە لەگەڵ شرۆڤەیەك لەبارەی دەشت و دەر و چیاو دۆڵ و گردو

١ - احمد سوسة، الشريف الادريسي، ل١٤٦.

٢ - ابن النديم، المصادر نفسه، ل١٣٨.

٣ - احمد سوسة، الاشريف الادريسي، ج١، ل١٤٦.

٤ - تاريخ الادب الجغرافي، ق١، ل٢٢٢.

٥ - التنبيه والاشراف، ل٧٥.

٦ - العزاوي، تاريخ الجغرافية، ورقة٩.

کانییا و ڕووبارەکان، بەوەش پەڕتووکەکەی درێژکردووەتەوە و لەبیری چووە باسی زۆر ڕێگە و جێگە و باسی شاری کۆن بکات).[1]

بگرە مەقدەسی لەو زیاتر دوورتر دەڕوات کاتێ تاوانباری دەکات بەوەی کە پەڕتووکەکەی لە پەڕتووکێکی ئیبن خوردازەبەوە هەڵهێنجاندووە.[2] هەروەها پۆستە باڵاکەشی بەکارهێناوە بۆ ئەو مەبەستە بەوەش (زۆر کەسی نامۆی کۆکردووەتەوە و پرسیاری لێ کردوون لەبارەی پاشا و میر و داهاتیان و چۆنییەتی ئەو ڕێگەیەی بۆیان دەچێت).[3]

لەوبارەیەوە مینۆرسکی پشتیوانی لە مەقدەسی دەکات لەوەی کە جەیهانی تاوانبار دەکات کە پەڕتووکەی لە ئیبن خوردازەبە وەرگرتووە، هەروەها باسی ئەوەش دەکات کە بیرۆکەی وەرگرتن و ڕازاندنەوە لەو کاتدا شتێك نەبووە مایەی کەموکورتی بێت و شتێك نەبووە وەکو ئێستە جێگەی شوورەیی بێت، بۆیە زۆرێك لە نووسەرە دێرینەکان لەوە زیاتریان ئەنجام نەدەدا، تەنیا نووسینەکانی پێش خۆیان دووبارە دەکردەوە.[4]

ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو ڕەخنانەی مەقدەسی لە پەڕتووکەکەی جەیهانی گرتووە، هەروەها وڵاتناسانی دیکەش بە شێوەیەکی بەرچاو ئاماژەیان بەوە داوە، ئەوە ئیبن حوقەل کە خاوەنی پەڕتووکی شێوەی زەوییە باسی دەکات کە (پەڕتووکەکەی ئیبن خوردازەبە و پەڕتووکەکەی جەیهانی هیچ جیاوازییەکیان نییە).[5]

لە لایەکی دیکەوە پەڕتووکەکەی جەیهانی تاکە سەرچاوەی گرینگ کە پشتی پێ بەستووە، پەڕتووکی (سنووری جیهان) بووە، کە خاوەنی ئەو پەڕتووکە دیار نییە، بە

---

١ - احسن التقاسيم، ل٢٠.

٢ - االمصادر نفسة، ل٢٥٨.

٣ - االمصادر نفسة، ل١٩.

٤ - الجغرافيون والرحالة المسلمون، ل٩.، ينظر كذلك: عزيز الله بيات، كليات جغرافياى طبيعي وتاريخي ايران، ل٣٣٥.

٥ - صورة الارض، ل٥.

گریمانی ئەوەی زۆرێك لەو چەمك و زاراوانەی ولاتناسی تایبەت بە ئاسیای ناوەڕاست هەیە، ئەو زانیارییانە لە پەڕتووکی سنووری جیهاندا هەیە.[١]

پەڕتووکەی جەیهانیش لێرەدا گرینگییەکەی بەدیار دەکەوێت کە زۆرێك لە نەخشەی تێدایە کە وێنەی جیهانی بە شێوەیەکی گشتی بەدیار دەخات، هەروەها نەخشەی دیکەی تێدایە لەبارەی زۆرێك لە ولاتان کە میلەر لە ئەتەلەسی جیهانی عارەبی بلاوی کردووەتەوە، کە ئەمە خالێکی وەرچەرخان بووە لە قۆناخی کارتۆگرافیای عارەبیدا.[٢]

## – بەلخی (لەدایکبوون:٣٢٢ك/٩٣٣ز)

ناوی ئەبوزەید ئەحمەد کوڕی سەهل ئەلبەلخی بووە، رەچەلەکی دەگەڕێتەوە بۆ شاری بەلخ، کە یەکێکە لە شارەکانی ناوچەی خوراسان، لە یەکێك لە گوندەکانی ئەو شارە لەدایکبووە لە دەوروبەری سالی (٢٣٥ك/٨٤٩ز)[٣] لە کاتی لاویدا کاری فێرکردنی مندالانی کردووە.[٤]

لە هەرەتی لاویدا چۆتە عێراق و بۆتە خوێندکار لەسەر دەستی کندی فەیلەسوف (لەدایکبوون:٢٦٠ك/٨٣٣ز). یاقوت لەو بارەیەوە ئەوە باس دەکات و دەلێت: (بە پێ رووی کردە ئەو شوێنە و بۆ ماوەی هەشت سالان تێدا مایەوە، بووە خوێندکاری ئەبی سوف کوڕی ئیسحاق ئەلکندی، لەسەر دەستی ئەو زۆر زانیاری فێر بوو، فەلسەفەی خوێند و، هەروەها زۆری لەبارەی نهێنی زانستی ئەستێرەناسی خوێندەوە، لە بواری زانستی نووشداریدا شوێن و پێگەیەکی دیاری بەدەستهێنا، زۆری لەبارەی چییەتی ئاین کۆلییەوە، رامانە قولەکانی هەندێ جار وای لێدەکرد تووشی سەرسامی ببێت و نەتوانێ

١ - بارتولد، جهود العلماء العرب المسلمين في علم الجغرافية، تقويم كتاب حدود العالم، ترجمة و تعليق: عبد الجبار ناجي، بغداد ٢٠٠٠، ل٣٩.

٢ - احمد سوسة، المصادر نفسه، ل٤٨.

٣ - ياقوت، معجم الادباء، ج٣، ل٦٥.

٤ - االمصادر نفسة، ج٣، ل٦٥.

ڕێگەیەکی ڕۆشن بدۆزێتەوە، بۆیە جارێك پەنای بۆ ئیمام دەبرد و، جارێکیش دەگەڕایەوە بۆ ئەستێرەناسی و یاسا و ڕێساکانییەوە).[1]

دوای ئەوەی زانستی لەسەر دەستی زاناکانی عێراق بەدەستهێنا، دووبارە گەڕایەوە بۆ شاری بەلخ کە زێدی لەدایکبوونی بوو و لەوێ مایەوە، کەوتە خزمەتکردنی میرەکەی لە دەوڵەتی سامانی.[2]

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەو هەموو زانستەی کە لە عێراق بەدەستی هێنا، ڕەنگدانەوەی هەبوو بەسەر بەرهەمەکانی لەسەرجەم بوارە جۆربەجۆرەکانی هونەر و زانیاری کە نێزیکەی چل پەڕتووك دەبێت بە پێی ئەو سەرژمێرییەی کە ئیبن نەدیم بۆی کردووە.[3] هەروەها یاقوتیش دەڵێ زیاتر لە شەست بەرهەمی هەبووە، کە هەر هەموویان بزر بوونە تەنیا هێڵکارییەکی نەبێت لەبارەی وڵاتناسییەوە، هەرچەندە ئیبن نەدیم بە شێوەیەك باسی دەکات و دەڵێت: (ئەو کەسێکی شارەزا و تێگەیشتوو بووە لەسەرجەم زانستە کۆن و نوێیەکاندا، لە دانانی پەڕتووکەکانی ڕێگەی فەلسەفەی گرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لە خاوەندارانی ئەدەب دەچێت).[4]

بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە کە ئیبن نەدیم لە دووتۆی ئەو پەڕتووکە زۆرانەی بەلخیدا، باسی ئەو پەڕتووکەی بەلخی نەکردووە کە لەبارەی وڵاتناسییەوە هەیەتی، هەروەها یاقوتیش کە لەدوای ئەو هاتووە باسی نەکردووە.

بەڵام حاجی خەلیفە[5] ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بەلخی پەڕتووکێکی لەبارەی ڕێگەکان و مەملەکەتەکانەوە هەیە (کە لە پێشەوە دوای حەمد و سەنا بۆ خودای گەورە..هتد، دواتر لە باسی هەرێمەکان و زەوی، بە دوور و درێژی باسی شار و وڵاتی ئیسلام دەکات).

---

١ - یاقوت، معجم الادباء، ج١، ل١٦١.

٢ - االمصادر نفسة.

٣ - اللفدي، للاح الدين خليل بن ابيك الوافي بالوفيات، اعتناء:محمد يوسف نجم، بيروت:١٩٧١، ج٦، ل٤٤٣.

٤ - الفهرست، ل١٣٨.

٥ - معجم الادباء، ج١، ل١٦١.

ئەو پەڕتووکە نادیارەی جۆرێك لە تەمتومان و شاراوەیی پێوە دیارە، ئەوەش لە ئەنجامی ئەوەی کە فرە ناونیشانە و جارێك بە (صوره الاقالیم)[1] ناوی هاتووە، جارێکیش بە ناونیشانی (اشکال البلاد) ناوی هاتووە، جارێکی دیکەش بەناونیشانی (رۆژ ژمێری وڵاتان) ناوی هاتووە، جیاوازی لە ناونیشانەکانیش بەڵگەیە بۆ ئەوەی پەڕتووکەکە لە بنچینەدا نازانرێ شێوە راستییەکەی چییە، هەتا لەسەردەمە نێزیکەکانیش کە نووسەر تێیدا ژیاوە.[2]

هەروەها کراچکۆفسکی پێی وایە کە بەلخی پەڕتووکی ناوبراوی لە دەوروبەری ساڵی (٣٠٨ك/٩٢١ز) نووسیوە، واتە لە کۆتایی ژیانی کە لە ساڵی (٣٢٢ك/٩٣٤ز) کۆتایی هاتووە، مەقدەسیش باسی بەلخی و پەڕتووکەکەی دەکات، بە شێوەیەك کە رەخنەی لێدەگرێت و دەڵێت: (بەڵام ئەبوزەید بەلخی کە مەبەستی بووە نموونە و شێوەی زەوی بنووسێتەوە، دوای ئەوەی پەڕتووکەکەی دابەشی سەر بیست بەش کردووە، ئینجا شرۆڤەی هەموو نموونەکانی بە کورتی کردووە، بەڵام هۆکارە بەسوودەکانی دیاری نەکردووە، هەروەها پرسی سوودی ئەو شرۆڤانە و چۆنییەتی رێکخستنەکانی روون نەکردووەتەوە، زۆررێك لە وڵات و شاری پشتگوێ خستووە و باسی نەکردوون، نە بارودۆخی وڵاتەکە و نە کاروبارەکەیشی باس نەکردووە).[3]

بۆیە ئەوە یەکەم ئاماژەیە بۆ پەڕتووکەکەی بەلخی لە رووی پێناسە و هەڵسەنگاندنیەوە، لە دووتۆی قسەکانی مەقدەسییەوە ئەوە دەستگیر دەبێت کە بەلخی

---

١ - کشف الظنون، بغداد:د/ت، ج٢، ل١٦٦٤.

٢ - دانەیەکی دەتنووس لەو پەڕتووکە بەهەمان ناونیشان لە (خەناەی سەدام بۆ هێلکارییەکان) هەیە لە بەغدا، بەڵام لەبەر خراپی دەستخەتەکەی، کاتێ دەیخوێنیەوە دەبینی کەموکورتی تێدایە، بە شێوەیەك کە ئەو هەرێ/انەشی تێدا نییە کە لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەدایە، لە کاتێکدا پەڕتووکەکانی ئەستەخری و ئیبن حوقەل هەموو ئەو شتانەی تێدایە لە هێڵکارییەکانی بەلخی، واتە ئەستەخری ئۆڤەر بووە بەسەر پەڕتووکەکەی بەلخی، هەروەها ئیبن حوقەل زۆرێك لە بابەتەکانی لە پەڕتووکەکەی ئەستەخری وەرگتووەو هەندێ:یشی لێ زیاد کردووە.

٣ - کراتشکوفسکی، المصادر نفسه، ق١، ل١٩٨. جمال الفندي، المصادر نفسه، ل١٢٧.

زۆر گەشت و گەڕانی نەکردووە، ئەوەش لە لای هەندێ لە لێکۆڵڤانی نوێ جەختی لێکراوەتەوە.[1]

گرینگی ئەو پەڕتووکە لەوەدا بەدیار دەکەوێت کە ئەمە هەوڵێکی پێشەنگ بووە بۆ ئەو وڵاتناسانەی کە پێیان وابووە نەخشە سەرچاوەیەکی سەرەکی لێکۆڵینەوەی هەرێمەکانە، بەڵام جۆری پەڕتووکەکەی دەستەواژەیەکە لەبارەی باسکردنی کارتۆگرافی، نەوەك باسێکی جوگرافی وڵاتانی ئیسلامی بێت، هەر بۆیە نەخشەکانی پێشەنگی نەخشەی کلاسیکیی عارەبییە کە میلەر miller ناوی ناوە (ئەتلەسی ئیسلام) ئەوەش لە لایەن هەندێ لە وڵاتناسانەوە بەکار هێنراون و لاسایی کراونەتەوە وەکو ئەستەخری و ئیبن حوقەل.[2]

## – ئەستەخری (لەدایکبوون:٣٤٦ك/٩٥٢ز)

ناوی ئیسحاق ئیبراهیم کوڕی محەمەدی فارسی ئەلئەستەخرییە،[3] رەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ شاری ئەستەخەر،[4] لە هەرێمی فارس، لەبارەی ژیانییەوە ئەوەندە نازانرێ تەنیا شتێکی کەم نەبێت، هەتا ئیبن نەدیمیش کە سەرچاوەیەکی سەرەکی زۆربەی وڵاتناسانە، ئاماژەی بۆ نەکردووە، هەروەها یاقوتیش لە فەرهەنگی وەرگێرانەکەی باسی نەکردووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە زۆرێك لە بابەت و فەرهەنگی وڵاتاندا پەنجە نومای بۆ کراوە.

ئەستەخری زۆر حەزی لە گەشت و گەڕان بووە، زۆر گەشتی کردووە، سەردانی وڵاتی ئەودیوی دەریا و ئێران و جەزیرەی عارەبی و شام و میسری کردووە،[5] لە کۆتاییەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی گەشتەکەی لە کەنداوەوە بۆ زەریا و دەریای

---

١ - کراتشکوفسکی، المصادر نفسه، ق١، ل١٩٨

٢ - احسن التقاسیم، ل٢٠.

٣ - حاجي خليفة، المصادر نفسة، ل٤٧٢.

٤ -ئەستەخەر: شارۆچکەیەکە لە فارس، گەورەترین قەلا ّو شار و ناوچەی ئاوەدانیە، معجم البلدان، ج١، ل١٧١.

٥ - کراتشکوفسکی، المصادر نفسەن ل١٩٩.

قەزوین دەست پێکردووە،[1] لەوێدا هەواڵی گەشتەکەیمان پێڕادەگەیەنێ، کە تێیدا باسی هەرێمەکان و وڵات و چیا و رووبار و چەندان شتی دیکە دەکات، بەڵام (تایبەتمەندی وڵاتناسی و بابەتە ئاوێـتەکانی دیکەی لە دەست چووە).[2]

لێرەدا بۆمان بەدیار دەکەوێت کە ئەستەخری لە دوو تۆی گەشتەکان و گەڕانەکانی چاوی بە وڵاتناس و گەڕیدە (ئیبن حوقەل) کەوتووە،[3] بەڵام شوێنی بەیەك گەیشتنیان دیار نییە و نەزانراوە، کە لە هیندستان بووە[4] یان لە بەغدا،[5] یان لە شوێنێکی دیکە بووە، دوای گەڕانێکی زۆر و گەشتکردنێکی دوور و درێژ ئەوەی بینیویەتی نووسیویەتیەوە، بەوەش توانیویەتی شتێکی نوێ لەبارەی جوگرافیا بێنێتەکایەوە و نوێکاریشی تێدا بکات، ئەگەر ئێمە نەمانتوانی بێت ئەستەخری بناسین، بەڵام بەرهەمەکانی لە پێگە و توانا زانستییەکانی لە لێکۆڵینەوەی جوگرافی ئاگەدارمان دەکاتەوە و، هەر بەوەشەوە توانیویەتی زانستی وڵاتان و پێگەکەی بەدەست بهێنێت.([6])

ئەستەخری گەشتەکەی لە ساڵی (٣٠٣ك/٩١٦ز) دەست پێکردووە لە شوێنی لەدایکبوونییەوە لە ئەستەخر،([7]) بەرواری نووسینی پەڕتووکەکەیشی کە بەناوی (ئەلمسالك والممالك)ــە، دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی (٣١٨-٣٢١ك/٩٣٠-٩٣٣ز) کە لەو کاتدا ئەبوزەیدی بەلخی لە ژیاندا نەماوە.([8])

---

١ - المغربي، كتاب الجغرافيان مقدمة المحققن ل٣٨.

٢ - سليم افندي، و ميخائيل شحادة، في الجغرافية وجغرافيي الاسلام، مجلة المقتطف (القاهرة، ١٨٨٣، السنة السابعة، ج١١، مج٧، ل٦٦١.

٣ - ابن حوقل، صورة الارض، ل٥.

٤ - المغربي، المصادر نفسه، ل٣٨.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، مقدمة المحقق، ل٩.

٦ -العزازوي، تاريخ الجغرافية، ورقة ١٢.

٧ - شمس الدين سامي، قاموس الاعلام، تاريخ و جغرافيا لغانتي وتعبير الحله كافة اسماء خالة يي جامعدر، لاحب طابعي (مهران:١٨٨٩) اكنجي جلد، ل٩٩١.

٨ -كراتشكوفسكي، المصادر نفسه، ق١، ل١٩٩.

هەندێ لە لێکۆڵەرەکان([1]) پەڕتووکەکەی ئەستەخری بە لەبەرگرتنەوەی دانەی دووەمی پەڕتووکەکەی بەلخی دادەنێن، بەڵام بەرفرەوانترە، واتە ئەوەی یەکەمیان زاڵ بووە بەسەر ئەوەی دووەمیان، ئەمەش بە روانین بۆ ئەوەی گەورەترە لە رووی بێژە و واتاوە لە نێوان ئەو دوو پەڕتووکەدا، بەڵام مەتز هەندێ لەو پرسە کەم دەکاتەوە و جەخت لەوە دەکاتەوە کە پەڕتووکی (شێوەی هەرێمەکانی بەلخی) بە گرینگترین سەرچاوە دادەنرێت کە ئەستەخری پشتی پێ بەستووە.([2])

بە دڵنیاییەوە ئەوەی ماوەتەوە کە ئەستەخری چاوی بە بەلخی کەوتووە لە خوراسان و پەڕتووکەکەیشی لێ وەرگرتووە و، دانەیەکی لەبەر گرتووەتەوە و لە دوای مردنی بەلخی هەندێ زیادکردنی تازەی بۆ کردووە، هەروەها ئیبن حوقەلیش دووەم کەس بووە کە پەڕتووکەکەی ئەستەخری لەبەرگرتووەتەوە و هەندێ زانیاری تازەی بۆ زیادکردووە کە تایبەت بووە بە ئەندەلوس و جەزیرە و هەندێ شوێنی دیکە. بارتۆلد لەو بارەیەوە ئاماژە بۆ ئەوەدەکات و دەڵێ: (ئەو پەڕتووکەی کە لە سەدەی چوارەم کە ئەبوزەیدی بەلخی قوتابی کیندی بووە نووسیویەتی، یەکەمجار ئەستەخری لەبەری گرتووەتەوە و، دواتر ئیبن حوقەل کە یەکێك بووە لە بازرگانەکانی ئەفریقیای باکوور لەبەری گرتووەتەوە).([3])

ئەستەخری تا ئەو ئاستە پشتی بە پەڕتووکەکەی بەلخی بەستووە، بەڵام ئەوە واتای ئەوە نییە کە پەڕتووکەکەی بێ سوودە، دوای خاوەنەکەی تەواوی دەکات و بەرهەمی دەهێنێت، دوای ئەوەی زانیارییەکی زۆری بۆ زیاد دەکات،([4])دواتر وڵاتناسەکانی دیکە کە لە دوای ئەوەوە هاتوون زۆر شتیان لێی وەرگرتووە بە تایبەتی یاقوت کە هەندێ لە زانیارییەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەستەخری.([5])

ئەستەخری لە کارەکەی خۆیدا وڵاتی موسڵمانانی دابەشکردووە بۆ بیست بەش، وەکو ئەوەی بەلخی کردوویەتی، کە بە شوێنی نیشتەجێبوونی عارەبەوە دەستپێدەکات و

---

١ - جمال افندي، المصادر نفسة، ل١٣٠. بارتولد: تاريخ الحضارة الاسلامية، ل٨٠.

٢ - الحضارة الاسلامية، ج١، ل٨١.

٣ - تاريخ الحضارة الاسلامية، ل٨٠.

٤ - مينورسكي، الجغرافيون والرحالة المسلمون، ل١١.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، مقدمة المحقق، ل٩.

بە وڵاتی ئەودیوی ئاوان کۆتایی پێ دێنێت، باسی هەر بەشێکیش بە جیا دەکات، لەگەڵ دەستنیشانکردنی وڵات و شار و جۆری بازرگانی و کشتوکاڵ و پیشەسازی و پیشەکاری خەڵکەکەیی و، هەروەها ماوەی دووری نێوان شار و قەزا و ناحییەکانی، هەروەها پەرتووکەکەیشی بە نەخشە روونکردووەتەوە، لە بابەت قسەکردنی لەبارەی هەرێمەکانەوە پشتی بەو وێنەیە بەستووە کە وێنەکێش وای نەخشاندووە، لەوەش زانیاری ئەوەمان بۆ بەدیار دەکەوێت کە ئەو ویستوویەتی لە ئەندێشەی بینەر بیرۆکەیەکی روون دروست بکات لەبارەی ئەو شتەوە.

ئەستەخری باسی میتۆدی نووسینی پەرتووکەکەی خۆی دەکات و دەڵێت: (من لە پەرتووکەکەی خۆمدا باسی ئەو هەرێم و زەوی و پاشایانەم کردووە، مەبەستیشم وڵاتی ئیسلام بووە بە دوور و درێژی، دابەشکردنەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ کارەکانی ئەو کۆمەڵەی تێدا بووە، مەبەستیشم لەو حەوت هەرێمە نییە کە زەوی بەسەردا دابەشکراوە، بگرە من وام کردووە هەر پارچەیەك بە جیا وەربگرم و وێنە بکێشم و قسە لە ڕوونکردنەوەی ئەو هەرێمانە بکەم، دواتر باسی ئەو شوێنانە بکەم کە پێوەی پێوەستنن وەکو شار و ناوچە و شوێنی بەناوبانگ و دەریا و رووبارەکان، هەروەها ئەوەی پێویست بووە بزانرێ لەسەرجەم ئەو شتانەی لەو هەرێمەدا هەبووە، بەبێ کورتکردنەوە و ناچاری درێژکردنەوە، کە دەبێتە هۆی بێزارکردنی خوێنەر، چونکە مەبەستم لەو پەرتووکە وێناندنی هەرێمەکان بووە، کە پێش من هیچ کەسێك ئەوەی نەکردووە کە من فێری بوویمە).([1]) بەڵام لە باسی شار و چیا و رووبار و دەریا و ماوەی نێوانیان و هەموو ئەو شتانەی من باسم کردووە، ئەوا لە هەواڵەکاندا هەیە، لە لای ئەو کەسەش شتێك نەبووە کە ویستوویەتی لەبارەی هاووڵاتیانی ئەو وڵاتانەوە بیگێڕێتەوە، هەر بۆیە ئێمە تێپەڕی ئەو شتەمان کردووە لەبارەی ماوەی دووری نێوان شار و هەموو ئەو شتانەی تێیدا هاتووە.([2])

---

١ - واتە ئەو ئینکاری ئەوە دەکات کە پەرتووکی (صوره الاقالیم) هی بەلخی بێت، کە هاوسەردی خۆی بووە.

٢ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٥.

بەڵام سەبارەت بە باسی کورد، ئەوا لە پەڕتووکەکەیدا بێژەی (کورد) هەژدە جار هاتووە،[1] زۆرترینیش کاتێ باسی کوردەکانی هەرێمی فارس دەکات کە ئەوان تێدا ژیاون.

سەبارەت بە مردنیشی بە شێوەیەکی دیاری کراو نازانرێ بەرواری مردنەکەی کەیە، وەکو زۆربەی وڵاتناسەکانی دیکە، بەڵام لێکۆڵینەوە لەبارەی پەڕتووکەکەی ئەسەتەخری و ئەو کەسانەی ئاماژەیان بۆ کردووە دەڵێن مردنەکەی لە دەوروبەری نیوەی سەدەی چوارەمی کۆچی بووە، ئەوەش ئاماژەیە بۆ یەکێك لە دەسەڵاتدارەکانی سامانی کە ناوی ئەبو موزەفەر محەمەد کوڕی لوقمان کوڕی نەسر کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەسەدی سامانی بووە، کە حوکمی سەمەرقەندی کردووە لەسەردەمی نوح کوڕی نەسری میری سامانی یان لەسەردەمی کوڕەکەی عەبدولمەلیك کوڕی نوح کوڕی نەسری سامانی بووە کە لە دەوروبەری ساڵی (٣٥٠ك/٩٥٦ز) مردووە.[2]

تەنیا حاجی خەلیفە نەبێت ساڵی مردنەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی (٣٤٦ك/٩٥٢ز)[3]

## – ئیبن حوقەلی نەسیبی (لەدایکبوون:٣٧٧ك/٩٧٧ز)

ناوی ئەبو قاسم محەمەد کوڕی عەلی ناسراوە بە ئیبن حوقەل یان حوقەلی، هەروەها بە نەسبیی و بە بەغدادی و مەوسڵی بانگیان کردووە، ئەو ناسناوەیشی بۆ شوێنی لەدایکبوونی دەگەڕێتەوە.[4]

کەسیش بە شێوەیەکی ورد نازانێ شوێنی لەدایکبوونی کوێیە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەندێ لە لێکۆڵڤانەکان پێیان وایە لە شاری نەسیبین لە دایکبووە،[5] هەندێکی

---

١ - المسالك والممالك اللفحات: ٦١، ٦٨، ٧١، ٧٢، ٧٨، ١٠٧، ١١٨، ١٥٣، ١٥٥، ١٥٨.

٢ -االمصادر نفسة، ١٧٧-١٧٨.

٣ - كشف الظنون، مجل١٦٦٤، البغدادي، هدية العارفين، (بغداد:د/ت)ج٥، ل٨.

٤ - ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ل٣٩٨، القزويني، اثار البلاد، ل٦، ابو الفدا، تقويم البلدان، ل١.

٥ -كراتشكۆفسكي، مرجع السابق، ق١، ل٢٠٠.

دیکەش پێیان وایە شوێنی لەدایکبوونی بەغدایە،[1] بەڵام رای یەکەم راستترە، لەبەرئەوەی ئیبن حوقەل بە نەسیبی بەناوبانگ بووە زیاتر لەوەی بە بەغدادی بانگکرابێ.

بە راستی ئەو زانیارییە بەرفرەیە لەبارەی ژیانی ئەو لەبەردەستدا بێت، وەکو هەر وڵاتناسێکی دیکە کەمە، بەڵام ئەگەر باسی هەندێ لایەنی ژیانی ئەو بکەین لە دووتۆی قسەکردن لەبارەی بابەتەکانییەوەیەتی،[2] وەکو دیاریشە ئەو لە بەغدا لە دایکبووە کە گەشتەکەی لێوە دەست پێکردووە،[3] کە دەکاتە رۆژی پێنج شەممەی رێکەوتی حەوتی مانگی رەمەزانی ساڵی (٣٣١کۆچی) بەرامبەر بە پێنجی مانگی ئایاری ساڵی (٩٤٣ز).

ئەو بە گەشتە بەرفرەوان و زۆر و زەوەندەکانی بەناوبانگ بووە لەسەرتاپای دنیای ئیسلامی، کە نێزیکەی سی ساڵی خایاندووە، کە هەر یەك لە شارەکانی میسر و شام و عێراق و بەحرەین و، هەروەها وڵاتی فارس و ئازەربایجان و ئەرمینیای گرتووەتەوە، هەروەها بە هەندێك لە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و باشووری ڕۆژهەڵاتیدا سووڕاوەتەوە، لەوانە هەرێمی سەند و، لەوێوە چووەتە وڵاتی بولگار و گەیشتووەتە ناوەڕاستی رووباری فۆڵگا و، لەوێشەوە چۆتە وڵاتانی ڕۆژئاوای عارەبی و ئەندەلوس و لای ڕۆژئاوای ئەفریقیا و هەتا گەیشتۆتە گانا، هەروەها سەردانی ناپۆلی و سەقلیەی کردووە لە ئیتاڵیا.[4]

مەبەستی یەکەمی لەو گەشت و گەڕانانەی بە پلەی یەکەم پیشەی بازرگانی بووە، کە سروشتی پیشەکەی کە بازرگانی بووە، وای خواستووە گەشت لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە بکات.

ئیبن حوقەلیش لە پەڕتووکەکەی ئاماژە بە پیشەکەی کە بازرگانییە دەکات و دەڵێت: (من لە گەشتەکانم تەنیا شتێك کە لەگەڵم بوویێت، شتومەك و ئەو کەلوپەلانە بووە کە بۆ فرۆشتن بووە).[5]

هەروەکو دەبینین یەکێك لەو هۆکارانەی وای کردووە پەڕتووکی وێنەی زەوی بنووسێت، لە کاتی گەنجیەتیدا سەرقاڵ بووە بە (پیشەی هەواڵی وڵاتان و هەڵوەستەکردن

-١ العراق في خوارط القديمة، مطبوعات المجمع العلمي العراقي، (بغداد ١٩٥٩) ل٦١.

٢ - صورة الارض، ل١٠.

٣ -االمصادر نفسة، ل١٠-١١.

٤ - االمصادر نفسة، ل١٦-٢٥، احمد سوسة، الشريف الادريسينج١، ل١٧٠-١٧١.

٥ - االمصادر نفسة، ل٢٩٣.

لە کاروباری شارەکان و، زۆر پرسینی هەواڵ بووە لەو گەشت و گەڕانانەی ئەنجامم داوە لەگەڵ ئەو بریکارە بازرگانیانەی بینیومە، هەروەها خوێندنەوەی ئەو پەڕتووکانەی لەو بارەیەوە هەبووە، بۆیە ئەگەر پیاوێکم بینیبێ و هەستم کردبێ ئەوە راستگۆیە و یان بەتاڵە لەوەی پرسیاری لەبارەی شارەزاییەك یان داناییەك لێبکەم، لەدوای داڕشتنەوەی هەواڵەکە هەستم کردووە چەندە راستگۆیە، ئەو قسەیە یان دەقی ئەو هەواڵەم لەبەر کردوە و رێگە و پەسنەکەییم وێناندووە لەوەی زیاتر هەڵە بێت، بینیومە قسەکەرەکە وەکو نەزانێك قسەی کردووە، دوای داڕشتنەوەی هەواڵەکە دووبارە چاوم پێی کەوتووەتەوە بۆ ئەوەی گوێی لێبگرم چۆن باسی شتەکەم بۆ دەکات، بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی قسەیان کردووە، لە نێوان کۆکردنەوەی هەموو ئەمانەدا و، بەراوردکردنی لەگەڵ گێڕانەوەی سێیەم بە شێوەیەکی دادپەروەرانە و یەکسان، دەبینم لێکنەچوون لە نێوان ئەو قسانە و ئەو گێڕانەوەیەدا هەیە، هەر ئەوەش وای لێکردووم لە ناخەوە هەست بە بەهێزی بکەم لەو گەشت و گەڕان و رووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسیانە و خۆشەویستی وێناکردنی شارەکان و چۆنییەتی نەخشاندنی پێگە و شوێنی شارەکان).([١])

ئیبن حوقەل رەشنووسی یەکەمی لە پەڕتووکەکەی بۆ میر سەیف ئەلدەولەی حەمەدانی (لە دایکبوون ٣٥٦ك/٩٦٦ز) بەرزکردووەتەوە لە حەلەب،([٢]) بەڵام رەشنووسی دووەمی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ساڵی (٣٦٧ك/٩٧٧ز).([٣])

ئیبن حوقەل وەکو هەر وڵاتناسێکی دیکە گرینگی زۆری بە باسکردنی (دار السلام) داوە، بە تایبەتی وڵاتی فارس، کە ئەوە یەکێکە لە خاسیەتە گرینگەکان کە لە قوتابخانەی کلاسیکی لەبارەی لە جوگرافیای عارەبی فێری بووە ، لەگەڵ ئەوەش نابێت ئێمە ئەو هەوڵانەی هەندی کەس لەبیر بکەین وەکو ئیبن خوردازەبە و یەعقوبی و ئیبن فەقێ و ئیبن رەستە و مەسعودی لە پێشکێشکردنی باسێکی رێك و پێك لە نەخشاندنی جیهانی ئیسلامی و سیستەمە ئیداریەکەیەوە، بەبێ ئەوەی کارەکەیان هەر لە وڵاتانی ئیسلامی گیرسابێتەوە، بگرە ئەو کارەیان وڵاتانی دیکەی غەیرە ئیسلامیشی گرتووەتەوە، بۆیە دەبینین ئیبن حوقەل سوودی زۆری لە پەڕتووکەکانی ئیبن خوردازەبە و

١ - االمصادر نفسة، ل٣٨٣.

٢ - بڕوانە: ابن خلكان، المصادر نفسه، ج٣، ل٤٠١-٤٠٦.

٣ -كراتشكوفسكی، المصادر نفسة، ق١، ل٢٠١.

جەیهانی و ئەبی فەرج قودامەی کوڕی جەعفەر وەرگرتووە بە شێوەیەك کە هەست بە جیاوازییەك ناکەیت کە لە نێوانیاندا هەبێت.([1])

زۆربەی لێکۆڵەرانەکان لەبارەی کاریگەری پەڕتووکی (شێوەی زەوی) بە پەڕتووکەی (المسالك والممالك)ی ئەستەخرییەوە، بگرە هەندێکیان زیاتر بۆ ئەوە دەچن کە دانەی یەکەم شتێك نییە تەنیا پاکنووسی دووەمە، ئەو کەسانەش ئەو بۆچوونەیان لێرەوە سەرچاوەی گرتووە کە بە شێوەیەکی بەرچاو هاوبەشییەك هەیە لە رووی شێوە و ناوەرۆك لە نێوان دەقی ئەو دوو پەڕتووکەدا بە تایبەتی لە بەشی یەکەمیدا، ئیبن حوقەلیش خۆی دان بەوەدا دەنێت کە چاوی بە ئەستەخری کەوتووە، ئەو چاوپێکەوتنەی کە نە شوێن و نە بەروارەکەیشی دیارە.([2])

وەکو ئیبن حوقەل ئاماژەی پێدەکات لەو بارەیەوە (چاوم بە ئەبا ئیسحاق ئەلفاترسی کەوت، ئەو وێنەی  زەوی سەندی کێشا و تێکەڵی کرد، هەروەها وێنەی فارسیشی بە باشی کێشا، منیش وێنەی ئازربایجانم کێشا، ئەویش بۆی چاککردم و وێنەی جەزیرەیشی نوێکاری تێدا کرد، هەروەها وێنەی میسریشی دەرهێنا و مەغریبیشی دەرکرد کە زۆر هەڵەی تێدابوو، گوتی من تەماشای پەڕتووك و نووسینەکانی تۆم کردووە، من لێت دەپرسم پەڕتووکەکەی من چاك بکەوە، ئەوەش ئەوها مایەوە، بە شێوەیەك چاکم کردەوە کە لەوێنەی ئەو نەدەچوو، دواتر بینیم ئەو پەڕتووکە چاککردنەوە و وێنەکێشان و کۆکردنەوە و روونکردەوەی خۆ تەنیا کردنی دەوێت).([3])

بە راستی رای زۆربە لەبارەی پەڕتووکەکەی ئیبن حوقەل شتێك نییە تەنیا دانەیەکی پاککراوە و دانسقەی پەڕتووکەکەی ئەستەخری نەبێت، زیادەڕەوی تێدایە، ئەوەی بەراوردێك بکات لە نێوان هەردوو پەڕتووکەکەدا، دەبینێ کە ئەوەی یەکەمیان زیاتر ورد و پوختە لە رووی شوێن و پێگەی جوگرافییەوە، هەروەها لە چۆنییەتی خستنەڕووی بابەتە جوگرافییەکانەوە لە رووی گشتگیری و روونکردنەوەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی تێبینی گرینگی لە چۆنییەتی باسکردنی بەشی ڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامی تێدایە، کە

---

١ - صورة الارض، ل١٥.

٢ - بۆ زیاتر زانیاری سەیری، سعد عبود سماد، ابن حوقل، دراسة تاريخية في كتابه صورة الارض، رسالة ماجستير كلية الاداب، جامعة البلرة، ل٥-١٠.

٣ -ابن حوقل، صورة الارض، ل٢٣.

ئیبن حوقەل بە شێوەیەکی دوور و درێژ باسی مەغریب دەکات، کە ئەوە لە پەڕتووکەکەی ئەستەخری نییە، هەروەها سەبارەت بە سەرتاپای ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیشەوە.(1) هەروەها هەرێمی چیا و جەزیرە و ئەوەی پێوەندیی بە کوردەوە هەیە.(2) کە ئەوە بەهیچ شێوەیەك لە پەڕتووکەکەی ئەستەخری نابینرێت.

یەکێك لە لێکۆڵڤانەکان دەڵێت: پێکچوونێکی گەورە و بەهێز لە نێوان هەردوو پەڕتووکەکەدا هەیە، کە ئیبن حوقەل پەڕتووکەکەی خۆی لەبەر پەڕتووکی مەسالك و مەمالیکی ئەستەخری گرتووەتەوە،(3) سەرەڕای ئەوەش گرینگی زیاتری لە پەڕتووکەکەی ئیبن حوقەل هەیە، ئەویش ئەو سەرنج و تێبینی و خستنەسەرانەیە کە خاوەنی لەبەرگرەوەکە لە سەدەی شەشەمی کۆچی بۆی داڕشتۆتەوە، هەروەها نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێت کە ئیبن حوقەل زۆر گەشت و گەڕانی کردووە زیاتر لە ئەستەرخی، کە نازانین سنووری گەشتەکانی چەند بووە، بەڵام هەرچەند پێی گەیشتبێت، ناگاتە کەمترینی ئەوانەی ئیبن حوقەل پێی گەیشتووە.(4)

سەبارەت بە پێگەی کورد لەو پەڕتووکە، تیبینی ئەوە دەکرێت کە گەیشتۆتە ئاستێك هەتا ئێستە هیچ پەڕتووکێکی دیکەی وڵاتناسی پێی نەگەیشتووە، کە بیست و یەك جار بێژەی کورد لە پەڕتووکەکەیدا هاتووە،(5)

ئەمە سەرەڕای ئەوەی باسی ژمارەیەك لە خێڵ و تیرەی کورد دەکات، ئەمەش بە دڵنیاییەوە گرینگی ئەو پەڕتووکە بەدیار دەخات سەبارەت بە مێژوو و جوگرافیای کورد، لە کەسانی هاوشانی خۆی.

بەڵام سەبارەت بە ساڵی مردنی ئیبن حوقەل تەنیا حاجی خەلیفە ئەو ساڵە دیاری دەکات کە ساڵی (٣٥٠ك/٩٦١ز)یە،(6) بەڵام لەمەدا هەڵەی کردووە، چونکە ئیبن حوقەل خۆی ئاماژە بە داگیرکردنی حەلەب لە لایەن ڕۆمەکانەوە دەکات لەسەردەمی

---

١ -ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٦٨-٣١٥.

٢ - االمصادر نفسة، ل١٩٥-٢٠٣-ل٣٠٨-٣١٥.

٣ -ابرهيم شوكت، الجغرافية العربية حتى نهاية القرن العاشر الاميلادي، ل١٢٨.

٤ -المرجع السابق.

٥ -ينظر اللفحات، ١٩٥، ٢٤٠، ٢٦٩، ٢٨٣، ٢٨٩، ٢٩١، ٣٠٧، ٣١٤، ٣١٥، ٣٧٠، ٣٧٧.

٦ -كشف الظنون، ج٢، ل١٦٦٤.

حەمدانییەکاندا، کە لە پەڕتووکی شێوەی زەویدا ئیبن حوقەل باسی ئەو رووداوە دەکات کە دەلێ (رۆم هاتنە شاری حەلەب لە ساڵی سێ سەدو حەفتاو پێنج)([1]) ئەوەش دڵنیامان دەکاتەوە کە ئیبن حوقەل دوای ئەو ساڵە مردووە.

## – مەسعودی (لەدایکبوون:٣٤٦ك/٩٥٢ز)

ناوی عەلی کوڕی حسێن کوڕی عەلی مەعروف ئەلمەسعودی ناسراو بە ئەبی حەسن بووە([2]) رەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ یارانی مەزن عەبدولای کوڕی مەسعود و لە بەغدا لە دایکبووە و لەوێ گەورە بووە.([3]) هەروەها خۆشی ئەوە رادەگەیەنێت و دەڵێت:(ناوەڕاستی هەرێمەکان هەرێمی بابل شوێنی لەدایکبوونمانە کە ناخۆشترین رۆژبووە، کە لێکی جیا کردینەوە.([4]) دواتر دەڵێت: (شاری سەلام چاکترین و باشترین شوێنی ئەو هەرێمە بوو، کە رۆژگار دایبڕیم و لەو سەردەمەی جیاکردمەوە.([5]) کەواتە ئەوەی ئیبن ئەلنەدیم([6]) باسی دەکات کە خەڵکی مەغریبە راست نییە، بەڵام مێژووی لەدایکبوونی نادیارە.

مەسعودی بە گەشتە زۆر و فرەوانەکانی بەناوبانگە و تێپەڕی جیهانی ئیسلامی کردووە و گەیشتۆتە وڵاتانی دیکەی وەکو هیندستان و چین و هی دیکە، کە چارەگە سەدەیەکی تەمەنی لە گەشتدا بەسەر بردووە،([7]) زۆر میرنشینی جۆراوجۆری بڕیوە و لە کاروباری زۆر میللەت و نەتەوەی کۆڵیوەتەوە کە پێیدا تێپەڕ بووە، کە لەو بارەیەوە زەحمەتی و ئەزیەتی زۆری لەو پێناوەدا بینیوە.

---

١ -صورة الارض، ل١٦٣.

٢ -ينظر: الكتيبي، فوات الوفيات، تحقيق احسان عباس، (بيروت، ١٩٧٤)ج٣، ل١٢-١٣، ياقوت، معجم الادباء، ج١٣، ل٩٠، السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، (القاهرة:د/ت)ج٢، ل٣٠٧.

٣ -ياقوت، معجم الادباء، ج٣، ل٩.

٤ -مروج الذهب، ج٢، ل١٨٤.

٥ -االمصادر نفسة، ج٢، ل١٨٥.

٦ -الفهرست، ل١٥٤.

٧ - علي حسين الخربوطلي المسعودي، (القاهرة، ١٩٨٠)ل٤٨.

مەسعودی سەرەتای گەشتەکانی لە ساڵی (٣٠٥ك/٩١٧ز) دەست پێکردووە، کە گەشتی بۆ فارس و کرمان کردووە، دواتر لە ئەستەخر گیرساوەتەوە، دوایی لە ساڵی (٣١٠ك/٩٢٢ز) لە گەشتەکەیدا گەیشتۆتە هیندستان و، دواتر رووی کردۆتە سەرندیب (دورگەی سیلان) لەویشەوە بۆ دەریای چین و دواتر بۆ دەریای هیندستانی هەتا مەدەغشقەر و عومان، لە ساڵی (٣١٤ك/٩٢٦ز) دەستی بە گەشتی دووەم کردووە لە ساڵی (٣٣٢ك/٩٤٢ز)([1]) کە چۆتە ئازەربایجان و جرجان و لەوێشەوە بۆ شام و فەلەستین.

مەسعودی ئاماژە بە زۆرێك لە گەشتەکانی دەکات و داوای لێبووردن لە هەر کەموکورتیەك دەکات کە لە قسەکانیدا هەیە (ئێمە داوای لێبوردن لەو کەموکورتیانە دەکەین ئەگەر هەبێت، یان نەمانزانیبێ و لێی بێ ئاگابووبین، یان هەڵەیەك کە بە ئەندێشەماندا هاتبێ و بەسەرماندا تێپەڕ بووبێت لەو بیابانەی بڕیومانە، لە گەشتەکانماندا جارێك بەسەر دەریا و جارێك بەسەر دەشتاییەکاندا لە بەکارهێنانی ئەو شتە جوانانەی میللەتان کە بینومانە، شارەزابووین لە تایبەتمەندی هەرێمەکان بەهۆی بینینی ئەو شتانەی هەبوون، وڵاتی سەند و چین و زەنجمان بڕی، بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایدا تێپەڕ بووین، جارێك بە خوراسان و جارێك بە ناوەڕاستی ئەرمینیا و ئازەربایجان و بەلقان و جارێك بە عێراق و جارێکی دیکە بە شامدا تێپەڕ بووین، لە ئاسۆدا ڕۆژی ئاسۆییمان بینی، وەکو هەندێك دەڵێن: لەو وڵاتانە سووڕاینەوە، جارێك بە ڕۆژهەڵاتی دوور و جارێك بە ڕۆژئاوایەوە، وەکو سوارچاکێك لەگەڵ گزنگی ڕۆژ تێپەڕ ببێت و بە هەموو ئەو وڵاتانەدا بسووڕێتەوە).([2])

ئەوەی شایەنی گوتنە خۆشەویستی بۆ زانست و زانیاری وپێداچوونەوە تاکە شت بووە پاڵی بە مەسعودییەوە ناوە بۆ ئەوەی ئەو گەشتە زۆرانە ئەنجام بدات، سەر لە وڵاتان بدات بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایی و بەدوای راستییە جوگرافی و مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکانیدا بگەڕێت و لێیان دڵنیا بێت، بۆیە مینۆرسکی بەو شێوەیە باسی دەکات کە (نموونەیەکی دەگمەن بووە لەو بەهرەیەی هەیبووە لە رەگەزەکەی خۆیدا، لەو

---

١ -احمد رمضان احمد، الرحلة والرحالَة المسلمون، ل١٠٢، ملطفى الشهابي، الجغرافيون العرب، ل٥٠.

٢ -موج الذهب، ج١، ل١٠.

روانگەیەی کە خۆشەویستییەکی زۆری بۆ زانست و گەشتکردن هەبووە و خاوەن سەرنجێکی تایبەت بووە).([1])

بەڵام سەبارەت بە نووسینەکانی لەوەی کە مەسعودی کۆی کردوونەتەوە لەو زانیارییە رۆشنبیرییە گشتیانە، بە شتێکی دەگمەن دادەنرێت، هیچ کەسێك پێش ئەو ئەوەی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پەڕتووکێکی تایبەتی لەبارەی جوگرافیا نەنووسیوە، بگرە ئەوەی لەو پەڕتووکانەی بەدەست ئێمە گەیشتووە تێکەڵییەکە لە نێوان مێژوو و جوگرافیا و کۆمەڵزانی، بەڵام لە رووی جوگرافیاوە باسی ئەو وڵاتانە دەکات کە سەردانی کردووە و بە شێوەیەکی زۆر ورد و گشتگیر لەسەر بنەمای بینین و ئەزموونەکانی شتەکانی داڕشتووە.

بە راستی مەسعودی هیچ کات (زانایەك نەبووە لەبارەی سروشتزانی یان جوگرافیا، بگرە مێژوونووسێکی گەورە بووە، نووسینەکانی بابەتی زانیاری جوگرافی و زەوی ناسی (جیۆلۆجی) گرانبەهای لەخۆ گرتووە، مەسعودی لە قۆناخی سەرهەڵدانی هزری ئیسلامی ژیاوە، بۆیە بیروراکانی رەنگدانەوەی هزر و بیری زانایانی ئەو سەردەمە بووە).([2])

کۆی پەڕتووکەکانی کە لە پێشەکی هەندێك لە پەڕتووکەکانی باسی کردووە،([3]) سی و چوار پەڕتووکە لە دەیان بەرگ و بەشدا، بەڵام رۆژگار وای کردووە تەنیا دوویان بمێنێتەوە، ئەوانەش: مەرجانی زێڕ و کانزای گەوهەر (مروج الذهب ومعادن الجوهر) لەگەڵ ئاگەدارکردنەوە و سەرپەرشتی کردن (التنبیه والاشراف).

مەسعودی پەڕتووکی یەکەمی لە ساڵی (٣٣٢ك/٩٤٢ز) یان ساڵی (٣٣٦ك/٩٤٧ز)([4]) نووسیوە، ئەو پەڕتووکە لە کاتی خۆیدا بیست بەرگی گران و سەنگین بووە، بەڵام تەنیا چەند بەشێکی ماوەتەوە،([5])لە پێشەکییەکەیدا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو توانیویەتی لە پەڕتووکی (اخبار الزمان) و کورتەی پەڕتووکی

---

١ -لاجغرافیون والرحالَة المسلمون، ل١٣.

٢ -مجلة رسالة الخلیج العربي، الریاض، العدد الثاني عشر، السنة الرابعة، ١٩٨٤، ل١٨٩-١٩٠.

٣ - ینظر: مروج الذهب، ج١، ل١١-١٢. التنبیه والاشراف، ل١٧-٢٢.

٤ -مروج الذهب، ج٢ -ل٦٣.

٥ -شاكر خصباك، كتابات مضیئة في التراث الجغرافي العربي، (بغداد، ١٩٧٩) ل٤٩.

(الاوسگ)[1] کۆی شتەکان بگەیەنیّ، ئەوەی گومانی تێدا نییە پەڕتووکەکە لە دووتۆی خۆیدا کورتەیەکی تەواوی لەبارەی زانیاری زانستی لەسەردەمی خۆیدا گرتۆتە خۆی.([2])

کۆمەڵێك زانیاری جوگرافی گرینگی داوەتە دەست، کە پێکهاتووە لە دوو بەش، بەشی یەکەم: بە کورتی باسی دروستبوونی چیرۆکی پێغەمبەران دەکات، دواتر باسی زەوی و دەریا و شتە سەیر و سەمەرکان و مێژووی نەتەوە دێرینەکان و ئۆل و داب و نەریت و و شتی دیکە دەکات، واتە ئەو بەشەیە کە تێیدا زانیاری گرینگی لەبارەی جوگرافیاوە لەخۆ گرتووە.

بەڵام بەشی دووەم: مێژووی ئیسلامی لەخۆ دەگرێت هەر لە کۆتایی سەدەی خەلیفەکانی راشیدین و هەتا دەسپێکی خەلافەتی موتیعەللای عەباسی.

بەڵام پەڕتووکی (التنبیه والاشراف) (ئاگەدارکردنەوە و سەرپەرشتی کردن) کە پێش ساڵێك لە کۆچکردنی نووسیویەتی،[3] کە مەسعودی لەبارەی خودی خۆیەوە لە پێشەکی ئەو پەڕتووکەدا گوتویەتی: (پێمان باشبوو ئەوە بە کورتکراوەی پەڕتووکی حەوتەم ناوزەد بکەین و ناوی بنێین پەڕتووکی (التنبه والاشراف) کە رۆشنابییەکە لەبارەی گەردوون و پێکهاتەکەیی و هەسارەکان و کاریگەرییەکانی و رەگەز و پێکهاتەکانی و چۆنییەتی کارلێکردنیان، هەروەها ئاماژە کردن بە زانیاری دابەشکردنی سات و کاتی وەرزەکانی ساڵ و، بۆ هەر وەرزێکیش سەرەتای داکشان و هەڵکشانی دیاری کردووە، با و ئاراستەکان و کارلێکردن و کاریگەرییەکانی و زەوی و شێوەکەیی و ئەوەی لەبارەی پانتایی و لایەنەکانی ئاوەدانی و چۆلەوانی گوتراوە و ئەوەی زاڵە بەسەریدا.[4] وەکو تێبینی دەکرێت سروشتی جوگرافیا بە شێوەیەکی بەرچاو زاڵە بەسەر ئەو پەڕتووکەدا.

بەڵام پەڕتووکی (اخبار الزمان ومن ابادە الحدپان، وعجائب البلدان والغامر بالماو والعمران) کە ئەویش ناسراوە بە (الجمان فی مختصر اخبار الزمان) بە ناودارترین

---

١ -المرجع نفسة واللفحة.

٢ - مروج الذهب، ج١، ل١٠.

٣ - محمد رجائي ريان، علم التاريخ عند المسلمين وتطوره في القرن الرابع الهجري، مجلة دراسات تاريخية، (جامعة دمشق، ١٩٨٩) العددان٣٣و ٣٤، ل٩٢.

٤ - التنبيه والاشراف، ل٢٠.

پەڕتووکەکانی مەسعودی دادەنرێت لەبارەی جوگرافیا و مێژووەوە،[1] کە ئەوەش خۆی لە سی بەرگدا دەبینێتەوە،[2] بەڵام هیچیان نەدۆزراونەتەوە.

بەڵام بە روانین بۆ بوونی زانیاری جوگرافی زۆر و زەبەند لە پەڕتووکەکانی مەسعودی و گرینگی ئەو بابەتانە، کراچکۆفسکی ئاماژەی پێ دەکات و دەڵێت: (لە لووتکەی زانیاری جوگرافی سەردەمەکەیدایە، هەموو کات بەدوای بەدەستهێنانی نوێترین زانیاری بووە لەبارەی ئەو وڵاتانەی بە خودی خۆی سەردانی نەکردووە).[3] بەڵام لە لایەکی دیکەوە کراچکۆفسکی خۆی رەخنەی لێدەگرێت لە لایەنی میتۆدییەوە لە رووی بەش بەشکردنەوە (کە ناگاتە ئاستی پێویست)[4] بە پێی بۆچوونی خۆی، بەڵام لە رووی شێوازی نووسیندا پشتی بە خستنەڕووی ئەدەبی بەستووە، دواتر ئەو زۆر بە کەمی ئاماژەی بەو سەرچاوانە کردووە کە پشتی پێ بەستوون.[5]

بەڵام مینۆرسکی، مەسعودی بە شێوەیەکی جیاواز دەبینێ لەو وڵاتناسانەی کە باسی هەموو شارێك دەکەن یان ماوەی دووریان بە خەملاندن حساب دەکەن، هەروەها شێوازەکەی بە چۆنییەتی نووسینیەوە دەچوێنێ (وەکو پەیامنێرێکی گەورەی ئەو سەردەمە، هەموو ئەو شتانە کێش دەکات کە نامۆیە، هەموو ئەو شتانە باس دەکات کە لەبەر چاوی ئەو روودەدات، هیچ کاتێك هەلی پرسیارکردن لەو کەسە پایە بەرزانە لەدەست نادات، یان ئەو کەسانەی سەردانی کردوون و ئەوانەی قسەیان هەبووە و رەخنەیان لەبارەی هەر شارێك هەبووە.[6] بۆ نموونە دەبینین مەسعودی لە دووتۆی گێڕانەوە و ئاماژە مێژووییەکانی باسی ئەو میرانە دەکات کە سەردانی کردوون. لە هەمان کاتیشدا گفتوگۆی هەموو ئەو پرسە جوگرافیانە دەکات کە لە پەڕتووکی وڵاتناسانی پێش خۆیدا هاتووە، بەبێ ئەوەی خۆی پابەند بکات بە میتۆدێکی تایبەتەوە.[7]

---

١ -احمد سوسة، الشريف الادريسي، ج١، ل١٨٧.

٢ - تاريخ الادب الجغرافي، ج١، ل١٨٣

٣ -رجائي ريان، المصادر نفسه، ل٩٢-٩٣.

٤ -المرجع نفسة، ل١٨٣.

٥ -المرجع نفسة، ل١٨٣.

٦ -الجغرافيون والرحالة المسلمون، ل١٣.

٧ -جمال الفندي، الجغرافيا عند المسلمين، ل٤٠.

مەسعودی ئەوەش بەدیار دەخات کە خۆی سوودێکی زۆری لە پەڕتووکەکانی وڵاتناسانی پێش خۆی وەرگرتووە وەکو بەلازری و ئیبن خوردازەبە و[1] قودامەی کوڕی جەعفەر.[2]

دۆمیلی رۆژهەڵاتناس گەواهی ئەوەدەدات و بە شێوەیەك باسی دەکات کە ( شایەنی ئەوەیە بە گەورەترین جوگرافیناسی سەدەی دەیەمی زاینی ناودێر بکرێت).[3]

بەڵام سەبارەت بە پشکی کورد لە پەڕتووکەکانی (مروج الزهب والتنبیه والاشراف) ئەوا بێژەی کورد زیاتر لە بیست جار هاتووە،[4] ئەمە سەرەڕای ئاماژەدان بە زیاتر لە حەڤدە خێڵی کورد،[5] ئەو ئاماژانەش لێرەوە هاتووە لە دووتۆی پێشکێشکردنی بابتەکەکانی تایبەت بە بنەچەی کورد و شوێن و جێگە و نیشتمان و ئاینزاکەیانەوە.[6]

سەبارەت بە مردنیشی ئەوا سەرچاوەکان دوو بەروارمان بۆ دەستنیشان دەکەن، یەکەم ساڵی مردنی ساڵی (٣٤٥ك/٩٦٥ز) و دووەم ساڵی (٣٤٦ك/٩٥٧ز)یە.[7]

## – ئەبو دەلف موسەعەر کوڕی موهەلهەل (لە دایکبوون: دوای ٣٨٤ك/٩٩٤ز)

ئەگەر هەندێ زانیاری مێژووییمان لەبارەی وڵاتناسانەوە بە شێوەیەکی گشتی وەرگرتبێ، ئەوا زۆرترین زانیاری لەبارەی ژیانی گەڕیدە ئەبی دەلف موسەعەری کوڕی موهەلهەلی خەزرەجی یەنبەعییە، بەڵام رەچەڵەکی (یەنبەعی) و( خەزرەجی) ئەوا جەخت لەوە دەکاتەوە کە بنەچەی دەگەڕێتەوە بۆ بەندەرێك سەرچاوەکەی دەکەوێتە سەر دەریای سوور، گەڕانەوەیشی بۆ خێڵی خەزرەج، نیشتەجێبوونی بووە لەو شارەدا.

---

١ -مروج الذهب، ج١، ل١٤.

٢ -االمصادر نفسة، ل١٦.

٣ - العلم عند العرب، ل٢٢٥.

٤ -ینظر: مروج الذهب، ج٢، ل١٣٣-١٣٥، التنبیه والاشراف، ل٧٨-٧٩.

٥ -مروج الذهب، ج٢، ل١٣٥، التنبیه والاشراف، ل٧٩.

٦ -االمصادر نفسة والفحة.

٧ -یاقوت، معجم الادباء، ج١٣، ل٩٠، السبكي، المصادر نفسه، ج٢، ل٣٠٧.

بەرواری لە دایکبوونی ئەبو دەلف و هەروەها مردنیشی نادیارە بە شێوەیەکی دیاری کراو، بەڵام یەکێك لە لێکۆڵەڤانەکان[1] کە لە دەقێکدا ئەو ئەنجامەی دەست کەوتووە کە سەعالیبی خستویەتیە روو،[2] کە تێیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەبی دەلف تەمەنی لە نەوت ساڵ تێپەڕی کردووە، لەبەرئەوەی لە ساڵی (٢٩٢ك/٩٠٣ز) لە دایکبووە، هەروەها لە دوای ساڵی (٣٨٤ك/٩٩٤ز) مردووە، ئەو ساڵەی کە سەعالیبی لە نووسینی پەڕتووکی (اليتيمه) بووەتەوە.

ئەبو دەلف لە خزمەت سامانییەکاندا بووە لەسەردەمی ئەمیر نەسەری دووەم کوڕی ئەحمەد سامانی، لە پێش هەموویانەوە بوخاری (٣٠١-٣٣١ك/٩١٤-٩٤٢ز) ئەوە هەر ئەو ئەمیرە بوو کە ئیبن فەزلان لەسەردەمی ئەودا گەشتی بۆ وڵاتی بولغار کردووە، لە ساڵی (٣٣١ك/٩٤٢ز) وەفدێکی چینی سەردانی وڵاتی سامانی کردووە، ئەبو دەلفیش ئەو هەلەی قۆستۆتەوە و یاوەری ئەو وەفدەی کردووە لە گەڕانەوەیان بۆ چین، کە بە وڵاتی تورکستان و تبتدا تێپەڕ بووە، دواتر گەیشتۆتە چین و لەوێشەوە بەرەو هیندستان و دواتر گەڕاوەتەوە بۆ دار ئەلئیسلام لە رێگەی سجستانەوە، لەویش لە خزمەت وەزیری بوەیهی و ئەدیبی بەناوبانگ ئیسماعیل کوڕی عیباد(لەدایکبوون:٣٨٥ك/٩٥٥ز) ماوەتەوە، کە لەوێدا هۆنراوە بە پێزەکەی داناوە کە ناسراوە بە هۆنراوەی ساسانی.[3] کە پێشکێش بە وەزیری کردووە و، زۆر پێی سەرسام بووە.[4]

وەکو باس دەکرێ ئەبو دەلف ئەو سەرنج و شتانەی بینیویەتی لەو گەشتەی کە بۆ چینی ئەنجامداوە لە نامەی یەکەمیدا باسی کردووە، لەماوەی نێوان (٣٣١-٣٤١ك/٩٤٢-٩٥٢ز) سەردانی زۆر شوێنی جیاجیای کردووە لە ئازەربایجان و ئەرمینیا و

---

١ -جمال الفندي، الجغرافيا عند المسلمين، ل٤٠.

٢ -مروج الذهب، ج١، ل١٤.

٣ - هۆنراوەی ساسانی، کە لە پلان و فێل و تەڵەکەبازی و زیرەکی دەدوێت، ئەو کەسانەی لەو رێگەیەوە دەستیان بەسەر ماڵی خەڵکیدا دەگرت لەو سەردەمەدا، ناوی ساسانیان بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو، ئەمەش بەڵگەیەك بوو بۆ بەرزی پێگەکەیان و گەورەییان؟ ينظر: الثعالبي، يتيمة الدهر، ج٣، ل٣٥٧. كراتشكوفسكى، المصادر نفسه، ج١، ل١٨٨.

٤ - كراتشكوفسكي، المصادر نفسه نج١، ل١٨٨. احمد سوسة، الشريف الادريس، ج١، ل١٨٤. حسام الدين النقشبندي، الرسالَة الثانية، ل٢١١.

ئێران و شارەزوور، ئەوەشی لە نامەی دووەم باس کردووە، یەکێك لە لێکۆڵڤانەکان[1] لە قسەکانی ئەبی دەلف لەبارەت رووداوەکان دەڵێت و باسی ئەوە دەکات کە لە شارەزوور لە ساڵی **٣٤١**ی کۆچی ماوەتەوە، نووسینی نامەی دووەمی دوای ئەو بەرواره بووە.

لەو شتانەی کە ئیبن نەدیم[2] باسی کردووە ئەوە بەدیار دەکەوێت کە ئەبا دەلفی بینیوەو، هەندێ زانیاری لێوەرگرتووەو بە گەڕیدەی پەسن کردووە. هەروەها یاقوت و قەزوینیش کە بەشێك لە نووسینەکانی ئەبی دەلفیان لەبەر کردووە، کە یاقووت لە فەرهەنگی ولاتناسییەکەیدا سی و چوار بابەتی لێ هەڵهێنجاوە، قەزوینیش لە پەرتووکی (اپار البلاد) بیست و چوار بابەتی لێ هەڵێنجاوە،[3] هەروەکو قەزوینی بە شێوەیەك باسی ئەبا دەلف دەکات کە گەڕیدەیەکە زۆربەی ولاتانی دنیا گەڕاوە.([4])

گەڕانەکانی ئەبی دەلف روو بەڕووی زۆر گومان و تاونبارکردن بۆتەوە سەبارەت بەوە تا چەند زانیارییەکانی راستن کە ئەبا دەلف کۆی کردونەتەوە، بە تایبەتی لە نامەی یەکەم و ئەوەی پێوەندیی بە گێڕانەوەو سەرنجەکانی سەبارەت بە چین هەیەتی.([5])

بەڵام کراچکۆفسکی ئەو جۆرە تاوانبارکردنانە رەتدەکاتەوە.([6])

ئەو زانیارییانەی ئەبو دەلف لەو گەشت و گەڕانانەی کۆی کردوونەتەوە دوای ماوەیەك لە بەسەرچوونی رۆژگار بووە، واتە ئەو زانیارییانە راستەوخۆ دوای گەشتەکانی یان لە کاتی گەشتەکانیدا نەبووە، ئەوەش رەنگدانەوەی هەبووە بەسەر چۆنییەتی نووسینەوەو خستنەڕووی بابتەکان و گێڕانەوەی بەسەرهاتەکان لە (نامەی دووەمدا) کە جۆرە نارێکیەك لە رێکخستنی بابەتەکان هەیە لە رووی کات و زەمەنەوە لە چۆنییەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ بابەت و رووداوەکاندا.

---

١ - حسام الدين النقشبندي، الرسالَة الثانية، ل٢١٠.

٢ -الرسالَة الثانية، عنى بنشرها وترجمتها وتعليقها، بطرس بوغاكوف، و انس خادوف، لدرت عن اكاديمية العلوم للاتحاد السوفيتى دار النشر للاداب الشرقية، (موسكو، ١٩٦٠)

٣ -احمد سوسة، الشريف الادريسي، ج١، ل١٨٥.

٤ -اثار البلاد واخبار العباد، ل١٤١.

٤- hudud al alam.p.225

٥-تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١، ل١٨٩.

٦-الرسالة الثانية، ل٧-١٣، النقشبندي، الرسالَة الثانية، ل٢١٤.

ئەبو دەلف گەشتەکەی لە شاری شیزەوە دەست پێکردووە کە دەکەوێتە باشووری ئازەربایجان، لەوێشەوە بەئاڕاستەی باکوور بەرەو وڵاتی ران و دواتر بەرەو باشوور گەڕاوەتەوە بۆ ناوچەی تەرم کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی رووباری سفیدرود و باشووری ڕۆژئاوای دەریای خەزەر (قەزوین)، دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ئازەربایجان و لەوێشەوە بەرەو کەناراوەکانی دەریای قەزوین هەتا دەگاتە ناوچەی موقان و لەوێشەوە بەرەو باکوور هەتا دەگاتە شاری باکۆ کە دەکەوێتە ئازربایجان، دواتر بە ئاڕاستەی باکووری ڕۆژئاوا هەتا دەگاتە شاری تفلیس و دواتر دەگەڕێتەوە بۆ شاری ئەردەبیل، دواتر بە ئاڕاستەی باکوور هەنگاو دەنێت تا دەگاتە دەشتی بلاشجان کە دەکەوێتە کەرتی باشووری رووباری رەس.([1])

دواتر قسە لەبارەی شاری ئورمیە و دەریاچەکەی دەکات، دواتر باسی شارەکان و شوورە و هەواڵی مێژوویی شارەزوور دەکات، دواتر باسی شاری خانەقین و قەسری شیرین و حەلوان و قەڵای مەرج دەکات.([2]) لە گەشتەکەی بەردەوام دەبێت بەئاڕاستەی باشووری ڕۆژهەڵات تا دەگاتە لووڕستان و باسی هەندێك لە شارەکانی دەکات، دواتر بەرەو باکوور دەڕوات هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان، لەوێش باسی ئەو شارانە دەکات کە سەردانی کردوون،([3]) دواتر باسی شاری توبرستان و خەوارزم دەکات و، لەوێوەش دەڕوات بەرەو خۆزستان، کە تێیدا باسی هەندێك لە شارو رووبارەکانی دەکات، بەوەش ئەبو دەلف کۆتایی بە نامەی دووەمی دەهێنێت.([4])

بەڵام شێوازی داڕشتن و نووسینی نامەکەی زۆر بە شەوق و بە زەوقە، لەبەرئەوەی ئەبو دەلف کەسێکی هەم شاعیر و هەم ئەدیبیش بووە، وەکو ئەوەی سەعالیبی جەختی لێدەکاتەوە.([5]) بەڵام لە نەریتی ئەدەبی جوگرافی باو دەرنەچووە لەسەردەمەکەی خۆیدا، بە تایبەتی لە پەسنکردنی شار و ئەو شوێن و پێگانەی لێی وەستاوە و بینیویەتی.([6]) بگرە زۆر وردبینتر بووە لە کەسانی دیکە.

---

١ - الرسالَة الثانية، ل٧-١٣. النقشبندی، الرسالة الثانية، ل٢١٤.

٢ - الرسالَة الثانية، ل١٣-٢١.

٣ - االمصادر نفسة، ل٢٢-٣٤.

٤ -االمصادر نفسة، ل٣٤-٤٥.النقشبندي، الرسالَة الثانية، ل٢١٤.

٥ - يتيمة الدهر، ج٣، ل؟

٦ - النقشبندي، الرسالة الثانية، ل٢١٥.

لەو نووسینانەی ئەبو دەلف نووسیویەتی ئەوە دەستگیر دەبێت کە لە چەندین بواری زانستی گرینگ کاری کردووە وەکو ئەچزاخانەیی و کیمیا و[1] هەندێ زانستی دیکە، بە شێوەیەك زۆر جەختی لە باسکردنی هەندێ کانزا و رووەك و بەکارهێنانەکەی کردووەتەوە، هەروەها ئاماژە بە دەیان شوێن و جێگە دەکات کە ئەو جۆرە کانزا و رووەکانەی تێدایە.[2]

بەڵام نامەی دووەم، سەرەڕای ئەوەی قەبارەی بچووکە، بەڵام گرینگییەکی زۆری هەیە لە رووی مێژوویی و جوگرافی بە تایبەتی ئەوەی پێوەندیی بە بابەتی لێکۆڵینەوەکەمانەوە هەیە، کە هەر تەنیا ئەبو دەلف باسی هەواڵی هەندێ شاری کوردیمان بۆ دەکات و، هەروەها ئاماژە بە رووە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی و ئاینەکانی دەکات، یان بە لایەنی کەمییەوە پێش هەموویان کەوتووە.[3]

ئەبو دەلف بێژەی کوردی پێنج جار بەکارهێناوە،[4] هەروەها باسی پێنج تیرەی کوردیشی کردووە.[5]

## – نووسەرێکی ون (خاوەنی پەڕتووکی "سنووری جیهان")

ئەو پەڕتووکە لە ناوچەیەك نووسراوە کە ئێستە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی ئەفگانستان لە ساڵی (٣٧٢ك/٩٨٢ز) کە بە زمانی فارسی نووسراوە لە لایەن کەسێك هەتا ئێستە ناوی بزرە، بۆ میری ناحیەی کزکان یان کزکانان (جزجان)ی نووسیوە،[6] (کە سەر بە خێزانێکی بچووکی دەسەڵاتداری بنەماڵەی فریگۆن بووە).[7] کە ئەو پەڕتووکەیان

---

١ -الرسالة الثانية، ل٦، عزيز الله بيات، المصادر نفسة، ل٣٣٧.

٢ -ينظر على سبيل المثال: اللفحات: ٦، ٧، ١٠، ١١، ١٢، ١٤ن١٧، ١٩، ٢٣، ٣٨.

٣ -ينظر لفحات: ١٣، ١٤، ١٨، ١٩، ٢٠، ٢٥.

٤ -االمصادر نفس اللفحات: ١٤، ١٨، ١٩، ٢٥.

٥ -االمصادر نفسة، ل١٨، ينظر كذلك: القلل الرابع من هذه الدراسة.

٦ -ذبيح الله لفا، تاريخ ادبيات ايران (تهران:١٣٧٨ك) مجلد١، ل١٥٣-١٥٤.

٧ - بنەماڵەی فریغۆن: لە سەدەی چوارەمی کۆچی وەکو میرێك دەرکەوتوون کە سەر بە سامانیەکانن، ناوەکەشیان دەگەڕێتەوە بۆ پیاوێکی ئەفسانەیی بەناوی فەرەیدون، یان ئەفریدون، رەنگە بۆ فریغیش بگەڕێتەوە کە حوکمی خوارزمیان کردووە پێش ئیسلام، ذبیح الله لفاالمصادر نفسة، ل١٥٤.

پێشکێش بە حاکمی خۆیان کردووە کە ناوی ئەبو حارس محەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی فریگۆن بووە و هاوسەردەمی میر ئەبی قاسم نوح کوڕی مەنسووری سامانی بووە.

وەکو دیارە ئەو نووسەرە گەڕیدە نەبووە، بگرە ئەو شتانەی لە کەسانی دیکەی وڵاتناس و گەڕیدەی وەکو ئیبن خوردازەبە([1])و جەیهانی و ئەستەخری وەرگرتووە،([2]) ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئاماژە بە وەرگرتنەکانی ناکات لە پەڕتووکەکەیدا، تەنیا ئاماژەی بە بەتلیمۆس کردووە. هەروەها سیستەمی پەڕتووکی بەتلیمۆسی بە گشتی پەیڕە و کردووە، تەنیا کۆکردنەوەی زانیارییەکان ئەوەی تایبەتە بە هیڵکاری پانی و درێژی نەبێت.([3])

لەو بارەیەوە بارتۆلد باسی بنەمای ئەو پێوەندییە ئەدەبییە دەکات لە نێوان ئەو پەڕتووکە و پەڕتووکە ونبووەکەی جەیهانی،([4]) لە هەمان کاتدا مینۆرسکی گومانی لەوە نییە کە ئەو پەڕتووکە هەڵگری هەمان سروشتی ئەو کەسەیە لە رووی کۆکردنەوە و لێوەرگرتن لە پەڕتووکی باسکراو دا.([5])

لە هەمان کاتدا بارتۆلد جەخت لەوە دەکاتەوە کە کەردیزی([6]) ئەو مێژوونووسەی پەڕتووکی (زین الاخبار)ی بە فارسی نووسیوە ، کە پێوەندیی بە جوگرافیاوە هەیە پشتی بە پەڕتووکی (حدود العالم) بەستووە، کە مینۆرسکی بە (مناگق العالم) ناوی دەبات کە ئەوە زۆر لێیەوە نێزیکە و وردترە).

---

١ -ذبیح الله لفا، مرجع السابق، ل١٥٤.

٢ - کراتشکۆفسکي، المصادر نفسه، ق١، ل٢٢٣.

٣ - جمال الفندي، الجغرافیا عند المسلمین، ل٣٩-ل١٢٤.

٤ - جهود العلماء العرب المسلمین في علم الجغرافیا، تقویم کتاب حدود العالم، ترجمة و تعلیق: عبدالجبار ناجي، (بغداد ٢٠٠٠) ل٣٩-٤١.

٥ -الجغرافیون والرحالة المسلمون، ل١٥.

٦ -کەردیزی: ناوی ئەبو سەعید عەبد الحی کوڕی کەردیزی بووە، ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ ناحیەی کەردیز کە دەکەوێتە باشووری غەزنەی سەر رێگەی هیند، زانیاری مێژوویی سەبارەت بەوە کەمە، بەلاّم هاوسەردەمی غەزنەوەیەکان بووە، پەڕتووکێکی نووسیوە لە بارەی مێژووەوە بە زمانی فارسی بە ناوی (زین الاخبار) کە پەڕتووکێکی مێژوویی گشتگیرە تێیدا بە کورتی باسی رووداوە مێژووییەکان دەکات هەر لە سەردەمی زووەوە هەتا دەگاتە سەردەمی سولتان مەودود کوڕی مەسعود ئەلغزنەوی (٤٣٢-٤٤٠ك/١٠٤٠-١٠٤٨ز) هەروەها تێیدا باسی داب و نەریتی گەلانیش دەکات، ینظر: ذبیح الله لفا، المصادر نفسه، مجلد١، ل١٦١.

ئەو پەڕتووكە قەبارە بچووكە لەچاو پەڕتووكەكانی دیكەی وڵاتناسان، كە پێكدێت لە شەست و یەك بەش، حەوت بەشی یەكەمی باس لە بابەتە گشتییەكانی شێوەی زەوی و بارودۆخی دانیشتووان و دەریاو رووبارو شتی دیكە دەكات، بەڵام بەشەكانی دیكە هەر یەكە تایبەتە بە ناوچەیەكی دیاری كراو بە شێوەیەكی كورت، ئەوەی تێبینی دەكرێ نووسەر زۆر جەختی لە لایەنی ئابووری كردووەتەوە بە تایبەتی بازرگانی و بەروبوومە كشتوكاڵییەكانی ئەو ناوچانە، هەروەها پەڕتووكەكە هەر تەنیا باسی وڵاتانی ئیسلامی نەكردووە، بگرە هەموو وڵاتانی جیهانی بە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتییەوە گرتووەتەوە، هەروەها دەكرێ بڵێین نووسەر لە باسكردنی وڵاتانی غەیرە ئیسلامی هەڵوەستەی زیاتری كردووە و بە دووردرێژی باسی ئەو وڵاتانەی كردووە زیاتر لە وڵاتناسە موسڵمانەكانی دیكە.

بەڵام سەبارەت بە پشكی كورد لە پەڕتووكی (حدود العالم) سەرەڕای ئەوەی نووسەر باسی وڵات و شار و دیاردەی سروشتی و مرۆیی ئەو ناوچانەی بە كورتی كردووە وەكو هەر وڵاتانێكی دیكە،([1]) بەڵام بێژەی كوردی گۆ نەكردووە تەنیا یەك جار نەبێت كە پێناسەی شاری جەبەل دەكات لە عێراقدا و ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە زۆربەی دانیشتووانەكەی كوردن.([2])

## – مقدەسی (لەدایكبوون: ٣٩٠ك/١٠٠٠ز)

ناوی شەمسەدین محەمەد كوڕی ئەبی بەكری بینای مەقدەسی یە، ناسراو بە بەشاری و ڕەچەڵەكی (مەقدەسییە)([3]) ناسناوەكەی دەگەڕێتەوە بۆ بەیت ئەلمقدەس،([4])ئەمە

---

1- hudud al alam.p.73

٤- الجغرافیون والرحالة المسلمون، ل١٥.

٥-مؤلف مجهول، حدود العالم من المشرق الى المغرب، (القاهرة:١٩٩٩)ل١١٧، ل١١٨، ١١٩، ١٠١، ١٠٦، ١٠٧، ل١٠٨.

٣ -مەقدەسی، لە رووی زمانەوانییەوە مەبەستی تایبەتی خۆی هەیە، لێرەدا بە مەبەستی شوێنە پیرۆزەكە (بیت المقدس) بەكارهاتووە.

٤ -ینظر: البغدادي، المصادر نفسه، ج٢، ل٦٢-٦٣، حاجي خلیفة، المصادر نفسه، ج١، ل١٦. كراتشكۆفسكي، ق١، ل٢٠٨.

سەرەڕای ئەو دوو ناسناوە، بە چەندین ناسناو و سیفاتی دیکە بەناوبانگ بووە کە مەقدەسی لە پەڕتووکەکەی خۆیدا ئاماژەی پێ دەکات، کە دەگاتە نێزیکەی سی و شەش ناسناو،([1]) زۆری ناسناوەکەیشی بۆ ئەو ناوچانە دەگەڕێتەوە کە سەردانی کردووە یان ئەو کار و پیشانەی تێدا ئەنجام داوە.

مەقدەسی لە نێوان سالآنی (٣٣٤-٣٣٦ك/٩٤٥-٩٤٧ز) بە پێی زۆری گێڕانەوەکان لە دایکبووە،([2]) بەلآم ئەمە زۆر جێگەی دلّنیایی نییە، بەلآم ئەوە جێگیرکراوە کە پەڕتووکەکەی بەرهەمهێناوە تەمەنی لە چل سالّی تێپەڕی کردووە، ئەویش لە سالّی (٣٧٥ك/٩٨٥ز) بووە،[3] بەمەش لەدایکبوونەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سالّی ٣٣٥ك/٩٤٦ز).

وەکو دیارە لە بەیت ئەلمەقدس لە دایکبووە، لێرەدا ئاماژەیەك هەیە بەوەی کە سەردانی مەکەی کردووە، کاتێ تەمەنی گەیشتووەتە بیست سالّی، رەنگە ئەو گەشتکردنەی لەگەلّ باوکی بووبێت بۆ سەردانیکردنی حەج.([4])

مەقدەسی جەخت لەوە دەکاتەوە کە خۆی لە شام لە دایکبووە وەکو دەلّێت: (قسەمان بە زاراوەی شام دەکرد، چونکە لە هەرێمی شام لەدایکبووم)([5]) دواتر ناوی مامۆستای یەکەمی دێنێت کەناوی قازی ئەبی حوسێن ئەلقەزوینی([6]) بووە، وەکو دەلّێ: (چونکە یەکەم ئیمام بووە وانەی پێگوتووم).([7]) کە وانەی فیقهی پێگوتووم لەسەر مەزهەبی خەلّکی عێراق.([8]) وەکو دەردەکەوێ مەقدەسی هەر لەمندالّیەوە سەردانی بەغدای کردووە و لەسەر دەستی زاناکانی ئەوێ زانستی خوێندووە.

---

١ - احسن التقاسیم، ل٤٩، وینظر للمزید: عدي یوسف مخلل، المقدسي البساري حیاته و منهجه.

٢ - کراتشکوفسکي، المصادر نفسه، ق١، ل٢٠٩.

٣ الاقلیمیة عند العرب، مجلة المجمع العلمي العراقي، (بغداد ١٩٨٩)مج ٤٠، ج١، ل٢٣٨.

4 - ency.of islamK vol.lll.p708 .

٥ - احسن التاقسیم، ل٣٩.

٦ - ئەبو حەسن قەزوینی: ناوی ئەحمەد کوڕی عومەر کوڕی عەباس، ئەبو ئەلحەسن قەزوینی بووە، لە سالّی ٢٤٥ك هاتووەتە بەغدا، ینظر: الخطیب البغدادي، تاریخ بغداد، (بیروت:د/ت) مج٤، ل٢٩١.

٧ - احسن التقاسیم، ل٣٩.

٨ - االمصادر نفسة، ل٤٠.

مەقدەسی بە زۆری گەشتەکانی بەناوبانگە، کە سەرجەم ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی گەڕاوە، تەنیا ئەندەلوس نەبێت کە پێی نەگەیشتووە، هەروەها نەچۆتە ولاتانی غەیرە ئیسلامیش یان ئەوەی پێی دەڵێن (دار الکفر) وەکو دەڵێت (هیچ شتێکمان باس نەکردووە تەنیا ولاتی موسڵمانان نەبێت، ئێمەش لەسەرمان نییە باسی مەملەکەتی گاوران بکەین، چونکە ئێمە نەچووینەتە ئەو ولاتانە و نەشمانبینیوە لە باسکردنیدا سوودێکی هەبێت، بگرە تێیدا باسی موسڵمانانمان کردووە).([1]) مەقدەسی لە دووتۆی گەشتەکانیدا ئەوەی بینیویەتی و ئەوەی گوێی لێ بووە لەو کەسانەی شارەزاییان هەبووە تۆماری کردووە، ئەوەی باوەڕی پێکردووە و دڵنیابووە کە قسەکانیان راستە، بۆیە چاوی بە هەموو چین و توێژ و دەستەیەك کەوتووە بە جیاوازی رەگەز و ئاینزایانەوە.

لە پەڕتووکەکەیشیدا (باشترین دابەشبوون لە زانیاری هەرێمەکان) (احسن التقاسیم فی معرفه الاقالیم) ئەوە دەستگیر دەبێت کە زۆر تووشی چەرمەسەری و ئێش و ئازار بووە لە کاتی گەشت و گەڕانەکانی لە نێوان ولاتان و ناوچە و شارەکاندا، لە هیچ شوێنێك سەقامگیر نەبووە و لەسەر یەك پیشە نەگیرساوەتەوە و چەندان کاری ئەنجام داوە و لەو بارەیەوە دەڵێت : (دواتر هیچ شتێك نەمایەوە کە گەشتەوەران وەری نەگرن، هەتا بەشێکی باشی لە زەوی رووتەڵان و سواربوونی گەورە وەرگرتووە، لە فەقێیاتی و فێرکردنەوە، حاڵی بووە و فێربووە، لەسەر مینبەر وتاری داوە، لەسەر منارەی مزگەوتەکان بانگی داوە، ئیمامەتی لە مزگەوتەکان کردووە، لەگەڵ سوفییەکان هەریسەی خواردووە و لەگەڵ دەوڵەمەندانی خانەقاکان گوزەراندوویەتی، ماوەیەك سەرپەرشتی نقومبوون و رێگرتنی کاروانەکانی کردووە، خزمەتی دادگە و گەورە پیاوانی کردووە، بۆ دەسەلاتداران و وەزیرەکان گوتاری داوە، ماوەیەك رێگەی خراپە و ماوەیەکیش لە بازارەکاندا شتی فرۆشتووە، هەروەها زیندانیش بووە و دەستگیریان کردووە و بەوەی کە سیخوور بووە، بەڕم لێیان داوە و بە چاوچنۆکی تاونباریان کردووە).([2])

---

١ -الملر نفسة، ل٢٣.

٢ -االمصادر نفسة، ل٥٠.

وەكو لە پێشەكی پەڕتووكەكەی مەقدەسیدا تێبینی دەكرێت ئەو توانیویەتی بە شێوەیەك لە گۆڕەپانەكەدا رۆبچێت هیچ كەسێك وەكو ئەو و لە پێش ئەو بەو شێوەیە رۆنەچووە لە زانستی وڵاتناسیدا، وەكو دەڵێت: (بینیم زاناكانی پێشتر زانستییان پۆلێن كردووە بە شێوەی دەسپێك، دواتر شوێنی ئەو جیاوازیانە كەوتوون و قسەكانی خۆیان شرۆڤە كردووە و كورتیان كردووەتەوە، بینیم مەبەستی زانستەكەیان پشت گوێ خستووە، تاكڕەویان كردووە بە هونەرێك كە باسیان نەكردووە تەنیا بە شێوەی خراپ باسی هەرێمەكانی ئیسلامییان كردووە، لەوەی كە لە بیابان و دەریا، دەریاچە و رووبار، باسی ناوچە و شارە بەناوبانگەكان، باسی ئەو شارانەیان كردووە كە ناویان هاتووە، ماڵەكان و ئەو رێچكانەی هەبووە، رێگە بەكارهێنراوەكان و رەگەزەكان و ئامێرەكانی نێچیر گرتن، چاوەدێری بار و بازرگانی، جیاوازی وڵاتەكان لە رووی قسە و دەنگ و زمان و رەنگیانەوە، ئاینزا و پێوانە و كێشانەیان، پارە و دراو و خواردنەوەیان و بەروبووم و ئاویان، ئەوەی شانازییان پێكردووە و ئەوەی نەنگی بووە، ئەوەی لەسەریان بووە و بۆ ئەوان بووە).([1])

لەوەی پێشەوە بۆمان رووندەبێتەوە كە مەقدەسی گەشتەكانی وای لێكردووە ببێتە بناخەیەك لە دانانی پەڕتووكەكەی، ئەمە سەرەڕای ئەوەی گوێی لێبووە لە شێخەكانی ئەهلی ئەو وڵاتانەی كە سەردانی كردووە، هەروەها خوێندنەوەی پەڕتووكی وڵاتناسانی پێش خۆی.

لەگەڵ ئەوەشدا پەڕتووكەكانی وڵاتناسی لەو بارەیەوە رووبەڕووی رەخنە بۆتەوە، بەڵام ئەو ئاماژەی بە هەندێك لەو وڵاتناسانە كردووە كە كاریگەرییان بەسەر ئەودا هەبووە، بۆیە ئەو رەخنەیەی رووبەڕووی بەلخی كراوەتەوە ئەویشی گرتووەتەوە، رووبەڕووی نەنگییەك بۆتەوە([2]) لە جەیهانیش ئەوەی وەرگرتووە بەوەی كە (ئەو خاوەنی فەلسەفە و ئەستێرە و دەستەكەی بووە، نامۆكانی كۆكردووەتەوە و پرسیاری لەبارەی پاشاكان و داهاتیان و چۆنییەتی بەڕێوەبردن و خەرجكردنیان لێكردوون).([3]) هەروەها رەخنەی لە ئیبن فەقیێ گرتووە وەكو دەڵێت: (ئەو رێگەیەكی دیكەی گرتووە، تەنیا باسی

---

١ -احسن التقاسيم، ل١٥-١٦.

٢ - االمصادر نفسة، ل٢٠.

٣ -االمصادر نفسة واللفحة.

شاره گەورەکانی کردووە و کورِ و سەربازگیریەکانی ریکنەخستووە، هەروەها لە خوێندنەوەی پەرتووکەکەیدا چاوت بە زانستێك ناکەوێ، جارێك دەبێتە سوفی دنیا و جارێك ئارەزووی لێدەکاتەوە و جارێکی دیکە تێیدا دەگریێ، جارێکی دیکە پێدەکەنێ و خۆشی دای دەگرێت).([1]) هەروەها هەر یەك لە جاحیز و([2]) ئیبن خوردازەبە، چونکە (پەرتووکەکانیان زۆر کورتە و ناتوانرێ سوودی زۆریان لێ وەربگیرێت).([3]) لە بابەتێکی دیکەی پەرتووکەکەیدائاماژە بەوە دەکات کە بەلخی بۆتە رێبەرێك و پێشرەوێکی باش بۆ بەخشینی زانیاری گرینگ لەبارەی خوراسانەوە کە دەڵێ: (ئێ ئەوەی لە پێشمانەوەیە و بۆی دەچین ئەبو زەیدە کە بە نووسراوەکانی لەبارەی خوراسان و پوختی کارەکەی لە هەموو کەسێك شارەزاترە).([4])

ئەوەی لە مەقدەسی دەبینرێت ئەو دوژمنایەتیە توندەیە بەرامبەر بەو کەسانەی لە سنوور دەرچوونە وەکو دەڵێت: (نازانین گەورەیی پەرتووکەکەی ئێمە چییە، تەنیا لە روانین بۆ پەرتووکەکانی ئەوان نەبێت، یان سەرلێشێواندنی ولاتناسانە کە خەڵکانی خاوەن زانست و زیرەکی بوونە).([5]) لە بابەتێکی دیکەدا لەدوای ئەوەی کە هەندێ لە ولاتناسان زانیاری و بابەتەکانی یەکتر دەنووسنەوە دەڵێت: (..ئەگەر بینیت لە پەرتووکەکەی ئێمە ئەو شتە هەیە، ئەوە بەتەنیا ئێمەین بێ دایك و باب لە سیستەمەکەدا).([6])

---

١ - االمصادر نفسة واللفحة.

٢ - جاحیز: لە ساڵی (٢٥٥ك/٨٦١ز) مردووە، خاوەنی پەرتووکی ئەو ئاژەڵەی زانیاری زۆرە لەبارەی جوگرافیای زیندەوەران و مرۆناسی و ئاینزاییەوە، نامەیەکی هەیە بەناوی (وردبوونەوە لە بازرگانی) کە گرینگییەکی زۆری لەبارەی جوگرافیای ئابووری جیهانی ئیسلامی هەبوو لە کاتی خۆیدا، بەلاّم پەرتووکە بەناوبانگەکەی (شوێن و شتە سەرسورمانەکانی ولاّتان) ئەوە نەدۆزراوەتەوە، بەلاّم هەر یەك لە ئیبن خوردازەبەو ئیبن فەقێ هەمەدانی و ئیبن حوقەل و مەسعودی و مەقدەسی هەندێ شتیان لێوەرگرتووە.

٣ -احسن التقاسیم، ل٢١.

٤ - االمصادر نفسة، ل٢٤٢.

٥ -االمصادر نفسة، ل٢١.

٦ - احسن التقاسیم، ل١٩٩.

بەڵام ئەوە هەرگیز لە شان و شکۆی پەڕتووکەکەی کەم ناکاتەوە کە زۆر جیاوازە لە پەڕتووکی وڵاتناسانی دیکە لە رووی رێکخستن و شێواز و باشی و داهێنانەوە، کە مەقدەسی زۆر سوور بووە لەسەر ئەوەی هەتا پێی بکرێ زانیارییەکان دووبارە نەکاتەوە.([1]) ئەگەر بە شێوازی سەروایەکی سادە شتەکانی نووسیبێ، ئەوە گەواهییەکە بۆ نووسینەکانی، کە زۆربەی نووسەران و لێکۆڵەنەکان دان بەوەدا دەنێن، چونکە زانستی وڵاتناسی لەسەر دەستی ئەودا مەودایەکی گرینگ و گەورە بڕیوە و پێشکەوتووە و پێگەیشتووە، وەکو یەکێك لە لێکۆڵەنەکان گرینگی کارەکەی لەوەدا بینیوەتەوە کە زۆر (ورد بووە لە تێبینیەکانی سەبارەت بە ژیانی خەڵکی و ئیش و کاریان و، هەروەها روانینێکی وردی هەبووە بۆ نرخاندنی نەریت و ئادابی ئەو وڵاتانەی سەردانی کردوون).([2])یەکێکی دیکە گرینگی پەڕتووکەکە لەوەدا دەبینێتەوە کە مەقدەسی نەخشەی باشی ئەو هەرێمانەی تێدا کێشاوە و هێما و رێگەی دەربڕینی زاراوەکان و رەنگەکانی باش بەکارهێناوە.([3]) کراچکۆفسکیش دەڵێت: (زیاتر لە هەر جوگرافیناسێکی دیکە رەسەنتر بووە).([4]) هەروەها شبرنجەر لەو بارەیەوە گوتویەتی: هیچ کەس پێش ئەو نەکەوتووە لە فرەوانی گەشتەکانی و قووڵی تێبینیەکان و ملکەچی بۆ ئەو بابەتانەی کۆی کردوونەتەوە بە شێوازێکی رێك و پێك.([5]) مینۆرسکیش بەوە پەسنی دەکات و دەڵێت: (رەنگە ئەوە لە هەر جوگرافیناسێکی دیکەی موسڵمانەکان دیاتر بێت).([6])

ئەو زانیارییانەی مەقدەسی کۆی کردوونەتەوە سەبارەت بە هەرێمەکانی ئیسلامی، کە بە چواردە هەرێم هەژماری کردووە، جیاواز بووە لە وڵاتناسانی دیکە، لێکنێزیکی لە نێوانیاندا کردووە، کاتێ باسی هەر هەرێمێك دەکات هەمیشە دابەشی سەر سێ بەشی وەك یەکی دەکات لەبارەی قەبارەوە، لە بەشی یەکەمدا دەبینین باسی بەشەکانی

---

١ -االمصادر نفستنل٢١.

٢ -نفيس احمد، جهد المسلمين في الجغرافيا، ل٥٧.

٣ -لامنس، المقدسي وجغرافية سوريا في قرن العاشر الميلادي، مجلة المشرق السنة العاشر (بيروت، ١٩٠٧) العدد ١٣، ل٦٨٢-ل٦٨٤.

٤ -تاريخ الادب الجغرافي العربي، ق١، ل٢٠٨.

٥ -يوسف الغنيم، مرجع السابق، ل٤٤.

٦ - الجغرافيون والرحالَة المسلمون، ل١٤.

ئەو هەرێمە لە شار و جێگە ئاوەدانەکانی دەکات، لە کاتێکدا بەشی دووەم باسی کەش و ئاو و هەوا و کشتوکاڵ و تائیفە و زمان و بازرگانی و کێشانە و پێوانە و دراو و داب و نەریت و، هەروەها ئاو و کانزا و شوێنی پیرۆز و رەوشت و ئاکاری خەڵکی و وەلائی سیاسی بۆ کام ویلایەت و باج و خەراج بە درێژی باس کردووە، بەڵام لە بەشی سێیەمدا ئەوەی تەرخان کردووە بۆ باسکردنی پێوانەی رێگەی هاتوچۆ.

ئەوەی جێگەی تێبینی بێت ئەوەیە مەقدەسی زۆر گرینگی بە لایەنی مرۆیی داوە لە هەر لایەنێکی دیکەی سروشتی زیاتر، تەنیا هەرێمی شامی لێ دەربچێت، لە باسکردنی لایەنی سروشتییەکەی هەندێ شتی زیادی باس کردووە.[١]

بە راستی مەقدەسی خۆی لە کەسانی پێش خۆی جیاکردووەتەوە لە پەڕتووکی (احسن التقاسیم) لە رووی میتۆد و رێکخستنی بابەتەکانی، بە راستیش داهێنەرێکی جدی و مەزن بووە لەو شتەی کۆی کردووەتەوە، بۆیە پێگە و جێگەی دیارە و گرینگییەکەی زۆر تایبەتە.

بەڵام سەبارەت بە باسکردنی کورد لەو پەڕتووکەکەیدا، ئەوەی تێبینی دەکرێت مەقدەسی سەرەڕای ئەوەی هەشت جار باسی کوردی کردووە، بەڵام باسەکەی لەبارەی ئەو هەرێمانەوە بووە کە کورد نەبوونە، وەکو ئەرمینیا و فارس و کرمان، واتە ئەو گرینگی زۆر بە کورد نەداوە، سەرەتا بەوە دەستی پێکردووە باسی هەرێمی چیا و ئاقوور (دورگە)ی کردووە، کە بەوە دەناسرێنەوە کە کورد تێیدا نیشتەجێبوونە بە شێوەیەکی بەرفرەوان هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە. رەنگە مەقدەسی پێی وابووبێت گرینگ نەبێت باسی کورد بکات، کاتێ باسی وڵاتەکەیان دەکات، چونکە پێی وابووە ئەوە شتێکی ئاشکرایە و جۆرێکە لە ئەنجامی بەدەست، بۆیە هەر بەوەندە وەستاوە باسی لایەنی سروشتی و مرۆیی و سەرجەم بەشەکانی وڵاتی کوردستان بکات و تێپەڕی راگەیاندنی بێژەی کورد بکات.

سەبارەت بە بەرواری مردنی، بە شێوەیەکی دیاری کراو دیار نییە و نازانرێ کەی مردووە، بەڵام وەکو دیارە لە چارەگی کۆتایی سەدەی چوارەمی کۆچی مردووە، کە لە پەڕتووکەکەی باسی ئەوە دەکات لە نێوان خەلیفەی بەنی عەباس کە هاوسەردەمی

---

١ -احسن التقاسیم، ل١٣٥، ١٤٩.

خەلیفە تائیع (٣٦٣-٣٨١ك/٩٧٣-٩٩١ز) بووە، بەڵام ئاماژە بە خەلیفە قادر ناکات کە جێنشینی حوکمی بووە، لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانین بڵێین ساڵی مردنی لە دەوروبەری ساڵانی (٣٧٥-٣٨١ك/٩٨٥-٩٩١ز) بووە، بەڵام کراچکۆفسکی پێی وایە لە ساڵی (٣٩٠ك/١٠٠٠ز) مردووە.([1])

## دووەم: وڵاتناس و گەڕیدەکانی هەردوو سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچی:

ئێمە تووشی زێدە ڕۆیی یان هەڵە نابین، ئەگەر بڵێین سەرجەم یان زۆربەی وڵاتناسەکان ئەوانەی لەدوای سەدەی چوارەمی کۆچی (دەیەمی زاینی) دەرکەوتوون، ئەوا لاسایی کەرەوە و دەقی بابەتەکانی وڵاتناسانی پێش خۆیان لەو وڵاتناسە پێشەنگانەی سەدەی چوارەمی کۆچی وەرگرتووە، کە ئەو سەردەمە شارستانییەتی ئیسلامی لەسەرجەم بوارەکاندا لەو پەڕی پێشکەوتن و لە ترۆپکدا بووە، ئەوە ئەگەر هەندێ لەو گەڕیدانەمان لێدەرکرد، ئەوانەی هەواڵ و زانیاری نوێیان تۆمارکردبێت لەبارەی هەندێ لەو وڵاتانەی سەردانیان کردووە، لەوانە ناسر خەسرەو (٣٩٤-٤٨١ك/١٠٠٣-١٠٨٨ز) و ئیدریسی (٤٩٣-٥٦٠ك/١١٠٠-١١٦٦ز) و هەندێکی دیکە.

### - ناسر خەسرەو (لەدایکبوون:٤٨١ك/١٠٨٨ز)

ناوی حەکیم ئەبو موعین ناسر کوڕی خەسرەو کوڕی حارس ئەلبەلخی ناسراو بە (ئەلحجە) یان (حجەی وڵاتی خوراسان) بووە، ئەوەش پلە و پایەیەکی ئاینی باو بووە لەنێوەندی شیعەی ئیسماعیلییەکاندا، لە مانگی زی القعدەی ساڵی (٣٩٤ك/١٠٠٣ز) لە ناحیەی بەلخ لە دایکبووە.([2])

---

١ -ینظر: اسماعیل باشا البغدادي، المصادر نفسه، مج٢، ل٦٣، حاجي خلیفة، المصادر نفسه، ل١٧، الزركلي، المصادر نفسه، ج٦، ل٢٠٣.كراتشكؤفسكي، المصادر نفسه، ق١، ل٢١٣، فلاح شاكر، المقدسي، (بغداد، ١٩٨٨)ل٨.

٢ -ذبیح الله لفا، المصادر نفسه، ج١، ل٢٧١-٢٧٣.عزیز الله بیات، المصادر نفسه، ل٤٥٢.

ناسر خەسرەو وەکو شاعیرێکی بەتوانا ناسراوە لەنێوەندی شاعیران و ئەدیبانی فارسدا، یان ئەوانەی بە زمانی فارسی نووسیویانە.([1])

ناسر خەسرەو زۆربەی تەمەنی خۆی لە بەدوا گەڕانی زانست و دەسکەوتی بژێوی ژیانیەوە بووە، لە دووتۆی ئەمەشدا پۆست و پلە و پایەی گرینگی پێدراوە لە لایەن ئەمیر و دەسەڵاتدارەسەرێ کانیدەمی خۆی لە نێو سەلجوقییەکاندا، بەمەش دەسکەوتی مادی زۆری بووە و وەکو دەڵێن توانیویەتی ژیانێکی خۆش بژی، بەردەوام بووە لەسەر ئەو بارە هەتا تەمەنی گەیشتووەتە چلساڵی.([2]) لەوە بەدواوە گۆڕانکارییەکی ریشەیی لە ژیانی خۆیدا چێ کردووە، دوای ئەوەی خەونێکی بینیوە ئەوە وای لێکردووە جۆری ژیانی بگۆڕێت و تەوبە بکات و واز لە خواردنەوەی مەی بهێنێت، دواتر دەستی بە گەشتێك کردووە بۆ حیجاز بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج، هەر ئەو گۆڕانکارییە پاڵی پێوەناوە دەست بە گەڕان و گەشتەکەی بکات کە ناسراوە بە (سەفەر نامە) و بە زمانی فارسی بینووسێتەوە.([3])

گەشتەکەی لە ساڵی (٤٣٧ك/١٠٤٦ز)ی دەستپێکردووە بە نیازی حەج، ئەو گەشتەی کە حەوت ساڵی خایاندووە، لە شاری مرومارای بنیسابورەوە دەرچووە بەرەو رێگەی رەی، هەروەها بە قەزوین و تفلیس و میافارقین و ئامەد و دواتر بە شام و فەلەستیندا گوزەری کردووە، لە قودسەوە مەبەستی مەکەیە لە ساڵی (٤٣٨ك/١٠٤٧ز) حەجی یەکەمی ئەنجام داوە و، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ قودس، دواتر بەرە و میسر کەوتووەتە رێ.([4])کە ئەو کاتە فاتمییەکان حوکمی وڵاتی میسریان کردووە ساڵی (٣٦٣-٥٦٧ك/٩٧٣-١١٧١ز).

ناسر خەسرەو چەندین ساڵ لە میسر نیشتەجێ دەبێت، لەو ماوەیەدا سێ جار سەردانی حەج دەکات لە رێگەی دەریای سوورەوە.([5])

---

١ - ذبيح الله لفا، المصادر نفسه، ل٢٧١.

٢ - عزيز الله بيات، المصادر نفسه، ل٤٥٥.

٣ - سفر نامة، ترجة: يحيى الخشب، (القاهرة، ١٩٤٥)

٤ -ناسر خسرو، المصادر نفسه، ل٢٧، كراتشكۆفسكي، المصادر نفسه، ل١، ل٢٠٦.

٥ - كراتشكۆفسكي، المصادر نفسه، ق١، ل٢٦١.

ئەوەی شایەنی باس بێت ناسر خەسرەو بەشێکی گرینگ و گەورەی لە پەڕتووکەکەی بۆ باسی میسر و فاتمییەکان تەرخان کردووە، کە ئاماژە بە خەلیفەکان و شارستانییەتەکەیان دەکات و، سەرسوڕمانی خۆی نیشان دەدات بەو خۆشی و لەزەتەی لەو ئاسایش و خۆشگوزەرانییەی لەو وڵاتەدا هەبووە.[1] وەکو دیارە لەوێ لەنێو ئیسماعیلیەتدا قووڵبووەتەوە لەو ماوەیەی لە قاهیرە بووە، دوای ئەوە بۆتە یەکێك لە گەورەترین بانگخوازانی ئەو مەزهەبە، دواتر هاتووە لە وڵاتەکەی خۆی بڵاوی کردووەتەوە.

هەڵبەت دوا گەشتی بۆ حەج لە ساڵی (٤٤٢ك/١٠٥٠ز)ی بووە، دوای ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی لە ڕێگەی کەنداوەوە و گەیشتووەتەوە بەلخ، زێدی لە دایکبوونی ساڵی (٤٤٤ك/١٠٥٢ز).[2]

لە شێوازەکەیدا دەردەکەوێت ئەو زانیاریانەی لە پەڕتووکەکەیدا (سەفەر نامە) خستوویەتییە ڕوو، ناسر خەسرەو دوای ئەوە سەردانی شوێنەکەی کردووە بە شێوەیەکی مەیدانی و دوای بینین و سەرنجەکانی، ئینجا دەستی کردووە بە نووسینەوەی ئەو سەرنجانە، بۆیە شێوازی نووسین و داڕشتنەکەی زیاتر لە (یاداشت) دەچێت، کە لەوێدا زانیاری بەڵگەدار لەبارەی جوگرافیای مێژوویی و داب و نەریتی ئەو کات و لایەنی ئابووری و چەندین دیکە باس دەکات، وەکو دەزانین میسر لەو خستنەڕووەدا گرینگییەکی زۆری بەرکەوتووە لەو پەڕتووکەدا، لەبەرئەوەی نێوەندی خەلافەتی فاتمییەکان بووە لەو کاتدا.

بەڵام ئەوەی پێوەندیی بە پشکی کوردەوە هەبێت لەو پەڕتووکەدا، ئەگەرچی ناسر خوسرەو بە شێوەیەکی خێرا بە هەندێ شاری کوردەکاندا تێپەڕبووە کاتێ بەرەو حەج چووە، بەڵام سەبارەت بە کاروباری ئەوان لە ڕووی ڕامیاری و ئابووری و ئاوەدانی وڵاتی کوردستان هەندێ شتی خستووەتە ڕوو.[3]

ناسر خوسرەو لە ساڵی (٤٨١ك/١٠٨٨ز) کۆچی دوایی کردووە، دوای تەمەنی گەیشتووەتە حەفتاو هەشت ساڵی، لە دوای خۆیشیدا چەندین پەڕتووك و نووسینی بە

---

١ -ینظر: سفر نامه، ل٦٧.

٢ -كراتشكؤفسكي، المصادر نفسه، ق١نل٢٦١. نيقولا زيادة، الرحالَة العرب، ل٤٨.

٣ - ينظر: الفلل الثالث من هذه الدراسة.

زمانی فارسی بۆ جێهێشتووین لەوانە: سەفەر نامە، برامان برایی، کەشایش و رەهایش، جامع الحکمتین، زیادبوونی گەشتیاران بەرەو ئاین).([1])

## – ئەبو عەبید ئەلکبری (لەدایکبوون:٤٨٧ك/١٠٩٤ز)

ناوی عەبدوللا کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی محەمەد کوڕی ئەیوب کوڕی عومەر ئەلبکرییە و لە زۆربەی جارەکاندا ناسراوە بە (ئەبو عەبید)، لە شاری قورتەبە لە دایکبووە و تێدا پەروەردە بووە.([2]) بەڵام بەرواری لەدایکبوونی نازانین بە شێوەیەکی راست و رەوان، بەڵام لە هەندێ لە لێکۆڵڤانەکان پێیان وایە لە دەوروبەری ساڵی (٤٠٠ك/١٠١٠ز) یان هەندێك دوای ئەمە بە ماوەیەکی کەم لە دایکبووە.([3]) بەڵام هەندێکی دیکە پێیان وایە لە ساڵی (٤٣٢ك/١٠٤٠ز)ی لەدایکبووە.([4]) هەر ئەوەش راستە.

بەکری سەر بە رەچەڵەکی خێڵی بیکری کوڕی وائیلە، کە زۆرێك لە کەسەکانیان پۆست و پلە و پایەی فەرمییان لە ئەندەلوس وەرگرتووە، بەڵام شتێك لەبارەی سەرەتای ژیانی خێزانی بیکرییەوە نازانین، هەتا لەبارەی ئەو ماوەیەی کە ئەوان لە ئەلندەلوس نیشتەجێبوونە.

کاتی بیکری دەگاتە تەمەنی گەنجی دەبێتە فەرمانبەرێکی پایە بەرز و دواتر دیبلۆماسییەك لە ئەندەلوس لەسەردەمی مەلیکی تەوائف.([5])هەروەها هاتنە ناوەوەی

---

١ -ذبیح الله لفا، المصادر نفسة، ج١، ل٢٧٥.

٢ - دائرة المعارف الاسلامیة، مادة البكري، ج١، ل٥٣١، حسین مؤنس، تاریخ الجغرافیا والجعرافیون في الاندلس، (مدرید:١٩٨٧) ل١٠٩.

٣ - البكري، المسالك والممالك، مقدمة المحقق، ل٩.

٤ - شاكر خصباك، في الجغرافیا العربیة، ل٣٧٩.

٥ -مەلیکی تەوائف: ئەوانە سەرکردایەتی ولاّتی تەوائفیان کردووە(٤٢٢-٤٨٤ك/١٠٣١-١٠٩١ز) ئەوانە لەدوای کەوتنی خەلافەتی ئەمەوی لە ئەندەلوس لە کۆتایی حوکمی بنەماڵەی بەنی عامر سەریان هەڵداوە، ئەو ماوەیە بە ئالۆزی و گیرمەوکێشە و خۆپیشاندان و زاڵبوونی بەرژەوەندی خودی مەلیك و تائیفەکان ناسراوە، هەروەها دەسەلاّتدارانی ئیسپانی هانی ئەو ولاّتانەیان داوە بۆ فرەوانخوازی لەسەر حسابی ئەوان، ئەو حاڵەتەش نێزیکەی هەتا سەرهەڵدانی دەوڵەتی مەرابتین و هاتنە ریزی ئەندەلوس درێژەی کێشاوە لە ساڵی

مەرابتین بۆ ئەندەلوس کاتێ پاشای ئیشبیلیە داوای لێکردوون بێنە ریزی سەربازی و موسڵمانەکان بپارێزن لە سوپای لیی شەشەمی مەسیحی، کە ئەمە سەرەتای هەلوەرینی دەوڵەتی پاشای تەوائف بوو.([1])

سەبارەت بە پەڕتووکەکانی بیکری وەکو بەدیار دەکەوێ ئەو تەنیا لە لقێکی زانیاری مرۆڤایەتی تایبەتمەند نەبووە، وەکو زۆربەی زانایانی موسڵمان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بۆیە نووسینەکانی بابەتی جۆراوجۆری بە خۆوە گرتووە، بیکری کەسێکی زمانەوان و ئەدیب بووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ناوبانگیشی بە وڵاتناسی دەرکردبوو لە ڕۆژئاوا و لە ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام زۆربەی نووسینەکانی لەناو چووە و دیار نییە، تەنیا ناونیشانەکانی ماوەتەوە، هەر بۆ نموونە (کتاب الاحساو اگبقات الشعراو، کتاب اشتقاق الاسماو، اعلام نبوە نبینا محمد، التدریب والتهژیب فی دروب الحروب و کتاب النبات).

بیکری بە یەکێك لە وڵاتناسە گەورەکان دادەنرێت کە توانی ڕۆژئاوای ئیسلامی بەرهەم بهێنێت لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی گەشتی بۆ سەرجەم وڵاتانی ئیسلامی نەکردووە، بەڵام ئەوەی لەبارەی وڵاتانەوە نووسویەتی گرینگی تایبەتی خۆی هەیە، کاتی باسی وڵاتانی جیهانی ئیسلامی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەکات، (باسێك تا ئاستی وردی و پوختی)([2]) لە پەڕتووکی (معجم ما استعجم) و (المسالك والممالك)دا.

بەڵام پەڕتووکی یەکەمی فەرهەنگێکی زمانەوانی جوگرافییە لە دووتۆی چوار بەرگدا، کە بە ناوی زاراوەکانی شوێن دەست پێدەکات و زۆربەشیان پێوەستە بە دوورگەی عارەبییەوە، ئەویش ئەو ناوانەیە کە لە شیعری جاهیلی و لە پەڕتووکی فەرمودە دایە، واتە ئەو وشانە بووە کە جێگەی جیاوازی و دەمەتەقێی لێکۆڵڤانەکان بووە، لە پێشەکیەکەیدا باسی ئەو هۆکارە دەکات کە پاڵی پێوەناوە ئەو پەڕتووکە بنووسێت و دەڵێت: (من کاتێ ئەوەم بینی ویستم زمان پاراوی بەسەر خەڵکیدا بکەم،

---

(٤٨٤ك/١٠٩١ز) بۆ زانیاری زیاتر سەیری (عبد الرحمن علی الحجی، التاریخ الاندلسی"بیروت:١٩٧٦ )ل٣٢٣-٣٢٦.بکە.

١ -احمد رمضان احمد، المصادر نفسة، ل١٤٨.

٢ -دائرة المعارف الاسلامیة، مادة البکري، ج١، ل٥٣١.

توانیم هەندێکی پاك بکەمەوە، بەوەی هەر بابەتێك لەسەر بنەمای فەرهەنگ و پیت دابنێم، هەتا هیچ شتێك بەنادیاری و بە لادراوی بەجێ نەمێنێ).[1]

بەڵام پەڕتووکی دووەم رێگەکان و هەرێمەکان (المسالك والممالك) کە نێزیکەی ساڵی(٤٦٠ك/١٠٦٨ز)[2] لە نووسینی بووەتەوە، کە بە تەواویش نەگەیشتووەتە ئێمە و، لە پەڕتووکیش ناچێت وەکو هەر پەڕتووکێکی دیکە لە هەمان جۆردا، چونکە هەر تەنیا گێڕانەوەیەکی رێگەکان نییە، هەر وەکو ئەوەی ئیبن خوردازەبە ناوی لە پەڕتووکەکەی ناوە، یان کۆمەڵێك چیرۆك و شتی سەرسوڕمان و ئەفسانەش نییە کە بە شێوەیەکی رێك و پێك کۆکرابنەوە.[3] وەکو پەڕتووکی ئیبن فەقێی ولاتناس، یان ئەوە بەرئەنجامی گەشتەکان و گەڕانەکانیشی نییە، وەکو ئەوەی مەقدەسی و ئەستەرخی یان هەر کەسێکی دیکە کردوویەتی.

هەروەها ناتوانین ئەو پەڕتووکە لە جۆری هونەری سەرسوڕمان پۆلێن بکەین، یان لە جۆری پەڕتووکی دەستەی (گەردوون)، بگرە پەڕتووکەکەی بیکری دەچێتە خانەی نێوان هەموو ئەوانەوە، کە تێیدا بە درێژی باسی رێگە و ولات و گەل و نەتەوە و شارەکان دەکات و، بە دەرە لە چاپوکی و ئەفسانە و قسە و بۆچوونی مێژوویانە.[4]

کەواتە ئەو شتانەی لە (مەسالیك و مەمالیك)دا هاتووە بابەتی ولاتناسی نییە بە تەواوی، بگرە تا رادەیەکی زۆر پێوەندیی بە مێژووی سیاسی و کۆمەلایەتی و، هەروەها بە زانستی وەچەی مرۆڤ (ئەتنۆگرافیا)وە هەیە، هەر ئەوەش وای کرد بەهای پەڕتووکەکەی دوو ئەوەندە زیاتر بێت، بە تایبەتی لەبەر چاوی رۆژئاواییەکانەوە.

شێوازەکەی بە تەجرید پەسن دەکەن لە رووی وردی و روونکردنەوەدا، بە تایبەتی ئەوەی پێوەندیی بە باسی ماوە و رێگەکانەوە هەیە.

بەڵام ئەوەی پێوەندیی بە کوردەوە هەبێت، چۆن لە پێشەوە باسی کورد کراوە، ئەوا بیکریش باسی شێواز و لایەنی رەگەزی کوردی کردووە و ئەوانەیشی لە مەسعودی وەری

---

١ -معجم ما استعجم.ج١.ل١.

٢ - کراتشکوفسکي، المصادر نفسه، ق١، ل٢٧٥.

٣ -ابن کثیر، المصادر نفسه، ل٧٠.

٤ -ینظر: المسالك والممالك، اللفحات: ٣٤٢، ٣٤٢، ٣٤٦، ٣٤٩، ٣٦٤، ٣٦٧.

گرتووە،[1] هەروەها باسی هەندێ تیرەشی کردووە، هەروەها زیاتر لە دەجار بێژەی کورد و کوردەکان لە پەڕتووکی مەسالیك و مەمالیك هاتووە.[2]

بیکری لە قورتوبە ساڵی (٤٨٧ك/١٠٩٤ز) دوای تەمەنێکی پڕ لە چالاکی و دەسکەوتی زانستی کۆچی دوایی کردووە.

## - ئیدریسی (لەدایکبوون: ٥٦٠ك/١١٦٦ز)

ناوی ئەبو عەبدولڵا محەمەد کوڕی محەمەد کوڕی عەبدوڵا کوڕی ئیدریسی کوڕی یەحیا بووە، ناسراوە بە ئیدریسی، رەچەڵەکی بۆ خێزانێکی خانەدانی ئەدارسە دەگەڕێتەوە.([3]) لە شاری سەبتە لە مەغریبی دوور لە ساڵی (٤٩٣ك/١١٠٠ز) لە دایکبووە، منداڵی لە مەغریب بەسەر بردووە، دواتر لە منداڵییەوە چۆتە قورتوبە لە ئەندەلوس و، لە زانکۆکانی ئەوێ دەستی بە وەرگرتنی زانست کردووە و لە زانستی بیرکاری خوێندوویەتی و، بە شێوەیەکی بەرچاو گرینگی بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی و جوگرافی داوە.([4])

ئیدریسی گەشتەکانی لە تەمەنێکی گەورەییدا دەست پێکردووە، بە هەندێ ناوچە گەیشتووە لەسەردەمی خۆیدا زانیاری کەمیان لەبارەوە هەبووە، ئەگەر زانیارییەکی بەرفرەوانی لەبارەی ئیسپانیا و مەغریب هەبووبێت ئەوە پرسێکی نامۆ نییە، چونکە

---

١ -المسالك والماملك، ل٣٤٣.

٢ -االمصادر نفسة، ل٢٣٥.

٤- المصادر نفسة، ل٣٤٤.

٦- الادارسة: ئەوانە عەلەوی بوونەو بە مافی خۆیان زانیوە جێنشینی بۆ ئەوان بێت لە سەدەی دووەمی کۆچی، ئەو ناوەش بۆ دامەزرێنەری بنەماڵەکە دەگەڕێتەوە، ئیدریسی یەکەم لە حیجاز هەڵاتووەو بەرەو میسرچووە، لەوێشەوە بۆ مەغریب، لەوێ توانیویەتی بە یارمەتی دانیشتوانەکەی ئەوێ دەوڵەتی (ئەدارسە) لە ساڵی (١٧٢ك/٧٨٩ز) دابمەزرێنێت، لە شوێنێك کە ناسراوە بە (جەراوە) شاری فاسیش بکاتە پایتەختی خۆی، هەتا مدریشە لە ساڵی (١٧٧ك/٧٩٣ز) حوکمەکەی بەردەوام بووە، بە ژەهرخوارکردنیش مردووە، لەدوای خۆیشی کوڕەکەی بەناوی ئیدریسی دووەم بۆتە جێنشینی، دەوڵەتەکەیشی لە ساڵی (٣٧٥ك/٩٨٣ز) لەناوچووە. بڕوانە: محمود شاکر، التاریخ الاسلامي، ج٢، ل١٩٢.بکە.

٤ - ینظر:اللفدي، الوافي بالوفیات، باعتناء هلموت ریتر(فیسبادن:١٩٦٢)ج١، ل١٦٣.

خۆی لەوێ ژیاوە، سەردانەکانی هەر یەك لە لیشبۆنە و کەناراوەکانی فەرنسا و هەندێ شاری گرینگ بووە، هەتا گەیشتووەتە هەندێ دوورگەی بەریتانیا.[1] هەروەها پێشتریش سەردانی ئاسیای بچووکی کردووە لە ساڵی (٥١٠ك/١١١٦ز) کە ئەو کاتە تەمەنی لە شازدە ساڵی تێپەڕی نەکردووە، لەو بارەیەوە یەکێك لە لێکۆڵەرانەکان[2] گومانی لەوە هەیە و دەبێژی پێویستە چاو بخشێنینەوە بە ساڵی لەدایکبوونی ئیدریسی، چونکە عەقڵ تەقەبولی ناکات کەسێك لەو تەمەنەدا گەشتی کردبێ بۆ ناوچەیەکی دوورە دەستی وەکو ئاسیای بچووك.

بە شێوەیەکی گشتی ئیدریسی پێش ئەوەی سەردانی هیچ وڵاتێکی ئیسلامی بکات، چۆتە وڵاتانی ئەورووپی بە شێوەیەکی بەرفرەوان، هەروەها لە پاشای نۆرماندی رۆجەری دووەم کە پاشای سەقلیە بووە نێزیك بۆتەوە و داوەتی کردووە و لە سەقلییە نیشتەجێ بووە، پەڕتووکێکی وڵاتناسی نووسیوە لەسەر داواکاری پاشا، کە تێیدا پۆلێنی ئەو شانشینە و سەرجەم وڵاتانی دنیای کردووە، نەخشەی هەرێمەکانی زەوی داناوە، لەدوای ئەویش پەڕتووکە بەناوبانگەکەی (نزهە المشتاق فی اختراق الافاق)[3] یان وەکو ناسراوە بە (پەڕتووکی رۆجەر)[4]ی داناوە.

ئەو پەڕتووکە بەوە دەناسرێتەوە کە خاوەن میتۆدێکی زانستی ورد بووە، کە نووسەرەکەی پشتی بە بینینی راستەوخۆی خۆی بەستووە، یان بە پەڕتووکی وڵاتناسی و مێژوویی عارەبی یان یۆنانی پێش خۆی بەستووە، هەروەها زۆر سوودی لە زانیارییەکانی ئەو کەسانەش وەرگرتووە کە رۆجەری پاشا ناردوونی بۆ هەموو لایەکی ئەورووپا، بۆ پەیبردن و روونکردنەوەی باسەکان و بابەتەکان، ئەمە سەرەڕای ئەوەی پشتی بەو زانیارییانەش بەستووە کە گەڕیدە و بازرگان و گەشتیارەسەرێ کانی کەشتییەکان کۆیان کردوونەتەوە کە لە بەندەرەکانی سەقلییە کارییان کردووە لەو کاتدا.

---

١ -ملطفی شهابي، المصادر نفسه، ل٥٢-٦٢.

٢ -حسين مؤنس، تاريخ الجغرافية والجغرافيين في الاندلس، ل١٧٣.

٣ -اللفدي، المصادر نفسه، ج١، ل١٦٣.

٤ -وێنەیەکی لەبەر گیراوی یەکێك لە هێلکارییەکانی ئەو پەڕتووکە لە پەڕتووکخانەی کۆڕی زانیاری عێراق هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا ئیدریسی میتۆدی یەتلیمۆسی پەیڕوکردووە لە دابەشکردنی زەوی بەسەر حەوت هەرێمدا، واتە هێڵێکی پانی بەسەر هێڵی یەکسانییدا داوە، واتە لەو دابەشکردنەدا جۆرێك لە گۆڕانکاری و هەمووارکردنی تێدا ئەنجامداوە، کە هەر هەرێمێکی لەو حەوت هەرێمەدا دابەشی سەر دە بەشی سەرەکی کردووە، لە باسکردنیشیدا بۆ هەر بەشێك یاسایەکی داناوە یەك بەدوای یەك، لە ڕۆژئاواوە دەستی پێکردووە بەرەو ڕۆژهەڵات، بۆ هەر بەشێکیش نەخشەیەکی وەکو پاشکۆی بۆ داناوە، بە شێوەیەك ئەگەر ئەو حەفتا نەخشەیە بخینە دەم یەکەوە، ئەوا نەخشەیەکی تەواومان لەبارەی جیهانەوە بۆ دروست دەبێت بە شێوەیەکی لاکێشەیی،([1]) ئەوەش ناکرێ پیادەبکرێت لەسەر نەخشەکانی وڵاتناسانی دیکە، لە هەمان کاتیشدا دەتوانین نەخشەکانی ئیدریسی لە نەخشەکانی کەسانی دیکە جیابکەینەوە.

بە ڕاستی پەڕتووکەکەی ئیدریسی گرینگییەکی تایبەتی هەیە لەوەی پێوەندیی بە ئەوروپاوە هەیە، چونکە یەکەم پەڕتووکە باسی وڵاتانی ئەوروپا دەکات بەو شێوە روون و پوختە، بەڵام لەبارەی جیهانی ئیسلامییەوە، ئەوا شتێکی نوێی تێدا نییە، لەوەش پشتی بە وڵاتناسانی دیکەی پێش خۆی بەستووە، زیاتر لەوەی پشت بە گەڕان و گەشتەکان و ئەو شتانەی کە خۆی بەچاوی خۆی بینیویەتی ببەستێت.

هەروەها ئیدریسی پەڕتووکێکی دیکەی لەبارەی وڵاتان داناوە، رەنگە ئەوە کورتەیەك لە پەڕتووکی (نزهە المشتاق) بێت، ئەو پەڕتووکەش پێشکێش بە پاشا نۆرماندی غەلیۆم کوڕی رۆجەری دووەم کراوە، ئەو پەڕتووکە کۆمەڵێك ناونیشان لەخۆ دەگرێت لەوانە (روچ الانس ونزهە النفس) و(روچ الفرج وانس المهج) و (انس المهج وروچ الفرج) رەنگە ناونیشانی یەکەم ناوی پەڕتووکەکە بێت، بەڵام لە گواستنەوە و تۆمارکردنیدا ئەو شتە کراوە.([2]) ئەبو فیداش لە پەڕتووکەکەی (رۆژژمێری وڵاتان) پشتی پێ بەستووە.([3])

---

١ -كراتشكوفسكي، المصادر نفسه، ق١، ل٢٨٥.

٢ - ابراهيم شوكت، تحقيق اجزيرة والعراق من (روض الفرج وانس المهج، للشريف الادريسي، عن حكيم ونسخة حسن حسني باشا، مجلة المجمع العلمي العراقي، (بغداد:١٩٧٣)مج٣، ل٥-٤٠.

٣ - ابراهيم شوكت، تحقيق اجزيرة والعراق من نزهة المشتاق في اختراق الافاق، مجلة الاستاذ كلية التربية/جامعة بغداد، ١٩٦٣/مج١١، ل٢.

فوئاد سزکین یەکێك لە هێڵکارییەکانی بڵاوکردووەتەوە بە ناونیشانی (انس المهج و روج الفرج)([1]) لە راستیدا ئەو پەڕتووکە بە زۆری باسی ماوەی نێوان شار و هەرێمە جیاجیاکان دەکات.

بەڵام سەبارەت بە کورد کە دەکەوێتە بەشی شەشەم لە هەرێمی چوارەم بە پێی ئەو دابەشکردنەی ئیدریسی بۆ هەرێمەکانی زەوی کردووە، کە لەوێدا باسی ماوەی نێوان شار و ناحیەی کوردەکان دەکات لە لایەك و ئەو ناوچانەی دەکەوێتە دراوسێیانەوە لە لایەکی دیکەوە.([2]) ئەوەی لەو پەڕتووکەشدا هاتووە شتێك نییە لەو بارەیەوە تەنیا دووبارەکردنەوەی ئەوانەی پێش خۆیەتی، بە تایبەتی وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی.

بەڵام بۆ بێژەی (کورد) تەنیا لە بەشی شەشەمدا لە باسکردنی هەرێمی چوارەم پێنج جار ناوی کورد هاتووە. ئیدریسی لە شاری سەبتە لە ساڵی (٥٦٠ك/١١٦٦ز) کۆچی دوایی کردووە.

## – ئیبن جەبیر (لەدایکبوون: ٦١٤ك/١٢١٧ز)

ناوی ئەبو حەسەن محەمەد کوڕی ئەحمەد جەبیر ئەلکنانی ئەلبلنسییە، لە ساڵی (٥٤٠ك/١١٣٥ز) لە شاری بلنسیە لە ئەندەلوس لەدایکبووە، زانستی قورئان و فەرموودە و فیقهو ئادابی خوێندووە، لسانەدین کوڕی خەتیب بەو شێوەیە باسی دەکات کە: (ئەدیبێکی لێهاتوو و شاعیرێکی مەزن بووە، نهێنی پارێز و رەوشت بەرز بووە).([3])

لە شاری غەرناتە نیشتەجێ بووە، وەکو نووسەری دادوەری داواکار ئەبو سەعید عوسمان کاری کردووە، سەرەتای بیرکردنەوەی لە نووسینەوەی ئەو شتانەی بینیویەتی لێرەوە هاتووە کە بڕیار دەدات سەردانی شوێنێکی پیرۆز بکات، ئەویش ئەنجامدانی

---

١ -من منشورات معهد تاريخ العلوم العربية الاسلامية في اطار جامعة فرانكفورت، (جمهورية المانيا الاتحادية، ١٩٨٤).

٢ -نزهة المشتاق في اختراق الافاق، ل٢١٩-٢٢٣.

٣ -الاحاطة في اخبار غرناطة، ل٩٦.

فەریزەی حەج بووە بۆ جاری یەکەم وەکو کەفارەتی ئەو پێکە مەیەی بە فەرمانی حاکمی غەرناتە خواردوویەتییەوە.([1])

ئا بەو شێوەیە ناوبانگی ئیبن جەبیر لە دووتۆی سێ گەشتدا بەدیار کەوت، گرینگترینیان ئەوە بوو کە نێزیکەی سێ ساڵی خایاند، کە رۆژی دووشەممەی نۆزدەی مانگی شەوالی ساڵی (٥٧٨ك) بەرامبەر بە سێی مانگی شوباتی ساڵی (١١٨٢ز) دەست پێکردووە،([2]) هەروەها لە رۆژی پێنجشەممەی بیست و دووی مانگی موحەرەمی ساڵی (٥٨١ك) بەرامبەر بە بیست و پێنجی مانگی نیسانی ساڵی (١١٨٥ز) کۆتایی بە گەشتەکەی هێناوە.([3])

لە کاتی گەشتەکەیدا هێڵی ژیانی بە شێوەیەکی راستگۆیانە تۆمار کردووە، کە بە سەبتەدا گوزەری کردووە و بە کەناراوەسەرێ کانیدینییە و سەقلیە و هەتا چۆتە نێو بەندەری ئەسکەندەرییە، لەویشەوە بەئاراستەی قاهیرە و دواتر سەعیدی میسر و لەوێشەوە بەرەو جەدە و دواتر کاروانەکەی بەرەو مەکە چووە، کە لەوێدا نێزیکەی ساڵ و نیوێك ماوەتەوە، دوای ئەوە لە کاتی گەڕانەوەیدا بە شاری مەدینەدا هاتووەتەوە بەرە و کوفە، سەردانی حلە و بەغدا و سامەرا و مووسڵ و حەلەبی کردووە و لەوێشەوە بۆ دیمەشق کە لەوێدا چەند مانگێك ماوەتەوە، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ غەرناتە.([4])

لەو پەرتووکەی کەناوی ناوە (یادەوەری هەواڵ لە رێکەوتنی گەشتەکان) تەواوی بینین و سەرنجەکانی تۆمار کردووە، کە ناسراوە بە (گەشتی ئیبن جەبیر) و سەرجەم پەسن و کۆی ئەو شتانە دەگرێتەوە کە لە تێپەڕبوونی شاراندا بینویەتی، هەروەها ئەو شتە سەرسوڕمانانەی لە وڵاتان و سەمەرەی دیمەنەکان و، بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری، لە دووتۆی ئەمەشدا گرینگییەکی زۆری بە باس و لایەنی ئاینی داوە، لە رووی باسکردنی مزگەوت و گۆڕی یاران و پیاو چاکان و سەردانی حەج و کۆڕ و دانیشتنی واعیزان و نەخۆشخانەکان، هەروەها باسی کڵێسەو قەڵاکانی کردووە،

---

١ - ملطفای الشهابي، المصادر نفسة، ل٧١.

٢ - رحلة ابن جبير، ل٧-٨.

٣ -االمصادر نفسة، ل٣٢٠.

٤ - االمصادر نفسة، ل٣٢٠.

هەروەها ئاماژەی بەو جەنگانە کردووە کە لە نێوان موسڵمانەکان و خاچهەڵگرانو ئەو پێوەندییەی لە نێوان هەردوولایاندا هەبووە لە کاتی ئاشتیدا.

بەڵام سەبارەت بە کورد، ئەمە سەرەڕای ئەوەی باسی لایەنی ئابووری و ئاوەدانی و سیاسی هەندێ شاری جەزیرەی کردووە کە ئیبن جەبیر سەردانی کردووە[1] وەکو رەئس ئەلعین و دنیسر.[2] لێرەدا تیشك دەخاتە سەر مەترسییەکانی گەشتەکەی کە بەرەو مووسڵ لەوێوە بۆ نەسیبین و هەتا دنیسەر دەکات، هەر وەکو خۆی باسی دەکات و دەڵێت: (هێرشی ئەو کوردستانەی لە هەموو لایەکەوە نەهامەتییە، خەڵکی سەردەبڕن و گەندەڵی سەر ئەو زەوییەن، شوێنی نیشتەجێبوونیان لەنێو چیاکانە و دەکەوێتە نێزیکی ئەو ناوچانەی باسمان کردووە، بەڵام خوا یارمەتی دەسەڵاتدارەکانی ئەوانی نەداوە بەردەوام بن لەسەر ئەو سەرکوتکاری و چۆنییەتی نەریتی خۆیان، هەندێ جاریش گەیشتوونەتە دەسەڵات لە نەسیبین، کەسیش نەبووە بەرگرییان لێبکات، تەنیا خوای تاك و تەنیا نەبێت).[3]

ئەوە یەکەم جارە ئیبن جەبیر بەو شێوەیە باسی کورد دەکات لە پەڕتووکەکەیدا، لە لایەکی دیکەوە ئەو زۆر جار ئاماژەی بە سەلاحەدینی ئەیوبی کردووە و رۆڵی خۆبەختکردوانە و دادپەروەری و خزمەتکاری باش و مەزنە بێوەنەکانی کە پێشکێشی خەڵکانی کردووە، بەڵام بەبێ ئەوەی ئاماژە بەوە بکات کە کورد بووە، یان شتێك لەبارەی ژیانی ئەو مەزنە باس بکات، بەڵام هەموو بۆنەیەکی بەهەل زانیووە بۆ ئەوەی باسی لێوە بکات.[4]

ئیبن جەبیر لە شاری ئەسکەندەرییە لە ساڵی (٦١٤ك/١٢١٧ز) کۆچی دوایی کردووە.[5]

---

١ -رحلة ابن جبير، ل٢١٤-٢١٥.

٢ - االمصادر نفسة، ل٢١٦.

٣ --االمصادر نفسة، ل٢١٥.

٤ -ينظر لفحات:١٤، ١٦، ٢٣، ٢٥، ٣٣، ٣٨، ٤٥، ٥٤، ٧٣، ٨٠، ١٢٤، ١٤٩، ٢٠٧، ٢١٦، ٢٢٢، ٢٦٠، ٢٧٢.

٥ -ملطفى الشهابي، المصادر نفسة، ل٧٥.

## سێیەم: وڵاتناس و گەڕیدەکانی سەدەی شەشەم و نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەمی کۆچی:

### - یاقوتی حومەوی (٥٧٥-٦٢٦ك/١١٧٩-١٢٢٩ز)

ئەو بەشە بە باسکردنی وڵاتناسێکی گەورە کۆتایی پێ دێنین، کە بابەتەکانی وڵاتناسی گەیاندە لووتکە لە دووتۆی فەرهەنگە گشتگیرەکەیەوە (فەرهەنگی وڵاتناسی) کە ناوی ئەبو عەبدوڵا یاقوت کوڕی عەبدوڵا شەهاب ئەلبەغدادییە، بە رەچەڵك دەگەڕێتەوە بۆ حەمات کە لە بەغدا دانیشتوون، لە ساڵی (٥٧٥ك/١١٧٩ز) لە دایکبووە لە وڵاتی رۆم (ئەنادۆڵی ئێستە)، دواتر هەر لە تەمەنی بچووکییەوە لە وڵاتەکەی خۆی بە دیل دەگیرێت، رۆمی لەبارەیەوە دەڵێت، یەکێك لە بازرگانەکانی بەغدا کڕیویەتی بەناوی (عەسکەر کوڕی ئەبی نەسر ئەلحەمەوی) رەچەڵەکی یاقوتیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو یان بۆ ئەو بازرگانە، هەر بۆیە ناویان ناوە یاقوت ئەلحومەوی.([1])

ئەو بازرگانە بەغدادییە بینویەتی زۆر سوودی لێ وەردەگرێت بۆ ئەوەی پشتی پێ ببەستێت لە کاری ژمێریاری و نووسیندا، بۆیە ناردوویەتییە قوتابخانە بۆ ئەوەی فێری خوێندن و نووسین ببێت، بەڵام یاقوت دەستی کردووە بە فرەوانکردنی خوێندنەکەی، گرینگی بە رێزمان و ئەدەب داوە، بۆیە بەخێوکارەکەی بە کاری بازرگانی ناردوویەتی بۆ کەنداو و عومان و شام، ئەمەش وای کردووە یاقوت حەزی بچێتە ئەو گەشتانە.([2])

---

١ -ابن خلكان، المصادر نفسة، ج٥، ل١٠٤.

٢ - بۆ زیاتر سەیری (المنذري، التكملة لوفيات النقلة، تحقيق: بشار عواد معروف، (بيروت، ١٩٨١)ج٣، ل٢٤٩.ابن مستوفي الاربيلي، نباهة البلد الخامل بمن ورودة من الاماثل (المعروف بتاريخ اربل) حققه وعلق عليه سامي بن السيد خماس اللفار، (بغداد ١٩٨٠) ق١، ل٣١٩-٣٢٣، ابن خلكان، المصادر نفسة، حقق الوله وكتب هوامشه يوسف علي الطويل و كريم قاسم الطويل، دار الكتب العلمية، ط١، (بيروت:١٩٩٨)ج١، ل١٠٣-١١٦.

دواتر ئەو پیاوە یاقوت دەکاتە نۆکەری خۆی لە ساڵی (٥٩٦ك/١١٩٩ز) هیچ کێشە و ناکۆکیەك لە نێوانیاندا روونادات، بۆیە یاقوت دەست دەکات بە نووسینەوەی پەڕتووکەکەی، بەمەش قازانجێکی زۆر دەکات، هەر بەوەش هەوادارانی زانست و ئەدەب دەناسێ.([١]) بۆیە ئەو پێوەندییەی لە نێوان گەورەکەیی و یاقوتدا هەیە ناگەڕێتەوە دۆخی جارانی، یاقوت دووبارە لە گەشتە بازرگانییەکانی تێهەڵدەچێتەوە، لە کاتی گەڕانەوەیدا دەبینێ گەورەکەی مردووە و لەدوای خۆیشی هەندێ وەسیەتی کردووە کە هەندێ لە سامانەکەی پێ ببەخشن.([٢])

دوای ئەوە خەریکی کاری بازرگانی پەڕتووك دەبێت، بەڵام حەزی لە گەڕان و سووڕان دەبێت، بۆیە دەست دەکات بە گەڕانێك بە وڵاتی فارس و دوورگەی عارەبی و ئاسیای بچووك و میسر و شام. چەند دادەبەزێ، پەرۆشی زیاتری  بۆ کۆگەی پەڕتووکی وڵاتان دەبوو، لە شاری مەرو دەستی کرد بە دانانی پەڕتووکەکەی (فەرهەنگی وڵاتان)([٣]) کە بەرهەمی سێ گەشتی دوور و درێژ و جیاجیا بوو، کە لێی دانەبڕا تەنیا دوو ساڵ پێش مردنی نەبێت.([٤])

وەکو دەزانین لە شاری مەرو کە یەکێکە لە شارە گەورەکانی خوراسان، پەڕتووکخانەکەی یەکێك بووە لەو سەرچاوە گرینگانەی کە یاقوت زانیارییەکانی لێ نۆشکردووە، یاقوتیش لە دووتۆی باسکردنی شاری مەروی شاهجاندا جەخت لەوە دەکاتەوە، ئەگەر داگیرکردنی مەغۆل نەبوایە، ئەوا لێی جیا نەدەبۆوە و تا دوا ساتەکانی تەمەنی لە شاری مەرو دەمایەوە، کاتێکیش بەجێی هێشت دە پەڕتووکخانەی تێدا بوو کە دەرگاکانیان لەبەردەم خەڵکان کرابۆوە، لە مزگەوتەکەیشی دوو پەڕتووکخانە هەبوو، یەکێکیان نێزیکەی دوازدە هەزار بەرگی تێدابوو، زۆر بەئاسانی پێی دەگەیشت، لە ماڵەکەیشیدا بە بەردەوام دوو سەد پەڕتووك هەبووە، رەنگە لەمەش زیاتر بووبێت، هیچ کەسێکیش نەی دەپرسی بەهای ئەمانە چەندە، ئەوانە رەنگە نرخیان لە دوو سەد دینار (زێڕ) تێپەڕی دەکرد، چێژی زۆری لە خوێندنەوەی ئەو پەڕتووکانە وەردەگرت، ئەو

١ - ابن خلكان، المصادر نفسة، ج٥، ل١٠٨.

٢ -ابن المستوفي، المصادر نفسة، ل٣٢٠.

٣ -ابن خلكان، المصادر نفسة، ل١١٠.

٤ - عبدالرحمن حميدة، المصادر نفسة، ل٢٤٤.

سەرقاڵییەی بەو پەڕتووکانە وای لێکردبوو هەموو وڵاتان و هەتا ماڵ و منداڵەکانیشی لەبیر بچێتەوە.([1])

یاقوت گرینگی بە چەندین ئارەزوو دەدا، بگرە ئەنسکلۆپیدیایەك بوو لە بوارەکانی زانست و زانیارییدا، لە گرینگترین دانراوەکانی: فەرهەنگی وڵاتان، فەرهەنگی بیابان، و پەڕتووکی (المشترك وچعا وامفترق صقعا) و پەڕتووکی (المبداو والمال) لەبارەی مێژووەوە، هەروەها پەڕتووکی ((وڵات) و پەڕتووکی (اخبار المتنبی) و هەروەها کۆمەڵێك وتەی ئەبی عەلی فارسی، و (المقتچب فی النسب).([2])

ئەوەی لێرەدا گرینگە پەڕتووکی (فەرهەنگی وڵاتان)ـــە کە یاقوت دوای ساڵی (٦١٥ك/١٢١٨ز) ی لە نووسینی بۆتەوە، رەشنووسی یەکەمی ئەو پەڕتووکەی لە شاری حەلەب لە بیستی مانگی سەفەری ساڵی (٦٢١ك) بەرامبەر بە چواردەی مانگی مارسی ساڵی (١٢٢٤ز) یان ساڵی (٦٢٣ك/١٢٢٥ز) بووە.([3])

یاقوت لە پێشەکی پەڕتووکەکەیدا باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە ئەوەی پاڵی پێوەناوە بۆ نووسینی پەڕتووکێکی لەو جۆرە، قورئانی پیرۆز بووە، کە لە یەکێك لە ئایەتەکانیدا هاتووە (افلم یسروا فی الارچ فتکون اهم قلوب یعقلون بها او اژان یسمعون یها فانها لا تعمی الابصار ولکن تعمی القلوب التی فی الصدور).([4]) چەندان ئایەتی دیکەش کە باس لە گەڕان و خوێندنەوەی کاروباری وڵات و شارەکان دەکات.([5])

لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی وای کرد یاقوت پەڕتووکەکەی بەو شێوەیە پۆلێن بکات، کاریگەر بوونی بووە بە یەکێك لە ئەنجوومەنی زانستی شاری مەروی شاهجانی پایتەختی هەرێمی خوراسان، کە لەسەر شێوەی جوڵەی زمانەوانی وشەی (حەباشە) کە لە یەکێك لە بازاڕەکانی عارەب لەسەردەمی جاهیلی گۆ دەکرا، کە ئایا وشەکە لە پێشەوە بە زەمە دەنووسرێت یان دەستبەسەرداگرتنە، دوای ئەوەی یاقوت بە پەڕتووکە زۆر و زەبەندەکاندا چۆوە، نەیتوانی بگاتە مەبەستێك کە دڵنیابێتەوە لەوەی وشەی

---

١ -معجم البلدان، ج٨، ل٢٥٤-٢٥٥.

٢ -ابن المستوفي، المصادر نفستقنل٣٢٤، ابن خلكان، المصادر نفسة، ج٥، ل١١٢.

٣ -كراتشكوفسكي، المصادر نفسة، ق١، ل٢٧٦، لسترنج، المصادر نفسة، ل١٢.

٤ -سورة الحج، الاية:٤٦.

٥ - معجم البلدان، ج١، ل١٧.

(حباشه) به زەمەیە نەك (حباشه) بە دەستبەسەرداگرتنه، کە ئەو سوور بوو لەوەی دووەم راستە، یەکێك لە دانیشتووەکانی ئەو ئەنجوومەنە بەبێ بەڵگە، بینی زۆر پێویستە پەڕتووکێك هەبێت گشتگیر بێت و سەرجەم ناوی بابەتەکان و جوڵەی زمانەوانی لەخۆ بگرێت، تەنیا ئەوەی هەبێت، ئەوا (فەرهەنگی وڵاتان)ـــە.([1])

سەرەڕای ئەوەی یاقوت لە لایەن هەندێ لە هاوڕێکانییەوە داوای لێکراوە کورتیەك لە فەرهەنگی وڵاتان دابنێ، بەڵام ئەو لەسەر ئەمە رازی نەبووە، بەڵام دوای ئەوەی سەدەیەکی بەسەردا تێپەڕبووە، عەبدولمونعم عەبدولحەق (لەدایکبوون:٧٣٥ك/١٢٣٤ز) بەو کارە رابووە، پەڕتووکێکی بەناوی (مراصد الاگلاع على اسماو الامكنه والبقاع)ی داناوە.

ئەو کارانە بە هەر شێوەیەك بووبێت، یاقوت هەستاوە بە دانانی پەڕتووکێکی دیکە لەبارەی وڵاتان، مەبەستمان لێرە (المشترك وچعا)یە، کە ئەوە ناونیشانێکی نوێی پەڕتووکەکەی بووە، کە رەشنووسی یەکەمی لە ساڵی (٦٢٣ك/١٢٢٦ز٩ یان لە ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز٩ نووسیوە، کە دەکاتە ساڵی مردنی، داڕشتنەوەی ئەو پەڕتووکە لەگەڵ کەمێ گۆڕانکاری بە شێوەیەکی کەم لە ناونشانەکەی بۆتە (المشترك وچعا والمفترق صقعا). دواتر ئیبن خەلەکان دانەیەکی لەو دەست نووسە دەست کەوتووە و پەڕتووکەکەی خۆی بەناوی (وفيات الاعيان) لێ هەڵێنجاوە.([2])

یاقوت لە دووتۆی ئەو دوو پەڕتووکەدا لەبارەی وڵاتان، بابەتێکی جوگرافی وامان پێشکێش دەکات، کە بە شێوەیەکی بەرچاو دەچێتە سەرووی هەموو ئەوانەی لە پێشترا پێشکێش کراون، نەك هەر تەنیا لە رووی گەورەیی و سەنگینی بابەتەکانی کە لە سەرچاوەکانی پێش خۆی کۆی کردوونەتەوە، بگرە بەهۆی ئەو تێبینیە راستەوخۆیانە و ئەو گرینگیدانە زۆرەی بە سەرجەم وڵاتان بەبێ جیاوازی.([3])

نابێتە زیادەڕۆیی ئەگەر بڵێین یاقوت بۆتە چڵەپۆپە لە بواری فەرهەنگی وڵاتان لە لای موسڵمانەکان، هەروەها نابێ ئەوەش لەیاد بکەین وەکو کراچکۆفسکی دەڵێت: یەکەم فەرهەنگی جوگرافی لە ئەورووپا دەرکەوتبێت فەرهەنگی ئۆتلی (ORTELIUS) بووە لە سەدەی شازدەیەمی زاینی (دەیەمی کۆچی) ئەوەش واتای ئەوەیە

---

١ -االمصادر نفسة، ج١، ل١٨.

٢ -كراتشكوفسكي، المصادر نفسة، ق١، ل٢٧٧.

٣ -المرجع نفسة، ل٢٧٨.

پەڕتووکخانەی جوگرافی ئیسلامی چەندان فەرهەنگی تێدابووە پێش ئەوەی ئەوروپا فەرهەنگی جوگرافیا بناسێت بە چەندین سەدە.([1])

لەگەڵ ئەوەش وەکو پێشدەستییەکی مێژوویی، ئەوا فەرهەنگی وڵاتان بە یەکێك لە باشترین ئەو پەڕتووکانە دادەنرێت کە نووسەرێکی موسڵمان لە سەدەکانی ناوەڕاست دایبنابێت، لەبەرئەوەی دیوانێکی جوگرافی گەورەیە و، گەوهەرێکە لە نموونەی پاك و پوختی دانایی و زانستی مرۆیی بە درێژایی مێژوو.([2])

ئەگەر سەیری فەرهەنگی وڵاتان کە یاقوت لە پەڕتووکی (المشترك) پێشکێشمانی کردووە، سەیر دەکەین زیادکردنێکی بێوێنە و زۆری هێناوەتە کایەوە، ئینجا هەست بە پێگە و شوێنی ئەو وڵاتناسە دەکەین، کە خزمەتێکی زۆر مەزنی بە زانست و زانیاری مرۆڤایەتی کردووە لە بواری جوگرافیادا.

ئەوەی تێبینی دەکرێت لە میتۆدی یاقوت بۆ چارەسەرکردنی پێگە و سەقامگیری مرۆڤایەتی لە وڵاتی کوردستان و ئەوانی دیکە:

- گرینگیدان بە جێگیرکردنی ناوەکان بە پشت بەستن بەو زانیارییانەی لە پەڕتووکەکانی پێش خۆیدا هاتووە.
- ئاگەدار بووە لە شێوەی پێکچوون و جیاوازی لە دانانی ناوەکاندا.
- دیاری کردنی پێگە کارگێڕییەکانی شارەکان یان گوندەکان و، پۆلێنکردنی نێوەندی ئاوەدانی هەتا شارە گەورەکان و شارە ئاساییەکان و شارەوانی و گوند و ئەو شوێنانەی سەر بە گوندەکان بووە.
- دڵنیابوون لە بارودۆخی ئەو شوێنانە لە رووی هەرەسهێنان و لە ناوچوون، هەروەها بەراوردکردنی بارودۆخی ئەو جێگەیە لەو سەردەمە و لەگەڵ ئەوەی لە رابردوودا چۆن بووە.
- دیاری کردنی پێگەی گەردوونی شارو گوندەکان.

گرینگی (فەرهەنگی وڵاتان) لێرەدا بەدیار دەکەوێت و خۆی لە پەڕتووکەکانی دیکەی وڵاتناسی جیادەکاتەوە، لەبارەی کورد و وڵاتەکەیان، لە رووی بابەتی جوگرافیا و زانیاری گشتیەوەیە، ئەوەی یاقوت لە پەڕتووکەکەیدا لەبارەی وڵاتی کوردستان

---

١ -المصادر نفسة ل٣٣٥.

٢ -حسين مؤنس، تاريخ الجغرافيا والجغرافيون، ل٤١٨.

خستوویەتیە روو، ئەوەیە لە سەرچاوەکانی دیکەدا نییە، ئەوەی لە فەرهەنگەکەیدا دەیبینین لەبارەی مەڵبەندی ئاوەدانی کوردستان لە شار و گوند و ئەوانی دیکە، زۆر لەوە زیاترە کە لە سەرچاوەکانی دیکەی وڵاتناسیدا هەیە.

لەسەر ئەو بنەمایە هەر لێکۆڵینەوەیەك لە بنەماکانی شارستانییەتی کۆمەڵگەی کوردی لەسەردەمەکانی ئیسلامدا، هەر دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ ئەو پەڕتووکەی باسمان کردووە، کە زۆر بە وردی باسی وڵاتی کوردستان دەکات و، تێیدا بەسەدان مەڵبەندی ئاوەدانی کە ڕەنگدانەوەی رووی شارستانی کورد نیشان دەدات لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامیدا خراوەتەڕوو، ئەو قسەیەش بە درۆ دەخاتەوە کە کورد شارستانی نەبوونە، لە لایەکی دیکەوە زۆری ئەو زانا و پیاوچاکانەی کە وڵاتی کوردستانیان هێناوەتە بوون، کە یاقوت ئاماژە بە هەندێکیان دەکات لە کۆتایی باسی هەر شارێك یان هەر گوندێك. ئەمەش رەنگدانەوەی لایەنێکی دیکەی شارستانییەتی کورد دەگەیەنێت، جەختیش لە بەردەوامی کورد دەکاتەوە کە لەگەڵ کاروانی زانست و شارستانییەت ڕێی کردووە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا.

هەروەها ئەوەی جێگەی سەرنجە بە دەیان جار باسی کورد و تیرەکانیان لە فەرهەنگی وڵاتاندا دەکات، واتە لەو هەشت بەشەی پەڕتووکەکەیدا بەش نییە تێیدا باسی کوردی نەکردبێت.

بەڵام سەبارەت بە مردنی یاقوت، ئەوا لە بیستی مانگی رەمەزانی ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٩ز) لە شاری حەلەب کۆچی دوایی کردووە، کە تەمەنی لە شەست ساڵیدا بووە.([1])

بەو شێوەیە لەماوەی ئەو چەند لاپەڕەیەی پێشەوە بە کورتی باسمان لە دیارترین ئەو گەڕیدە و وڵاتناسە موسڵمانانە کرد لە دووتۆی لێکۆڵینەوەکەماندا، چونکە بینیم هەڵوەستەکردن لەسەر ژیان و ناسینی بەرهەمەکانیان سوودێکی زۆری دەبێت، بۆ ئەوەی ئەوە ببێتە پێشدەستیەك بۆ بەشەکانی دیکە کە باسی لایەنە جیاجیاکانی ئاوەدانی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و لایەنەکانی دیکە دەکەین، کە وڵاتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان باسییان لێوەکردووە کە پێوەندییان بە کورد هەبووە.

---

١ - وفيات الاعيان، ج٥، ل١١٦.

# بەشی دووەم

## وڵاتی کوردستان.. وەکو لە پەڕتووکی وڵاتناس و گەڕیدە موسڵمانەکاندا هاتووە:

### یەکەم: وڵاتی کوردستان و پێگەی لە نێو حەوت هەرێمەکەدا:

کورد بە یەککێك لە دیارترین ڕەگەزەکانی مرۆڤایەتی دادەنرێت کە لە ڕۆژهەڵات و ناوچەکەدا هەبووبێت و، هەروەها هەر لەسەردەمەکانی زووەوە ڕۆڵێکی کاریگەرییان هەبووە لە ناوچەکە لە ڕووی رامیاری و سەربازی و شارستانییەوە. بوونیان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی وای کردووە ئەرکێکی سیاسی و شارستانیی وازی بکەن شان بەشانی گەل و نەتەوەکانی دراوسێ، لەو ڕووەوەش ڕۆڵی مێژوویی خۆیان وازی کردووە.

هەڵبەت دیاری کردنی سنووری وڵاتی کوردستان لە ماوەی دەسەڵاتی ئیسلامیدا بە شێوەیەکی گشتی دیاری کراو نەبووە، چونکە ئەمە بە شێوەیەکی جێگر نەبووە، لەبەرئەوەی ئەو وڵاتە دابەشبووە بۆ سەر چەند هەرێمێك و لەژێر ناوی جیاجیا بووە.[1]

---

١ - ئەو جیاوازییە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش ئیسلام، هەر بۆ نموونە لە سەرچاوەکانی یۆنانی و رۆمانی ئەو ناوچانەی کەوتۆتە باکووری وڵات (وڵاتی نێوان دوو رووبار کە بە (میسوپۆتامیا) ناسراوە لەو کاتدا، لە کاتێکدا سەرچاوەکانی سریانی بە هەرێمی ئاشوور ناویان بردووە، بەڵام سەرچاوەکانی ئیسلامی ئەو ناوچەیەیان بە هەرێمی جەزیرە و هەندێ جاریش بە هەرێمی ئاقوور ناساندووە.

بۆ زیاتر زانیاری سەیری: مینورسکی، الاکراد ملاحظات وانطباعات: ترجمة معروف خزندار، (بیروت:١٩٨٧) لیرخ، دراسات حول الاكراد، ترجمة: عبدي حاجي (بغداد:١٩٨٦)ل١٤-١٥، درايفر، الكرد

ئەمەش بارودۆخێکی سیاسی و ئیداری و جوگرافی ئەو سەردەم سەپاندوویەتی، ئەگەر سنووری هەرێمێکی وەکو جەزیرە([1]) ناکۆکی لەسەر بێت لە لایەن ولاتناسەکانەوە، ئەوا ناکۆکی سەبارەت بە سنووری ولاتی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی شتێکی ئاشکرایە.

دەکرێ ئاماژە بەوە بکەین کە لێکۆلڤان بە شێوەیەکی مەبەستدار زاراوەی (ولاتی کوردستانی) بەکار هێناوە لە جیاتی زاراوەی (کوردستان)، چونکە دەلالەتی وشەی یەکەم سوودی بۆ ئەو لێکۆڵینەوەیە زیاترە، لەبەرئەوەی بەکارهێنانی وشەی دووەم لە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی و ولاتناسیی لە دووتوێی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا بەکار نەهاتووە، بۆ وردی و بۆ دڵنیایی لە لێکۆڵینەوەکەمان ئەو وشەیەمان بەکار نەهێناوە.

ئەوەی شایەنی باسکردنە بەکارهێنانی زاراوەی (کوردستان) بۆ یەکەم جار لە سەرچاوە مێژووییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی کۆچی/ بەرامبەر بە بە سێزدەی زاینی، مەبەستیش لەمە یەکێك بووە لە کەرتەکانی کارگێڕی کە هەرێمی چیاکانی ڕۆژئاوای لە خۆگرتووە، کە برێتی بووە لە شازدە شار و شارۆکە، پایتەختەکەیشی قەلای بەهار بووە کە کەوتۆتە باکووری شاری هەمەدان.([2])واتە وشەی (کوردستان) بە واتای هەموو ولاتی کوردستان نەبووە و بە هەموو ئەو شوێنانە نەگوتراوە کە کوردی تێدا نیشتەجێ بووە.([3])

هەندێك کەس باوەڕیان وایە کە ولاتناسی فارسی (حەمەدەللا مستوفی قەزوینی (لەدایکبوون:٧٥٠ك/١٣٤٩ز) یەکەم کەس بووە لە پەڕتووکەکەی خۆیدا (گەشتی دلان) وشەی کوردستانی بەکارهێنابێ، بەلام لە راستیدا هەندێ پەڕتووکی دیکەی موسڵمانان و ئەوانی دیکەش کە لە پێش ئەوان هەبووە، ئەوانیش هەمان وشەیان بەکارهێناوە لە نووسینەکانیاندا، هەر بۆ نموونە گەر سەرنج بدەین گەڕیدەی ئیتالی (مارکۆپۆلۆ ( mrco

---

في ملادر القديمة، ترجمة: فؤاد حمة خورشيد، (بغداد: ١٩٨٦)ل٣٣-٣٤. ابن العبري، غريغوريوس اللمطي، تاريخ مختلر الدول(بيروت:د/ت)ل١١-١٥، الالطرخي، ابو اسحاق ابراهيم بن محمد الفارسي الكرخي، المسالك والممالك، تحقيق محمد جابر عبد الال الحسيني (القاهرة:١٩٦١) الاقاليم، ل١٢١.

١ - ينظر: الالطرخي، المصادر نفسة، ل٥٢-٥٣. المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٢-١٢٣.

٢ -للمزيد ينظر: زرار لديق، كردستان في قرن الثامن الهجري (اربيل، ٢٠٠٠)ل٤٦-٤٩.

٣ - لەم سەردەمەدا وشەی کوردستان لە ئێران بە واتای (کوردستانی موکریان) و (کوردستانی ئەردەلان) بەکار هاتووە، سعيد خضري، جغرافیای طبیعي كوردستان موكريان (تهران:١٣٧٩ه)ل١٢.

polo) (لەدایکبوون: ٧٢٣ك/١٣٢٣ز) کە بە گەشتێکی بەناوبانگ هەستاوە بۆ ڕۆژهەڵاتی سنە (٦٧٠ك/١٢١٧ز) وشەی (کوردستان)ی بەکارهێناوە لەو گەشتەیدا تۆماری کردووە، هەروەها لای ڕەشیدەدین فزلەللا ئەلهەمەدانی (لەدایکبوون:٧١٨ك/١٣١٨ز) کە مێژووی مەغۆلەکانی نووسیوەتەوە لە پەڕتووکەکەیدا (جامع التواريخ) کە تێدا وشەی (کوردستان)ی چەندان جار تێدا هاتووە.([1])

ئەگەر وڵاتناسەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی جەختیان لە دابەشکردنی گەردوونی بۆ زەوی ئاوەدان بۆ حەوت هەرێم کردبێتەوە، ئەوا وڵاتناسانی سەدەکانی دواتر هەوڵیان داوە جیهانی ئیسلامی دابەشبکەنە سەر چەندان هەرێم، ئەوشەیان بە نەزەری ئیعتبار وەرگرتووە بۆ ئەو ڕەهەندە ئیداری و جوگرافییە، یەکەم ئامانجیش لەو دابەشکردنە، کارگێڕییەتی هەرێمەکان بووە بۆ ئاسان کردنی پرۆسەی ئیداری و کۆکردنەوەی باج، چونکە پرۆسەکان بە شێوەیەکی مکوم نەبووە لە وڵاتێك کە لە چەندین لاوە دەورە دراوە، وەکو دەوڵەتێکی ئیسلامی لەسەرمە جیاجیاکانیدا.

بە ڕاستی نەبوونی قەوارەیەکی سەربەخۆ کە سەرجەم پارچەکانی کوردستان لەخۆ بگرێت، بە تایبەتی لە مێژووی ئیسلامی بۆتە ئاستەنگێك لە دیاری کردنی سنووری هەرێمەکان لە کۆنەوە تاکو ئێستە کە سەر بەو دەوڵەتە بووە یان ئەوی دیکە، بەسەر ئەمەشدا چەندا ماوە تێپەڕ بووە و لێیان خواردوە و بۆتە بچووکبوونەوەی سنووری کوردستان لە هەموو لایەکەوە.([2]) هەر لێرەوە لێکۆڵەنەکان ڕای جیاوازییان هەیە لە

---

١ - للمزيد ينظر: رشيد الدين فضل الله الهمذاني، جامع التواريخ، (الترجمة العربية): (القاهرة:د، ت) ل٢٦١-٢٦٢. حمد الله المستوفي القزويني، نزهة القلوب، (طهران:١٣٣٦ه.ش)ل١٢٧. كاركوبولو، رحلة ماركوبولو، ترجمة:عتبدالعزيز جاويد، (ملر:١٩٧٧)ل٤٥.باسيل نيكيتين، الاكراد اللهم وتاريخهم، (بيروت:١٩٥٨)ل٢٥. م: جەمیل ڕۆژبەیانی ، سولتان سەنجەری سەلجوقی کوردستان سلێمان شا بەبوە، گۆڤاری ڕوشەنبیری نوێ، ژمارە (١١٨) (بەغدا، حوزەیرانی ١٩٨٨) ل٢٢-٢٦، زرار سديق، توفيق، هەمان المصادر نفسه، ل٥.

٢ - محسن محمد حسين، نناشد للاح الدين ام نحاسب انفسنا، (اربيل:٢٠٠٢) ل٢٣.

دیاری کردنی سنووری کوردستان لە هەر چوار لاوە بە تایبەتی لە هەندی شتی بچووکدا.([1])

زۆر پێویستە دەستنیشانی پێگە و جێگەی ولاتی کوردستان لەو حەوت هەرێمەدا دەستنیشان بکەین، پێش ئەوەی باسی هەرێمەکان بکەین کە ئەو ولاتانەیان بەسەردا دابەشبووە، ئەوەش پێویست دەکات هەلوەستە لەسەر بێژەی (هەرێم) و بنچینەی ئەو دابەشکردنە گەردوونییە بکەین.

لە دووتۆی خوێندنەوەی سەرچاوەکانی ولاتناسیدا، تێبینی ئەوەدەکەین خاوەنەکانیان زۆر بێژەی (هەرێم)یان بەکارهێناوە، ئەم دابەشکردنەشیان بە سەر زەوییە ئاوەدانەکاندا دابەشی سەر چەند هەرێمێك کردووە، هەتا هەندێك لە ولاتناسەکان وشەی (هەرێم)یان کردووەتە ناونیشانی پەرتووکەکانیان، وەکو دەلێن (پەرتووکی هەرێمەکان) کە دەگەرێتەوە بۆ هیشام ئەلکەلبی، یەکەم پەرتووکە لەو بوارەدا، کە دیارنەماوە و بزربووە، لە پەرتووکەکانی دیکە پەرتووکی (سەرسورهێنەرەکانی حەوت هەرێمەکە هەتا کۆتایی ئاوەدانی)ی سوهراب لە کۆتاییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی و، پەرتووکی (شێوەی هەرێمەکان) ی بەلخی لەسەرەتاکانی سەدەی چوارەمی کۆچی و، پەرتووکی (شێوەی هەرێمەکان)ی ئەستەرخی لە ناوەراستی هەمان سەدە و، پەرتووکی (باشترین دابەشکردن بۆ زانینی هەرێمەکان)ی مەقدەسی لە نیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی کۆچی.

کاتێ سەیری وشەی (هەرێم) دەکەین دەبینین جیاوازییەك هەیە لە رووی چەمکەکە و بچنیەکەیی و پێکهاتەکەی لە نێوان ولاتناسە موسلمانەکاندا، یاقوت بەو شێوەیە باسی

---

١ - ئەولیا چەلەبی، کورد لە مێژووی دراوسێدانیدا، سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، وەرگێرانی: سەعید ناکام، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد (بەغداد:١٩٧٩) ل٩٠. شەریف پاشا، یاداشتنامە لەبارەی داخوازییەکانی گەلی کوردەوە، وەرگێرانی لە فەرنسییەوە: فەرهاد پیربال، گۆڤاری رابوون، ژمارە (٢) (ستۆکهۆلم:١٩٩١) شاکر خصباك، کوردو مەسەلەی کورد، وەرگێرانی ئەمین موتابچی (بەغداد:١٩٦١) ل٢٢-٢٤. عەبدوللا غەفور، جوگرافیای کوردستان، چاپی دووهەم، (هەولێر:٢٠٠٠) ل٢٥٤-٢٦٨. عزیز الله بیات، کلیات جغرافیای گبیعی وتاریخی ایران، چاپ دووەم، (تهران:١٣٧٣هش)ل٣٧٣. حسن ارفع، کردها، (نیویورك- تورینتو: ١٩٦٦) ل٧-١٠) علی الغر شمیم، کوردستان: (تهران:د/ت) ل١٣-١٤. جلال الدین شافعی کورد، جوگرافیای تاریخی کوردستان (تهران:١٣٧٨ه.ش)ل٣٢-٣١. mehrdad r.izadyK .the kurds (Washington)p1

دەكات (بەڵام پێكهاتەی هەرێم، كە ئەوە وشەیەكی عارەبییە و هەرێم تاكە و هەرێمەكانیش كۆیە، وەكو نەخشە، نەخشەكان.. وەكو ئەوەی ناونرابێ هەرێم، واتە دابڕێنراو لە زەوی، واتە لێی كراوەتەوە (كەرت كراوە) و (قەڵەم) لە بنچینەی زماندا بە واتای (بڕین) دێت.(1)

ئەبو رەیحانی بیرونیش بەو شێوەیە باسی دەكات: (هەرێم وەكو ئەبو فەزلی ئەهرەوی لە دەروازەی خاوەندارەیەتی (المیل) باسی دەكات. وەكو ئەوەی داوای شوێنی نیشتەجێبوون بكەن بە درێژایی رۆژ.(2)

حەمزەی ئەسفەهانیش لەو بارەیەوە رای وایە كە یاقوت قسەكەی گواستووەتەوە و دەڵێ: (زەوی شێوەی خرە، لە چارەگێك كەمتر خەڵكی لێ نیشتەجێیە، ئەو چارەگەش دوو بەشە، بەشێكی وشكاییە و بەشێكی دەریایە، دواتر ئەو چارەگە دابەش دەبێتە سەر حەوت بەش، بە هەر بەشێك بە زمانی فارسی دەگوترێت (كەشخەر) عارەبیش كەشخەریان لە سریانییەكان وەرگرتووە و ناویان ناوە هەرێم، هەرێمیش ناوێكە بە واتای (رستاق).(3)

لێرەدا رایەكی دیكەش هەیە كە وشەی (هەرێم) لە وشەیەكی یۆنانی وەرگیراوە (KILMA) كە زانای گەردوونی هیباركوس (Hipparchus)ی یۆنانی بەكاری هێناوە لە سەدەی دووەمی پێش زاینی (لە دەوروبەری سالی ١٤٠پ.ز) كاتی سیستەمێكی هێڵكاری هاوشێوەی هێڵی یەكسانی دۆزییەوە و، رووبەری زەوی دابەشكردە سەر ناوچەكان بە پێی درێژی رۆژ لە هەر ناوچەیەكدا لە كاتی وەرگەڕانی هاوینە، هەروەها ناوی لە هەر ناوچەیەكیش ناوە (kilma) و بۆ ناوچەكانیش (kilmata) بە شێوەیەك كە درێژی رۆژ لە هەر ناوچەیەكدا تا رادەی نیو كاتژمێر لەیەكترییەوە جیاوازە لە ناچەیەكەوە بۆ ناوچەیەكی دیكە.(4)

---

١ -معجم البلدان، ج١، ل٣١.

٢ - التفیم الاوائل لناعة التجیم، (بغداد:د/ت) ل١٤٤. كذلك: ابن رستة، المصادر نفسة، ل١٢.

٣ -معجم البلدان، ج١، ل٣١.

٤ - محمد محمود محمدین، مفهوم الاقلیم و دراسة عندة المقدسي، ضمن بحوث الامؤتمر الجغرافي الاسلامی الاول، (الریاض:١٩٨٤)مج٣، ل٣٤٢.

ئەوەی شایەنی باسکردنە فارسەکان یەکەم کەس بوون چارەگی ئاوەدانی زەوییان دابەشکردە سەر حەوت بەش و ناویان نا (کشورات).([1]) ئەوەش واتای ئەوەیە، ئەو دابەشکردنە ناگەڕێتەوە بۆ یۆنانییەکان کە ئەوان سیستەمی هەرێمیان دۆزیبێتەوە، کە پێشتر وڵاتناسە موسڵمانەکان لە دووتۆی پەڕتووکەکانیاندا باسیان کردووە.([2])

ئەگەر بارودۆخی سیاسی و کارگێڕی خواستی دابەشکردنی وڵاتی کوردی بووبێت بۆ چەند هەرێمێك، ئەوا دابەشکردنی گەردوونی بە پێی سیستەمی حەوت هەرێمەکە، ئەوا وای دەکرد وڵاتەکە بکەوێتە نێو تەنیا یەك هەرێم، ئەویش هەرێمی چوارەم بوو کە دەکەوێتە نێوان هەموو هەرێمەکان.

لێرەدا زۆر بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە هەندێ لەو شتانە بکەم کە لە لای هەندێ لە وڵاتانەسەکانەوە هاتووە سەبارەت بە هەرێمی چوارەم، ئەوە ناچێتە نێو بۆتەی وڵاتناسییەوە، مەقەدەسی باس دەکات کە (هەرێمی چوارەم سەرەتاکەی کە سێبەر لەو کاتەدا چوار پێ و سێ پێنج و سێیەکی پێنج پێ بێت، پانییەکەی نێزیکەی دوو سەدو شەست میل و نیوی مەبەستدار بووە، ناوەندەکەیشی دەکەوێتە نێزیك ئاقور و مەنبەهج و عەرقە بەرەو رەی، لایە دوورەکەی دەکەوێتە عێراق لە نێزیك بەغدا بەلای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوایەوە، هەروەها لای نێزیکەکەیشی کە شام دەگرێتەوە لە نێزیك قالیقەلا و کەناراوەکانی تەبرستان هەتا دەگاتە ئەردەبیل و جرجان و ئەوەی دەکەوێتە سەر ئەو رێگەیەوە، ئەو شارە بەناوبانگانە لەخۆ دەگرێت: نەسیبین و دارا و رقە و قەنسرین و حەلەب و حەران و سمیسات و سەغور و شامیە و مووسڵ و سامەرا و حەلوان و شارەزوور و ماسبزان و دەینور و نەهاوەند و هەمەدان و ئەسبەهان و مەراغە و زنجان و قەزوین و توس و بەلخ و سەرجەم ئەو شارانەی دەکەوێتە سەر ئەو رێگەیەوە.([3])

هەمەدانیش باس دەکات کە (هەرێمی چوارەم لە ناوەڕاستییەوە دەڕوات بەرە و ڕۆژهەڵات هەتا ڕۆژئاوا بەسەر ئەو ناوچانەی کە رۆژیان درێژ ترە.. لەو شوێنەش دەست پێدەکات کە هەرێمی سێیەم کۆتایی دێت، پانیەکەیشی هەتا دەگاتە ئەو شوێنەی کە

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل٣١.

٢ -کراتشكؤفسكي، تاريخ الادب الجغرافي العربي، ترجمة:للاح الدين عثمان هاشم (القاهرة:١٩٥٧)ق١، ل١٢٦.

٣ -احسن التقاسيم، ل٦٨، ابو عبيدالله البكري، المسالك والممالك، (بلا:د، ت) ل١٨٤.

ڕۆژیان نێزیکەی چوارده کاتژمێر و چارەگێك درێژه، پانیەکەیشی دەگاتە سی و هەشت پلە و نیو، ناوەڕاستی ئەو هەرێمە دەکەوێتە نێزیك ئەسبەهان، ئەو پانییە نموونەی نەبووە لە هیچ جێگەیەکی زەوی، سەرەتاکەی لە ڕۆژهەڵاتی دیکەی زەوی چین و تبت و بەلخ و خوراسان و چیاکان و زەوی مووسڵ و باکووری شام و هەندێ لای سغور و دوورگەی قوبرس و بلاتی تەنجە و هەتا دەگاتە ئاستی مەغریب بەبێ ئەوەی بگاتە دەریای تاریك).[1]

بەڵام ئیدریسی پێگە و جێگەی وڵاتی کوردستان بە شێوەیەکی وردتر دیاری دەکات کاتێ لە بەشی شەشەم باسی هەرێمی چوارەم دەکات و دەڵێ: (ئەوەی لە بەشی شەشەم باسی دەکەین ئەو زەویانەیە کە زیاتر زەوی جەزیرە و هەندێ لە زەوییەکانی ئەرمینیا و هەندێ لە زەوییەکانی ئازەربایجان و وڵاتی پەهلەویەکانە، کە دەکاتە وڵاتی چیاکان و جەزیرە و ئەوەی دەکەوێتە نێوان دیجلە و فورات، ئەوەش هەواری ڕەبیعە و موزەر دەگرێتەوە، هەروەها وڵاتی چیاکان دەسکەرە و خانەقین و قەسری شیرین و سیروان و سەمێرە و قرمیسین و دەینور و زۆزان و کەرخ و دنباوەند دەگرێتەوە، بەڵام وڵاتی پەهەلەوەیەکان ڕەیی و ئەسبەهان و نەهاوەند و میهرجانقزق و ماسبزان و قەزوین و شاری موبارەك لەخۆ دەگرێت).[2]

لەبەرئەوە جێگەی ناوەند کە وڵاتی کوردستان پێی بەهەرەمەند بووە لەگەڵ وڵاتانی دیکە، گرینگی تایبەتی هەبوو کە ئەمە زاناکانیش لەسەری کۆك بوون، وەکو مەسعودی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەبارەی هەرێمی چوارەم کردووە بە ناونیشانی (گەورەیی هەرێمی چوارەم بەسەر هەرێمەکانی دیکەدا، هەروەها باسی ئەوە دەکات کە کەوتۆتە نێوەندی هەر حەوت هەرێمەکە و لە هەمووشیان باشتر و راسترە).[3]

هەروەها یەکێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان تا ئەو ئاستە دەڕوات و باسی خاسیەتەکانی هەرێمی چوارەم دەکات کە ئەوە وای لێکردووە لە ڕووی شارستانییەتەوە دەوڵەمەند بێت وەکو دەڵێت: (هەرێمی چوارەم کە نێوەندە و لە لای زانایانی موسڵمان دەکەوێتە سەر پانتاییەك لە نێوان لایەکی گەرم و لایەکی سارد، کە هەموو بارەکانی ژیانی مرۆڤ و

١ -لغة جزيرة العرب، تحقيق:محمد الاكرع (لنعاء:١٩٨٣) ل٤٨.

٢ -نزهة المشتاق في اختراق الافاق، ل٢٢٨-٢٢٩.

٣ -التنبيه والاشراف، (بيروت:١٩٨١)ل٤٨.

چۆنییەتی کارکردنی لەخۆیدا کۆکردووەتەوە، پێویستە ئەو وڵاتە لەسەر بنەمای یاسای سروشتی زیاتر خەڵکی شارستانی سەر زەوی بن، بۆیە ناوەندی شارستانییەتی ئیسلامی وەکو بەغدا و ئەسفەهان دەکەوێتە نێو ئەو هەرێمەوە).([1])

## دووەم: ئەو هەرێمە جوگرافییانەی وڵاتی کوردستانیان بەسەردا دابەشبووە:

له پێشەوە ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد کە وڵاتناسەکان لەسەر یەك شێوە ڕێکنەکەوتوون لە چۆنییەتی دابەشکردنەکانی وڵاتانی ئیسلامی بۆ هەرێمەکان و کۆر و شار و رستاقەکان، دیارە ئەو زاراوانەش چەسپاو و دیاری کراو نەبووە و هەر هەمووشیان لەسەر ئەوە کۆك نەبوونە، بۆیە ئەو دابەشکردنانە سەرەڕای گرینگییەکەی، شتێکی ناتەواو نەبووە و، وێنەیەکی روونی دنیای سیستەمی ئیداری هەرێمەکانی ئیسلامیان پیشان نەداوە.

وڵاتناسەکان هۆکاری سروشتی و سیاسییان لە چۆنییەتی دابەشکردنەکانیان بە نەزەری ئیعتیبار وەرگرتووە، هەر هەرێمێکیان وەکو شێوەیەکی ئیداری سەربەخۆ وەرگرتووە، بۆ هەر هەرێمێك ناوێکیان داناوە وەکو: مەمالیك، وڵات، زەوی، دیار.([2]) لێرە بەدواوە باسێکی ئەو دابەشکردنە ئیدارییەی هەرێمەکان دەکەین کە وڵاتی کوردیان پێکهێناوە، لەگەڵ خستنەڕووی زانیاری ئاستی ڕێکبوون و ناکۆکی وڵاتناسەکان لەو بارەیەوە، لەگەڵ تێبینی ئەوەی کە نیشتەجێبوونی کورد دەکەوێتە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان و جەزیرەوە.

---

١ - بارتولد، تاريخ الحضارة الاسلامية، ل٥٠.

٢ -لالح احمد العلي، دراسات في الادارة في العهود الاسلامية الاولى، (بغداد:١٩٨٩)ل١٥٤.

### أ- ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان:

وەکو لە دیرۆکەوە ناسراوە ئەو ناوچەیە- لەماوەی لێۆکلێنەوەکەماندا- هەرێمی سەربەخۆ نەبووە، بگرە لە چوارچێوەی هەرێمی چیاکان بووە.[1] ئەو هەرێمە بەربلاوەی کە چەندان کۆرو رستاق و ناحیەی زۆری لەخۆ گرتووە، کە لەسەر زەوییەکانی چەندان نەتەوە و دەستە و تائیفەی جۆراوجۆر دەژیان، لێرەدا ولاتناسەکان سنووری هەرێمی چیاکانیان وەکو یەك بەش دیاری کردووە نەك بەش بەش، شار و تۆبۆگرافیا و پێکهاتە مرۆییەکەیان لەسەر ئەو بنەمایە باس کردووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زۆربەی دانیشوانەکەیان کورد بوونە، بەلام ئەوان ئەوەیان بە سەرنج و تیبینی نەگرتووە، چونکە ئەو بنەمایەی باسی دابەشکردنەکەیان لەسەر بنیاتناوە رەهەندێکی سروشتی و سیاسی و ئیداری دوور لە پێکهاتەی مرۆیی و پێگەکەی وەرگرتووە.

لسترەنگ دەڵێ: هەرێمی چیاکانی دێرین دابەش دەبێت بۆ دوو بەش: یەکەمیان بچووکە کە کوردستان لە ڕۆژئاوایی و ئەوەی دیکە گەورە کە عێراقی عەجەم لە ڕۆژهەلاتییەوە بووە.[2] پێش ئەوەی باسی ڕۆژهەلاتی هەرێمی چیاکان بکەین، بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە سنوور و ناوچە و هەرێمی چیاکان بە شێوەیەکی گشتی بکەم، ولاتناسەکان رای جیاوازییان هەبووە لە دیاری کردنی سنووری ئەو هەرێمە کە ولاتی پەهلەوییەکان بووە.[3] لای هەندێکی دیکە،[4] وەکو هەر هەرێمێکی دیکە بووە، بەلام لەم پێناوەدا پێویستە باسێکی ئەوانە بکەین کە ولاتناسەکان وروژاندوویانە لەو

---

١ - وةكو دةردةكةويَت ئةو بيَذةية لةدواى داطيركردنةكانى مةغؤلةوة بةكار هاتووة، ضونكة قةزوينى ولاَتناسى بةناوبابط ئةمةى بةكارنةهيَناوة، (لةدايكبوون:٦٨٢ك) لسترنج، بلدان الخلافة الشرقية، ل٢٢١.

٢ - المرجع نفسة، ل٢٢١.

٣ -ئەو ناوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانی (٢٢٦-٦٥٠ز) ئەگەر گریمانی بوونی پەیوەندی لەنێوان زمانی فەرمی دانیشتوانی هەرێم لەو سەردەمەدا بکەین، ئەویش بە زمانی پەهەلەوی ناسراوە، بڕوانە: کریستنسن، ايران في عهد الساسانيين، ل٣٣.ادوارد براون، تاريخ الادب في ايران، ترجمة:احمد كمال الدين حلمي، ٠الكويت:١٩٨٤)ل١٤٦.

٤ -بڕوانة: ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٥٨، ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٩٣.

بارەیەوە، کە لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە دەست پێدەکات، کە ئیبن خوردازەبە باسی کردووە (وڵاتی پەهەلەوییەکان رەیی و ئەسفەهان و هەمەدان و دەینور و نەهاوەند و مهرا نەقزق و ماسبزان و قەزوێنی دەگرتە خۆ،([1]) لە بابەتێکی دیکەدا باسی هەرێمی چیاکان دەکات کە ئەمانەی گرتووەتە خۆ: ماسبزان و مهرجەرجا نەقزق و ئاوی کوفە، کە برێتی بووە لە دەینور، ئاوی بەسرەش برێتی بووە لە نەهاوەند و هەمەدان و قوم.([2])

بەڵام یەعقوبی هەرێمی چیاکانی دیاری نەکردووە و، تەنیا بەوە وازی هێناوە کە ئاماژە بە ناوچەی ماسبزان و مهرجەرجا نەقزق و سەمیرە بکات کە دەکەوێتە نێو هەرێمی چیاکان، لە دووتۆی باسەکەیدا لەبارەی رێگەو ماوەی نێوان ناوچەکانی کە دەکەوێتە نێو چارەگی یەکەمی وڵاتی ئیسلام بە پێی دابەشکردنی خۆی، ئەویش چوارەمی رۆژهەڵاتە.([3]) لە کاتێکدا ئیبن رستە هەرێمی چیاکانی بەوە دیاری کردووە کە برێتی بووە لە (ماسبزان و مهرجەرجا نەقزق و ئاوی کوفە کە برێتی بووە لە دەینور، ئاوی بەسرەش برێتی بووە لە نەهاوەند و هەمەدان و قوم.([4]) ئەوەش ئەو دەقەیە کە ئیبن خوردازەبە باسی کردووە بەبێ ئەوەی پێش و پاشی بکات، رەنگە ئەگەری ئەوە هەیە ئەو دەقە لە پەڕتووکی مەسالك و مەمالیکی ئیبن خوردازبە وەرگیرابێت، کە پەڕتووکەکەی پێش پەڕتووکەی (الاعلاق النفسیه)ی ئیبن رەستە داناوە بەچەند دەیەیەك. بەڵام ئیبن فەقێی هەمەدانی کە ئاماژە بە وڵاتی پەهلەوییەکان بەو شێوەیە دەکات کە برێتی بووە لە: (هەمەدان و ماسبزان و مهرجەرجا نەقزەق بووە، کە ئەویش برێتییە لە (سەمێرە و قوم و ئاوی بەسرە و ئاوی کوفە و قرماسین).([5]) ئیبن فەقێ هەر بەوەندە وازناهێنێ لە باسکردنی ناوچە و شارەکان کە دەکەوێتە ئەو هەرێمەوە، بگرە دەچێتە سەر باسکردنی ئەو ناوچانەی سەر بە چیاکانن، کە بەشێك نینە لەو، وەکو دەبینین

---

١ -المسالك والممالك، ل٥٨.

٢ -االمصادر نفسة، ل٣٢.

٣ -البلدان، ل٣٩.

٤ -الاعلاق النفسية، ل١٥.

٥ -االمصادر نفسة، واللفحة، الادريسي، نزهة المشتاق، ل٢٢٣.

بریتییه لە (رەیی و ئەسبەهان و قومس و تەبرستان و جرجان و سجستان و کرمان و قەزوین و دەیلەم و ئەلبیر و تیلستان).[1]

ئەگەر بچینە سەر ولاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی بەرامبەر بە دەیەمی زاینی، دەبینین ئەوان بە شێوەیەکی وردتر و پوختر باسی هەرێمی چیاکان دەکەن و سنوور و ناوچەکانی دیاری دەکەن، بۆیە هەر یەکە لە ئەستەخری و ئیبن حوقەل بەو شێوەیە باسی چیاکان دەکەن کە (ئاوی کوفە و بەسرە دەگرێتەوە هەتا دەگاتە دوو بەشی سەروو تر، لای ڕۆژهەلاتی بەو شێوەیە دیاری دەکات کە بریتییە لە خوراسان و فارس و ئەسبەهان و رەی، لە لای باشووریشیەوە عێراق و خۆزستانە).[2]

ئەستەرخی هەر یەکە لە رەیی و قەزوین و ئەبهر و زنجان لە هەرێمی چیاکانی هەژمار ناکات، بگرە لەسەر دەیلەم هەژماری دەکات، (چونکە بە زنجیرە چیاکانی ئەو ناوچەیە دەورە دراوە)[3] ئیبن فەقێی هەمەدانیش پالپشتی ئەوە دەکات، بەلام هەر یەکە لە ئیبن خوردازەبە و ئیبن رستە لەو جیاوازن، بەهۆی ئەوەی پێش هەمەدانی کەوتوون لە ئاماژەدان بە هۆی ئەو دابەشکردنەوە.

دواتر ئەستەرخی و ئیبن حوقەل باسی شارە بەناوبانگەکانی ئەو هەرێمە دەکەن کە گەورەترینیان: هەمەدان و دەینور و ئەسبەهان و قومن. لەوانیش بچووکتر شاری وەکو : قاشان و نەهاوەند و لوورو کەرجەج و بورجە بووە.

بەلام مەقدەسی کە بە میتۆدە تایبەتییەکەی دەناسرێتەوە، سەرەتای باسەکەی لەبارەی هەرێمی چیاکان بە کۆمەلێك پەسن و تایبەتمەندی تایبەت باس دەکات لەبارەی ناوچە و شارەکان وەکو دەلێت: (توانیمان ئەو هەرێمە دابەشبکەینە سەر سێ ناوچە و حەوت ناحیە و ئەسفەهانیشمان خستە ژمارەیەك و خستمانە سەر ژمارەکە و هەلمانواسی بە لایەکی وێنەکەوە، بە تەنیا باسمان کرد و هەندێ وێنە و واتا کە هەبوون بۆ مان زیاد کرد، یەکەم ناوچە لە پێشەوە کەباس کراوە رەیی و دواتر هەمەدان و دواتر

---

١ -مختلر كتاب البلدان، ل١٩٣.

٢ -الالصطرخي، المسالك والممالك، ل١١٥. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٤٠٣.

٣ -المسالك والممالك، ل١١٥.

ئەسفەهان و ناحیەکانی : قوم و کاشان و سەمێرە و کەرەج و ئاوی کوفە و، بەسرە و شارەزوورە).[1]

هەر بەوەندە ناوەستێت، بگرە باسی رایەکی دیکە دەکات کاتێ ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە هەندێ پەڕتووکدا ئەوەی خوێندووتەوە کە رەیی و ئەسفەهان بەشێك نین لە وڵاتی پەهلەوییەکان، بگرە هەمەدان و ماسبزان و مهرجەرجا نەقزەق کە برێتییە لە سەمێرە و ئاوی بەسرە کە برێتییە لە نەهاوەند و ئاوی کوفە کە برێتییە لە دەینور کە ئەویش ئەو شارانەی هەبووە: ئەسەد ئاباد و ئاوە و بۆستە و رامسن و سیرواند و رۆژاوەر و تەرز و ناحییەکانی (ئاوی کوفە و ئاوی بەسرە و ماسبزان).[2] وەکو دەردەکەوێت مەبەستی لە خوێندنەوەی پەڕتووکی وڵاتناسی پێش خۆی یان ئەوەی لەسەردەمی ئەودا هەبووە، وەکو کورتکراوەی پەڕتووکی وڵاتناس و مەسالیك و مەمالیك و شێوەی زەوی بووە.

هەروەها خاوەنی پەڕتووکی (سنووری جیهان) ئاماژە بە سنووری هەرێمی چیاکان دەکات لە هەر چوار لایەوە، ئەویش لای یەکەمی ڕۆژهەڵات کە بەشەکانی فارس و هەندێ لای کەرج کوە و بەشێك لە خوراسان دەگرێتەوە، لە لای باشووریشەوە بەشەکانی خۆزستان و لە لای ڕۆژئاوایەوە بەشەکانی هەر یەك لە عێراق و ئازربایجان و لای باکووریشەوە چیاکانی دەیلەمە.[3]

لە لایەکی دیکەوە وڵاتناسی مەغریبی ئەبو عەبدوڵای بەکری لە دووتۆی بەشەکانی ئیرانشار هەتا ناوچەکانی چیاکان باس دەکات کە برێتییە لە (ئاوی ماسبزان و مهرجا نەقزەق و ئاوی کوفە کە برێتییە لە دەینور و ئاوی بەسرە کە برێتییە لە نەهاوەند و هەمەدان و قوم.[4] دواتر باسی ئەو ناوچانە دەکات کە دەکەوێتە سەر چیاکان، کە بەشێك نین لەو و بەشێکیش نیین لە خوراسان، کە برێتییە لە رەیی و قومس و ئەسبەهان و شەهرەزوور و سامغان و داراباد و قەزوین و ئەبهەر و زنجان و تەبرستان و جرجان و دەنباوەند.

---

١ -احسن التقاسیم، ل٢٩٥.

٢ -احسن التقاسیم، ل٢٩٦.

٣ - مؤلف مجهول، ل١٠٦.

٤ - المسالك والممالك، ل٤٩٦.

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەو ئاماژەی بە هەرێمەکە نەکردووە لەوەی ئەو شار و ناوچە و ناحیانەی کە لەوی دابڕیوە و سەر بە چیاکان و خوراسان نین چییە، لە کاتێکدا ئەستەرخی و ئیبن حوقەل دەیخەنە سەر دەیلەم، تێبینیەکی دیکە بەکری زۆرتر ئەو ناوچانە لەوانەی پێش خۆیەوە دەخاتە دەرەوەی سنووری ناوچەی چیاکان.

بەڵام وڵاتناسی بەناوبانگ ئیدریسی لەبارەی چیاکانەوە دەڵێت: (شاری بەناوبانگ و ناوچەی دیار دەگرێتەوە، گەورەترینیان هەمەدان و دەینور و ئەسبەهان و قومن، هەروەها کۆمەڵێك شاری دیکەی بچووکی دیکە هەیە وەکو قاشان و نەهاوەند و زەوزان و کەرەج و ئەبهەر و قەزوین، هەروەها هەندێ لە خەڵکان وای دەبینن کە سەر بە ناوچەی دەیلەم بن).([1])

وەکو دەردەکەوێت ئەو بەو رایە رازی نییە، هەر بۆیە دەیگێڕێتەوە بۆ هەندێ لە خەڵکان بەبێ توانج، رەنگە ئەو لە (هەندێ لە خەڵکان) ئەستەخری و ئیبن حوقەل بێت، ئەو دوانە زۆر بە روونییەوە باسی ئەمەیان کردووە وەکو لە پێشەوە باسمان کرد.

بەڵام یاقوت وا باسی چیاکان دەکات کە (ناوێکی ناسراوە بۆ وڵاتێك کە ئەمڕۆ ناسراوە لە عێراق بە عەجەم ناوی دەبەن، کە دەکەوێتە نێوان ئەسبەهان هەتا زنجان و قەزوین و هەمەدان و دەینور و قرمسین و رەیی و ئەوەی دەکەوێتە نێوان وڵاتی چیاکان و ناوچەی گەورە دەگرێتەوە).([2])

هەروەها یاقوت خۆی لە ناوی هەرێمی چیاکان لە عێراق نامۆ دەکات، دواتر بەستنەوەی بەهۆی ئەوەی وای هەست کردووە کە پاشاکانی سەلجوقییەکان کە یەکێك بوونە لە پاشای عێراق، بۆیە ئەو وڵاتە بووتە یەکێك لە وڵاتە پاشاییەکان و بە سوڵتانی عێراق ناویان بردووە، ئەوە زۆرترین ئەو چیرۆکانەیە لەبارەی چیاکان بە عێراقییان داناوە، بۆیە رەچەڵەکەکەی بۆ پاشایەتی دەگەڕێتەوە کە چیاکان بووە.([3])

وەکو تێبینی دەکەین لەوەی پێشەوە کە وڵاتناسەکانی سەدەی چوارەمی کۆچی بە تایبەتی ئەستەخری و ئیبن حوقەل و خاوەنی پەرتووکی (سنووری جیهان) ئەوانە زیاتر

---

١ -نزهة المشتاق، ل٢٢٤.

٢ -معجم البلدان، ج٣، ل٢٦.

٣ -االمصادر نفسة، ج٣، ل٢٧.

ورد بوونە لە دیاری کردنی سنووری هەرێمی چیاکان و ئەوەی سەر بەو بووە لە ناوچە و شارەکان، هەروەها ئاماژەیان بۆ هەر چوار لای سنوورەکانی کردووە.

دەکرێ ئێمەش هەرێمی چیاکان دیاری بکەین لەم سەردەمەدا، بەوەی کە ئەو زەویانە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە ناوچەی باکوور و ڕۆژئاوای ئێران هەتا دەگاتە دەریاچەی ئورمییە، لەوێشەوە درێژ دەبێتەوە لە دەشتاییەکانی ڕۆژئاوای عێراق هەتا دەگاتە بیابانی گەورەی ئێران بەرەو ڕۆژهەڵات، هەروەها ناوچەی چیاکان ڕۆژئاوای ئازەربایجانیش دەگرێتەوە.([1])

بەڵام بەشی ڕۆژئاوای هەرێمەکە، ئەوا ناوچە و ئەو شارانە دەگرێتەوە کە دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوای هێڵی ئەندێشەیی کە هەمەدان بە شاری کەرج، کە ئەبی دەلف دەیبەستێتەوە کە دەکەوێتە نێوان هەمەدان و ئەسبەهانەوە.([2]) کە ئەوە لە ئێستەدا دەکەوێتە بەشی ناوەڕاستی کوردستانی ڕۆژهەڵات-کوردستانی ئێران ـ کە هەر یەکە لە شارەکانی کرمانشا و باختەران و کوردستان ـ سەنندەج ـ و بەشەکانی ڕۆژهەڵاتی ئوستانی هەمەدان و بەشی باشووری ئوستانی ئازربایجانی ڕۆژئاوا دەگرێتەوە، هەروەها زەوییەکانی هەر یەکە لە پارێزگەی ئاراك و زنجان لە ڕۆژهەڵات و هێڵی میندواب-مهاباد- پیرانشار لە باکوور و لووڕستان لە باشووری دەگرێتەوە([3]).

هەروەها ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان لەسەردەمی عەباسییەکان ژمارەیەك ناوچەی لەخۆ دەگرت وەکو هەمەدان و ئاوی بەسرە و ئاوی کوفە و ئاوی ماسبزان و مەهرجا نەقزەق و حەلوان و لووڕی بچووك، ئەمە سەرەڕای ژمارەیەکی زۆری گوند و شار و دێهاتی لەخۆ دەگرت کە لە بەشەکانی دواوەدا باسی دەکەین.

---

١ -النقشبندی، الكرد في الدينور وشهرزور، ل٢.

٢ -احمد میرزا، المصادر نفسة، ل٢٧، وکرج ئەبی دەلف ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ قاسم کوڕی عیسا ئەلعەجەلی ناسراوە بە ئەبی دەلف کە یەکێك بووە لە دیارترین خەلیفەکانی مەئموون، کە ئەوە ئەو کەرەجە نییە کە دەکەوێتە نێوان ناحیەی خۆرداری نێوان هەمەدان و نەهاوەند، بڕوانە : یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل١٢٦.

٣ -نیشتمان بشیر، الاحوال السياسية والاجتماعية و الاقتلادية لغربي لقليم الجبال خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين، رسالَة ماجستير، كلية الاداب، (جامعة للاح الدين: ١٩٩٤) ل١٨.

بەڵام سەبارەت بە لوور،[1] سەرچاوەکانی وڵاتناسی بەو شێوەیە ئاماژەیان پێکردووە کە لوورستان لەسەردەمی ئیسلامدا ناوچەیەکی سەربەخۆ بووە و سەر بە هیچ هەرێمێك نەبووە، بەڵام لەبەرئەوەی پانتایی خاکەکەی بچووك بووە، ئەوا خستوویانەتە سەر هەرێمی خۆزستان کە دەکەوێتە بەسی باشوورییەوە، بەڵام دواتر خرایە سەر هەرێمی چیاکان، چونکە ئاو و هەواکەی وەکو ئاووهەوای چیاکان بووە لە لایەك و[2] هەروەها لە لایەکی دیکەوە پێوەی بەستراو بووە.[3] لە راستیشدا ناوچەکە درێژبۆوەی بویەری سروشتی و مرۆیی بووە بە ئاراستەی باشووری رۆژئاوای هەرێمی چیاکان کە زۆرینەی دانیشتووانەکەی کورد بوونە.

هەروەها (لوور) بەو خێڵە کوردی و ئەو ناوچەیەش گوتراوە کە تێیدا نیشتەجێ بوونە، وەکو یاقوت باسی دەکات کە (لوور نەوەیەکە لە کوردەکان و لە چیاکان لە نێوان ئەسبەهان و خۆزستان و ئەو ناحیانەی کە پێیەوە دەناسرێتەوە، وەکو دەڵێن وڵاتی لوور یان دەڵێن لوورستان هەروەها پێشی دەڵێن لوور).[4]

ئەوەی شایەنی ئاماژە پێکردنە لوور بەختیان نەبووە لەوەی لە لایەن وڵاتناسە موسڵمانەکانەوە گرینگی زۆریان پێبدرێت، هەتا سەدەی حەوتەمی کۆچی، بەرامبەر بە سەدەی دەیەمی زایینی، کە ئاماژەکانیان بۆ لوور سنووردار بووە و وەکو (خێڵ و شوێن) هاتووە.

دەکرێ بڵێن کە لوورستان پارچەیەك بووە لە لای رۆژهەڵاتییەوە ئەسفەهان و ویلایەتی فارس و لە لای باشووریەوە کرمانشا و هەمەدان و لە باشووریەوە خۆزستان و هەرێمی فارس و لە لای رۆژئاوایەوە عێراقی عارەبی بووە.[5]

---

١ -للوور: بێژەیەکی کوردییە بە زاراوەی للووری واتا چیایەك کە درەخت داپۆشیبێت، حمید ئیزدە بەنا، فەرهەنگی لەك و للوور، چاپخانەی کۆرشی زانیاری کوردی (بەغدا:١٩٧٨)ل١٤.

٢ - الاصطخری، المسالك والممالك، ل٦٥، ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٣٢.

٣ - یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل١٨٤.

٤ - االمصادر نفسة، ج٧، ل١٧٧. للمزید ینظر: رمضان شریف زبیر الداودي، لورستان الکبری، رسالة ماجستیر، کلیة الاداب، (جامعة للاح الدین:١٩٩٤).

٥ - ینظر: رمضان شریف، المصادر نفسة، ل١٩.

لووڕستان دەبێتە دوو بەش: لووڕی گەورە و لووڕی بچووك، لستەرنگ لووڕی گەورە ئاوا دیاری دەکات کە بەشێکە لە هەرێمی خۆزستان و لووڕی بچووك بە شێکە لە هەرێمی چیاکان.([1])

ناوچەی لووڕی بچووك دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان هەتا دەگاتە باشووری ناوچەی هەمەدان و نەهاوەند بەرەو ڕۆژئاوای ناوچەی ئەسفەهان.

لە دیارترین شاری لووڕستان بە هەردوو بەشەکەیەوە: ئایدج و بروجەرد و تستەر و لیشتەر و شۆش و شابوور و خواستە.([2])

## هەرێمی جەزیرە:

سەرجەم سەرچاوەکانی وڵاتناسی و مێژووی ئیسلامی کۆکن لەسەر چۆنییەتی دابەشکردنی هەرێمی جەزیرە بۆ سێ ناوچە: رەبیعە و مەزر و بەکر، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی هەر سێ خێڵە عەرەبییەکان کە لە جەزیرەدا نیشتەجێبوونە، ئەمە سەرەڕای ئەوەش ئیبن حوقەل پێی وایە شتێکی رێگە پێدراو نییە جەزیرە بخرێتە سەر دیاری عارەب، هەروەها نیشتەجێبوونی هەندێ لە تیرە عارەبییەکان لەو شوێنە و نیشتەجێبوونیان و مانەوەیان و داگیرکردنی هەندێ ناوچە بۆ شوانکارەیی بەهانەی دڵنیایی ئەوەمان پێ نادات: (باوەڕ ناکەم هیچ کەسێك حەز بکات جەزیرە بخاتە سەر ناوچەی عارەبان، چونکە نیشتەجێوونی ئەوان لەو شوێنە، ناوچەی فارس و رۆم بووە لە بەرئەنجانی بوونی چەندین گوندی ئاوەدان و شار و بوونی کارو کاسبی زۆر).([3])

ئەوەی تێبینی دەکرێت لەوەی پێشەوە کە ئیبن حوقەل بنچینەی جەزیرە دەگەڕێنێتەوە بۆ وڵاتی فارس و رۆم لە رووی لۆژێکی دەسەڵاتی سیاسییەوە سەر بەوان بووە، بەبێ ئەوەی لایەنی جوگرافی و سروشتی و مرۆیی لەبەرچاو بگرێت.

---

١ - بلدان الخلافة الشرقية، ل٢٣٥، ل٢٦٨.

٢ - صورة الارض، ل٢٩.

٣ -صورة الارض، ل٢٩.

بەڵام سنووری هەرێمەکە هەر یەکە لە ئەستەخری و ئیبن حوقەل بە شێوەیەکی ورد و درێژ وێنەیان کێشاوە،([1]) زیاتر لەو وڵاتناسانەی کە ئەو لێکۆڵینەوەیە لەخۆی گرتوون،([2]) وەکو هاتووە: (بەڵام جەزیرە دەکەوێتە نێوان دیجلە و فورات، کە هەرێمی رەبیعە و مزەر دەگرێتەوە، سەرچاوەی ئاوی فورات لەنێو وڵاتی رۆم لە مەلتیەوە بۆ ماوەی دوو رۆژ و لە نێوان ئەوان و سمیسات هەڵدەقوڵێت و بە سمیسات و باڵس تێپەر دەبێت هەتا دەگاتە رقە و قرقیسیا و رەحیبە و هیت و ئەنبار، لەوێ سنووری فورات دەبڕێت، لەوێوە هەرێمی جەزیرە دەست پێدەکاتەوە، دواتر سنووری جەزیرە هاوڕێك دەبێتەوە لە سمت و باکووری تکریت، کە لەسەر دیجلەیە، هەتا بە سن کۆتایی دێت، لە وێشەوە جەزیرە و حەدیسە و مووسڵ و جەزیرەی ئیبن عومەر، دواتریش بە ئامەد تێپەڕ دەبێت، لەوێشەوە سنووری دیجلە دەبڕێت هەتا دەگاتە دووریيەکانی ئەرمینیا، دواتر درێژ دەبێتەوە بەلای ڕۆژئاوایەوە هەتا دەگاتە سمیسات، دواتر بە سەرچاوەی ئاوی فورات کۆتایی دێت لەسەر سنووری ئیسلام کە لەوێوە دەستمان پێکردبوو، سەرچاوەی ئاوی دیجلە لەسەرووی ئامەد لە راست وڵاتی ئەرمەن، لە لای ڕۆژهەڵاتی دیجلە و ڕۆژئاوای فورات ئەو شار و گوندانەی هەیە سەر بە جەزیرەن، جا ئەوە ئەگەر لە دەرەوە بێت یان لێ وەی نێزیك بێت)([3]).

بەڵام مەقدەسی وتەکانی خۆی لەبارەی هەرێمی جەزیرەوە چڕ کردووەتەوە و بە (ئاقور) ناوی بردووە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بە بنەما و بنچینەی ئەو ناوە بکات، بەدەر لەو قەسەیەی نەبێت کە دەڵێت: (هەرێمی نەفیس، دواتر ئەوە رێزی گەورەی هەبووە، چونکە رووگەی پەیامبەران و شوێنگەی پیاوچاکان بووە، کەشتی نوحی تێدا گیرساوەتەوە لەسەر جودی و نشینگەی ئەوان بووە، لەوێ شاری هەشتیان بنیاتناوە و لەوێ خودا تۆبەی هەوادارانی یونسی وەرگرتووە و لەگەڵ خۆیدا چاوگە دەربووە، زوئەلقرنەین لێرەوە چووەتە نێو تاریکییەوە، شتە سەیروسەرەمەکانی جەرجیش لەوێ بینراوە، هەر لەوێدا خودای گەورە کولەکەی بۆ یونس سەوز کردووە، هەر لەوێدا زێی ملەی پیرۆز سەرچاوەی گرتووە کە پێی دەڵێن دیجلە، ئەی مزگەوتەکەی یونس لەوێ نەبوو، هەر ئەوێ بووە بە سنگەرێك لە

---

١ینظر: عبد المرشد العزاوي، حدود الجزيرة الفراتية عند الاصطخري و ابن حوقل، مجلة دراسات تاريخية، جامعة دمشق، العددان الخامس والسادس عشر، كانون الثاني، ايار:١٩٨٤، ل١١١.

٢ -تناول ابو الفدا هو الاخر في كتابه (تقويم البلدان) حدود الجزيرة باتفليل.

٣ -المسالك والممالك، ل٥٢، صورة الارض، ل١٨٩.

سەنگەرەکانی موسڵمانان و بنکەیەك لە بنکەکانی ئەوان، چونکە ئامەدی ئەمڕۆ شوێنگەی جیهادیان بووە، مووسڵیش لە بەهادارترین شوێنیان بووە، هەروەها جەزیرەی ئیبن عومەر یەکێك بووە لە شوێنگەی ئەوان، لەگەڵ ئەوەش بەیەك گەیەنەری عێراق و شام و شوێنگەی عارەبان بووە لە ئیسلام و کرۆکی ئەسپی رەسەن بووە، هەر ئەویش شوێنگەی بەرووبوومی زۆربەی عێراقییەکان بووە، بەرهەمێکی زۆر هەرزان، بەروبوومی چاك و شوێنگەی پیاوی چاك و باش بووە).[1]

ئەو وشانەی مەقدەسی کۆی گرینگی جەزیرەمان بۆ بەدیار دەخات لە رووی ئاینی و سەربازی و سروشتی و مرۆیی و ئابوورییەوە.

دواتر دەچێتە سەر دابەشکردنی هەرێمەکە و دەڵێت: (ئەو هەرێمەمان دابەشکردووە بەسەر هەناوی عارەبان، بۆ ئەوەی ناوچەکەیان بناسین و جیای بکەینەوە، توانیمان سێ ناوچە لەو ناوەدا دیاری بکەین، یەکەمیان وەکو دەڵێن عێراق ناوچەی رەبیعە، دواتر ناوچەی مزر و ئەوەی دیکە دیاربەکر).[2] واتە ئەمە بەشێکی دیکەی هەرێمەکەیە بە تێڕوانینی عارەبی خێڵەکی، بەبێ ئەوەی لایەنی جوگرافی و مێژوویی و مرۆیی لەبەرچاو بگرێت.

کورد ڕێژەیەکی گەورە لە دانیشتووانی ئەو هەرێمە پێك دەهێنێت بە تایبەتی لە بەشی سەرەوەی هەرێمی جەزیرە لە لای ڕۆژهەلات و باکووری ڕۆژهەلاتییەوە.[3] زۆربەی شار و گوندە کوردییەکان کە بلاوبوونەتەوە لە ناوچەکانی جەزیرە ئەوە دەسەلمێنن.[4]هەروەها بەلگەیەکی دیکە بۆ سەلماندنی ئەو قسەیە ئەوەیە کاتێ هەمەدانی باسی ئەوە دەکات کە (چیای توری وشکایی ئەوە یەکەم سنووری دیاربەکرە، کە ئەوە بەنی شەیبان و ئەوانەی سەر بەوانن لەو شوێنەدا بوونە کە تێکەڵی ناوچەی خوراسان نەبوونە تەنیا کوردەکان نەبن).[5] ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەو پانتاییە جوگرافییەی کورد تێیدا نیشتەجێ بووە دیار بەکر بووە تا خوراسان، کە پێکهێنەری

١ -احسن التقاسیم، ل١٢١.

٢ - االمصادر نفسة، ل١٢٢.

٣ -عبدالعزيز الدوری، تاريخ العراق الاقتلادي، (بغداد:١٩٤٨)ل١٩.

٤ - بڕوانە بەشی چوارەمی ئەو لێکۆڵینەوەیە بکەن.

٥ -لفی جزیرة العرب، ل٢٤٧.

بەشێك لە وڵاتەكەیان بووە، وەكە باسی دەكەن لە چیای جودی (لە رەبیعە نیشتەجێ بوونە، لە پشت ئەوانیش كوردەكان و لە پشت ئەوانیش ئەرمەنەكان بوونە).[1]

## هەرێمی ئازەربایجان[2] و ئەرمینیا و ئاران:

ئەوەی جێگەی سەرنجە وڵاتناسەكان[3] هەر یەكە لە ئازەربایجان و ئەرمینیا و ئارانیان كردووەتە یەك هەرێم لە كاتی دابەشكردنی وڵاتی ئیسلامیدا، ئەمەش بەر ئەو پێكچوون و بەیەكاچوونە گەورەیە كەوتوونە كە لە نێوانیدا هەبووە لە رووی جۆراوجۆرەوە، وەكو لایەنی جوگرافی و ئیداری و سیاسی و رەگەزییەوە، هەروەها یەك نەخشەی جوگرافیایان بۆ كێشاوە كە هەرسێیكان دەگرێتەوە، ئەوەی شایەنی باسكردنە هەر سێ ناوچەكە لە یەك هەرێمدا نوێترین جۆری جیاوازییە لە نێوان وڵاتناسەكاندا لەبارەی چۆنییەتی هەندێ شارەوە.

وەكو دەبینین ئیبن حوقەل هۆكاری خستنە پاڵیەكی ئەو سێ ناوچەیە لە یەك هەرێمدا دەگێڕێتەوە بۆ، وەكو دەڵێت: (لەبەرئەوەی كردمە یەك هەرێم، چونكە هەرێمی یەك جۆرە مرۆڤ بوو كە لە هەموو تەمەنی خۆمدا بینیبم، هیچ هەواڵێكم نەگواستەوە كە پێشم بخات).[4] بەڵام مەقدەسی كە لەژێر یەك ناودا كۆی كردوونەتەوە ئەویش (هەرێمی ریحاب)ـــە ئەوەش لەبەر فرەوانی و خۆشی و زۆری خێر و بیرەكانی بووە.[5]

بەڵام خاوەنی پەڕتووكی سنووری جیهان (حدود العالم) بەو شێوەیە باسی وڵاتی ئازربایجان و ئەرمینیا و ئاران دەكات كە سێ وڵاتی بەیەكەوە بەستراو بووە، هەموو

---

١ - االمصادر نفسة، واللفحة.

٢ - للمزيد ينظر: سروان كاويان بورن تاريخ عمومى ازربيجان، (تهران:١٣٤٦ه.ش) دائرة المعرف الاسلامية، مادة اذربيجان، ج١، ل٤١. حسام الدين النقشبندي، اذربيجان، اطروحة دكتوراه، (كلية الاداب، جامعة بغداد:١٩٨٤).

٣ - ينظر: ابن خراذبة، المصادر نفسة ل١٠٥-١٠٦- الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٠٨، ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٨٥، المقدسي، المصادر نفسة، ل٢٨٧، مؤلف مجهول، المصادر نفسة، ل١١٩.

٤ -صورة الارض، ل٢٨٥.

٥ - احسن التقاسيم، ل٢٨٧.

شتەکانیشیان بەیەکاچوو بووە، دواتر کە سنوورەکانیان دیاری دەکات، لە ڕۆژهەڵاتەوە لە سنووری گەیلانەوە هەتا باشووری سنووری عێراق و جەزیرە دەگرێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتیشیەوە سنووری ڕۆم و سەریر و،[1] لە باکووریشیەوە هەتا سنووری سەریر و خەزەر بووە.[2]

وڵاتناسەکان هەندێ جیاوازی بچووکیان هەیە سەبارەت بە سنووری ئازربایجان.[3] بەڵام دەکرێ بڵێین ئازربایجان سنوورەکەی لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی دەیلەم و جیل و ڕۆژهەڵاتی دەریای قەزوین و لە ڕۆژئاوایەوە ئەرمینیا و باکووری جەزیرە و لە باشوورییەوە هەرێمی چیاکان بووە، بەڵام سنووری باکووری، بە ڕووباری رس (ئاراس) دەست پێدەکات کە سنوورێکی سروشتی و دابڕاو دروست دەکات لە نێوان ئازەربایجان لە باشووری و، وڵاتی ران (ئاران) لە باکوورییەوە.[4]

کە باسی ئازەربایجانیش دەکات بەوەی کە هەرێمێکی بەرفرەوان بووە زۆر سارد و زوقماوی و مەملەکەتێکی گەورە بووە و هەمووی چیا و چۆڵ بووە و قەڵای زۆر بووە و خاوەن خێر و بێرێکی بەرفرە بووە.[5]

ئازەربایجان یەکێك بووە لەو هەرێمانەی کە هەر لەسەردەمەکانی زووەوە کورد تێیدا نیشتەجێ بووە،[6] واتە یەکێك بووە لە شوێنگەکانی کورد، ئەمەش لە بەر ئەوەی

---

١ - سەریر: مەملەکەتێکی فرەوان بووە لەنێوان لان و دەروازەیەك لە دەروازەکان، هیچ شتێکی نەبووە تەنیا دوو ڕێگە، ڕێگەیەك بەرەو وڵاتی خەزەرو ڕێگەیەك بەرەو وڵاتی ئەرمینیا، کە ئەویش بریتی بووە لە هەژدە گوند لە چیاکان، خەڵکی سەریر لە خاچهەڵگران بوونە، بڕوانە: یاقوت: معجم البلدان، ج٥، ل٤٥. بکە.

٢ - مؤلف مجهول، ل١١٩.

٣ - ينظر: الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٠٨، ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٨٥، ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل١١٩.

٤ -النقشبندي، اذربيجان، ل٣٧.

٥ - ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٠٩.

٦ - مینۆرسکی دەڵێ کورد یەکێك بووە لە دیارتین ئەو رەگزی مرۆڤانەی کە لە ئازەربایجاندا ژیابن و لە هەموو دەڤەرەکانیشی بڵاوبوونەتەوە هەتا داگیرکارییەکانی تورك دەستی پێکردووە، سەلجوقییەکان کە هاتوونەتە نێو شاری هەرێمەکە هەر لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچی، ئەوا دانیشتوانە رەسەنەکەیان راگواستووە کە کورد بوونە، ئەوەش بۆتە هۆی ڕوودانی گۆڕانکارییەکی گەورە لە ڕووی پێکهاتەی

بەشێك بووە لە وڵاتی میدییەکان.[1] هەروەها کورد بە شێوەیەکی تایبەتی لە ناوچەکانی باشوور و ڕۆژئاوای هەرێمەکە بڵاوبوونەتەوە کە بە شێوەیەکی سروشتی درێژ دەبێتەوە بەرەو هەرێمی چیاکان و جەزیرە، کە دوو شوێنگەی سەرەکی کورد بووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی ئورمییە، کە وڵاتناسەکان ئاماژە بەو راستییە دەکەن، کاتێ باسی ناوی ئازەربایجان دەهێنن کە کوردی تێدا دەژێت، ئەوا باسی خێڵ و عەشیرەتە کوردەکانیان کردووە کە لەو شارانەی هەرێمەکەدا نیشتەجێ بوونە، هەروەها هەندێ لەو ئاماژانە دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی دووەمی سەدەی یەکەمی کۆچی، کە ئەو کاتە کردە داگیرکارییەکان لەو پەڕی بووە، لەوانەش کە بەلازری باسی کورد دەکات، کە لە دەشتەکانی بەلاشجان و ساترودان و چیای سبلان[2] هەڵوێستیان بەرامبەر داگیرکارەکان چۆن بووە.[3]

مەسعودیش باسی ئازەربایجان وەك شوێنگەیەکی کوردی هەزەبانی و[4] گەلالی (الجلالیه) و زەرزاری دەکات.[5] لە دیارترین ئەو شارانەی کە کورد تێیدا نیشتەجێ بوونە لە دووتۆی شارەکانی ئەرمینیا وەکو وڵاتناسەکان باسیان کردووە برێتی بووە لە:

---

دانیشتوانی ناوچەکە، کە ئەو کات کورد زۆرینەی زۆر بەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای باشووری پێکدەهێنا. دائرة المعارف الاسلامیة، مادة اذربیجان، ج١، ل٣٠-٣٢، مادة اران، ج٢، ل٥٦٩.

1- kinneir,op.cit.p.148.

٢ - فتوح البلدان، ل٣١٧، ابن الفیه الهمداني، المصادر نفسة، ل٢٦٨، قدامة بن جعفر، المصادر نفسة، ل٣٧٨، یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٠٩.

٣ -ینظر:الفلل الاخیر من هذه الدراسة.

٤ -مروج الذهب، ج٢، ل١٣٥.

٥ -ینظر:الفلل الاخیر من هذه الدراسة.

٦ -مروج الذهب، ج٢، ل١٣٥.

### - شاری ئورمییه: (ورمیّ):

مەقدەسی له دووتۆی شارەکانی ئەرمینیای باس دەکات[1]که شاری مەراغەی بەدوا دادێت و به شێوەیەك باسی دەکات که زۆر پاك و به پیت و شوورەکراو بووه،[2] له کاتێکدا مەراغه[3] که شاری دووەمه له ئازەربایجان له رووی قەبارەوه لەدوای ئەردەبیل دێت که پایتەخت بووه.

ئەو شاره به ناوی ئەو دەریاچەیەوه ناونراوه که له نێزیکی ئەوه، هەروەها به خویّ ناسراوه، که دەورەی به چەندین ئاپارتمان و گوند و رستاق دراوه.[4] ماوەی نێوان دەریاچەکه و شاری مەراغه سیّ فرسەخه (نێزیکەی ۱۸کم). نێوان ئەو و شاری ئورمیه دوو فرسەخه (نێزیکەی ۱۲کم).[5]

ئورمییه یەکێك بووه له شارۆکەکانی میری هەزەبانی که ناوی ئەبو هیجای کوڕی رەیبی دەولّه بووه.[6]

بەلّام ئیبن خوردازەبه له رووی ئاینییەوه باس له گرینگی شارەکه دەکات، چونکه که پێناسەی دەکات به شاری زەردەشت ناوزەدی دەکات و هیچ شتێکی دیکەی لەبارەوه نالّێت.[7]

---

٧- التنبيه والاشراف، ل٧٨.

-٨ الالصطخري، المسالك والممالك، ل١٠٨.

٩- مەقدەسی شاری مەراغەی خستۆته پالّ ئەرمینیا.

4 - Jackson,percia past and persnt, ams press,(new york:1906)p.70-71.

٥ -اللطخرى، المسالك والممالك، ل١٠٨.

٦ - زانیاری مێژوویی لەبارەی ئەو شاره زۆر کەمه، چونکه دەبوایه باسی یەکەم میری هەمەدانی بکات، ينظر: ابن اثير، الكامل في التاريخ، ج٩، ل٥٣١. احمد عبدالعزيز، الهذبانيون في اذربيجان، ل٥٣، قادر محمد حسن، الامارات الكردية في عهد البويهي، رسالَة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، جامعة للاح الدين، اربيل، ١٩٩٩، ل٤٢-٦٧٥.

٧ -المسالك، والممالك، ل١٠٦، للمزيد حول ماضى المدينة و حاضرها ينظر: جمال رشيد احمد، لقاء الكرد واللان في بلاد الباب وشروان، (اربيل:٢٠٠١) ل٣٤-٣٥.

- **شاری ئاشنه (ئەشنویه) (شنۆ):**

به یەکێك له شوێنگەکانی کوردی هەزبانی و[1] زەرزاری ناوزەدیان کردووە.[2] ئیبن حوقەل ئاماژە بە گرینگی شارەکە لە رووی کشتوکاڵی و بازرگانی دەکات و دەڵێ زۆر دەوڵەمەند بووە بە سامانی ئاژەڵی.

یاقوت لە ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ز) سەردانی کردووە و لەبارەیەوە دەڵێت: شارێکە دەکەوێتە تەنیشت ئازەربایجان لە لایەك و نێوان ئەربل و ئورمییە لە لایەکەی دیکەوە، لە نێوان ئەو و شاری دووەمدا دوو رۆژە لە کاتێکدا لە ئەوەی یەکەم پێنج رۆژە.[3]

هەروەها یاقوت دەڵێت ئەوانەی قسەیان لەبارەوە کردووە بە سێ شێواز رەچەڵەکەکەیان بۆ چەندان ریوایەت گەڕاندووەتەوە ئەوانیش: (ئەلئەشنانی)و (ئەلئەشنائی) وەکو ئەبی جەعفر محمد کوڕی عومەری کوڕی حەفسەی ئەشنانی یان ئەشنائی، شێوازی سێیەمیش (ئەلئەشنەهی)یە وەکو بنەچەکەی دەگێڕنەوە بۆ فەقێ عەبدولعەزیز کوڕی عەلی ئەشنەهی شافعی، کە لەسەر دەستی ئیسحاق ئیبراهیم کوڕی عەلی فەیرۆز ئابادی فەقێ بووە، ئەو قسەیە ئەبی جەعفەر کوڕی مووسڵمە گوێی لێبووە و پەڕتووکێکی کورتی لەسەر داناوە لەبارەی فەرزەکانەوە.[4]

دیارە شاری شنۆ و تەبرێز و جابروان و ئەوەی دەوروبەری بە ڕدێنی ناسێنراوە[5] ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کاتێ عارەبان دەسەڵاتیان بەسەر ئەو ناوچانەدا بووە، وایان لێکردوون هەندێ موڵکی تایبەت بەخۆیان هەبێت پێش ئەوەی رۆژگار بەسەریاندا راببورێت، کە ئەوانە

---

١- ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٨٩.

٢ -المسعودي، التنبيه والاشراف، ل٧٨.

٣ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٨٩. للمزيد، حول المدينة، ينظر: دائرة المعارف الاسلامية، مادة اشنوية، ج٢، ل٢٢١-٢٢٣.

٤ - ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٦٤.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٠٨.

نەك بەدەستی خۆیان وەریانگرتبێتەوە[1] بگرە کوردی هەزەبانی شاری نریزیان لێوەرگرتوونەتەوە کە دەکەوێتە باشووری شاری ئورمیە لەسەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچی.[2]

- شاری سەلماس:

مەقدەسی لە چوارچێوەی شارەکانی ئەرمینیای حساب دەکات[3] کە شارێکی بچووك بووە لە سەدەی چوارەمی کۆچی.[4] هەروەها یاقوت بەوە باسی دەکات کە شارێکی بەناوبانگی ئازەربایجان بووە، کە لە شاری ئورمییە دوو ڕۆژ دوورە و لە شاری تەبریزیش سێ ڕۆژ و لە شاری خویش یەك هەنگاو، یاقوت باسی ئەوەش دەکات کە شارەکە هەمووی وێران بووە.[5]

ئەگەر ریوایەتێکی مێژوویيمان هەبێت، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٣٣٢ك/٩٤٤ز) کە ئاماژەیە بۆ (هاوولاتیانی هەزەبانی) کە لە ژێر دەسەلاتی یەك سەرکردەی کورد کە ناسراو بووە بە جەعفەری کوڕی شکۆی کوردی بووە لە شاری سەلماس،[6] کە یەکێك لە ولاتناسەکان باسی دەکات کە کوردەکان لەو شارە و دەوروبەری نیشتەجێ بوونە.[7]

بەلام ئەرمینیا- وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد- کە وەکو هەر یەکە لە ئازەربایجان و ئاران یەك هەرێم بووە، ئەویش کەوتۆتە دوورترین لای باکووری ولاتی ئیسلامی و باشووری چیاکانی قەفقاسەوە وەکو باس کراوە[8] بە درێژی لە پەڕتووکەکانی

---

١ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٩٠

٢ - للمزيد ينظر: النقشبندي، اذربيجان، ل١٠٠

٣ - احسن التقاسيم، ل٢٨٨.

٤ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٠٨.

٥ - معجم البلدان، ج٥، ل٦٠.

٦ - مسكوية، تجارب الامم، ج٢، ل٦٥.

٧ - المقدسي، المصادر نفسة، ن.ل٢٨٩. للمزيد حول هذه المدينة، دائرة المعارف الاسلامية، مادة اذربيجان، ج١٢، ل١٠٣-١٠٦.

٨ -بڕوانە: للاح الدين امين طه، الحياة العامة في ارمينيا، رسالة الماجستير، كلية الاداب، جامعة بغداد، ١٩٧٥، ل٢٤.شركن دائرة المعارف الاسلامية، مادة ارمينيا، ج٣، ل٣٣.

وڵاتناسە دێرینەکان لە لایەن هەندێکیانەوە ئاماژەیان پێکردووە،[1] کە ئەرمینیایان بۆ چوار بەش دابەشکردووە ئەوانیش: ئەرمینیای یەکەم کە ئەو شارانەی لەخۆ گرتووە: سیسجان و ئاران و تفلیس و بیلقان و قبلە شروان بووە. ئەرمینیای دووەم: شارەکانی جزران و سەغدەبیل و باب فەیرۆز قوباد و ئەلکز بووە، ئەرمینیای سێیەم ئەو شارانەی لەخۆ گرتووە: بسفرجان (سەفەرجان) و دبیل (دوین) و سەراج تەیر و بغروند و نەشوی بوونە، ئەرمینیای چوارەم ئەو شارانەی لە خۆ گرتووە: شمشات و خەلات و قالیقەلا و ئەرجەش و باجنیس بووە.[2]

ئەمە سەرەڕای دابەشکردنەکانی پێشتر کە یاقوت باسی سێ رای دیکە دەکات و دەڵێت ئەرمینیا دوو بەشە: ئەرمینیای گەورە و ئەرمینیای بچووك، هەروەها دەڵێن سێ ئەرمینیا هەبووە.[3] وەکو یەعقووبی باسی دەکات کە ئەرمینیا سێ بەش بووە.[4]

بەڵام وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی هەر بەوەندە وازیان هێناوە کە ئەو شارانەی سەر بە ناوچەی ئەرمینیا بوونە لەگەڵ بوونی جیاوازی لە نێوانیاندا سەبارەت بە هەندێ شار لە نێوان ئازەربایجان و ئەرمینیا.[5]

دەکرێ سنووری ئەرمینیا دیاری بکەین کە لە لایەکی باشووری چیاکانی قەفقاس و وڵاتی کەرج بووە،[6] لە باشووریشەوە ناحیەی هەکاری و دیاربەکر لە هەرێمی جەزیرە

---

١ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل١٠٨.ابن فقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل٢٦٣-٢٦٤، البلاذري، المصادر نفسة، ل١٩٣.

٢ - للمزيد ينظر: جمال رشيد احمد، لقاء الكرد واللان في بلاد الباب وشروان (اربيل٢٠٠٠)ل٣٤-٣٥.

٣ - معجم البلدان، ج١، ل١٣٣.

٤ - البلدان، ل١٢٠.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١١، ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٩٥. المقدسي، المصادر نفسة، ل٢٨٨.

٦ - کەرج: یاقوت بە قسەی خۆی وادەناسێنێ: نەوەیەك بوون لە خەڵکی خاچ پەرست لە چیاکانی قەبەج و شاری سەریر نیشتەجێ ببوون، زۆر بەهێزبوون تا توانیان شاری تەفلیس بخەنە ژێردەستی خۆیان، ویلایەتێکیان هەبوو ڕەچەڵەکەکەی بۆخۆیان دەگەڕایەوە. معجم البلدان، ج٧، ل١٢٦.

بووە، بەڵام لای ڕۆژهەڵاتەوە ئازەربایجان و ئاران و لە ڕۆژئاوایشەوە وڵاتی ڕۆم هەبووە کە ناوچەکانی بە کۆسپ و تەگەرە ناوزەدکراوە.[1]

ئەوەندەی کرابێت بۆ سەرنجدان لە بابەتی لێکۆڵینەوەکەمان، هەندێ لە ناوچەکانی ئەرمینیا بەشێك بووە لە وڵاتی کوردستان، هەندێ لە وڵاتناسە موسڵمانەکان ئاماژە بە هەندێ لە شارە کوردییەکان لە ئەرمینیا دەکەن کە بە شێوەیەکی بەرچاو کوردی تێدا نیشتەجێ بووە، بە تایبەتی لە لای باشووری ڕۆژئاوایەوە کە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ پێوەستن بوونی کورد بە سەردەمە تیژڕۆکان لە کۆندا.[2]

بەڵام یاقوت باسی کە ئاران دەکات بەوەی کە ناوێکی عەجەمیە و ویلایەتی بەرفرەوان و وڵاتێکی گەورەیە، لە نێوان ئەو و نێوان ئازەربایجان ڕووباری ڕەس بووە، شار و ناوچەکانی دیکە کە کەوتووەتە ڕۆژئاوای باکووری سەر بە ئاران بووە، بەڵام ئەوەی کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتیەوە، ئەوە بەشێك بووە لە ئازەربایجان.[3] هەر وەکو یاقوت ئاماژە بە چوار شاری سەر بە ئاران دەکات کە بریتی بووە لە کنجە (جنزە) و برزەعە و شمکور و بیلقان.[4]

مەقدەسیش جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئاران نێزیکەی سێ بەشی هەرێمی وەکو ناوی دەبەن بە (هەرێمی ریحاب)ی پێکهێناوە.[5]

ئەوەی شایەنی باسکردنە ئیبن خوردازەبە کە باسی ئاران دەکات و، بە یەکێك لە شارەکانی ئەرمینیای یەکەم دادەنێت،[6] بەڵام ئیبن رستە هەر بەوەندە وازدەهێنێت کە باسی ئاران دەکات و لە کاتی ناوهێنانیدا دەبێژێت ڕووباری رسی بەتەنیشتدا گوزەر دەکات.[7]

---

١ - ينظر: الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٠٨. ابن حوقلن المصادر نفسة، ل٢٨٥، ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل٢٦٣-٢٦٤. ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٣٢-١٣٣. القزويني، اثار البلاد، ل٤٩٥.

٢ -صللاح الدين امين طه، المصادر نفسة، ل٣٤.

٣ - معجم البلدان، ج١، ل١١٥.

٤ - االمصادر نفسةن والفحة نفسةا.

٥ - احسن التقاسيم، ل٢٨٧.

٦ - المسالك والممالك، ل١٠٨.

٧ - الاعلاق النفيسة، ل٨٨.

هەروەها لە وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی/ دەیەمی زاینی کە باسی دیارترین شاری سەر بە ئارانیان کردووە ئەوانیش: برزعە و باب و ئەبواب و تەفلیس و بیلقان و ورسان و بردیج و برزنج و شەماغە و شروان و ئەبخار و شابران و قبلەی وشکی و جەنزە و شمکور و خنانە بووە، ئەو سێ شارەی لە پێشەوە باسمان کردن گەورەترین شاری ئاران بوونە.

وەکو سەرچاوەکانی مێژوویی و وڵاتناسی ئەوەمان بۆ بەدیار دەخەن کە چەندان رەگەزی مرۆڤایەتی لە ناوچەکانی ئاراندا نیشتەجێ بوونە وەکو ئەرمەنی و کورد و خەزەر و رۆم و عارەب و تورك، کە هەندێك لەمانە پێش ئیسلام لەو ناوچەیەدا هەبوونە و، هەندێکی دیکە وەکو عارەب و تورك لە دووتۆی کردە داگیرکارییەکانی ئیسلامییەوە هاتوونەتە ناوچەکە، ئەمەش وای کردووە هەندێکیان ببنە خاوەنی قەوارەی سیاسی سەربەخۆ لەسەردەمەکانی ئیسلامدا، وەکو میرنشینی بەنی شەدادی کوردی و شەروان شاهاتی بەنی شەیبانی عارەبی.[1]

لە دیارترین خێڵەکانی کوردی کە لە هەرێمی ئەرمینیا و ئاران نێشتەجێ بوونە، بە تایبەتی لە شاری دوین و برزەعە و جنزە (کنجە) و بیلقان، ئەوانە بەنی شەدادین بوونە کە یەکێك بوونە لە بنەماڵەکانی رەوادی و دواتر بەو رۆڵەی هەیانبووە هەزەبانیان هێناوەتە بوون.[2]

### لە شارەکانی دیکە کە کورد تێیدا نیشتەجێ بووە لە هەرێمەکەدا:

#### -خەلات (ئەخلات):

یەکێك بووە لە شارەکانی ئەرمینیای چوارەم بە پێی دابەشکردنەکانی وڵاتناسی، کە لە زەوییەکی دەشتایی بووە، هەروەها یەکێك بووە لە شارۆکەکانی ئەرمینیای ناوەند، شارۆکەیەکی ئاوەدان و بە خێر و بێری فرەوان و بەناوبانگ بووە.[3]

---

١ - اسماعيل شكر رسول، الامارة الشدادية الكردية في بلاد ئاران، اربيل ٢٠٠١، ل٤٥.

٢ - منجم باشي، جامع الدول، باب في الشدادية، تحقيق: مينورسكي، كمبردج:١٩٥٨، ل٨. محمد مردوخي، تاريخ مردوخي، تهران:د/ت، ل٣-٤.

٣ - ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٢٤١.

## دوین:

به چەندان شێواز ناوی هاتووە وەکو (دبیل)[1] و (دون)[2] و (دافین)[3] کە شارێکی گرینگ بووە و لە ئەردەبیل گەورەتر بووە، یەکێك لە شارۆکەکانی ئازەربایجان بووە و گەورەترین شاری بووە، هەروەها یەکێك بووە لە شارۆکەکانی ئەرمینیا کە کۆشکی میری لێبووە.[4] وەکو خاوەنی پەڕتووکی (سنووری جیهان) باسی دوین دەکات و دەڵێ هەتا سنووری جەزیرە درێژ دەبێتەوە، کە دەگاتە وڵاتی رۆم.[5] هەروەها مەقدەسیش کە باسی ئەو شارە دەکات دەڵێ لەژێر دەسەڵاتی کورد بووە.[6] بەڵام یاقوت بە یەکێك لە شارۆکەکانی ئاران ناوی دەبات و لە کۆتایی سنووری ئازەربایجان و نێزیك لە شاری تفلیس، کە(بەنو ئەیوبی پاشاکانی شامی تێدا بووە).[7]

### - بەدلیس:

شارۆکەیەکە لە شارۆکەکانی ئەرمینیا لە نێزیك بەلات، مەقدەسیش ئەوە رەتدەکاتەوە کە ئەو شارە سەر بە جەزیرە بێت، هەروەها روونی دەکاتەوە کە ئەوانە سەر بە حوکمی بەنی حەمدانی بوونە، لە لایەکی دیکەوە هەردوو شاری قنسرین و رقە سەر بە حوکمی سەیف ئەلدەولەی حەمەدانی بوونە، کە ئەوە هیچ کەسێك نەیگوتووە کە رقە

---

١ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل١٠٨. اليعقوبي، المصادر نفسة، ل١١٩. ابن رستة، المصادر نفسة، ل٨٨. ابن الفقيه الهمداني، المصادر نفسة، ل٢٦٤. الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٥، ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٨٧. المقدسي، المصادر نفسة، ل٢٨٩.

٢ -مؤلف مجهول، المصادر نفسة، ل١٢٠.

٣ - احمد كسروي، شهرياران كمنام، تهران:١٩٢٩، ج٣، ل٢٧٦.

٤ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٠، مؤلف مجهول، المصادر نفسة، ل١٢٠.

٥ - مؤلف مجهول، ل١٢٠.

٦ - احسن التقاسيم، ل٢٨٩.

٧ - معجم البلدان، ج٤، ل٣٢٨.

لە شارمە، هەروەها رایەکەی قوولتر دەکاتەوە کە شارێکی دیکەش هەیە لە ئەرمینیا پێکچووی بەدلیسە لە رووی ناوەکەیەوە ئەویش تفلیسە.[١]

### قەندەریە:

مەقدەسی بە تەنیا باسی ئەوە دەکات و بەو قسە کۆتایی پێدەهێنێت کە (شارێکی کورد ئاویان کردووە، کە مزگەوتی لەتیفی لێبووە).[٢]

### کورد لە هەرێمەکانی دیکەدا:

جێنشینبوونی کورد هەر تەنیا لە هەرێمەکانی جەزیرە و چیاکان و ئازەربایجان و ئەرمینیا نەبووە، بگرە لەوانە تێپەڕی کردووە کە ناوچەکانی دیکەشی لە هەرێمەکان گرتووەتەوە ئەوەش هۆکاری خۆی هەبووە جا ئەوە سیاسیی یان ئابووریی یان هەر لایەنێکی دیکەی هەبووبێت، وەکو ولاتناسان ئاماژەی پێدەکەن کە کورد بە ژمارەی جیاواز جیاواز لە هەرێمەکانی فارس و خوراسان و کرمان هەبوونە.

١- لە هەرێمی فارس:

یەکەمین کەسانێك کە سەرنجیان دابێت لە کوردەکانی دانیشتووی هەرێمی فارس و، لە پەڕتووکە ولاتناسییەکەیدا باسی کرابێت ناسراوە بە (زموم الاکراد)یان بە شێوازی (رموم)یش هاتووە.[٣] هەروەها یەکەمین کەس وشەی (زموم)ی بەکار هێنابێت ئیبن خوردازەبەی ولاتناسە کە زمومی بە شوێنی کورد ناساندووە.[٤]

---

١ - احسن التقاسيم، ل٢٨٨.

٢ - االمصادر نفسة، ل٢٨٩.

٣ - بڕوانە: محب الله، موقع الاكراد و كردستان تاريخيا و جغرافيا وحضاريا، (بلا:١٩٩١، ل٥٣.

٤ - المسالك والممالك، ل٥١.

دیارە ئەو دەستەواژەیە لە لای وڵاتاناسانی دیکەش دووبارە بووەتەوە وەکو ئیبن فەقێی هەمەدانی و[١] ئەستەخری و[٢] ئیبن حوقەل و[٣] مەقەدەسی و[٤]) ئیدریسی،[٥] بەڵام یاقوت ئەلحومەوی دەستەواژەی (رم)ی بەکارهێناوە و کۆیەکەیشی (رمومە) ئەمەش بە واتای هەمان وشە بەکارهاتووە، کە شرۆڤەی وشەکە دەکات و دەڵێ (شرۆڤەی رموم واتە شوێنی کوردستان وماڵەکانیان بە زمانی فارس).[٦]

نووسەرانی سەردەم سەبارەت بەو بێژەیە ناکۆکییەکیان هەیە، هەندێکیان لایەنگیری وشەی (زم) دەکەن و هەندێکی دیکە لایەنگیری (رم) دەکەن، بەڵام مینۆرسکی دەڵێ راستی بەکارهێنانی وشەی دووەمە، ئەویش دەڵێ ئەو بێژەیە وشەیەکی فارسییە و بە واتای (مەعشەر) یان (کۆمەڵە)[٧] دەدات، بەڵام جرجی زەیدان دەستەواژەی یەکەم دەگێڕێتەوە بۆ بنچینەی عارەبی کاتێ وشەکە دەگێڕێتەوە بۆ بنچینەی وشەی (زمام)ی عارەبی و دەڵێ واتای سەرکردایەتی و چاوەدێری و هاوتاکەی دەگرێتەوە،[٨] ئەوەش رایەکی زۆر دوور و لاوازە.

بەڵام بە تێڕوانین بۆ وشەی (زموم) کە دەستەواژەیەکە تایبەت بە ناوچە کوردییەکان لە نێوەندی هەرێمی فارسدا، بۆیە ئەمە وشەیەکی کوردیە، هەروەها هەر لە دێرین زەمانەوە لە لای کورد بەکارهاتووە، بەتایبەتی ئەگەر بزانین کە وشەی (زوما) لە پەڕتووکەکەی مەلا مەحمودی بایەزیدی هاتووە.[٩]

---

١ - مختلر كتاب البلدان، ل١٨٨.

٢ - المسالك والممالك، ل٧١.

٣ - لروة الارض، ل٢٣٦-٢٣٩.

٤ - احسن التقاسيم، ل٣٢٥-٣٣٩.

٥ - نزهة المشتاق، ج٤، ل٤١٨.

٦ - معجم البلدان، ج٤، ل٤٢٣.

٧ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٧١.

٨ - تاريخ التمدن الاسلامي، ج٤، ل٧٨.

٩ - عادات ورسوماتية، ل٧. ارشاك بولاديان، الاكراد حسب الملادر العربية، نقله الى العربية: خشادور قلباريان وعبد الكريم ابا زيد، (بريفان:د/ت)، ل٩٣-٩٤.

یەکەمین کەسێك لە وڵاتناسەکان شرۆڤەی وشەی زمومی کردبێت، ئەستەخری بووە کە بە مەمالیکی چواندووە و ناوی هاووڵاتییەکانی بە پاشا بردووە.[1] وەکو باس دەکات دەکات بۆ هەر زەمێك شارۆکەیەك یان گوندێك هەبووە تێیدا کۆبوونەتەوە، کە لە دووتۆی هەر ناحیەیەکدا سەرۆکێکی کورد هەبووە و خەراجی کۆکردووەتەوە لە رێگەی (پیاوانی خاوەن چەك و تفاق و پاسەوان، "بژرقە")[2] کە ئەمانەشی بۆ پاراستنی کاروانچییەکان و رێگە و پیاوانی سوڵتان بووە، ئەگەر بەو شوێنەدا هاتبن، دواتر سنووری شوێنەکەی دیاری کردووە، ئیبن حوقەل هەمان ئەو شتە دووبارە دەکاتەوە لەگەڵ هەندێ زیادە کە ئەستەخری باسی دەکات.[3] هەروەها یاقوتیش ئەمەی کردووە و هەمان شتی گواستووەتەوە کە هەر یەکە لە ئەستەخری و ئیبن حوقەل و مەقدەسی باسیان کردووە.[4]

وەکو تێبینی دەکرێت لەوەی ئەو وڵاتناسانە کە باسی وشەی زەمیان کردووە، بە واتای پانتاییەکی گەورەی زەوی هاتووە، کە شارۆکە و گوند و شوێنگەی زۆری لە خۆ گرتووە، هەروەها سەردارێکی کوردیش کە خاوەن کەسایەتییەکی دیار بووە، بەرپرس بووە لەو سنوورەی کە تێدا فەرمانڕەوایی کردووە و، سەرپەرشتیاری ئیدارەی ناوچەکەی بووە و، بە کۆکردنەوەی باج و خەراج هەستاوە و، پارێزگاری لە کاروانچییە بازرگانەکان کردووە و، چاوەدێری رێگەوبانەکانی کردووە و رووبەڕووی هەر رێگرێك بووەتەوە کە بۆتە هۆی تێکدانی ئاسایش و یارمەتی و کۆمەکی پێشکێش بە سولتانەکان کردووە، ئەگەر پێویستی کردبێت لە هەندێ بارودۆخی لە ناکاودا یان رووبەڕووی هەر مەترسییەك بووبێتنەوە، بە دانانی ئەوەی ئەو قائیمقامی سولتانە.

لەوەشەوە ئەوە روون دەبێتەوە کە هەر زەمێك دەستەواژەیەك بووە لەبارەی یەکەی ئیداری کە نیمچە سەربەخۆ بووە و، هەر یەك لەمانە خاوەن ئیدارەی سەربازی و ئابووریی و ئاسایش بووە، ئەو زەمانەش بۆ ماوەی چەندین سەدە ماوەتەوە، وەکو تێبینی دەکرێت لە پەڕتووکەکانی وڵاتناسیدا کە باسی ئەو ناوچانە دەکرێت کار و

---

١ - المسالك والممالك، ل٨٧.

٢ - بذرقة: خةفارةت يان ثاسةوانى.

٣ -المسالك والممالك، ل٧١-٧٢.

٤ - صورة الارض، ل٢٣٦-٢٣٩-٢٤٠.

چالاکی و ئەرکەکانیان پەیوەستن بووە بە سەرۆکە کوردەکان و ئەوانەی بێگومان خاوەن کەسایەتی و لێهاتوویی بوونە و، توانیویانە ئیدارەی ناوچەکەیان بە شێوەیەکی باش بەڕێوەببەن و، خوازیاری ئەوەش بوونە ناوچەکانی دەرەوەی وڵاتەکانی خۆیان بە ڕێوە ببەن، هەروەها ئەوەش شتێکی ئاسایی بووە کە لەو ناوچانەدا هەر تەنیا کورد نەبووە، بگرە نەتەوەکانی دیکەش شانەبشانی کورد تێیدا نیشتەجێ بوونە.

بەڵام لەبارەی ژمارەی (زمەکانی کورد) لە هەرێمی فارس، ناکۆکی لەسەر بووە، کاتێ ئیبن خوردازەبە بە چواری دادەنێت،[1] بەڵام ئەستەخری و ئیبن حوقەل و مەقدەسی بە پێنجی هەژمار دەکەن.[2]

بەڵام ئەوەش راستە کە ئەستەخری باسی دەکات، چونکە خۆی خەڵکی ئەستەخری ناوچەی فارس بووە و، خۆیشی باشی لەبارەی بارودۆخ و ئیدارەی ناوچەکەی زانیوە.

ئیبن خوردازەبە زەمەکە بە چوار هەژمار دەکات و ماوەی نێوان هەر یەکێکیشیان دیاری دەکات کە لە نێوان شاری شیراز[3] بە فرسەخ[4] دیاری دەکات، باسی زەمی حەسنی کوڕی جیلوە دەکات کە ناسراوە بە (مازنجان)[5] لە شیرازەوە چواردە فرسەخ دوورە، کە دەکاتە نێزیکەی (٨٤کم)، هەروەها زەمی ئەردەم کوڕی جوانا بیست و شەش فرسەخ لەو دوورە، کە دەکاتە نێزیکەی (١٥٦کم)، هەروەها زەمی قاسم کوڕی شەهریار کە ناسراوە بە زەمی (کوریان) پەنجا فرسەخ دوورە، کە دەکاتە (٣٠٠کم)، زەمی حەسەن کوڕی ساڵحیش کە ناسراوە بە (سۆران) لە شیرازەوە نێزیکەی حەوت فرسەخ دوورە، کە دەکاتە (٤٢کم)، کە ئەوە نێزیکترین زەم بووە لە نێوەندی هەرێمی فارس.

بەڵام مەقدەسی تەنیا باسی سێ زەمی لەو پێنجانە کردووە و، بەپێی گەورەییان ڕێکی خستووە، بەڵام لەگەڵ کەمێك جیاوازی لە رووی ناوەکان بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی ئیبن خوردازەبە باسی کردووە وەکو دەڵێت: (ئەو پێنج زەمە، گەورەترینیان زەمی ئەحمەد

---

١ - المسالك والممالك، ل٥١.

٢ - المسالك والممالك، ل٧١-٧٢. صورة الارض، ل٢٣٦. احسن التقاسيم، ل٣٣٩-٣٤٠.

٣ - شیراز: شارێکی نوێ بووە لە ئیسلام، شارێك بووە لە هەرێمی فارس، دیوان و خانووی میرنشینی لێبووە، الاصطخري، المسالك والممالك، ل٦٧.

٤ - المسالك والممالك، ل٥١، ابن فقيه المذاني، المصادر نفسة، ل١٨٨.

٥ - لە لای ئەستەخری بە (الرميجان) هاتووە.

کوڕی سالّحە کە ناسراوە بە دیوان) دواتر زەمی شەهریار ناسراوە بە زەمی بازنجان، کە ئەوانە لە ناحیەی ئەسفەهان  بووە، دواتر باسی زەمی ئەحمەد کوڕی حەسەن دەکات کە ناسراوە بە زەمی کاریان کە ئەوە زەمی ئەردەشێر خڕە بووە.[1]

بەڵام سنووری ئەو زمانە وەکو ئەستەخری و ئیبن حوقەڵ باسی دەکەن بەو شێوەیە بووە:

زەمی جیلوە (رەمیجان) دەکەوێتە ناحیەی ئەسفەهان[2] کە لایەکی کورەی ئەستەخر لە خۆ دەگرێت و[3] لایەکی کورەی شابوور[4] و لایەکی کورەی ئارجان[5] دەگرێتەوە، لایەکی سنوورەکەی بە شاری بەیزا کۆتایی دێت[6] و لایەکیشی بە ئەسبەهان و لایەکیشی بە سنووری خۆزستان و لایەکیشی بە ناحیەی سابوور کۆتایی دێت، هەموو ئەمانە دەکەوێتە سنووری ئەو زمەوە.

---

١ - احسن التقاسیم، ل٣٣٩-٣٤٠.

٢ - ئەسفەهان: شارێکی گەورەو بەناوبانگ بووە لەناوچەکەو لە لای خەڵکەکەیەوە، لە ناوچەی چیایی بووەو چەندان زانای گەورەی پێگەیاندووە. یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٦٧.

٣ - ئەستەخر: شارێکە لە هەرێمی فارس، پانتاییەکەی نێزیکەی میلێك دەبێت، لە کونترین و بەناوبانگترین شاری هەرێمی فارسة الاصطخري، المسالك والممالك، ل٧٦..

٤ - شابور: بچووکترین کورەی هەرێمی فارس بووە سەر بە شاری سابوور بووە، ئەو ناوە بۆ ڕەچەڵەکی پاشاکەی دەگەڕێتەوە، الاصطخري، المسالك والممالك، ل٦٧.

٥ - ارجان: کورەیەکی خۆش بووە هەم چیایی و هەم دەشت و هەم دەریایی بووە، یەکێك بووە لە ناوچەکانی فارس، درەختی خورما و هەنجیرو زەیتون و زۆر بە خێرو بێر بووە، لە عەزدئەلدەولّەی بویەهی دەگێڕنەوە گوتویەتیەك مەبەستەم عێراقە وەکو ناو، وەکو داهاتیش ئەرجان. المقدسي، احسن التقاسیم، ل٣٢٤.

٦ - ئەلبەیزا: گەورەترین شلر بووە لە ناوچەی ئەستەخر، لەنێوان ئەو شیراز شەش فرسەخ دوور بووە (نێزیکەی ٤٨کم) بۆیە بەو ناوەوە ناونراوە چونکە قەلایەکی هەبووە لە گرتنی ئەستەخر، بەلاّم ناوەکەی بە فارسی (بهونسابك) بووە. ابن حوقلن صوره الارچ، ل٢٤٧. لەو کەسانەی کە سەر بەو شارەن زانای کورد عەلی کوڕی حسێن کوڕی عەبدولاّ کوڕی ئیبراهیم ئەبو حەسەن سۆفی ناسراو بە کوردی بەیزاوی، کە ئەبا حسێن ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی فادشا و ئەبا بکر کوڕی زندە گوێیان لەمە بووە. بڕوانە: یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٤١٦. بکة.

- زەمی شەهریار (بازنجان[١] یان مازنجان)،[٢] کە دەکەوێتە تەنیش زەمی پێشتر لە ناحیەی ئەسبەهان، هیچ کەسێك باسی سنووری ئەو ناوچەیەی نەکردووە لە هەرێمی فارس تەنیا ئەوە نەبێت کە برێتی بووە لە ناوچە ودێهاتی زۆر.

- زەمی دیوان (زەمی حەسەنی کوڕی ساڵح): کە دەکەوێتە نێو ناوچەی سابوور، کە لایەکی سنوورەکەی ناوچەی ئەردەشێر خرە بووە[٣] بەڵام سێ لای سنوورەکەی دیکەی بە تەنیشت ناوچەی سابوور بووە، ئەو شارۆکە و گوندانەی کە هەیبووە دوو بەقەد ئەوانی دیکە لەو ناوچەیەدا بووە.

- زەمی لوالجان (زەمی ئەحمەد کوڕی لەیس): کە دەکەوێتە ناوچەی ئەردەشێر خرە، لایەکی سنوورەکەی دەریا بووە، لە کاتێکدا ناوچەی ئەردەشێر خرە بە تەنیشت زەمی ئەو سێ زەمەکەی دیکەوە بووە و، زۆرێك لە گوند و شارۆکەی لە خۆ گرتووە.

- زەمی کاریان: کە ئەوە دواییانە دەکەوێتە ناوچەی ئەردەشێر خرە، کە لە هەر چوار لایەوە هەر یەك لە سەیفی کوڕی سەفار[٤] و زەمی بازنجان و سنووری کرمان و ئەردەشێر خرە بووە، کە هەر یەکێکیش لەمانە سنوورێك بووە بۆ هەر چوار زەمەکانی دیکە.[٥]

بەڵام رێکخستنی زەمەکان بە پێی گەورەییان، لە هەموویان گەورەتر زەمی رەمیجانە، لە دوای ئەویش زەمی لۆجان و دواتر زەمی دیوان و زەمی بازنجان و لە دوای ئەوان زەمی کاریان دێت.[٦]

---

١ - المسالك والممالك، ل٦٨.

٢ - صورة الارض، ل٢٣٩.

٣ - ئەردەشێر خرە: ناوچەیەکی دێرین بووە لە هەرێمی فارس، زۆربەی ناوچەو دیهاتەکانی درێژدەبۆوە بۆ سەر دەریا، بە شێوەیەك کە زۆر گەرم و زۆر کەم بەرهەم بوو، المقدسی، المصادر نفسه، ل٣٢٤.

٤ - بڕوانە: المسالك والممالك، ل٧١-٧٢، صورة الارض، ل٢٣٩-٢٤٠. معجم البلدان، ج٤، ل٤٢٣. بکة.

٥ - سەیف بەنی سەفار: دەگەڕێتەوە بۆ بەنی سەفار کە ئەوانە بنەماڵەی عمارە بوونەو ناسراون بە بنەماڵەی جەلەندی، کە مەملەکەتێکی پان و ناوچەیەکی بەرفرەوان لەسەر لێواری دەریا لە هەرێمی فارس و هەتا دەگکاتە سنووری کرمان. الاصطخري، المسالك والممالك، ل٣٦٩، . یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٦٩..

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٧٨، ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٣٦.

تەنیا ئەستەخری نەبێت ئاماژە بە چەند پاشایەکی ئەو زەمانە دەکات کە (لەبەردەروازەکانیاندا سوپای بەردەوام هەبووە لە هەزار پیاوەوە هەتا دەگاتە سێ هەزار پیاو)،[1] بەڵام بارودۆخی گواستنەوەی دەسەڵاتیان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە یان لە ڕێگەی هێزەوە بووە یان لە ڕێگەی پشتاو پشتەوە بووە، دەسەڵاتی نێوخۆیش خۆی لە تاهیرییەکان و دواتر سەفارییەکان بینیوەتەوە کە حوکمی وڵاتی فارس و ناوچەکانی دیکەیان کردووە لە ماوەی سەدەی سێیەمی کۆچی بەناوی خەلافەتەوە.

لەو پاشایانە مهرەجان کوڕی رۆزبی کە پاشای زەمی رمێجان (جیلوە) بووە و لە کۆنترین پاشاکانی جیلوە بووە، دەسەڵاتی لە براکەی کە ناوی سەلمەی کوڕی رۆزبێ بووە بۆ بەجێماوە، بەڵام جیلوە یەکەم جار لە خزمەت سەلمەدا بووە و، لەو سەردەمەی لە ئەستەخرەوە گواستوویەتیەوە بۆ ئەو شوێنە، دوای مردنی سەلمە، جیلوە توانویەتی زاڵ بێت بەسەر زەمەکەدا و دەستی بەسەردا گرتووە و هەتا زەمەکە بۆتە بەشێك لە بنەماڵەکەی.[2]

ناکۆکی توند کەوتۆتە نێوان جیلوە و بنەماڵەی ئەبی دەلف،[3] لە یەکێك لەو شەڕانە مەعقەلی کوڕی عیسا -برای ئەبی دەلف- دەکوژرێت، لە شەڕێکی دیکەدا جیلوە دەکوژرێت و ئەبی دەلف دەست بەسەر زەمەکەدا دەگرێت و، دواتر سوکایەتی بە جەستەکەی دەکەن، هەتا بنەماڵەی ئەبی دەلف لە کاتی رابوونیان بۆ جەنگەکان سەری جیلوەیان خستۆتە نێو دەستەکانی خۆیان و بە سەری رمەکانیان وەکردووە، هەتا ئەو رۆژەی ئەمیری سەفاری عومەری کوڕی لەیس[4] دێت و دووبارە ئیدارەی زەمەکە بۆ بنەماڵەی جیلوە دەگێڕێتەوە.[1]

---

١ - المسالك والممالك، ل٧٨

٢ - االمصادر نفسة واللفحة.

٣ - بنەماڵەی ئەبی دەلف: نەوەیەك بوونە لە خوداپەرستانی خەڵکی حیرە، دانایەکیان لێهەڵکەوتووە، جدێکیان لێ دەرچووە، وەکو دەڵێن ئەوە ئیدریس بووە، بەڵام جورئەتی ئەوەی نەبووە دەعوەتەکەی خۆی ئاشکرا بکات لە کوفە، بۆیە ناچاربووە بڕوات بۆ بەسرە، لەوێ خانوویەکی کڕیوە، دواتر دەرچووە بۆ ناوچیاکان، کە ئەبو دەلف کوڕی ئەوە. ابن رستة، الاعلاق النفیسة، ل١٨٦.

٤ - عومەر کوڕی لەیس: (٢٦٥-٢٨٩ك/٨٧٨-٩٠١ز) دووەم میری دەوڵەتی سەفاری بووە، کە لە سجستان دامەزراوەو درێژبۆتەوە هەتا خوراسان و تەبرستان و جرجان و رەیی و فارس و چەندانی دیکە، بەهێزترین میری

بەڵام زەمی دیوان سەرۆکەکەیان کەسێکی کورد بووە ناوی ئازاد کوڕی مەرد کوڕی شەهاز بووە و رۆژگارێکی ناخۆشی بووە، لە دەسەڵات لایانداوە و گرتوویانە، دواتر توانیویە رابکات بۆ عومان، دوای ئەوەی لەبەرامبەر محەمەدی کوڕی ئیبراهیمی تاهیری شکست دێنێ و لەوێ دەمێنێتەوە هەتا دەمرێت.[٢] بەڵام ئەستەخری ئاماژە بە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی ئەو ناکۆکییەکیانە ناکات.

دواتر پرسی دەسەڵاتی زەمەکە دەگوازرێتەوە بۆ کەسێکی دیکەی کوردی بە ناوی حوسێن کوڕی ساڵح، ئەو زەمە لەژێر دەسەڵاتی ئەو و کوڕەکانیدا دەمێنێتەوە هەتا سەردەمی عومەری کوڕی لەیسی سەفاری کە توانی دەسەڵاتی زەمەکە لەژێر دەستی ئەواندا دەربهێنێت و، بیداتە کەسێکی کوردی بەناوی ساسانی کوڕی غەزوان، ئیتر دەسەڵاتی ئەو زەمە کەوتۆتە دەست ئەو و کوڕەکانییەوە.

بەڵام زەمی لۆجان لە دەستی بنەماڵەی سەفارییەکان بووە هەتا وەلی محەمەد کوڕی ئیبراهیمی تاهیری فارس زەمەکەی تەسلیمی کەسێکی کورد کردووە بەناوی ئەحمەد کوڕی لەیس و، لەوە بەدواوە دەسەڵات لە نێو بنەماڵەکەیدا بەشێوەی پشتاو پشت بووە.

بەڵام زەمی کاریان، حەجەر کوڕی ئەحمەد کوڕی حەسەن سەرۆکایەتی کردووە کە لە بنەماڵەی سەفارییەکان بووە، واتە کورد نەبووە.

بەڵام زەمی مازنجان یەکێك لە بنەماڵەی مازنجان سەرۆکایەتی کردووە لە دوو سەردەمدا، یەکەمیان بەدەستی شەهریار و، دواتر دەسەڵاتەکە گوازراوەتەوە بۆ کوڕەکەی بەناوی قاسم کوڕی شەهریار و موسای کوڕی قاسم و دواتر موسای کوڕی عەبدولرحمان موسا کوڕی میحراب و، دواتر ئەبو مووسڵم محەمەد کوڕی موسا و لەدوای ئەویش گوازراوەتەوە بۆ فارس کوڕی موسا و، دواتر بۆ ئەحمەد کوڕی موسا.[٣]

---

سەفاری بووە، پەیوەندی لەگەڵ خەلیفەکانی عەباسی لەنێوان باشی و دوژمنایەتی بووە، لە جەنگێك لەگەڵ سامانیەکان لە ساڵی (٢٨٨ك/٩٠٠ز) بەدیل گیراوە، لە ساڵی (٢٨٩ك/٩٠١ز) لە زیندان مردووە. بڕوانە: محمد الخضري بك، محاضرات في تاريخ الامم الاسلامية، الدولة العباسية، (ملر:١٩٧٠) ل٣٠٩-٣٢١.

١ - المسالك والممالك، ل٨٧.

٢ - االمصادر نفسة، والفحة.

٣ -االمصادر نفسة، ل٨٧-٨٨.

ئەوەی پێوەندیی بە بارودۆخی باجەوە هەبێت لەو زەمانەدا و چۆنییەتی هەڵسوکەوتکردنی دەوڵەت لەگەڵ زەوییەکان و ڕێژەی باج و خەراج لەسەر ئەو زەویانەدا، لە واقیعدا باجی زەوی بە پێی سێ جۆر بووە: پانتایی زەوی و بەشکاری و یاساکان بووە کە لە ناوچەکەدا باو بووە،[1] زیاد ناکات و کەم ناکات ئەگەر زەوییەکەی بچێنێت یان نەی چێنێت،([2]) بەڵام بە پێی پێوانەی بەشکاری، ئەوا ئەو زەوییەی دەچێنرا خەراجی لێ دەدرا، بەڵام ئەگەر نەچێنرایە، ئەوا خەراجی نەدەدا.[3]

دیار سەرجەم وڵاتی فارس خەراجیان بەسەردا سەپێنراوە بە پێی پانتایی، تەنیا هەندێ زەم نەبێت کە لە هەندێ ناوچەدا بە کەمی بە پێی بەشکاری بووە.([4]) ئەویش بە دوو شێوە بووە (بەشێکیان بەدەست خەڵکی زمەکانەوە بووە و هەندێکی دیکەش بەڵێننامەیان هەبووە کە دەگەڕایەوە بۆ سەردەمی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و عومەری کوڕی خەتاب (ر.خ)و، هەندێکی دیکەش لە خەلیفەکانەوە دابەشکرابوو بۆ دە یەك و سێ بەش و چوار بەش، ئەوەی دیکە دابەشکرابوو بۆ چەند گوندێك کە ئەوانە زەوی بەیتولمال بوون و کەسانێك ئەو زەویانەیان دەچاند.([5])

لەوەدا ئەوە تێبینی دەکرێت کە هەندێك لە کوردەکانی خەڵکی زمەکان بەشێکی دیاریکراویان لەو باجی زەویانەیان دەدا بە شێوەی بەشکاری بە پێی ئەو ڕێککەوتنەی کە لەگەڵ بەرزترین دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی دەیانکرد کە خۆی لە دەسەڵاتی خەلافەت دەبینیەوە، بەبێ گوێدانە هەر دەستێوەردانێکی نابەرپرسانە جا ئەوە لە دەرەوەی خەڵکی زمەکان بوایە یان لە کەسانی دیکە.

---

١ - مەبەست لێی ئەو بڕە دیاریکراوەیە لە باج کە پێویست دەکات بدرێت بەپێی ئەو ئەو ڕێککەوتنەی کراوە لەنێوان دەوڵەت و ئەو کەسانەی باجەکە دەدەن، هەروەها بەپێی ئەو پابەندبوونەی دەوڵەت بەشەکەی بۆ دیاری کردوون بەپێی ئەو سیستەمەی ڕێکەوتنی لەسەر کراوە.

٢ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٩٥. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٦٣.

٣ - بڕوانە: ابو يوسف، كتاب الخراج، ط٥، (القاهرة ١٣٩٦ه) ل٧٥. مجموعة المؤلفين، النظم الاسلامية، (بغداد ١٩٨٧) ل١١٢.

٤ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٩٥. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٦٣.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٩٥. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٤٦٣.

ئەمە سەرەڕای زەمەکان، وڵاتناسەکان باسی دەیان گوند و دێهات و ماڵی کوردیان کردووە کە بڵاوبوونەتەوە لە هەرێمی فارس، بەڵام بەبێ ئەوەی شوێن و پێگەیان دیاری بکەن، تەنیا جەختیان لە زۆری و ژمارەی کەسەکان کردووەتەوە.

وڵاتناسەکان[1] نێزیکەی سی و چوار گەڕەکیان لە گەڕەکەکانی کوردەکان لە وڵاتی فارس ژماردووە، لەگەڵ بوونی هەندێ جیاوازی لە رووی رێکخستنیان وەکو: کرمانی و رامانی و مدسەر (مدین) و گەڕەکی محەمەد کوڕی بەشر و بەقیلیە و بەنداد مهریە و گەڕەکی محەمەد کوڕی ئیسحاق و سەباحیە و ئیسحاقیە و ئەزرەکانیە و شەهرەکیە و تەسما دهنیە و زیادیە و شەهرویە و بەندادکیە (بەندادقیە)و خەسرەویە و زنجیە و سەفریە و شەهاریە و مبارکیە و ئەشتامهریە و شاهوانیە و فراتیە و سلەمۆنیە و سەیریە و ئەزادختیە و بەراز و دختیە و مەتلەبیە و مەحالیە و لارییە[2] و شاهکانیە و کەجتیە[3]و جەلیلیە.

ئەستەخری جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەو ناوی ئەو گەڕەکانەی ئامادەکردووە و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زۆر بووە بە شێوەیەك نەدەکرا تەنیا لە دیوانی خێر و چاکە نەبێت، کە ژمارەکەیان رەنگە لە سەد گەڕەك زیاتر بێت،[4] وەکو ئیبن حوقەل دەڵێت ئەو گەڕەکانەی باسیان کردووە ئەوە بەناوبانگ بوونە لەنێو ئەو گەڕەکە کوردیە زۆرانەی کە زۆر ئەستەم بووە هەژمار بکرێن تەنیا لە دیوانی خێر و چاکە نەبێت،[5] هەروەها هاتووە کە ئەو گەڕەکانە نێزیکەی پێنج سەد هەزار ماڵی لەخۆ گرتووە، کە لە یەك گەڕەکدا نێزیکەی هەزار سوارچاك هەبووە،[6] واتە کۆی ئەو سوارچاکانە لەسەرجەم گەڕەکەکاندا دەگەیشتە زیاتر لە سەد هەزار سوار.

---

١ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٩٥. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٤٠، المقدسي المصادر نفسة، ل٣٣٩.

٢ - ناوی ئەو گەڕەکە لە پەرتووکی (المسالك والممالك) ناوی نەهاتووەو باس نەکراوە.

٣ - ناوی ئەو گەڕەکە لە پەرتووکی (صورة الارض) باس نەکراوەو ناوی نەهاتووە.

٤ - المسالك والممالك، ل٧٢.

٥ - صورة الارض، ل٢٤٠.

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٧٢. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٤٠. یاقوت، معجم البلدان، ج٦، ل٤٠٨.

کەسەکانی ئەو ناوچە کوردیانە بە هۆی شوانکارەییەوە گەرمیان و کوێستانیان دەکرد، تەنیا ژمارەیەکی کەمیان نەبێت کە هەڵهاتبوونە سەر سنوورەکانی شمشێر و تاوان (واتە ناوچە سارد و ناوچە گەرمەکان) و جێگیربوون، خەڵکانی ئەو گەڕەکانە بە هێز و توندوتیژی ناسرابوون و ژمارەشیان زۆربوو و خاوەن گوزەرانێکی ئابووریی دەوڵەمەند بە سامانی ئاژەڵ بوون، بە شێوەیەك کە دەسەڵاتدارانی ئەوکات نەیاندەتوانی ئازاریان پێ بگەیەنن یان دەسەڵاتی خۆیانیان بەسەردا بسەپێنن.(1)

ئەگەر وا دابنێین هەر ماڵێك لەو پێنج سەد هەزار ماڵەی کە ئەستەخری باسی دەکات پێنج کەسی لەخۆ گرتبێت، ئەوە ژمارەیەکی کەم بووە سەبارەت بە خێزانی خێڵەکی لەو کاتدا، ئەوەش واتای ئەوەیە کە ژمارەی دانیشتووان لە گەڕەکە کوردییەکان لە وڵاتی فارس دەگەیشتە دوو ملیۆن و نیو، ئەمە سەرەڕای قورسی ئەو خەمڵاندنەی کە بە زیادەڕۆیی دادەنرێت، چونکە ئەمە بە دڵنیاییەوە واتای قورسایی کورد دەگەیەنێ لە هەرێمی فارس لە دووتۆی ئەو زەمەم و گەڕەکانەی کورد تێیدا سەقامگیر و کۆچەری بوونە و تێیدا بڵاوبوونەتەوە، کە بە شێوەیەك هێزێکی ناوخۆیی گەورە بوونە و نەتوانراوە گاڵتە بە توانیان بکرێت، بۆیە حسابیان بۆ کردوون لە بواری ئیداری و سەربازی و ئابووریی و ئاسایشەوە.

بەڵام سەبارەت بە کوردی فارس لە زەمەم و گەڕەکان و بارودۆخ و چۆنییەتی گەیشتنیان بەو شوێنە و نیشتەجێ بوونیان لەوێدا بەو قەبارە گەورەیە، ئەوا هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی و وڵاتناسی لەو بارەیەوە شتێکمان پێناڵێن، ڕەنگە بوونیان لە وڵاتی فارس بگەڕێتەوە بۆ پێش پەیدابوونی ئیسلام بە ماوەیەکی درێژ، ڕەنگە ئەوان کۆچەری بووبن و لە شوێنێکەوە گواستبیانەوە بۆ شوێنێکی دیکە بە هۆی شوانکارەیی و گەڕان بەدوای پەرێزدا، دواجاریش ئەوان لەو شوێنەدا نیشتەجێ بووبن و گوند و زمومیان دروست کردبێت، چونکە (زموم) واتایەکی پێوەستن بە ئابووریی شوانکارەیی دەدات.(2)

ئەوەی لێرەدا شایەنی باسکردنە وڵاتناسی فارسی ئیبن بەلخی (لەدایکبوون:٥٠٠ك/١١٠٧ز) رایەکی هەیە لەبارەی زمەکانی کوردەکان لە وڵاتی فارس

---

١ - المسالك والممالك، ل٧٢.

٢ - ارشاك بولاديان، المصادر نفسة، ل٩٤.

که هیچ شتێکی تێدا نییە جێگەی زیادەڕۆیی بێت، دوای زەمەکان هەژمار دەکات بە پێی بۆچوونی خۆی بە پێنج زەم هەژماریان دەکات و دەڵێ خەڵکەکەیشی کورد بوونە، کە باشترین رەگەزی شەڕکەری سوپای فارس بوونە، دەبینین وا دەگێڕنەوە کە سەرجەمیان لە ئەنجامی بەشدارییان لە پرۆسەکانی ئازادکردنی ئیسلامی لەناوچوونە، تەنیا یەك کەسیان نەبێت کەناوی (عەلکە پور) بووە و ئەو موسڵمان بووە، کە ئەمیر بویەهی عەزد دەولە لە سەدەی چوارەمی کۆچی کوردەکانی دانیشتووی ئەسفەهانی هەرێمی چیاکانی گواستووەتەوە بۆ وڵاتی فارس.[1]

بەڵام ئەوە دەچێتە عەقڵەوە کە کەسەکانی پێنج سەد ماڵی کوردی لە هەرێمی فارس کوژرابن و کەسیان نەمابێت تەنیا یەك کەسیان مابێتەوە؟ بەڵام لە لایەکی دیکە جەخت لەوە دەکەنەوە کە کورد هەر لە دێرین زەمانەوە لە وڵاتی فارس هەبوونەو لە لایەکی دیکەش سووربوونە لەسەر ئەوەی کە زەمەکان پێگەیەکی بەرزیان هەبووە لە سوپای فارسدا، هەروەها دەڵێن ئەوان لە لایەن دەوڵەتەوە بەکار خراون بە حوکمی ئەوەی بەتوانا و ئازا بوونە لەبارەی جەنگەوە،[2] زانیویانە چۆن بەکاریان بهێنن و بیانخەنە خزمەت ئامرازە جەنگەیە مرۆییەکانی دەوڵەتەوە.

لە لایەکی دیکەوە هەندێ لە وڵاتناسەکان ئەوانەی لە پێشەوە باسمان کردن قسەو باسی زەمەکان و گەڕەکە کوردیەکان لە وڵاتی فارس، بانگەشەکەی ئیبن بەلخی رەتدەکەنەوە، چونکە ئەوەی هاتووە جەخت لەوە دەکاتەوە کە مانەوەیان و وەرگرتنی پاداشتە تایبەتیەکان و ئەنجامدانی ئەرکەکانیان کە لە جیاتی ئەوان ئەنجامیان داوە بە درێژایی ئەو ماوەیە کە لەو لێکۆڵینەوەیەدا چارەسەری بۆ کراوە.

ئەمە سەرەڕای ئەو زەم و گەڕەکە کوردیانەی لە هەرێمی فارس هەبوونە، وڵاتناسێکی دیکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە کورد لە شوێنە جیاجیاکانی دیکەی هەرێمەکە هەبووە، وەکو یەعقوبی ئاماژە بۆ رستاقێك لە رستاقەکانی ئەسفەهان دەکات کە کورد و خەرەمیەکانی تێدا نیشتەجێ بوونە.[3] واتە ئەوانە سەر بە بابەکی

---

١ - فارس نامة، ل٢٤٠.

٢ - شمس الدين سامي، قاموس الاعلام (التركي) (اسنبول: ١٣٠٦ه/١٨٨٩ز) مادة كرد، ل٣٨٤٢.

٣ - ينظر: الفلل الرابع من هذه الدراسة.

خورەمی بوونە، ئەوانیش رستاقەکانی ئەقەدەمان و فەهەمان([1]) بووە، هەر وەکو ناوی شارێك دەهێنن لە پێناوی شار و ناحیەکانی ئەسفەهان ناوی شاری (کرد)([2]) یان (کورد)([3]) دەهێنن، رەنگە ئەوەش رەچەڵەکەکەی بۆ ئەو شارە بگەڕێتەوە کە کوردی تێدا نیشتەجێ بووە،([4]) وەکو مەقدەسی باسی ئەو شارە دەکات کە (دەوڵەمەند بووە بە گوێز و بەرهەمە چیاییەکان)([5])هەروەها ناوی شارێکی دیکە دێت لەژێر هەمان ناو دێت کە سەر بە شاری ئەستەخر بووە.([6]) ئەوەی دیکەش ناوی شاری (کوردەکان) بووە کە یەکێك بووە لە شارەکانی شابوور.([7])

لە ناوەندی چیاکان لە هەرێمی فارس ناوی شارێك هاتووە بەناوی (زەمی کوردەکان) کە خاوەن خێر و بێری زۆر بووە، کە یەکێك بووە لە شارەکانی شابوور.

هەر وەکو مەقەدەسی باس دەکات کە لە یەکێك لە ناحییەکانی شارۆکەی شابوور-شەهرستان- قەڵای حەسینە بەناوی دەنبلا([8]) هەبووە، رەنگە دوور نەبێت ئەوە بگەڕێتەوە بۆ عەشیرەتی دەنبلای کوردی کە لە سەرچاوە وڵاتناسییەکان هاتووە.([9])

ئەوەی شایەنی باسکردنە هەندێك لە وڵاتناسەکان دەچنە سەر باسی پێکدانانی نێوان فارس و رۆم لەو شەڕانەی پێش ئیسلام روویانداوە، کە یەکێك لە ئەنجامەکانیان دیلەکانی ناوچە داگیرکراوەکە وەکو ئەوەی لە دووتۆی جەنگەکانی پاشای ساسانی قوباز و لە نێوان فەیرۆز باوکی نەوشیروانی داد پەروەری هەردوو شاری کوردی میافارقین و ئامەد کە هەردووکیان لەژێر دەسەڵاتی رۆم بووە، دوای ئەوەی داگیرکراوە دیلەکانی ئەو ناوچەیە ئەمریان پێکراوە بە دروستکردنی شارێك لەسەر سنووری فارس و ئەهواز و

---

١ - البلدان، ل٤٤.

٢ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٧٧.

٣ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٤٠.

٤ - االمصادر نفسة والفحة.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٦٩.

٦ - ياقوت، معجم البلدان، ج٥، ل٦.

٧ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٤٢٥-

٨ - االمصادر نفسة، ل٣٣٠.

٩ - ينظر: الفلل الثالث من هذه الدراسة.

ناویان ناوه ئەبر قوباز، کە دواتر بووە بە ئەرجان[1]، کە دیلەکانی هەردوو شاری میافارقین و ئامەدی تێدا نیشتەجێ بووە، هەروەها رستاقەکانی ئەمهەرمزو و شاری سابوور و شاری ئەردەشێرخرە و شاری ئەسفەهانی خراوەتە پاڵ.[2] ئەوەش بەڵگەیەکی روونە لەبارەی بوونی کورد لەو شارانە لە هەرێمی فارس.

٢- کورد لە هەرێمی خوراسان:

خوراسان هەرێمێکی زۆر فرەوانە، ئەستەخری و ئیبن حوقەل سنوورەکەیان بەو شێوەیە دیاری کردووە کە لە لای ڕۆژهەڵاتییەوە ناحیەکانی سجستان و بەلەد هەند هەیە، لە لای ڕۆژئاوایشیەوە بیابانی غەزیە و ناحیەکانی جرجان هەیە، لە کاتێکدا وڵاتی ئەو دیوی رووبار و بەشێك لە وڵاتی تورك دەکەوێتە باکوورییەوە، بەڵام بیابانی فارس و قۆمیس هەتا دەگاتە ناحیەکانی چیاکانی دەیلەم لەگەڵ جورجان و تەبرستان و رەیی و ئەوەی پێوەندیی بەوانەوە هەیە، ئەوا سنووری خوراسانی باشوور پێك دەهێنێت.[3]

وەکو دەردەکەوێت بوونی کورد لە هەندێ ناوچەی خوراسان لە باشوور و ناوچەی فارس کە ژمارەیەکی زۆری کوردی تێدا نیشتەجێ بووە لە دووتۆی ئەو زەم و گەڕەکە فرەوانانەی کە لە پێشەوە باسمان کردن.

هەندێ لە وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی ئاماژە بە بوونی کورد لە خوراسان دەکەن، وەکو ئەوەی لە چەند کۆمەڵەیەکی کۆچەری و شوانکارەیی لە زۆربەی بارەکاندا گەڕان بووە بەدوای ڕۆژاك و ئاو و گژوگیا و پاوان، یان لە شێوەی گوندی شوانکاریی بووە.

---

١ - ئەرجان: کوریەکی بەرفرەوان بووە لە کورەکانی فارس، لە رووی فرەوانییەوە لە کورەی دارابگرد گەورەتر بووە، کەوتۆتە دەوروبەری باکووری ڕۆژئاوای هەرێمی فارس، شانبەشانی هەرێمی خۆزستان. یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٢٠.

٢ - ابن الفقسه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٨٥. ابن بلخي، فارس نامة، ل٨٤. یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٢٠.

٣ - المسالك والممالك، ل١٤٥. صورة الارض، ل٣٥٨. للمزيد ينظر: ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٢١٨-٢٢٠.

بەڵام ئەستەخری کە باسی شاری ئەشترج([1])- ئەندەخز([2]) دەکات و دەڵێ شارێکی بچووك بووە لە بیاباندا کە حەوت گوندی بەسەرەوە بووە و، ماڵە کوردەکان خاوەن مەڕو ماڵات و وشتری توکن و بێ توك بوونە.([3])

هەروەها باسی کورد کراوە لە ناوچەی قهستان([4]) کە سەربە هەرێمی خوراسان بووە، کە دەڵێن هەشت شاری لەخۆ گرتووە([5]) ئەمە سەرەڕای ئەوەی چەندین گوند و ناوچەی ئاوەدانی بەسەرەوە بووە، کە لە نێوانیاندا پانتاییەکی زۆری دەشت و دەری بەرفرەوان هەبووە.([6])

هەر وەکو باس دەکرێت چەند بارەی ئەو شارانە کورد و خاوەن مەڕ و ماڵات و وشترەکان لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوونە،([7]) لە هەمان کاتدا وەکو تێبینی دەکەین هەر یەك لە ئەستەخری و مەقدەسی ناوی گوندێکیان بردووە بە ناوی (گوندی کوردستان) ئەمەش لێرەوە هاتووە کە باسی ماوەی نێوان ئەو رێگەیانەیان کردووە کە شار و گوندەکانی خوراسان یەك بەوەی دیکە دەبەستێتەوە.([8])

٣- کورد لە هەرێمی کرمان:

یاقوت وا پێناسەی کرمان دەکات وەکو ئەوەی ویلایەتێکی بەناوبانگ بێت، ناحیەیەکی گەورە و ئاوەدان کە خاوەن وڵاتێك بووە گوند و شاری فرەوانی لە نێوان فارس و کرمان و سجستان و خوراسان هەبووە.([9])

---

١ - ولاَتناسانی دیکة باسیان نةکردووة.

٢ - شارۆچکەیەکە لەنێوان بەلخ و مرۆ. یاقوت، معجم االبلدان، ج١، ل٢٠٨.

٣ - المسالك والممالك، ل١٥٣.

٤ - قهستان: وشەیەکی کوردییە بە واتای (کوردستان) دێت، واتە ناوچەیەکی شاخاوی.

٥ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٢٣٨.

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٥٣-١٥٤. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٧٠-٣٧٢. یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٠٣.

٧ -االمصادر نفستا، ل١٥٥، ل٣٧٢-١٠٣.

٨ - المسالك والممالك، ل١٥٨. صورة الارض، ل٣٧٧.

٩ - معجم البلدان، ج٧، ل١٣٢.

تەنیا ئیبن حوقەل لەنێو ولاَتناسان نەبێت بە تەنیا باسی بوونی کورد دەکات لە کرمان لە دوو تۆی باسەکانی لەبارەی هەرێمی چیاکان وەکو چیای قەفەس و چیای بارز و چیای کانزا و زیو.([1])

زۆر گونجاوە دەقی ئەو بابەتە وەکو خۆی باس بکەین کە ئیبن حوقەل لەو بارەیەوە نووسیویەتی: (چیای قەفەس چیایەکە لە لایی باشووری دەریا و لە باکووریشی سنووری جیرۆفت و رۆزبار و قۆهستان ئەبی غانە بووە، لە لای رۆژهەلاَتییەوە ئەخواش و بیابانی نێوان قەفەس و مەکرانە، لە لای ڕۆژئاوایشەوە بلوس و سنووری ناحیەکانی مەنوجان و ناحیەکانی هورمز بووە، هەروەها دەڵێت کە ئەوە حەوت نەوە بووە([2]) بۆ هەر نەوەیەك سەرۆکێکی هەبووە، ئەوانەش جۆرێك بوونە لە کورد.([3]) گەڕەکێك لەو گەڕەکانە وەکو خەڵکی ناوچەکە لەبارەیانەوە دەڵێن دە هەزار پیاوی خۆپیشاندەری یاخی، سولتانەکەیان بریکارییان لەسەر بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگەیان دەگرت و خەڵکیان دەترساند، بە گشتی لە کرمانەوە هەتا دەگەیشتە بیابانی سجستان و سنووری فارس، پاشا لێیان پڕ بوو کە بەو شێوەیە بینیانی، شان و شەوکەتی شکاندن و دەستی بەسەر ماڵ و سامانیاندا گرت و ناوچەکەیان وێران کردن، بەش بەشی کردن و دواتر ناردنیانی بۆ خزمەتکردن، بۆیە هەڵهاتن و لە ناوچەکە و لە مەمەلەکەتە دوورکەوتنەوە).([4])

ئەگەر لەو دەقە وردبینەوە تێبینی ئەوانە دەکەین:

- سەرەڕای ئەوەی کە ئیبن حوقەل تاك لایەنە باسی کورد لە هەرێمی کرمان دەکات، ئەوەی لە پەڕتووکەکەیدا هاتووە ئەوە بە دوور نازانرێ لە بوونی سنوورێکی هاوبەش لە نێوان کرمان و هەر یەك لە ولاَتی فارس و خوراسان، کە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد بە تایبەتی لە هەرێمی فارس بە شێوەیەکی بەرچاو لەوەی کورد هەبوو بێت.

---

١ - صورة الارض، ل٢٦٩.

٢ - لە لای ئەستەخری حەوت چیابووە. المسالك والممالك، ل٩٨.

٣ - یاقوت باس دەکات قەفەس نەوەیەك بووە وەکو کوردەکان، وەکو ئەوان ژیاون.بڕوانە: معجم البلدان، ج٧، ل٧٥. بکة.

٤ - صورة الارض، ل٢٧٠.

– نیشتەجێ بوونی كوردی قەفس لە یەكێك لە چیاكانی عاسێ كە خۆیان پێیەوە ناسراون، ئەوە ئەو ژینگەیەیە كە كورد بۆی دەگەڕێتەوە.

– ئیبن حوقەل ئەو زانیارییانەی لە خودی خەڵكانی ناوچەكە گواستووەتەوە كاتێ متمانەی پێ كردوون ئینجا نووسیویەتیەوە.

– ژمارەی ئەو كوردستانەی ئەوێ دیار بووە بە بەراورد بە ڕێژەی كوردی هەرێمی فارس.

– ئەوان نوێنەری گەڕەكێك لە گەڕەكەكانیان بوونە، ڕەنگە ئەو گەڕەكە درێژبۆوەی ئەو گەڕەكە زۆرەی كوردستان بووە لە هەرێمی فارس وەكو لە پێشەوە باسمان كرد.

– ئەو كوردستانە بە ئازایەتی و چاونەترسی باسیان كراوە، بە شێوەیەك كە هیچ دەسەڵاتێك نەیتوانیوە ڕووبەڕوویان ببێتەوە و دەستپاچەیان بكات، هەر ئەوەش ناچاری كردوون هەندێك شتیان پێشكێش بكەن، ئەگەر تێپەڕی هەندێ كاریشیان كردبێت، هەتا دواجار وای لێهاتووە ڕووبەڕووی هیلاكی و وێرانكاری و ئاوارەبوون و پارچەپارچە بوون بچن و، بە زۆر سەریان پێ دانواندبن لە لایەن پاشایەكەوە كە ئیبن حوقەل ناوی نابات، كە ڕەنگە یەكێك بێت لە پاشاكانی بویەهی كە گەمارۆی داون، یان یەكێك بێت لە میرەكانی حەسنەوییەكان.

### سێیەم: زاراوە كارگێڕییەكان كە لە لایەن وڵاتی كوردستانەوە بەكارهاتووە:

وڵاتناسەكان لە پەڕتووكەكانیاندا كۆمەڵێك بێژە و زاراوەی كارگێڕییان بەكارهێناوە كە بە هەموویانەوە وێنەیەكی گونجاو دەبەخشن بەو دابەشكردنە كارگێڕییەی لە وڵاتی خەلافەتی ئیسلامی كە لەو كاتدا هەبووە، بەڵام وەكو تێبینی دەكەین جیاوازییەكی زۆر هەیە لە ڕەهەندی ڕوونكردنەوە و واتای ئەو زاراوانە لە لایەك و لە شوێنی بەكارهاتنی لە لایەكی دیكەوە.

وڵاتناسانی سەدەی سێیەمی كۆچی/ نۆیەمی زاینی هەندێ بێژەی كارگێڕییان بەكارهێناوە بەبێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ واتاكەیی و هەڵوەستەی لەسەر واتاكەی بكەن، هەندێكیان وەكو ئیبن فەقێی هەمەدانی (كۆر و ئەجنادی ڕێك نەخستووە)([1]) وەكو

---

١ -المقدسي، المصادر نفسة، ل٢٠.

دەڵێ: (بەڵام ئێمە وەکو دەبینین شاری هەر وڵاتێك شوێنی سوڵتانی گەورە بووە، کە دیوانەکانی تێدا کۆکراوەتەوە و هەموو کارەکانی شاری هەرێمەکەی تێدا ئەنجام دراوە وەکو دیمەشق.. رەنگە بۆ هەر شارێك یان شارۆکەیەك ناحیەیەك هەبووە، هەر چواردە هەرێمەکە، لەوانە شەشیان عارەبی و هەشتیان عەجەمی بووە، دەبوایە بۆ هەر هەرێمێك کۆرێك هەبێ، دواتر بۆ هەر کۆرێك شارۆکەیەك و بۆ هەر شارۆکەیەك شارێك.. نەك بۆ هەر شارۆکەیەك شارێك).([1])

بۆ روونکردنەوەی وێنەکە مەقەدەسی شارەکان بە پاشا و شارۆکەکان بە رووپۆش و شارەدێیەکان بە سەرباز و گوندەکان بە پیاوەکان دەچوێنێ، هەروەها دەڵێت (وڵات هەر یەك لە شار و شارۆکە و رستاق و ناوچە و ناحیەی هەبووە).([2])

بەڵام یاقووت کە پێناسەی ئەو بێژانە و دەستەواژانە دەکات کە لە فەرهەنگەکەیدا هاتووە، لەوانەش کارگێڕییەکان بە شێوەیەکی روون و دیار کە پاژێکی تایبەتی لە بەشی یەکەم بۆ ئەو باسە تەرخان کردووە، بەمەش گرینگییەکی زۆری بە فەرهەنگەکەی بەخشیوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم گرینگترین ئەو زاراوە کارگێڕیانەی کە لە لایەن وڵاتناسان لە دووتوێی باسکردنی کورد هاتووە بخەمە روو، لەوانە:

١- هەرێم:

بەکارهێنانی بێژەی هەرێم لە لای وڵاتناسانەوە هەر تەنیا لەسەر سیستەمی گەردوونی کورت نابێتەوە کە لە پێشەوە ئاماژەمان پێکرد، بگرە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەدەی چوارەمی کۆچی کە دابەشکردنەکانی جوگرافی و کارگێڕی وڵاتانی ئیسلامی دەگرێتەوە، کە دابەشکردنەکان بۆ سەر چەند یەکەیەکی کارگێڕی بووە، بەپێی تایبەتمەندی جوگرافی بە شێوەیەکی گشتی یان هەندێ جار سیاسی بووە، وەکو ئیبن حوقەل لە بەهانە هێنانەوەی بۆ ئەرمینیا و ئازەربایجان و ئاران تاکە یەك هەرێمی سەربەخۆن، چونکە (مەملەکەتێکە یەك مرۆڤم تێدا بینیوە لە هەموو تەمەنمدا، هیچ هەواڵێکم تێدا نەگواستووەتەوە وەکو ئەوەی ئیبن ئەبی ساج و موفلح غەلامە و دەیسم

---

١ - احسن التقاسيم، ل٢٠.

٢ -االمصادر نفسة، ل٢٢.

کوڕی شازلۆیه و مەرزەبان کوڕی محەمەد ناسراو بە سالار خۆشمەحشەری وەکو گەورەیی نێوان یەحیا و عەبدولای کوڕی مالیکی خوزاعی و ئەوانی دیکە).[1]

بەڵام بەلخی و ئەستەخری ولآتی ئیسلام دابەشدەکەنە سەر بیست هەرێم، ئیبن حوقەلیش دابەشی دەکاتە سەر بیست و دوو هەرێم، لە کاتێکدا مەقدەسی دابەشی دەکاتە سەر چواردە هەرێم، شەشیان عارەبی و هەشتیان عەجەمی.

وەکو تێبینی دەکرێت گرینگیدانی ولآتناسەکان تەنیا لەسەر ولآتانی ئیسلامی بووە نەك ئەوانی دیکە، مەقدەسیش بەهانەی بۆ ئەوە دەهێنێتەوە وەکو دەڵێ: (ئێمە داوامان لە پاشاکانی گاور نەکردووە، چونکە نەچووینەتە ناویانەوە، هیچ سوودێکمان لە باسکردنیدا نەبینیوە، بگرە تەنیا باسی بابەتەکانی موسڵمانانمان کردووە تێیدا.[2]

لە لایەکی دیکەوە هەر یەك لە ئەستەخری و ئیبن حوقەل و مەقدەسی سەرەڕای ئەوەی سەر بە یەك قوتابخانە بوونە، کە بە قوتابخانەی بەلخی ناسراوە[3] هەروەها لە یەك سەدەدا ژیاون، بەڵام جیاوازن لە دابەشکردنی زۆرێك لە هەرێمەکانی ولآتی ئیسلامی، هەر یەکێکیشیان تێڕوانینی تایبەتی خۆی هەبووە، بەڵام دابەشکردنی بابەتەکانیان تا رادەیەکی زۆر لەیەکتر نێزیك بووە.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی بەکارهێنانی زاراوەی (هەرێم) بە واتای بەشەکانی کارگێڕی سەرەکی بووە لای ولآتناسان، بگرە هەندێ جار مەبەستیان بووە لە بەکارهێنانیدا وەکو یەکەیەکی کارگێڕی سەر بە بەشەکانی کارگێڕی سەرەکی بووە.[4]

هەندێکیان کە باسیان کردووە واتای هەرێمیان پێ بەخشیوە، مەبەستیان یەکەیەکی کارگێڕی سەر بە شار بووە، وەکو یەعقوبی ئاماژەی بۆ دەکات و دەڵێ شاری دەینور (چەندین هەرێم و رستاقی هەبووە).[5] وەکو لەبارەی شاری نەهاوەند دەڵێت کە

---

١ - صورة الارض، ل٢٨٥.

٢ - احسن التقاسيم، ل٢٣.

٣ - جمال الفندي، الجغرافيا عند المسلمين، ل٤٠.

٤ - تەمشای: ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٧٣-٧٤. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٩٥.

٥ - البلدان، ل٤٠.

(چەندان هەرێم بووە)[1] هەروەها ئیبن حوقەلیش لەبارەی شاری مووسڵەوە دەڵێت (چەندان هەرێم و رستاق و شارەدێی زۆری هەبووە).[2]

لەوەی پێشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە وڵاتناسەکان ئیجتهادیان کردووە لە دەربڕینی ناوەکان لە دابەشکردنە کارگێڕییەکاندا، کەم جار نەبێت بە پێی بیروڕا و ئاراستەی تایبەتی خۆیان بووە، بە تایبەتی ئەوەی پێوەندیی بە شارێك سەر بە چ هەرێمێکی دیاری کراو بووە، یان لەنێو هەرێمێکی دراوسێی دیکەیان داناوە.

٢- ناوچە: [3]

زۆرترین لەو زاراوانەیە کە لە لایەن وڵاتناسەکانەوە بەکارهاتووە، هەمیشە مەبەستیشیان لەو بەرکاهێنانەدا یەکەی کارگێڕییەك بووە کە بچووکتر بێت لە هەرێم، کە چەندین شار و رستاق لەخۆ دەگرێت،[4] بە فارسیش واتای ئوستانە.[5]

یاقوت بەو شێوەیە باسی دەکات کە لە حەمزەی ئەسفەهانی وەرگرتووە: ناوچە بێژەیەکی فارسییە، بە بەشێك لە بەشەکانی ئوستان دەوترێت، عارەب وەریان گرتووە و کردویانەتە ناوی ئوستان، وەکو ئەوەی زاراوەی هەرێمیان لە یۆنانییەکان وەرگرتووە و لە جیاتی کەشخەر بەکاریان هێناوە، ناوچە و ئوستان هەر یەکە، دواتر یاقوت بەوە پێناسەی ناوچە دەکات و دەڵێت: (هەر ناوچەیەك چەندان گوند لەخۆ بگرێت، کە دەبێت ئەو گوندانە شارۆکە یان شار یان روباری هەبێت، بەوە دەگوترێت ناوچە، وەکو بە فارسی دەڵێن چەندان خانووە و کاری زۆری تێدا دەسدەکەوێت..).[6]

---

١ - االمصادر نفسة، ل٤٢.

٢ - صورة الارض، ل١٩٤.

٣ - ناوچە: واتا پانتاییەك لە زەوی یان خاك کە چەندان گوند لە خۆ دەگرێت لە دەوروبەری شارێك، لە ئێستەدا ئەو واتایە زۆر نێزیکە لە هەرێم. لسان العرب، ج١٠، ل١١٦.

٤ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل١٨.

٥ - المسعودي، التنبيه والاشراف، ل٥٢.

٦ - معجم البلدان، ج١، ل٣٩.

هەروەها ئیبن حوقەلیش چەمکی ناوچەی بەکارهێناوە وەکو واتایەك بۆ یەکەی کارگێڕی کە لە شار بچووکتر بێت، وەکو قسەکانی لەبارەی شاری حەران لە هەرێمی جەزیرە کە دەڵێت (چەندان رستاق و ناوچەی نایابی هەبووە).(1)

وڵاتناسەکان کە ئاماژە بە ناوچە دەکەن دابەشی سەر چەند بەشێکی دەکەن، وەکو ئیبن خوردازەبە و قودامە، کۆر دابەشی سەر چەند رستاقێك دەکەن، تەنیا کۆری عێراق نەبێت دابەشی سەر چەند (تەساسیجێکیان) کردووە، لە کاتێکدا ئەستەخری دابەشی سەر چەند ناحیەیەك کە مینبەری هەبێت، هەندێکی دیکە مینبەری نەبێت.(2)

٣- تەسوج:

وشەیەکی فارسییە بنچینەکەی (تسو)ـە، بەو واتایە عارەباندوویانە و لە کۆتاییشدا پیتی (ج)یان بۆ زیاد کردووە و بە شێوەیەکی کۆ بووەتە (تەساسیج)، بە زۆریش لەسەروکاری عێراقدا بەکار هاتووە.(3) وەکو ئیبن خوردازەبە بەو شێوەیە باسی دەکات و دەڵێت: وەرگێڕانی وشەی تسوج بۆ ناحیە بەکارهاتووە، کە عەوامیان دابەشی سەر کۆر و کۆریش بۆ تەسوج و هەر تەسوجێکیش بۆ چەند رستاقێك.(4) ئەمە رای قودامەش بووە.(5) بەڵام یاقوت بەو شێوەیە باسی تەسوج دەکات کە تایبەت تر و کەمترە لە ناوچە و رستاق و ئوستان، وەکو ئەوەی بەشێك بێت لە ناوچە کە لە کۆمەڵێك تەسوج پێکهاتبێت.(6)

٤- ناحیە:

هەندێ لە وڵاتناسەکانی سەدەی چوارەمی کۆچی بە تایبەتی ئیبن حوقەل و مەقدەسی بەکاریان هێناوە، بەڵام وەکو تێبینی دەکەین بەکارهێنانی لە لایەن ئیبن حوقەل بە شێوەیەکی ورد و روون نەبووە، چونکە هەندێ جار وەکو یەکەیەکی بنچینەیی

---

١ - صورة الارض، ل٢٠٤.

٢ - المسالك والممالك، ل١٨-٢٨. الخراج ولناعة الكتابة، ل١٥٩-١٦٢.

٣ -ياقوت معجم البلدان، ج١، ل٤٠.

٤ - المسالك والممالك، ل١٨-٢٦.

٥ - الخراج، ل١٦٠.

٦ - معجم البلدان، ج١، ل٤٠.

لە هەرێمێکی دیاریکراو بەکاری هێناوە و،(1) هەندێ جاریش وەکو یەکەیەکی کارگێڕی بچووکتر لە ناوچە بەکاری هێناوە،(2) هەندێ جاری دیکەش وەکو یەکەیەکی کارگێڕی بچووکتر لە شار بەکاری هێناوە.(3)

لە لایەکی دیکەوە ئیبن حوقەل زۆرجار بێژەی (ناحیە)ی بەکارهێناوە بە شێوەیەکی گشتی بە واتای ناوچەیەك کە سەر بە لایەك بێت وەکو دەڵێت: (ئەوانەی بە زۆزانەوە نووساون ناحیەکانی ئەرمینیا و رانن، زۆزان ناحیە و قەڵایەکەیشی هەندێ جار بەچیادا چووە). وەکو دەڵێت: (بۆ ئەو چیایانە پاشا هەبووە، ناحیەکانیش رستاق). هەروەها لەبارەی شاری ئورمیە دەڵێت: (هەندێ رستاقی فرەوان و ناحیەی بە پیتی هەبووە).

هەروەها ئیبن حوقەل کە باسی ناوچەسەرێ کانی بە دەسەڵاتی کەسێك دەکات بەناوی ناحیە وەکو دەڵێت: (ناحیەکانی ئەبی هەیجای کوڕی رەواد).

بەڵام مەقدەسی بۆ هەندێ لە شار و شارۆکەکان، هەندێ ناحیەی سەر بە شارەکانی دیاری کردووە، وەکو هەرێمی ئاقور کە (چوار ناحیەی هەبووە)، هەروەها دەڵێت (ناحیە)ی هەواری رەبیعە جەزیرەی ئیبن عومەرە، کە چەندان شاری لەخۆ گرتووە، ئەوانیش: فیشار، باعەیناسا، مەغیسە و زۆزان، هەروەها بۆ هەر هەوارێك ناحیەیەك هەبووە، هەروەها هەرێمی چیاکانی بە سێ ناوچە و حەوت ناحیە هەژمارکردووە.

٥- شار:

هەمیشە وڵاتناسەکان مەبەستیان یەکەی کارگێڕی بووە لە دووتۆی ئەو دابەشکردنە کارگێڕییە گەورەیەی بۆ هەرێمەکان و ناوچە و ناحیەکان کراوە، کاتێ باسی شار دەکەن بە پەسنی (شاربوونی) وەکو ئەوەی مەڵبەندی شارنشینی یان پایتەخت هاتووە.(4) وەکو یەعقوبی بە شێوەیەك باسی شاری سەمێرە دەکات کە شاری ناوچەی مهرجا نەقزەق بووە.(5)

---

١ - صورة الارض، ل٢٧٤-٣٢٠.

٢ - االمصادر نفسة، ل٢٣٧.

٣ -االمصادر نفسة، ل٢١٨-٣١٢.

٤ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٦٠. الادريسي، نزهة المشتاق، ج٣، ل٣٧٧.

٥ - البلدان، ل٣٩.

بەڵام (شارۆکە) هەمان واتا دەبەخشێت واتا (پایتەخت) وەکو مەقدەسی باسی دەکات کە شارۆکەی دیاری رەبیعەی مووسڵە، بەڵام دیاری مەزەر شارۆکەکەی رەقیە، بەڵام ئامەد شارۆکەی دیاربەکرە.([1])

وەکو تیبێینی دەکەین ئیبن حوقەل دەستەواژەیەکی دیکەی بەکارهێناوە بۆ هەمان واتا کاتیَ باسی شاری بەرزەعە دەکات کە شاری (ئوم رانە)یە([2])

بەڵام دەستەواژەی (شار) بە واتا باوەکەی بەرزترین پێگەی شارنشینی بووە، کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا پاژێکی بۆ دانراوە.

٦- رستاق ([3])

ئەوە یەکێکە لەو زاراوانەی لە لایەن وڵاتناسانەوە بەکارهاتووە و مەبەستیشیان ناوچەیەکی کشتوکاڵی سەر بە شار بووە، رستاق ناوچەیەك بووە کە لە پێداویستییە کشتوکاڵییەکان بە شادەماری شار زانراوە، هەر وەکو ئیبن حوقەل لە ئاماژەیەکدا بۆ هەردوو رستاقی قەردی و بایەزیدی لە هەرێمی جەزیرە کە بەرهەمەکانیان گەنم و لۆکە بووە.([4])

هەروەها ئیدریسی دەڵێت رستاق (بە زمانی فارسی بە واتای هەرێم دێت)([5]) ئەمەش رەنگدانەوەی بووە بەسەر دابەشکردنە کارگێڕییەکان کە لە پەرتووکەکەیدا باسی کردووە، هەر بۆ نموونە دەڵێت (لە نێوان کەفر عەزی و سوفیدا رستاقی زێی گەورەو رستاقی حەزە هەبووە، کە ئەمانە دوو هەرێم بوونە خاوەن گەنمی زۆر بوونە).([6])

لە لایەکی دیکەوە دەبینین ئیدریسی کە باسی رستاق دەکات شاریش دەگرێتەوە، ئەوەش بەوە روونەکاتەوە کاتیَ قسە لەبارەی رستاقی خابوور دەکات کە دەڵێت:

---

١ - احسن التقاسيم، ل١٢٢.

٢ - صورة الارض، ل٢٩٠.

٣ - رستاق ناوچەیەکی کشتوکاڵی دەنوێنیَ کە گوندیشی تێدا بێت، بڕوانە: لسان العرب، ج٥، ل١٥٦.

٤ - صورة الارض، ل١٩٦.

٥ - نزهة المشتاق، ج٣، ل٤١١.

٦ - االمصادر نفسة، ج٤، ل٦٦٠.

(خاوەن شاری گەورە و شارەدێی بەرفرەوان بووە).([1]) لەوەی پێشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە رستاق بۆ زیاتر لە واتایەك بەکارهاتووە.

بەڵام یاقوت دەڵێت وشەیەکی فارسییە پێکدێت لە (رۆژی فستا) و (رۆژە) کە ناوێکە بۆ دێر و پۆل و سەما بەکارهاتووە، (فستا)ش ناوێکە بۆ بارودۆخێك کە بە واتای رێکخستن و سیستەم، دواتر دەڵێت فارسەکان وایان کردووە لە هەر ناوچەیەك کێڵگەی کشتوکاڵی و گوند هەبێت، ئەوش لە لای ئەوان شوێنی نیشتەجێ بوون بووە.([2])

٧- گوند:

وڵاتناسەکان بە شێوەیەك لێی دەدوێن کە یەکەیەکی کارگێڕییە و لەدوای شارەوە دێت لە رووی گرینگی و قەبارەوە، هیچ بنەمایەکی شاری تێدا نییە، ئەمە سەرەڕای ئەگەری بوونی پێکچوونێك لە نێوان هەندێ شار و گوند لە هەندێ لایەنەوە، وەکو زۆری ژمارەی دانیشتووان و بوونی هەندێ پێگەی ژیان لە شارەکاندا کە ئەمە لە گوندەکان نییە وەکو گەرماو و میوانخانە.([3]) هەروەها گوند لە رووی ژمارەی دانیشتووانەوە لە یەکتر جیاوازن هەیانە دەگاتە نێزیکەی چەند سەد کەسێك و([4]) لە هەندێکی دیکە دەگاتە چەند هەزارێك.

٨- دوانگە:

ئەوە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکان کە شار لە گوند جیادەکاتەوە، ئەو بیژەیەش بە واتای ئاینی بەکارهاتووە، کە پێوەستە بە نوێژی هەینییەوە لە رووی زمانەوانییەوە بریتییە لە (شوێنێکی بەرز کە وتاربێژ وەعز بۆ نوێژکەران دەدات).

زۆرترین بەکارهێنانی ئەو بێژەیە لە لای وڵاتناسەکان بە تایبەتی لە لای ئیبن حوقەل و مەقدەسی و ئیدریسی ئەوەیە کە ئەگەر دوانگە لە شوێنێك هەبوو ئەوە بەواتای بوونی

---

١ - االمصادر نفسة، ج٣، ٤٠٧.

٢ - معجم البلدان، ج١، ل٤٢.

٣ - الادريسي، نزهة المشتاقنج٤، ل٥٦.

٤ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٤٥.

بنەمای شارنشینی شارە، بە بوونی ئەو شتە ئەوە ئەو شوێنە دەبێتە شار، ئەگەر نا ئەوە گوندێکی گەورەیە، بەڵام ئەگەر دوانگەی تێدا نەبوو ئەوە ناچێتە بۆتەی شارەوە.([1])

لە لایەکی دیکەوە وڵاتناسەکان دوانگەیان وەکو واتایەك بەکارهێناوە بۆ یەکەی کارگێڕی، وەکو ئیبن حوقەل لەبارەی هەردوو مزگەوتی فوراتی ناوەڕاست دەڵێت: (برێتییە لە دوانگەیەکی بچووك کە بەتەنیشتییەوە رستاقی ئاوەدان و زۆر بە پیت هەیە).([2])

٩- عەمەل:

چەندان واتای گرینگی هەیە لە دابەشکردنی کارگێڕییەوە، واتا شارەدێکانی ناوەند و دەوروبەری کە مەبەست لێی لەژێر دەسەڵاتی کام شوێندایە، وەکو دەڵێن فلان گوند لە عەمەلەکانی فلان ناوەندە.([3]) وەکو قسەکەی ئیبن حوقەل لەبارەی شاری میافارقینەوە: (نەتەوەیەك لە عەمەلەکانی جەزیرەیە، کە ئەوە لە رۆژهەڵاتی دیجلەیە بە دوو قۆناخ، لەبەرئەوە بەسەر ئەرمینیاوە هەژمار دەکرێت)([4]) مەبەستیش لەوە ئەوەیە کە سەر بە جەزیرەیە.

دەکرێ بڵێین واتای (عەمەل) نێزیکە لە واتای (ناحیە)، بەڵام ئەوەی یەکەم واتای کارگێڕی دەدات، بەڵام ئەوەی دووەم لە رووی جوگرافییەوە واتای پتر دەبەخشێت.

## چوارەم: دیاترین شوێنە سروشتییەکان کە وڵاتناسەکان لە وڵاتی کوردستان باسیان کردووە:

ئەوە شتێکی ئاشکرایە باسکردنی شوێنی سروشتی لە لای وڵاتناسەکان پێش لایەنەکانی دیکە بکەوێت، یەکەم شتێك کە رێکەوتی بینینیان کردبێت خاك بووە لە رووی شوێنە سروشتییەکان، وەکو چیا و کەند و دۆڵ و رووبار و شتەکانی دیکە، هەتا

---

١ - تەمشای: ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٢٢. الادريسي، نزهة المشتاق، ج٣، ل٤٠٠.

٢ - صورة الارض، ل٢١٩.

٣ - المعجم الوسيط، ج٢، ل٦٣٤.

٤ - صورة الارض، ل٢٩٥.

هەندێکیان بەشێکی تایبەتی پەڕتووکەکانیان بۆ باسکردنی تەرخان کردووە،([1]) لە لایەکی دیکەوە ئەو وڵاتناسانە درکیان بە راستییەك کردووە، لەو پێوەندییەی لە نێوان مرۆڤ و سروشت و ئەو کارلێکە ناچارەکییەی لە نێواندایە.

لە دیارترین شوێنە سروشتییەکانی وڵاتی کوردستان وەکو لە پەڕتووکە وڵاتناسییەکاندا هاتووە:

أ- چیا:

خاوەن پەڕتووکی (سنووری جیهان)([2]) باسی ئەوە دەکات کە چیا لەسەر دوو ئاڕاستەیە: یەکەمیان چیای بنچینەییە لە ناوچەیەکەوە دەستپێدەکات بەرەو ناوچەیەکی دیکە، بەرتەسکە لە شوێنێك و لە لایەکی دیکەوە فرەوان دەبێت، بە شێوەی هێڵێکی راست لە شوێنێك و بەخواری لە شوێنێکی دیکە، بەڵام لەو شوێنەی گەیاندنەکەی دەبڕێت، پێی دەڵێن ستوونی.

بەڵام جۆری دووەم: خۆی لە چیای بەربڵاوی ستوونی دەبینێتەوە، درێژ دەبێتەوە هەتا لە شوێنێك دەبڕێتەوە، ئەوەش بە لقی چیاکە ناودەبرێت، پێکچووی ئەمەش لە لای وڵاتناسەکان بە درەختی خاوەن پەلوپۆی زۆر ناوی براوە، کە گەڵاکانی وەکو لقی چیاکانە، هەموو چیایەکیش ستوونەکەی درێژدەبێتەوە لە نێوان شار تا دەگاتە گوندەکان، لقەکانیشی زۆرە.

ئیبن حوقەل باسی چیا سەختەکانی سنووری شارەزوور هەتا ئامەد دەکات، هەروەها ئەوەی دەکەوێتە نێوان سنووری ئازەربایجان و جەزیرە و ناحیەکانی مووسڵ، ئەو چیایانەی پانییەکانیان لە نێوان (٣٠-٤٠ فرسەخە/١٨٠-٢٤٠کم)ــە، بە هیچ شێوەیەك پانییەکی یەك هەنگاوی تێدا نییە (٣٦کم) دەشتایی بێت، ئەو چیایانەش کوردی حەمیدی و ئاری و هەزەبانی و کوردەکانی شارەزوور و سەهرودی تێدا نیشتەجێ بووە.([3]) چیا لە بیابان یان لەسەر لێواری دەریا و رۆخی رووبارەکان بووە، لقەکانی کەم

---

١ - بڕوانە: ابن رستة، المصادر نفسة، ل٨٣-٩٠. ابن الفقيه المذاني، المصادر نفسة، ل١٠. مؤلف مجهول، المصادر نفسة، ل١٢-١٨-٢٣-٣٤-٤٤.

٢ -مؤلف مجهول، المصادر نفسة، ل٢٣.

٣ - صورة الارض، ل٣١٥. لەبارەی ئەو هۆزە کوردییەوە بڕوانە: بەشی چوارەم لەم تۆژینەوەیە.

بووه، تەنیا هەندێ ستوونی چیا نەبێت کە بگاتەوە بە چیاکانی دیکە،([1]) ئەوەش پەسنێکی ورد بووە، لە پەڕتووکی وڵاتناسەکانەوە ئاماژەی زۆر هاتووە لەبارەی ئەو چیایانەی لە وڵاتی کوردستان بڵاوبوونەتەوە، یان لەو هەرێمانەی کە کوردی بەسەردا دابەش بووە، لە بەناوبانگترین چیای ناوچەی جەزیرە چیای جودییە،([2]) کە نێزیکە لە جەزیرەی ئیبن عومەر،([3]) لە لای سنووری ڕۆژهەڵاتی رووباری دیجلە لە ناوچەکانی مووسڵ،([4]) کە دەگاتە چیایەك داپۆشراوە بە بەرد،([5]) ئەوەش پێوەستە بە چیرۆکی حەزرەتی نوحەوە کە کەشتییەکەی لەسەر ئەو چیایە نیشتووەتەوە لە کاتی ڕووداوی لافاوە بەناوبانگەکەدا کە لە قورئانی پیرۆزدا باسی کراوە: (وقیل یا ارچ ابلغی ماوك ویا سماو اقلعی وغیچ الماو وقچی الامر واستوت علی الجودی)([6]) قورئانی پیرۆز جەخت لە گرینگی چیای جودی دەکاتەوە، ئەو خاکەی کە هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە ئی کوردە بووە، کاتێ باسی ئەو ناوچەیە دەکات کە پێغەمبەر نوح لەسەری دابەزیوە کە بەسەر پشتی کەشتی رزگارکار بەناوی (پیرۆز) بووە، لێرەشەوە دەردەکەوێت لە ڕێگەی ئەو پەیامە ئاسمانییەی بە پێغەمبەر نوح دراوە بۆ ئەوەی خۆیی و ئەوانەی لەگەڵێدان لەسەر (شوێنی پیرۆز) دابەزن، کە خێر و ستایشێکی زۆری هەیە، هەر لێرەوە تێبینی ئەوە دەکەین لە ناوچەکە کە خودای گەورە پێغەمبەر دەدوێنێ: (فاژا استویت انت ومن معك علی الفلك فقل الحمد لله الژی نجانا من القوم الچالمین، وقل ربی انزلنی منزلا مبارکا وانت خیر المنزلین).([7])

هەر بۆیە چیاکە و ئەوەی لە دەوروبەریەتی گرینگییەکی تایبەتی هەیە بە تایبەتی وڵاتناسەکان جۆرێك لە پیرۆزییان بە ناوچەکە بەخشیوە، وەکو ئیبن فەقێی هەمەدانی کە

---

١ - االمصادر نفسة، واللفحة.

٢ - ابن فقهیة الهمذاني، المصادر نفسة، ل٢٢. مؤلف مجهول، المصادر نفسة، ل٣٠. المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٣. الزمخشري، الجبال والامکنة والمیاه، تحقیق: ابراهیم السمرائي، (بغداد:١٩٦٦) ل٥٨.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٥.

٤ - یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٨٨.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٣-٢٠٦.

٦ - سورة هود، الایة، ٤٤.

٧ - سورة المؤمنین، الایتان، ٢٨-٢٩.

باسێك لەبارەی خۆبەختکرنی پێغەمبەر ئیبراهیم دەکات کە بە مەبەست گۆشەکانی ماڵی خودای لە چوار جۆر بەرد دامەزراندووە: بەردێك لە حەرا و بەردێك لە سەبیر و بەردێك لە تور و بەردێك لە چیای جودی.([1])

هەر ئەویش باس دەکات کە تووشی پیاوێکی بە تەمەن بووە، کە پاڵی بە پارچە تەختەیەکەوە ناوە، باسی ئەوەی کردووە کە ئەوە تەختەی کەشتییەکەی نوح بووە!.

وەکو تیبێینی دەکەین هەموو وڵاتناسێك کە بێژەی جودی بەسەر زماندا هاتبێت، ئەوا باسی رووداوی لافاوە مێژووییەکەی کردووە.([2]) وەکو ئیدریسی ([3]) و یاقوت هەڵەیەکیان بەسەردا تێپەڕبووە لەبارەی چیایەك لە نێزیك جودی، ناویان ناوە چیای تنین، جا ئەوە هەڵەکە لەوان بووبێت، یان لەکاتی لەبەرگرتنەوە ئەوە روویداوە، راستییەکەی ئەوە ناوی چیای (پمانین)، کە ئەوەش پێوەستە بە رووداوەکەی کەشتییەکەی نوحەوە، وەکو ئیبن حوقەل کە باسی جەزیرەی ئیبن عومەر دەکات دەڵێت ئەوە (پێوەستە بە چیای ثمانین و باسورین و فیشابوور، هەمووشیان لە چیای جودی کۆدەبنەوە).([4])

لێرەدا چیایەکی دیکە هەیە پێوەستە بە جەزیرە و هەروەها بە رووداوەکەی لافاوەکەوە، ئەویش چیای سنجارە، کە یاقوت ناوەکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ نوح پێغەمبەر کاتێك بە کەشتییەکەی بەسەر چیاکەدا رەتبووە، نیشتووەتەوە و گوتوویەتی: (ئەوە سن جەبل جارە بۆ ئێمە، بۆیە بەو ناوەوە ناونرا)([5]) وەکو تێبینی کراوە ئەو شرۆڤەیە زۆر دوورە لە راستییەوە، هەن دەڵێن نوح پێغەمبەر بە عارەبی قسانی کردووە، لە چیاکانی دیکە چیای شەعرانە،([6]) بۆیە بەو ناوە ناونراوە، چونکە درەختێکی زۆری هەیە، ئەو

١ - مختلر کتاب البلدان، ل٣٢. ابن شداد، الاعلاق الخطیرة في ذكر امراء الشام واجزیرة قسم الشام، (دمشق، ١٨٦٢) ل٣٦.

٢ - الاشارات الی معرفة الزیارات، (دمشقن ١٩٥٣) ل٦٨.

٣ - البكري، معجم النعجم، ج٢، ل٤٠٣. الادریسي، نزهة المشتاق، ل٢٣٤. یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٨٨.

٤ - نزهة المشتاق، ل٢٣٤.

٥ - معجم البلدان، ج٢، ل٤٦١.

٦ - ضورة الارض، ل٢٠٣.

چیایەش کەوتۆتە ناوچەی مووسڵ، وەکو دەڵێن لە ناوچەکانی شارەزوورە[1]، هەروەها دەڵێن ئەوە چیای بباجرمییە لە (کەرکووك)، هەروەها لەوێدا چیای قەندیل هەیە[2] بە فارسیش تەختی شێروەیە، بە ئاوەدانترین چیا باسیان کردووە و بەفر لەسەر لووتکەی چیاکە بە زستان و هاوین دەمێنێتەوە.[3]

چیای ئامەد لە چیا بەناوبانگەکانی ناوچەکەیە[4]، کە لە نێزیك شاری ئامەدە هەتا دەگاتە باشووری، لەوێدا چیایەکی دیکە هەیە ناسراوە بە (توری عەبدین) درێژ دەبێتەوە لە نێوان هەردوو شاری دارا و نەسیبین.[5] چیای ماردینیش لە نێزیك شاری نەسیبین و بەرزییەکەی دەگاتە نێزیکەی (دوو فرسەخ/١٢کم) کە ماری بەناوبانگی تێدایە و دەڵێن زۆر بەخێرایی دەتکوژێت.[6]

وەکو ئەستەخری باسی شاری دارا دەکات کە دەکەوێتە لایەکی چیاکە،[7] لە نێوان نەسیبین و ماردینەوە.[8]

لە چیا بەناوبانگەکانی دیکەی ناوچەی جەزیرە چیای بارما کە نێزیکەی (هەنگاوێك/٣٧.٥کم) لە شاری سنەوە دوورە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی رووباری دیجلەوە، رایەکی دیکەش هەیە کە یاقوت دەیگێڕێتەوە و دەڵێ ساتیدما چیایەکە بە تەنیشت زەوییەوە، لەوانەش چیای بارما کە ناسراوە بە چیای حەمرین و دەگاتە نێزیك مووسڵ و جەزیرە و ئەو ناوچانە[9] کە ئیبن خەلدون بە (چیای کوردستان) ناوی بردووە.[10]

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٧٨.

٢ - ئەوە چیای هەورامانە.

٣ - ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٢٥.

٤ - االمصادر نفسة، ل١٢٧. ابن حوقل، المصادر نفسة، ٢٠١.

٥ - سهراب، المصادر نفسة، ل١١٦.

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٤. الادريسي، نزهة المشتاق، ل٢٢٢.

٧ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٣.

٨ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٢٧٣.

٩ - معجم البلدان، ج٥، ل٦.

١٠ - المقدمة، ل٦٣-٧٠.

یاقوت هەوڵی ئەوەی داوە وشەکە بگەڕێنێتەوە بۆ بنچینەی عارەبی کە لە وێوە خزیوە و بەوە ناوەنراوە کە هیچ رۆژێك نەبووە خوێنی تێدا نەڕژێت،[1] رووباری دیجلە لە نێوەڕاستی چیاکە بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە هەتا ناوەڕاستی جەزیرە، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە درێژ دەبێتەوە هەتا سنووری کرمان.[2] لەوێ بە چیای ماسبزان ناسراوە،[3] یاقوت لەو بارەیەوە دەڵێت: (ئەو چیایەی لە نێوان تکریت و مووسڵە بە چیای حەمرین ناو دەبرێت، [4] وەکو دەڵێن ئەمە بەتەنیشت دنیاوەیە).[5]

یاقوتیش ناوی ئەو چیایە بە (ساتیدما) ناو دەبات و، دەڵێت دەکەوێتە نێوان میافارقین و سەعرت، لەو چیایانەی لە لای مووسڵن چیای داسنە کە چیایەکی گەورەیە دەکەوێتە باکووری شارەکە لە لای ڕۆژهەڵاتیشیەوە رووباری دیجلەیە، زۆرێك لەو کەسانەی لەوێ نیشتەجێن لە خێڵە کوردەکانن و پێیان دەڵێن داسنی،[6] ئەو چیایە یەکێکە لە گرینگترین شوێنی پەناگەی کوردەکان، هەروەها چیای هەکاری بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کوردستانی هەکاری.[7] ئەوەی دواییان دەکەوێتە باکووری مووسڵ، هەروەکو یاقوت باسی چیایەکی دیکە دەکات لە ناوچەکانی مووسڵ، ئەویش چیای (حیتون)ــە، ئاماژە بەوە دەکات کە ناوەکەی عەجەمییە، چونکە ئەمە لە عارەبیدا نییە،[8] ئەوەش شتێکی ئاساییە ناکرێت هەموو شتێك بنچینەکەی عارەبی بێت.

تەنیا وڵاتناسی مەغریبی ئەنوەر عوبید بەکری نەبێت بە چیای جەزیرە دەڵێت چیای مرد.[9] یان مەردان و باسی هەندێ دیرە شیعر دەکات کە لەسەر ئەو چیایە گوترایە:

---

١ - معجم البلدان، ج٥، ل٦.

٢ - کرمان: ویلایەتێکی بەناوبانگ و ناوچەیەکی گەورە و ئاوەدانە،کە چەندان شار و گوندی بەرفرەوان لەخۆ دەگرێت لە نێوان هەرێمی فارس و مکران و سەجستان و خۆراسانە. یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل١٣٢.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٣.

٤ - چیای حەمرین سنووری سروشتی وڵاتی کوردستانە لە لای ڕۆژئاوایەوە.

٥ - معجم البلدان، ج٣، ل٢٢٥.

٦ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٢٨٤.

٧ - االمصادر نفسة، ج٤، ل٤٨٠.

٨ - االمصادر نفسة، ج٢، ل١١٢.

٩ - مرد- مەرد: بێژەیەکی کوردییە واتای پیاوی ئازا و گەورە دەگەیەنێت.

تزاورن عن مرد ودافعين ركنه    لمنعرج الخابور حيث تخبرا
عبرن عن قرقيسياو لعرعر    وفرچه نعم ساو ژلك معبرا
الى نسوه منينها بمپقب    امانى لا يجين عنك حبر برا

هەروەها بیکری دوو دێری دیکە دێنێتەوە کە ئی جەریر کوڕی عەبدوڵای بەجلییە- کە یەکێکە لەسەرکردەکانی زرگاکردنی جەزیرە کە تێیدا باسی چیای مەردان دەکات:

لقد فرقتم في كل ادب    كتفريق الاله بني معد
وكنتم حول مردان حلولا    اكارس اهل فاثرت ومجد([1])

لە چیایەکانی دیکە چیای سلقە کە یاقوت باسی دەکات کە (چیایەکی بەرزە و دەڕوانێتە سەر رووبار لە ناوچەکانی مووسڵ کە دەگاتە شارەکانی شارەزوور،([2]) ئەویش چیای لاهیجانە.
لە نێزیك شارەزوور چیایەك هەیە پێی دەڵێن زەڵم،([3]) گیایەکی لێیە بەناوی (حەبی زەڵم) کە دەڵێن دەرمانە بۆ نەخۆشی.([4])
ئەو چیایانەی کورد پێکدەهێنن زۆربەی دانیشتووانەکەی ڕۆژئاواییە، ئەوەشی بەسەردا سەپاوە، ئەوش لە ناوەکەیدا بەدیار دەکەوێت، چیاکان تەنیا ئەوەی دەکەوێتە نێوان هەمەدان هەتا دەگاتە رەی نەبێت، لەوێدا چیا کەمە زۆربەیان دەشتن، لە کاتێکدا چیا دەکەوێتە هەرێمەکان لە سنووری شارەزوورەوە درێژ دەبێتەوە هەتا شاری حەلوان و سەمێرە و سیروان و لووڕ و، هەتا دەگاتە ئەسبەهان و فارس، لەوێشەوە دەگەڕێتەوە بۆ

---

١ - معجم ماستعجم، ج٤، ل١٢١.
٢ - معجم البلدان، ج٥، ل٥٩.
٣ - االمصادر نفسة، ج٤، ل٤٧٩.
٤ - االمصادر نفسة، واللفحة. الجاحظ، التبلر بالتجارة، ل٢٥. حسام الدين النقسبندي، الكرد في دينور وشهرزور، ل٦٤. جمال بابان، الول اسماء المدن والمواقع العراقية، (بغداد:١٩٧٦) ج١، ل٢٥٥.

قاشان و هەمەدان، هەتا بە قەزوین و سەهرورد کۆتایی دێت لەسەر سنووری ئازەربایجان، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ شارەزوور.([1])

لە چیاکانی دیکە لە وڵاتی کوردستان بە پێی ئەوەی وڵاتناسە موسڵمانەکان باسییان کردووە، چیای بێستوونە کە بە (چیای گەورە و گرینگ)([2]) باسی دەکەن و، (خۆش و نەرم و لوسە، ئەشکەوت و کانی هەڵقوڵاوی تێدایە و([3]) پانییەکەی سێ رۆژ زیاترە.([4])

بەڵام ئەستەخری بە شێوەیەکی زۆر ورد و پوخت باسی چیا دەکات و دەڵێت: (چیا هەرگیز ناتوانی بگەیتە لووتکەکەی و رێگەکەی تەنیا لە ژێرەوەیە، رووەکەی لەسەرەوە بۆ خوارەوە لوسە ئەگەر لاریش بێت، پانتاییەکی زۆر لە زەوی دادەگرێت و رووەکەی لار و لوسە، دواتر باسی ئەوە دەکات کە هەندێك لە پاشا و میرەکانی فارسە ساسانییەکان توانیویانە ئەو چیایانە بکەنە ناوچەیەکی بازاڕی وەکو بەڵگەیەك بۆ توانا و دەسەڵاتیان، کە لەوێدا بەسەر پشتی چیایەك لە نێزیك رێگەکە وێنەی ئەسپێکی جولاّو کێشراوە زۆر لە وێنە باشترە، وەکو دەڵێن ئەوە وێنەی ئەسپی کیسرایە کە ناوی (شەبدیز)ـــە لەسەر ئەویش وێنەی کیسرا و شیرین کێشراوە.([5])

لەوێدا چیایەك هەیە بە ناوی (ئەلخرمیە)([6]) یان (ئەلخەرمەدینیە)([7]) دەگەڕێتەوە بۆ بابەکی خورەمی([8]) لە لای چەپی رێگەکە لە نێوان قەسری شیرین و حەلوان، چیایەکە دەگاتە چیای حەلوان.([1])

---

١ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٩.

٢ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٠٦.

٣ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٠٦.

٤ - القزويني، اثار البلاد، ل٣٤٢.

٥ - المسالك والممالك، ل١١٩.

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٢٠.

٧ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٠٦.

٨ - خوڕەمی: دەستەیەکی ئاینی بوو ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئۆلە ئێرانییە کۆنەکانی وەکو مەزدەکی و زەردەشتی، کە لە سەدەی دووەمی کۆچی/ هەشتەمی زاینی پەیدا بووە، کە بابەك خوڕەمی سەرکردایەتیی بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستکاری کردووە لە دژی دەوڵەتی عەباسی لە سەرەتاکانی سەدەی سێیەمی کۆچی، بۆیە بەناوی ئەوەوە ناونراوە، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: الاسفرابینی، التبلر فی الدین وتمیز الفرق الناجمه من

لەوێدا چیای ددانی سەمیرە هەیە[٢] لە پشت شاری قەرمیسین (کرمانشا)[٣] کە زنجیرە چیایەکە درێژ دەبێتەوە بۆ هەمەدان و لەوێشەوە بۆ شاری حەلوان کە بەسەر شاری ماسبزان دەڕوانێت، کە بەنێوان هەردوو شاری سۆس و ئایزج لە هەرێمی خۆزستاندا دەڕوات.[٤]

لە چیاکانی دیکە کە وڵاتناسەکان ئاماژەی بۆ دەکەن چیای ئارۆند یان چیای هەمەدانە لە باشووری شارەکە و دەڕوانێتە سەری،[٥] یاقوت بەو شێوەیە باسی دەکات: (کە ئەوە چیای نەزە خدر نەزرە).[٦]

چیای ئارۆند جێگەی گرینگی پێدانی شاعیرانی پایەبەرزی هۆزانییەکانە، ئەوانەی لە شیعرەکان و دانیشتەکاندا باسییان کردووە، هەروەها وەکو دەڵێن یەکێك بووە لە گرینگترین شکۆداری شارەکەیان و، وایان کردووە شارەکەیان بە گەورەتر تەماشا بکەن لە شارەکانی دیکە و بە کانیاوەکانی هەڵبدەن، هەروەها بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە ئەوە کانییەکە لە کانییەکانی بەهەشت بەهۆی پاکی ئاوەکەیی و روونییەوە، دەرمانیشە بۆ نەخۆشان، هەروەها ئاوەکەی شیرین و ساردە، هەر بۆیە یاقوت لەو بارەیەوە دەڵێت[٧]:

---

الهالکە (بلا:١٩٤٠) ل٨٠. دەڵێن خورەمییەکان بەدوای هیوا و هەوەس کەوتوون و پیادەیان کردووە، یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٢٢٧.

١ - ابن رستة، المصادر نفسة، ل١٥٠.

٢ - دەگێڕنەوە سوپای ئیسلام لە کاتی شەڕی نەهاوەند بەسەر چیایەکی دووورودرێژ رابردووە، کە بەسەر چیای دیکەدا روانیوەیەتی.

٣ - االمصادر نفسة واللفحة.

٤ - سهراب، المصادر نفسة، ل١١٤.

٥ - ابن الفقیه الهمذاني، المصادر نفسة، ل٢٠٣-٢١٨.

٦ - معجم البلدان، ج١، ل١٣٥.

٧ - االمصادر نفسة، ج١، ل١٣٥-١٣٦.

تذكرت من اروند طيب نسيمة فقلت لقليي بالفراق سليم
سقى الله اروندا وروض شعابة ومن حلة من ظاعن ومقيم

هەندێ لە شاعیرانی دیکە دەڵێن:
سقيا لظلك يا اروند من جبل وان رميناك بالهجران والملل
هل يعلم الناس ما كفلتني حججا من حب مائك اذ يشفي من العلل

وڵاتناسەکان ناوی دوو چیای دیکەیان هێناوە لە شاری دەبیل (دوین) کە کورد دەستیان بەسەردا گرتووە لە سەدەی چوارەمی کۆچی، ئەوانیش چیاکانی حارس و حوەیرسە، کە رەچەڵەکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ حوەیرسی کوڕی عوقبەی حارسی کوڕی عومرۆی غەنویەکان، کە ئەوانە لەگەڵ سەرکردەی رزگارکەر سەلمان کوڕی رەبیعەی باهلی، کە یەکەمین کەسانێك بوون گەیشتنە سەر ئەو دوو چیایە و بەو ناوەوە ناویان نان، وەك یاقوت لە مەدائنی وەرگرتووە و بۆمان باس دەکات.([1]) حارس چیای ئاراراتە، لووتکەکەی ئاراراتی بچووکە و پێیان گوتووە حوەیرس.([2])
هەروەها یاقوت لە ئیبن فەقێی هەمەدانی([3]) بۆمان دەگوازێتەوە کە پەڕتووکەکەی پڕە لە چیرۆکی ئەفسانەیی و ئەندێشاوی، رووداوێکی دیکە هەیە لەو بارەیەوە کە پێوەندیی بەو دوو چیایە و خەڵکانی رەسەوە هەیە کە گاور بوونە، کە خودا تۆڵەی لێکردوونەتەوە وەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.([4]) وەکو هەمەدانی باس دەکات کە ئەوە لەسەر رووباری رەسە لە ئەرمینیا، هەزار شاریان داناوە و خودا پێغەمبەرێکی بۆناردوون دەڵێن موسا بووە،([5])داوای لێکردوون ئیمان بەخودای تاك و تەنیا بهێنن، درۆیان لەگەڵ کردووە و نکوڵیان لێکردووە، بۆیە دوعای لێکردوون و خوداش نزاکەی

---

١ - معجم البلدان، ج٣، ل١٠٨.
٢ - لسترنج، المصادر نفسة، ل٢١٧.
٣ - ئەوەمان نەبینیووە لە پەڕتووکەکەی.
٤ - تەمشای: سورة الفرقان، الاية ٣٨. سورة ق، الاية:١٢.
٥ - ئەوە پەیامبەر نەبووە موسا کوڕی عومران.

قبووڵ کردووه، بۆیه هەردوو چیای حارس و حویەرسی بردووەته شاری تائیف، ئەوەی بۆ ناردوون و بە زیندوویی لەژێریاندا دەیانشارێتەوە.([1])

ئەو چیرۆکە زۆر دووره لە راستی و لۆژیکیەوە، خودای گەورە هیچ پێویستی بە گواستنەوەی ئەو دوو چیایە نییە، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە بۆ ئەوەی تۆڵە لە خەڵکەکەی بکاتەوە، بە تایبەتی ئەو ناوچەیەی غەزەبی لێگرتووە لە بنچینەوە ناوچەیەکی چیایی بووە.

ب- رووبار:

پەڕتووکەکانی وڵاتناسان پڕیەتی لە قسە لەبارەی رووبارەکانەوە، هەروەها لە لای وڵاتناسە موسڵمانەکان زانیارییەکی فرەوان لەبارەی رووبارە گەورەکان لە جیهانی کۆن هەیە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەندێکیان بەرپەرچی ئەفسانە کۆنەکان دەدەنەوە لەبارەی هەڵقوڵانی رووبارە گەورەکان لە فردەوس.([2]) لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەیان سەرچاوەکانیان بە وردی دیاری دەکەن لە رووبار و ئەو زێیانەی لە وڵاتی کوردستان هەبووە.

لەو راستییە زانراوانەی لە لای وڵاتناسە موسڵمانەکان لەبارەی رووبارەکانەوە هەبووە، باران و بەفر و کانیاوەکان سەرچاوەی هەڵقوڵانی رووبارەکان بووە، هەر وەکو تێبینی ئەوە دەکەین کە وڵاتناسە موسڵمانەکان گرینگییەکی زۆریان بە سەرچاوەی ئاو داوە کاتێ قسەیان لەبارەی نێوەندی ئاوەدانی کردووە.([3])

ئیبن رستە بە تەنیا بەشێکی تایبەتی لە پەڕتووکەکەیدا تەرخان کردووە بۆ ئەو رووبارانەی لە وڵاتی موسڵماناندا هەبووە، بە گەورە و بچووکیانەوە، لەگەڵ جەختکردنەوە لە پەسن و خواری و ناوچەی هەڵقوڵان و سەرچاوەکان و رێژگەکانییەوە([4])، وەکو رووباری رەس و([5]) رووباری ئەلکر و([6]) روباری ئەسفید رۆز کە

١ - معجم البلدان، ج٣، ل١٠٨. بڕوانة: المقدسي، المصادر نفسة، ل٢٩٢.

٢ - بڕوانە: المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٤. بكة.

٣ - بڕوانە بەشی سێیەمی ئەو لێکۆڵینەوەیە بکە.

٤ - الاعلاق النفيسة، ل٨٨-٩٤.

٥ - االمصادر نفسة، ل٨٨.

٦ - االمصادر نفسة واللفحة.

سەرچاوەکەی لە دەروازەی سیسەرەوە بووە،([1]) هەروەها ئاماژە بە سەرچاوەی هەردوو ڕووباری خابوور و بەلیخ و هەرماس دەکات.([2]) و سەرچاوەی ڕووباری جوندی سابوور و ڕووباری سۆس و([3]) هەندێ لە ڕووبار و سەرچاوەی دیکە.

هەروەها ئیبن خوردازەبە بەشێکی پەڕتووکەکەی تەرخان کردووە بە ناوی (دەروازەی دەرچەی ڕووبارەکان) کە تێیدا سەرچاوەی سەرجەم ڕووبارە ناسراوەکانی جیهانی ئیسلامی و ڕێژگەکانی تێدا دیاری کردووە، لە دووتۆی ئەوانەش باسی ڕووبارە بچووکەکانیشی کردووە.([4])

لێرەدا پێکچوونێکی گەورە هەیە لە نێوان بۆچوونەکانی ئیبن خوردازەبە و ئیبن رستە لەبارەی ڕووبارەکانەوە.([5]) وەکو ئەوەی سەردەمی ئەو بن، بەڵام ئەوەی یەکەم پێش دووەم کەوتووە لە دانانی پەڕتووکەکەی، چونکە ئەوەی دووەم سوودی لە پەڕتووکەکەی یەکەم وەرگرتووە و لەسەر ئەوی گواستووەتەوە.

ئەوەی ئیبن خوردازەبە لەبارەی ڕووبار و ڕێژگەکانەوە نووسیویەتی دەڵێت: (ڕێژگەی خابوور لە سەرچاوەی هرماسەوە سەرچاوە دەگرێت و لە فوراتدا ئارام دەبێت لە قەرقیسیا، سەرچاوەی هەرماس لە کێوی عابدینە و دەڕژێتە خابوورەوە).([6]) هەروەها دەڵێت: (سەرچاوەی ڕووباری جوندیسابوور کە قەنتەری ڕووبارەکەیە لە سوبهان، دەڕژێتە دوجەیلی ئەهوازەوە،سەرچاوەی ڕووباری سۆسیش لە دەینور ئەویش دەڕژێتە دوجەیلەوە، هەردوو ڕووبارەکە لە دوجیلەوە لەسەرووی شازوران لەنگەر دەگرن و دەڕژێنە دەریای ڕۆژهەڵاتەوە).([7])

ئەوەی شایەنی باسکردنە گرینگی پێدانی هەر یەك لە ئەستەخری و ئیبن حوقەل بە ڕووبارەکان و سەرچاوەی هەڵقوڵان و ڕێچکە و ڕێژگەکانیان، سنوور دارە، بەڵام مەقەدەسی زۆر قسەی لەبارەوەی ڕووبارەکان کردووە، کە جیای کردووەتەوە لەگەڵ دەریا

---

١ - االمصادر نفسة واللفحة.

٢ - االمصادر نفسة، ل٨٩.

٣ - االمصادر نفسة، ل٩٠.

٤ - المسالك والممالك، ل١٤٩-١٥٤.

٥ - قارن مع: الاعلاق النفيسة، ل٨٨-٩٤.

٦ - المسالك والممالك، ل١٥٠.

٧ - االمصادر نفسة، ل١٥١.

و بەشێکی کورتی لە پێشەکی پەڕتووکەکەی تەرخان کردووە بۆ باسی هەڵقوڵان و ڕێژگەکانی ئەو رووبارانە، بەڵام لەبیری چووە باسی زۆرێك لە رووبارەکان بکات، هەروەها دوازدە رووباری لەیەکتر جیاکردووەتەوە، لە نێو ئەو رووبارە جیاکراوانەدا هەر یەك لە دیجلە و فورات و هرماس و ئەهواز هەیە.([1])

هەروەها خاوەنی پەڕتووکی (سنووری جیهان)، ئەویش بە تەنیا بەشێکی پەڕتووکەکەی بە ناونیشانی (قسەیەك لەبارەی رووبارەکان) تەرخان کردووە و دەڵێ رووبارەکان دوو جۆرن: سروشتی و دەستکرد، بە شێوەیەکی زانستی و ورد پێناسەیان دەکات و دەڵێت: (بەڵام دەستکرد ئەوەیە کە ڕێژگەکەی هەڵدەکەنرێت جا ئەوە بۆ بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەی شارێك بێت، یان بۆ چاندن و ئاودێری بێت، زۆربەی رووبارە دەستکردەکان بچوکن و ناکرێ کەشتی پێیاندا تێپەڕ ببێت، دەکرێ لە شارێکدا دە رووباری دەستکرد زیاتر یان کەمتر هەبێت).([2])

(بەڵام سروشتی ئەوەیە ماهیەتی زۆرە، کە ئەویش لە ئەنجامی بارینی بەفرێکی زۆر و سەرچاوەکانەوە کە لە چیاکانەوە دێت و لەسەر زەوی دەردەکەوێت و دەتەقێتەوە، ئەوە رووبارە، ڕێگەکەی بەخۆی دەکاتەوە، ڕێژگەکەیی هەندێ جار فرەوان و لە هەندێ جێگەش بەرتەسکە..([3])

لە دوای ئەو پێشەکییە تایبتەوە لەبارەی پێناسە و باسکردنی دەیان رووبار، لەوانە بچووك و گەورە لە سەرچاوەکانییەوە هەتا دەگاتە ڕێگەکانی و ئاماژەدان بەو شارانەی کە رووبارەکە پێیدا تێپەڕ دەبێت، لەو رووبارانەش دیجلەو فورات و سۆس و ڕەس و زابان و کەرو سپیدرۆز و چەندانی دیکە.

بەڵام مەسعودی سەرەڕای ئەوەی لەبارەی رووبارەکانەوە بە درێژی لە پەڕتووکەکەیدا بەناوی (مێرگی زێر) (مروج الژهب) باسی رووبارەکانی کردووە، بەڵام لەبیری چووە باسی زۆرێك لە رووبارەکان بکات.([4]) بەڵام لەبەرامبەردا شتێکی گرنکی وروژاندووە

١ - احسن التقاسيم، ل٢٤-٣٤.

٢ - حدود العالم، ل٣٤.

٣ - االمصادر نفسة والصفحة.

٤ - مروج الذهب، ج١، ل؟

لەبارەی  ئەوەی کە رووبارەکانیش گەنجیەتی و قوچەکی ژیان و مردن و داخورانیان هەیە، وەکە چۆن مرۆڤ و ئاژەڵ و رووەك ئەو شتانەیان هەیە.([1])

بەڵام وڵاتناسانی دیکە هەتا یاقوتیش شتێکی ئەوتۆیان لەبارەی رووبارەکان باس نەکردووە.

ت- ئاووهەوا:

پەڕتووکی وڵاتناسان ڤاڵا نییە لە باسکردنی ئاوو هەوا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە پەڕتووکەکانیان گرینگی جۆراو جۆریان پێداوە، وەکو ئیبن رستە یەکەم وڵاتناسی موسڵمانە لە باسکردنی حەوت هەرێمەکەدا بە تەنیا لە بەشی حەوتەمی پەڕتووکەکەیدا (الاعلاق النفیسە) بەشێکی لەبارەی هەرێمەکانەوە باس کردووە لەوانەش وڵاتە ئاوەدانەکان.([2]) هەروەها باسی بیرۆکەی چۆنییەتی نیشتەجێبوون لە ناوچەکانی هێڵی یەکسانی و جەمسەرەکان دەکات، لە پێشەوەش هەنجەتی کەشوهەوای ناوچەکە دەکاتە بەهانەی ئەوەی بۆچی لەوێ رۆیشتوون و کۆچییان کردووە، هەروەها باسی کاریگەری هۆکاری ئاوو هەوا بەسەر مرۆڤ و ئاژەڵ و رووەك دەکات.([3])

هەر وەکو سەرجەم وڵاتناسە موسڵمانەکانی دیکە ئیبن رستەش پەڕتووکەکەی ڤاڵا نییە لە باسکردن لەبارەی حەوت هەرێمەکە جا ئەوە بەگشتی بێت یان بەکورتی، بەڵام یاقوتی حەمەوی هەر بە شرۆڤەی ئەوە نەوەستاوە یەك بەیەك باسی هەرێمەکان بکات لە فەرهەنگە وڵاتناسیەکەیدا، بگرە وێنەشی بۆ روونکردنەوە بەکارهێناوە.([4])

لێرەوە باسکردن بە شێوەیەکی دوور ودرێژ بە شێوەی پلە بەپلە هاتە نێو پەڕتووکی وڵاتناسییەوە لە دووتۆی بوونی زانیاری پەسنی دیکە لەبارەی شار و ناوچەکان، بەڵام بە شێوەیەکی سنووردار.

لەو وڵاتناسانەی بۆ یەکەمین جار لە پەڕتووکەکانیاندا ئاماژەیان بە ئاو و هەوا داوە، یەعقوبییە کە تەنیا بەچەند ئاماژەیەك لەبارەی ئاوو هەوای هەندێ شاری گەورەی وەکو بەغدا و سامەرا، وازی هێناوە.([5])

---

١ - االمصادر نفسة، ج١، ل؟

٢ - الاعلاق النفیسة، ل٩٤-٩٦.

٣ - االمصادر نفسة، ل٩٧-٩٩.

٤ - معجم البلدان، ج١، ل٣٣.

٥ - البلدان، ل٨-٢٧.

له لایەکی دیکەوە لە دووتۆی باسکردن و پێناسەی هەندێ وڵات باسی ئاو و هەواکەی کردووە، وەکو (میسری خاوەن ئاو و هەوای گۆڕاو).([1]) و (ئەرمینیای دووری سارد و سۆڵە و خەمبار و)([2]) (کۆری چیای خەمبار و توندوتیژ و بەسترا و، هەواری کوردی سەرکێشی بەجەرگ).([3]) وەکو ئەوەی گەرەکی بێت شتێکمان پێ رابگەیەنێت لەبارەی بوونی پێوەندیی لە نێوان ساردی و توندوتیژی و سەرکێشییەوە.

بەڵام ئیبن خوردازەبە پەڕتووکەکەی بە هیچ شێوەیەك ئاماژەیەکی لەبارەی ئاو و هەوای گرینگ تێدا نییە، تەنیا هەندێ ئاماژە لەبارەی ئاو و هەوای وڵاتی رۆم و یەمەن نەبێت لەو دەروازەیەی ئەو بە تەنیا سەرسامی زەوییەکەی بووە.([4])

بەڵام ئیبن فەقێی هەمەدانی سەری کێشاوە بۆ هەندێ لایەنی ئاو و هەوای هەندێ وڵات بەبێ ئەوەی درێژەی بداتێ تەنیا بە شێوەیەکی کەم نەبێت، وەکو ئاماژەدان بە ئەو بەفرە زۆرەی کە چیای قەندیل دادەپۆشێت بە درێژایی ساڵ.([5]) هەروەها قسەکانی لەبارەی شاری قرمیسین: (لە شتە سەرسووڕمانەکانی شاری قرمیسین با لە شەوانی هاوین بە هیچ شێوەیەك هەڵناکات).([6]) هەر بۆ نموونە کاتێ قسە دەکات لەبارەی ئاو و هەوای هەمەدان کە بەناوبانگە بە بەرزی پلەی گەرما لە هاوین و ساردییەکی دژوار لە زستاندا.([7])

خاوەنی پەڕتووکی (سنووری جیهان) بە هیچ شێوەیەك شتێکی زیاد باس ناکات، تەنیا باسێکی گشتی نەبێت لەبارەی ئاو و هەوای هەندێ هەرێم و شار، وەکو لەبارەی ئاو و هەوای جەزیرە: (هەواکەی خۆشە) و شاری لیشتر (هەواکەی خۆشە).([8])

بەڵام مەقدەسی لە هەموو وڵاتناسەکانی دیکەی پێشین زیاتر گرینگی بە باسکردنی ئاو و هەوا داوە، وەکو جەختێکی تایبەت لە پەسنەکانی ئاو و هەوای هەر هەرێمێك

---

١ - االمصادر نفسة، ل٩.

٢ - االمصادر نفسة، ل٩-١٠.

٣ - المسالك والممالك، ل١٣٤.

٤ - مختلر كتاب البلدان، ل١٢٥.

٥ - ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٩٧.

٦ - االمصادر نفسة، ل٢٠٣-٢١٦.

٧ - حدود العالم، ل١١٧.

٨ - االمصادر نفسة، ل١٠٧.

دەکاتەوە. ئەو باسکردنەی تەنیا باسکردنێکی رووکەشییە، نەك باسکردنێکی لێکدانەوەیی بێت، نموونەش لەسەر ئەوە کاتێ باسی ئاو و هەوای هەرێمی چیاکان دەکات و دەڵێت: (هەرێمێکی ساردە و بەفری زۆرە و خلیسکان بەسەر دڵەکاندا کەمە.[1]) هەروەها باسکردنی لەبارەی هەرێمی ئاقور (جەزیرە) بەوەی کە نێزیکە لە شام و عێراقەوە (ناوچەی ئامەد ساردە لەبەرئەوەی نێزیکە لە چیاکان، مووسڵیش خۆشترین ناوچەیە هەواکەی خۆش بێت.[2]) هەروەها کە باسی ئاو و هەوای حەلوان دەکات و دەڵێت: (ئاو و هەواکەی مامناوەندییە).[3]

بەڵام مەسعودی بە شێوەیەکی گشتی باسی زۆر لایەنی ئاو و هەوای کردووە و کاریگەری بەسەر سەرجەم لایەنە زیندووەکانی زەوی چییە، بەبێ ئەوەی درێژە بەو باسە بدات کە پێوەندیی بە چ وڵاتێکی دیاری کراو یان شارێکی دیارکراو هەیە.

بەڵام ئەو زۆر بە سنوورداری ئاماژە بەو ئاو و هەوایانە دەکات، کە هەر یەك لە ئەستەخری و ئیبن حوقەل باسیان کردووە، کە باسکردنەکەیان هیچ گرینگییەکی نییە لەو بارەیەوە، تەنیا گرینگیان بە لایەنەکانی ئابووری و ئاوەدانی و لایەنەکانی دیکە داوە.

هەروەها وڵاتناسانی سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچی/ یازدە و دوازدەی زایینی، هیچ ئاماژەیەکی ئەوتۆیان بە پرسەکانی ئاو و هەوا نەداوە کە شایەنی باسکردن بێت، هەتا یاقوتیش تەنیا ئەوە نەبێت لە پێشەکی فەرهەنگەکەیدا هەندێ پرسی ئاو و هەوای بە شێوەیەکی گشتی وروژاندووە لەبارەی شوێنە ئاوەدانەکانەوە، دیارە ئەو ئاماژانە لەبارەی ئەو ئاو و هەوایانە لەبارەی وڵاتان و شارەکان زۆر سنووردارە، کە لە چەند دەستەواژەیەکی سادە تێپەڕ ناکات وەکو لەبارەی ئاو و هەوای هەرێمی جەزیرە دەڵێت: (خۆش هەوایە)[4] هەروەها ئاماژە بۆ (زەمهەریری چیا و زۆری بەفر دەکات).[5]

---

١ - احسن التقاسیم، ل٣٠٣.

٢ - االمصادر نفسة، ل١٢٦.

٣ - االمصادر نفسة، ل١١٢.

٤ - معجم البلدان، ج٣، ل٥٤.

٥ - االمصادر نفسة، ج٣، ل٢٧.

# بەشی سێیەم

## شوێنە ئاوەدانەکان لە وڵاتی کوردستان

### یەکەم: مەڵبەندە ئاوەدانەکانی کورد (شار و گوند):

سەرچاوە وڵاتناسییەکان پڕە لە باسکردنی دەیان نێوەندی ئاوەدانی لە وڵاتی کوردستان لە شار و وڵات و شارۆکە و گوند و دێهات و چەندانی دیکە، کە سەرجەم ئەو هەرێمانەی گرتووەتەوە کە کورد تێدا ژیاوە، ئەوەی جێگەی تێبینییە لە لایەك گرینگیپێدانی وڵاتناسەکان بەو بابەتە بە شێوەی جیاجیا بووە، لە لایەکی دیکەوە ئەوان راستەوخۆ باسی کوردیان نەکردووە وەکو نەتەوەیەك، بگرە لە دووتۆی باسکردنی نێوەندی ئاوەدانی ئەو ناوچانەوە بووە، چونکە گرینگیدانەکەیان لەسەر بنەمای بە پلەی یەکەم لەسەر بارودۆخی سروشتی و ئابووریی شار و گوندەکان و پێگەیان و ماوەی دووری نێوانیان بووە، هەتا لە هەندێ جار ئەگەر باسی بارودۆخی مرۆیی و دانیشتوانیشیان کردبێت، بەوەندە وازیان هێناوە کە باسی دانیشتووانی شارۆکەیەکی دیاریکراویان کردبێت گوتویانە کە ئەوانە عەجەمن، ئەو بێژەیە بە شێوەیەکی رەها گشتێنراوە لە لایەن وڵاتناسەکانەوە، مەبەستیشیان لەو بێژەیە واتە ئەو کەسانە بووە کە بەعارەبی ئاخافتنیان نەکردووە.

لەسەر ئەو بنەمایە ئەوا پێکهاتەی دانیشتووانی وڵاتانی ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی لە -ماوەی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا- زۆرێك لە نادیاری و نارۆشنی پێوە دیارە، زۆر ئەستەم بووە دەستنیشانی دانیشتووانی هەر شارێك لە رووی رەگەزی مرۆیی بکرێت کە لەو شارەدا نیشتەجێ بوونە و رێژەی هەریەکەیان چەند بووە، تەنیا ئەوە نەبێت کە هەر

مەڵبەندێکی ئاوەدانی لەنێو سنووری کوردستان بووبێت بە شێوەیەکی لەیەك نێزیکی بە پێی ئەو سەرچاوە مێژوویی و جوگرافیانەی هەبووە، وای کردووە ئەو شارە یان ئەو گوندە بە ناوچەی کوردستان هەژمار بکەین.

ولاّتناسە موسڵمانەکان بە تایبەتی ئەستەخری و ئیبن حوقەل و یاقوت و یەعقوبی بە شێوەیەکی فرەوان خۆیان لە باسکردنی شارە جۆراوجۆرەکان لە رووی چەمکی ئاوەدانی و دەرخستنی تایبەتمەندییەکانی دانیشتووان و، لایەنەکانی ئابووریی و جوگرافی و سیاسیی و ئەبستمۆلۆژییەوە داوە، هەروەها باسی لایەنی ئاینی و ئاینزایی و هەندێ جاریش باسی لایەنی رۆشنبیریشی گرتووەتەوە.

بۆیە گرینگی پێدانەکەیان لە چەند تەوەرێکەوە بووە:

- شارەکە سەر بە چ هەرێمێك بووە.
- ئاماژەدان بە رەچەڵەکی دانیشتووان، هەروەها لایەنی ئاوەدانی و تەلارسازی و جۆری تەلار و ئەو کەرەستەیەی تێیدا بەکارهاتووە.
- شوێنگەی جوگرافی شارەکە و ئاستی گونجاوییەکەی.
- تا چەند شوێنەکە لە رووی ئاو و دەرامەتە ئابوورییەکان لە رووی کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانیی و ساتوسەودایی بازاڕەوە گونجاو بووە.
- شارەکە تا چەند پارێزراو بووە و چۆنییەتی پاراستنی لە رووی شوورە و قەڵا و قوللەوە.
- بوونی مزگەوت و شوێنی خوداپەرستی.
- بوونی دوانگە یاخۆ نەبوونی دوانگە.
- پێوەری پیتاك کۆکردنەوە.
- ماوەی نێوان شارەکان و باسکردنی رێگەکان.
- رەوشت باشی و یەکسانی شارەکە و خەڵکەکەی ئەگەر وەکو دیاردە بێت.
- بارودۆخی سیاسی شارەکە.

ئەوەی شایەنی باسکردنە ئەوەمان بە پێویست نەزانیوە بچینە نێو باسی هەموو ئەو تەوەرانەوە کاتێ باسی شارێکمان کردبێت لە رووی ولاّتناسییەوە.

دیارە وڵاتناسەکان هەندێ دەستەواژە و بێژەی جیاوازیان بەکارهێناوە لە رووی باسکردنی شارەکان وەکو (گەورە) یان (گەورەیی) یان (زل) یان (مەزن) یان (زۆر گەورە) یاخۆ (فرەوان) یان (فرەوان نەبووە) یان (ناوەند) یان (بچووك).

ئەوەی جێگەی سەرنجە هەندێك لە وڵاتناسەکان هەتا یاقوتی هەوڵی داوە جیاکاری لە نێوان مەڵبەندی ئاوەدانی لە رووی فرەوانی بکات، بۆیە زاراوەی (شار) یان (شارنشینی) یان (شارۆکە) یان (شارەدێ) یان (گوند)ی بەکارهێناوە، لە راستیدا سنووری جیاکراوە لە نێوان شاری بچووك و شاری گەورە لە لایەك و، لە نێوان شار و گوندا لە لایەکی دیکەوە بە تەواوی نادیارە، بۆیە کە تێبینی دەکەین یاقوت بێژەی (شارنشینی) یان (شارۆکە) لە زۆربەی بابەتەکاندا بە واتای شاری گەورە یان شاری ناوەند لە رووی قەبارەوە یان شاری بچووك بەکارهێناوە.([1])

لە لایەکی دیکەوە وڵاتناسەکان ئاماژەیان بۆ فرەوانی و پانتایی شار و ژمارەی دانیشتووان نەکردوە، تەنیا بە شێوەیەکی کەم نەبێت، وەکو لە هەندێ شاری هەرێمی فارس و هەرێمی چیاکان یان ئازەربایجان و هەندێکی دیکە ئەمە بەرچاو دەکەوێت.([2])

بێگومان سەرجەم شارەکان لە رووی قەبارە یان ژمارەی دانیشتووان یەکسان نین، بگرە ئەمە لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکە جیاوازە، ئەمەش بۆ هۆکاری جیاواز لە رووی جوگرافی، کارگێڕی، رامیاریی، ئابووریی و...هتد دەگەڕێتەوە، هەندێ لە وڵاتناسەکان هاتوونەتە سەر ئەو باسە و باسی شارییان بە دەستەواژەی جۆراوجۆر کردووە، هەروەها هەندێك بەراوردیان لە نێوان شارێك و شارێکی دیکە کردووە، بۆیە زۆر پێویست دەکات ئاماژە بە هەندێ لەو باسانە بکەین و بەراوردیان بکەین لەوەی کە پێوەندییان بە شاری وڵاتی کوردستانەوە هەیە.

یەعقوبی بەو شێوەیە باسی شاری هەمەدان دەکات کە (شارێکی فرەوان و قەدەرێکی گەورە و زۆری هەرێم و کۆری هەبووە).([3]) هەروەها ئەستەخریش لەبارەیەوە دەڵێت (شاری گەورەیە)([4]) لە لای ئیبن حوقەلیش (شارێکی گەورە و باش و خاوەن

---

١ - بڕوانە: معجم البلدان، ج٤، ل٣١٨، ج٥، ٣٦. بکة.

٢ - بڕوانە: الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٢٣-١٢٥-٢٠٨-٢٠٩-٢٥٤-٣١٧-١٨١-١٨٢. بکة.

٣ - البلدان، ل٤١.

٤ - المسالك والممالك، ل١١٧.

پانتاییەکی گەورەیە و)([1]) (پانتاییەکەی فرسەخێکە بەقەد خۆی)([2]) ئیدریسیش بەو شێوەیە باسی دەکات (شارێکی گەورە و زۆر ئاوەدان بووە).([3])

بەڵام شاری دەینور بە شێوەیەك باسی دەکات کە (قەدەرێکی گەورەی هەبووە).([4]) هەروەها ئیبن حوقەل جۆرێك لە بەراوردکاری لە نێوان ئەو و شاری هەمەدان دەکات و وەکو سێیەکی هەمەدان دەیبینێ.([5])

بەڵام شاری حەلوان کە لە سەدەی سێیەمی کۆچی بەو شێوەیە باسی کراوە کە (گەورەو گران بووە).([6]) هەروەها کە باسی شاری نەهاوەند دەکات بەوەی کە (گەورە و بازرگانی و گەڕەك و ئاپارتمانی زۆری تێدا بووە).([7]) هەروەها گرینگییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری جوگرافی و ئابووریی و دانیشتووانەکەی، هەر وەکو شاری قرمیسین کە (قەدەریی گەورە و- جۆراوجۆر بووە لە رووی نەتەوەییەوە).([8]) هەروەها ئەستەخری کە باسی شاری نەسیبین دەکات و دەڵێ شارێکی گەورە بووە.([9])

لە لایەکی دیکەوە مەقدەسی بەراوردێك لە نێوان ئەو و شاری مووسڵ دەکات و جەخت لەوە دەکاتەوە کە لە مووسڵ بچووکتر و خۆشتر و جوانتر بووە.([10]) ئیبن حوقەلیش لەو بارەیەوە دەڵێت: (لەناوچەی جەزیرە باشترین شار بووە).([11]) دواتر بەراوردی دەکات لەگەڵ شاری مووسڵ و دەڵێت: (چەند جارەی شاری نەسیبین کارپێدانی

---

١ - صورة الارض، ل٣٠٦.

٢ - االمصادر نفسة، ل٣٠٨.

٣ - نزهة المشتاق، ل٢٣٣.

٤ - البلدان، ل٤٠.

٥ - صورة الارض، ل٣٠٨.

٦ - اليعقوبي، المصادر نفسة، ل٤٠.

٧ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٠٧.

٨ - اليعقوبي، ل٤٠.

٩ - المسالك والممالك، ل٥٢.

١٠ - احسن التقاسيم، ل١٢٤.

١١ - صورة الارض، ل١٩١.

تێدا بووه و شوێنی بەسەر چوون و گەورەیی کارەکانی زۆر بووه.[1] هەروەها خاوەن پەڕتووکی سنووری جیهان بەو شێوەیە پێناسەی دەکات کە یەکێك بووە لە زۆرترین لەو شارانەی جەزیرە پاك و ئاوەدان و خاوەن دانیشتووانێکی زۆر بووه.[2]

بەڵام ئیبن جەریر کە سەردانی شارەکەی کردووه لە دووتۆی گەڕانەکانیدا، ئەوەش لە مانگی رەبیعی یەکەم لە ساڵی (٥٨٠ك/١١٨٤ز) گەیشتووەتە ئەو شارە و بە شێوەیەکی ورد باسی دەکات و لە پێشەکیەکدا کە ڤاڵا نییە لە پەسنێکی ئەدەبی و دەڵێت: (بەناوبانگ و پێشکەوتوو بووه، لە دەرەوەیدا گەنج و لەناوەوەیدا وێران، خاوەن دیمەنێکی جوان بووه، لە رووی گەورەیی و بچووکییەوە مامناوەند بووه).[3]

بەڵام شاری ئەربل وەکو یاقوت باسی دەکات و دەڵێت: (قەڵایەکی سخت و عاسێ و شارێکی مەزن بووه لە دەڤەری سەرزەمینێکی فرەوان و سادەدا.[4] واتە سەرزەمینە دەشتاییەکەی یارمەتی ئەوەی داوە شارەکە فرەوان و مەزن بێت.

بەڵام شاری جەزیرەی ئیبن عومەر بە شێوەیەك باسی دەکات کە شارێکی بچووك بووه.[5] وەکو دەردەکەوێت پێگەکەی کەند و کۆسپ بووه و یارمەتی ئەوەی نەداوە ببێتە شارێکی گەورە، بۆیە (بۆتە قەبلاندنێك بەسەر ئەرمینیا و وڵاتی رۆم و ناوچەکانی میافارقین و ئەرزن)[6]و (لەسەر لێواری کەندەرانێك بووه لە نێوان ترس و تکادا).[7] واتە هێمن و ئارام نەبووه، لەبەرئەوەی هەمیشە کەوتۆتە بەردەم هێرشی رۆمەکانەوە.

هەر یەك لە ئەستەخری و ئیبن حوقەل بەراوردێك لە نێوان هەردوو شاری رەهاو کفر توسا دەکەن و دەڵێن ئەوەی یەکەمیان بچووکترە لە شاری دووەم.[8]

---

١ - االمصادر نفسة، ل١٩٤.

٢ - مؤلف مجهول، ل١١٨.

٣ - رحلة ابن جبير، ل٢١٤.

٤ - معجم البلدان، ج١، ل١١٦. بۆ زیاتر بڕوانە: محسن محمد حسين، اربيل في العهد الاتابكي، (بغداد: ١٩٧٦).بكة.

٥ - صورة الارض، ل٢٠٢.

٦ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٣.

٧ -االمصادر نفسة واللفحة.

٨ - المسالك والممالك، ل٥٣، صورة الارض، ل٢٠٤.

ئەوەی شایەنی تێبینییە کۆمەڵێك لەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دراوە لەبارەی شار و ناوچە و هەرێمە کوردییەکانەوە، بە شێوەیەکی تایبەت نەبووە، بگرە هەر یەك لەمانە بەشێك لە شار و ناوچە کوردیەکانی وەرگرتووە، لە کاتێکدا ئەو لێکۆڵینەوە سەرجەم گوند و شار و ناوچە و هەرێمە کوردیەکانی وڵاتی کوردستانی گرتووەتەوە، لەگەڵ تێبینییەکی کورت لە کاتی باسکردن و جەختکردنەوە لەو جیاوازییانەی لەبارەی مەڵبەندی ئاوەدانی لە لای وڵاتناسەکان و چۆنییەتی باسکردنیان لە ماوە جیاوازەکاندا و ئاستی گەشەکردنیان لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە بەپێی ئەو گۆڕانکارییە سیاسیی و کاگێڕییەی لە ماوە جیاجیاکاندا هەبووە.

لەو لێکۆڵینەوەیەدا کاتێ باسی شارە کوردییەکان دەکەین لە هەرێمی چیاکانەوە دەستمان پێکردووە، لەبەرئەوەی بەشێکی گەورەی وڵاتی کوردستان پێکدەهێنێت، بەڵام سەبارەت بە مەڵبەندە ئاوەدانییەکانی دیکەی کورد کە دەکەوێتە هەرێمەکانی ترەوە ئەویشمان باسکردووە، لە گرینگترین لەو مەڵبەندانە:

أ- شارەکان:

* میافارقین:

وڵاتناسەکان سەبارەت بە کارگێڕی شاری میافارقین بیروڕایان جیاوازە، لە کاتێکدا ئیبن خوردازەبە لە دووتۆی کۆری دیاری رەبیعە لە هەرێمی جەزیرە هەژماری دەکات، هەر بەوەندەش وازدەهێنێ و ئاماژە بە ماوەی نێوان ئەو شارە و شارەکانی دیکە دەکات لە ناوچەکەدا.(١) لە کاتێکدا دەبینین ئەوانی دیکە دەڵێن لە بەناوبانگترین شارەکانی دیاربەکرە.(٢) کە ئەوەش راستە، هەروەها ئیبن رستەش شتێکی زیادە ناخاتە سەر ئەوە و دەڵێت: ئەوە یەکێکە لە ناوچەکانی جەزیرە.(٣) بەڵام ئیدریسی کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات جیاوازە لەوانی دیکە.(٤)

---

١ - المسالك والممالك، ل٨٦-٨٧.

٢ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢. البكري، معجم استعجم، ج٤، ل١٢٨٦. ياقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٣٤٩. القزويني، اثار البلاد، ل٥٦٥.

٣ - الاعلاق النفيسة، ل١٠٣.

٤ - نزهة المشتاق، ل٢٢٢.

بەڵام ئەستەخری و خاوەنی پەڕتووکی (سنووری جیهان) رایەکی دیکەیان هەیە، یەکەمیان بەو شێوەیە باسی دەکات: (نەتەوەیەکە لە هەرێمی جەزیرەوە دەست پێدەکات بەبێ ئەوەی بگاتە رووباری دیجلە، لە دواوەیشی سنووری جەزیرە وەکو وێنەمان کێشاوە لە نێوان دیجلە و فورات دایە، بۆیە خستمانە سەر ئەرمینیا).([1]) ئەمە لە کاتێکدا ئەستەخری ئەو شتەی لەو وەرگرتووە بە پشت بەستن بە نەخشەی جەزیرە کە بەو شێوەیە وێنەی کێشراوە و وای لێ کردووە شارەکە بکەوێتە دەرەوەی جەزیرەوە.([2])

بەڵام ئەوەی دواتریان میافارقین بەو شێوەیە پێناسە دەکات کە سنوورەکەی لە نێوان ئەرمینیا و جەزیرە و رۆمدایە.([3])

هەروەها لەبەرگرەوەی پەڕتووکی ئیبن حوقەل لە سەدەی شەشەمی کۆچی دەڵێت: (شارێکی گەورە و گران و مەترسیدارە.. ئاپارتمانی زۆرە).([4])

هەروەها مەقدەسی کە باسی شاری میافارقین دەکات بەوەی کە (شارێکی جوان و قایم و شکۆدارە و بە بەرد و کەندۆڕ دەورە دراوە، کەم نیشانە و رەز و باخە).([5]) یاقوتیش لە باسی ئەو شارە و مێژووەکەیدا([6]) جەخت لەوە دەکاتەوە کە کوردی شامی لەو شارەدا نیشتەجی بوونە.([7])

*ئەرزن:

ئەو شارە دەکەوێتە دیاری رەبیعە،([8]) لە نێزیك شاری میافارقین، لە کەرتی رۆژئاوای یەکێك لە لقەکانی رووباری دیجلە کە پێی دەڵێن سەربەت،([9]) کە شارێکی

---

١ - المسالك والممالك، ل١١١.

٢ - بڕوانە نەخشەی ژمارە ٥. بکە.

٣ - مؤلف مجهول، ل١٢١.

٤ - صورة الارض، ل٢٠٢.

٥ -احسن التقاسيم، ل١٢٤.

٦ - معجم البلدان، ج٨، ل٣٤٩. بڕوانە : عبد الرقيب يوسف، الدولة الدوستكية في كوردستان الوسطى، (بغداد:١٩٧٢) ج١، ل٧٦-٧٩.

٧ - معجم البلدان، ج٨، ل٣٩٤.

٨ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٨٦.

٩ - الاصطخري، الاقاليم، ل٤٣.

بەناوبانگە لە نێزیك خەڵات، کە یەکێکە لە دێرینترین ناوچەی ئەرمینیا، لەگەڵ ئەوەشدا وەکو ئەوە نەمایتەوە کە لەسەردەمی یاقوت دەڵێ: (بەڵام ئێستە ئاگەدارم دەکەنەوە لەوەی وێرانی بە ڕوویەوە دیارە).[1] لە لایەکی دیکەوە یاقوت ئاماژە بە بوونی جیاوازی دەکات لەبارەی رەچەڵەکی شارەکە وەکو دەڵێت: (هەندێ لە نەتەوەکانی شاری ئەرزن بۆ لایەکانی شاری دیاربەکر دەگەڕێتەوە وەکو رۆم، نەتەوەیەکی دیکە لە لای جەزیرە، بەڵام رایەکی دیکە هەیە دەڵێت ئەوانە بۆ ئەرمینیا دەگەڕێتەوە، کە ئەوە ئەرزنی رۆم نییە کە دەکەوێتە ئەرمینیا، بەڵام لەوەی یەکەم گەورەترە لە رووی جوگرافی و ئیداری و سیاسییەوە.[2]

*سەعرە:

دەکەوێتە سەر هەردوو لێواری رووباری رەزمی شەماڵ و گردی فاقان،[3] ناوی ئەو شارە بە شێوەی جیاجیا هاتووە لە سەرچاوە ولاتناسییەکان وەکو (سەعرت)[4] یان (ئەسعرد)[5] یان (سعرد)[6] ئەوەش پرسێکی ئاساییە لە نووسینی ناوەکەی بە پێتی عارەبی کە عارەبان بەو شێوەیە نووسیویانە.

لەو شارەدا رۆڵەکانی خێڵی حاربۆختی تێیدا نیشتەجێ بوونە کە لە نێوان هەردوو شاری سەعرد و حەیزان هەبوونە.[7]

لە راستیدا کەمێك لە ولاتناسەکان - لە ماوەی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا - چوونەتە سەر باسکردنی و تەنیا بەناوهێنانەکەی وازیان هێناوە بەبێ ئەوەی بچنە ناو

---

١ - معجم البلدان، ج١، ل١٢٥.

٢ - االمصادر نفسة، ل١٢٦.

٣ - لسترنج، المصادر نفسة، ل١٥٤.

٤ - ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل٢٠٨.

٥ - الاصطخري، الاقاليم، ل٣٤.

٦ - الشابشي، الديارات، تحقيق: كوركيس عواد (بغداد:١٩٥١) ل١٢٧.

٧ - الفارقي، تاريخ الفارقي، ل٤٩.

ناوەرۆکەکەیەوە، بەوەی کە ئەو شارە شایەنی باسکردن نەبووە لەماوەی هەر حەوت سەدەی یەکەمی مێژووی ئیسلامیدا.([1])

*ئەنحەل:

بە تەنیا یاقوت باسی دەکات و تەنیا بەوەندەش وازدەهێنێت کە دەڵێ: شارێکە لە دیار بەکر لەگەڵ سەعرت،([2]) واتە ئەو دوو شارە دراوسێی یەکتر بوونە.

*حەیزان:

ئەوە دەکەوێتە نێزیك سەعرت کە یەکێکە لە شارەکانی دیاربەکر، کە خێڵی حاربۆختی کوردی تێدا نیشتەجێ بووە،([3]) وەکو لە پێشەوە باسمانکرد.

وەکو باسی دەکەن ئاو و کشتوکاڵی زۆری هەبووە، هەروەها یاقوت ئەوە بەدوور نازانێت کە (حەیزان) چاوگی (حەوز) بووبێت، کە ئەوە شتێکە داوای دەکەیت و بەدەستی دەهێنێت.([4]) ئەو ئاڕاستەیەش هەڵەیە و دەچێتە دووتۆی هەوڵە دووبارە بووەکانی یاقوت لە عارەباندنی ناوی شارە غەیرە عارەبییەکان، چونکە وشەیەکی کوردی رەسەنە و ئێستە ناوی بە (هیزان) دێت.([5]) کە بە واتای خێڵ یاخۆ هێز دێت لە زمانی کوردیدا.

*حانی:

ئەوەش شارێکە لە دیاربەکر، ئەستەخری بەو شێوەیە پێناسەی دەکات و دەڵێت: (شارێکی مامناوەند و جوان و بە پیتە).([6]) هەروەها یاقوت باسی دەکات بەوەی کە (شارێکی ناسراوە لە دیار بەکر).([7])

---

١ - لە کاتێکدا لە سەدەی هەشتەمی کۆچی شارێکی بەناوبانگ بووە بە پیشەسازی کانزایی و شوشە و دار و درەختی جوان. بڕوانە: حمد الله المستوفي القزويني، نزهة القلوب في المسالك والممالك، تحقيق: محمد دير لادق، (طهران: ١٩١٧) ل١٢٣.

٢ - معجم البلدان، ج١، ل٢٠٨.

٣ - ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٢٠٤.

٤ - االمصادر نفسة واللفحة.

٥ - عبد الرقيب يوسف، الدولة الدوستكية، ج١، ل٢٢.

٦ - المسالك والممالك، ل٥٣.

٧ - معجم البلدان، ج٣، ل١١٠.

*ئەلناسریە (ئەلنەسرییە):

ئەوە ناسر خەسرە و لە دووتۆی گەڕانەکانی باسی دەکات و دەڵێت ئەوە یەکێکە لەو شارانەی کە ئەمیر دۆستەکی (مەروانی) سەعدەللای نەسر دەوڵە و شەرف مەلای ئەبو نەسر ئەحمەد بینای کردووە.([1]) کە بە دووری چوار فەرسەخ (٢٤کم) لە شاری میافارقینەوە دوورە.([2]) لەوەش زیاتر باسی وەردەکارییەکانی ناکات.([3])

*ئامەد (دیاربەکری ئێستە):

ئەو شارە بەختی هەبووە لەوەی زۆر بەگرینگییەوە باسی لێوەکراوە لە لای وڵاتناسان و گەڕیدەکانەوە، تەنیا خاوەنی پەڕتووکی سنووری جیهان نەبێت، کە زۆریان بەباڵادا گوتووە بە تایبەتی ئەوەی پێوەندیی بە قایمی شوورەکەیەوە هەیە، ئەو شارە دەکەوێتە سەر درێژایی ڕۆژئاوای رووباری دیجلە.([4]) هەروەها مەقدەسی باسی دەکات و دەڵێت (شارێکی قایم و بیناکانی باش و جێگەی سەرسوڕمانە کە لە کاری ئەنتاکیەکانە، لە نێوان ئەو و قەڵای فەزادا).([5]) کە لە هەموو لایەکانییەوە رووباری دیجلەیە تەنیا یەك لای نەبێت، کە وەکو مانگی هیلال وایە.([6])

---

١ - میر ئەبو نەسر ئەحمەد: سێیەم کوڕی مەروان کوڕی دۆستەکی دامەزرێنەری دەسەلاتی کوردی بووە کە لە نێوان (٢٧٣-٤٨٥ك/ ٩٨٢-١٠٩٣ز) حوکمی کردووە و دەسەلاتی دەوڵەتی دۆستەکی بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدە (٤٠١-٤٥٣ك/١٠١١-١٠٦١ز) کردووە، باشترین خزمەتگوزاری لە سەردەمی ئەودا پێشکێش بە خەڵکی کراوە بە هۆی سیاسەتیی باش و دانایی لەسەر ئاستی نێوخۆیی و دەرەکییەوە، بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە: ابن الاثیر، الکامل في التاریخ، ج٩، محمد امین زکی، خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان (سلێمانی ٢٠٠٠) بەرگی دووەم، ل٥-٥٠.

٢ -سفرنامة، ل٨.

٣ - فارقی مێژوونووس زۆر بە وردی سەیری ئەو شارەی کردووە لە رووی پێگە و خزمەتگوزارییەوە کە زۆر سەرسام بووە پێی، بۆ زیاتر زانیاریی بڕوانە: تاریخ الفارقي، ل١٤١. بکة.

٤ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠١.

٥ - احسن التقاسیم، ل١٢٤.

٦ - یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل٥٦. القزویني، اثار الابلاد، ل٤٩١.

*حصن کیفا (قەڵای کیفا)([1])

یاقوت بەو شێوە دەیناسێنیٚ کە شارێك و قەڵایەکە دەکەوێتە سەر رووباری دیجلە کە سەر بە دیار بەکرە، دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری ئامەد و جەزیرەی ئیبن عومەر و بە قەنتەرەکەیشی بەناوبانگە.([2]) مەقدەسیش بە شێوەیەك باسی دەکات کە (زۆر بەخێرە).([3])

بەڵام لەبەرگرەوەی پەڕتووکی ئیبن حوقەل بەو شێوەیە باسی دەکات کە قەڵایەکی قایم و تەنیا رێیەکی راگوزاری هەیە، کە لە نێوان چیاکاندا شاردراوەتەوە، تەنیا ئەو لایەی نەبێت کە دەکەوێتە سەر رووباری دیجلە، کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای رووبارەکە. چەندان ئاوەڕۆ و کەند و لەندی عاسێی تێدایە، هەروەها دەڵێت ناوچە ئاوەدانەکانی زۆر و ئاوەدانە، بەڵام ئاو و هەواکەی خراپ و ناتەندروستە بە تایبەتی لە وەرزی هاویندا.([4])

*تەل فاقان( گردی فاقان) ([5])

خوارەوەی ئەو گردە ناسراوە بە فاقان، دەکەوێتە لای چەپی رووباری دیجلە بە دووری پەنجا میل بەرەو ڕۆژئاوای حەسەن کێف، ئەو رووبارە بە شێوەیەکی گەورە وەردەچەرخیٚ بە ئاڕاستەی باشوور،([6]) ئەو شارە لەنێو پەڕتووکەکانی وڵاتناسانی سەدەی سێیەمی کۆچی بەرامبەر نۆیەمی زاینی باسی نەکراوە.

---

١ - ئەمە بە شێوەیەکی دیکەش هاتووە وەکو (حوسن کیبا) لە هەندیٚ سەرچاوەی دیکەدا: بڕوانە: (السمعاني، الانساب، (بیروت:١٩٨٠) ج٤، ل١٥٤، یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ١٥٣.

٢ - معجم البلدان، ج٣، ل١٥٣.

٣ - احسن التقاسیم، ل١٢٥.

٤ - صورة الارض، ل٢٠٢.

٥ -لە بەڵگەنامە ئاشوورییەکاندا بە ناوی (تلە) ناوی هاتووە، ئەوە واتای ئەوەیە ئەو شارە زۆر کۆنە، بڕوانە: دائرە المعارف الاسلامیە، مادە (دجلە) بکە، بەڵام ئێستە بە (تەلاتیف روان) ناو دەبرێت، کە دەکەوێتە رێژگەی رووباری برتان کە دەڕێژێتە رووباری دیجلەوە، عبد الرقیب یوسفن الدولة الدوستکیة، ج٢، ل١٩، پەراوێزی ژمارە ٦.

٦ - لتسرنج، المصادر نفسة، ل١٤٥.

بەڵام مەقدەسی لە سەدەی چوارەمی کۆچی پێگەی شارەکەی بەو شێوەیە دیاری کردووە کە دەکەوێتە نێوان رووباری دیجلە و وەرزم[1] لە لای چیاکان.[2]

*هەشتایەمین.[3]

کۆنترین مەڵبەندی ئاوەدانی کوردییە، ئەستەخری بەو شێوەیە پێناسەی دەکات کە گوندێکە دەکەوێتە خوارەوەی چیای جودی، هەروەها دەڵێت ئەوانەی لەگەڵ نوح پێغەمبەر بوونە لە کەشتی رزگارکاردا، کە لەسەر چیای جودی لەنگەری گرتووە، هەشتا پیاو بوونە، ئەو گوندەیان چێ کردووە و کەسیان بەدوادا نەهاتووە[4].

لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە وەکو گوندێك نەماوەتەوە، بگرە گەشەی کردووە و بووەتە شار و مەقدەسی بەو شێوەیە باسی دەکات کە (شارێکە لەسەر رووبارێکی هەڵقوڵاودا کە لە ئەرمینیاوە دێت بەژێر جودیدا، هەروەها دەڵێت یەکەم گوندە لەدوای لافاوەکەوە نوح بنیاتی ناوە لەگەڵ ئەو هەشتا پیاوەی کە لە کەشتییەکەدا لەگەڵی بوونە و بۆ هەر پیاوێك خانوویەکی دروست کردووە.

ئەوەش یەکەم شار بووە لە جەزیرە دروستکراوە[5] لە دوای لافاوەکە بە پێی ئەو گێڕانەوەیە.

بەڵام یاقوت کە باسی شاری هەشتایەمین دەکات بەوەی کە (شارۆکەیەکە) لە لای چیای جودی، لە نێزیك جەزیرەی ئیبن عومەر، هەروەها ئاماژە بۆ هەشتا مرۆڤ دەکات کە لەسەر کەشتییەکەی نوح (د.خ) بوونە و دوای لە شوێنێك سەقامگیر بوونە خانوویان

---

١ - رزم: کەندێك بووە لە خاکی ئەرمینیا کە ئاوێکی زۆری پێدا رۆیشتووە و رژاوەتە نێو رووباری دیجلەوە لە لای گردی فاقانەوە. یاقوت، معجم البلدان، ج٤، المصادر نفسة، ل٤٠١.

٢ - احسن التقاسیم، ل١٢٥.

٣ - هەتا ئێستە ماوە و ژیان تێیدا بەردەوامە، ئێستە ئەوە گوندێکە سەر بە قەزای (شەرناخ) کاتێ عارەبێنراوە بۆتە (هشتیان) واتە (هەشتایەمین) بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: سلام حسن طه، جزیرة ابن عمر، رسالة ماجستیر غیر منشورة، کلیة الاداب (جامعة للاح الدین: ١٩٩٩) ل٣٢.

٤ - المسالك والممالك، ل٥٥. بڕوانة: ابن قتیبة، عیون الاخبار، ج١، ل٤١٤. بکة.

٥ -احسن التقاسیم، ل١٢٣-١٢٤.

بۆخۆیان دروست کردووە، دواتر هەموویان بەر بای نەخۆشییەك دەکەون، تەنیا نوح و کوڕەکەی نەبێت.[1]

لە لایەکی دیکەوە یاقوت بە شێوەیەك باسی دوو لەو زانا گەورانە دەکات کە ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ گوندی هەشتایەمین، ئەوانیش ئەبو قاسم عومەر کوڕی سابتی زەریری هەشتایەمینە کە چەندان پۆلێنی تایبەتی هەیە، کە زانیاری لەسەر دەستی زانای بەناوبانگ ئیبن جەننی وەرگرتووە کە لە ساڵی ٤٨٢ك مردووە، بەڵام دووەمیان ئەبو حەفس عومەر کوڕی خدری کوردی محەمەدی هەشتایەمینە، کە لە دیمەشق و لە میسر لەسەر دەستی چەند زانایەك و ناودارێك زانستی وەرگرتووە.[2]

*جەزیرەی ئیبن عومەر (جەزیرەی کوردان) (بۆتان):

عزەدین کوڕی شەداد لە یەعقوبییەوە ئەوەی گواستووەتەوە کە جەزیرەی کوردستان لە دووتۆی کۆر (ناوچە)ی دیاری ڕەبیعە بووە.[3] ئیبن شەداد گریمانی ئەوە دەکات کە ئەو جەزیرەیە پێدەچێت جەزیرەی ئیبن عومەر بێت و بەوە دەیناسێنێ، پێش ئەوەی حەسەنی کوڕی تەغلەبی پلانی ئەوە دابنێت ڕەچەڵەکی شارەکە بۆ ئەو دەگێڕێتەوە.[4] ئەوەش ئەو رایە جێگیرەیە کە ئەو شارە شارێکی کوردییە.

بەڵام ئەستەخری بەو شێوەیە باسی دەکات کە شارێکی بچووکە و دەکەوێتە هەردوو لای ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلەوە.[5] لە کاتێکدا ئیبن حوقەل زۆر تیشکی دەخاتە سەر و باسی دەکات، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە نێزیکەی سی فرسەخ (١٨٠کم) لە شاری مووسڵەوە دوورە، ئەوەش وادەکات بۆ ئەرمینیا و وڵاتی ڕۆم و ناوچەکانی میافارقین و ئەرزن بگەڕێتەوە.[6] هەروەها جەخت لەوە دەکاتەوە باشترین شتەکانی ئەو ناوچەیە

---

١ - معجم البلدان، ج٣، ل١٥.

٢ - االمصادر نفسة واللفحة.

٣ - ئەو زانیارییە لە پەڕتووکەکەی یەعقوبی نییە، ڕەنگە پەڕتووکێکی دیکە هەبووبێت بە ناوی (المسالك والممالك) بەڵام ون بووبێت.

٤ - الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام واجزيرة، حققه: يحيى عبارة، (دمشق: ١٩٧٨) ج٣، ق١، ل٢١٣.

٥ - المسالك والممالك، ل٥٣.

٦ - صورة الارض، ل٢٠٢.

ئاوەدانی و زۆرترین ئارامی و سەلامەتی تێدایە، لەبەر زۆری خەڵکەکەیی و بە پیتی ناوچەکەی، دواتر بەراوردێك لە نێوان ئەو و ناوچەکانی دیکە دەکات لە رووی ئاوەدانی و دەوڵەمەندییەوە وەکو دەڵێت: (ئەوە ئەرزن و میافارقین نییە، کە خانووی تێدا نەبێت، یان خێزان و هاوولاتی تێدا نەبێت و مەڕو مالات و مانگای نەبێت).([1])

هەروەها مەقدەسی بەو شێوەیە باسی جەزیرەی ئیبن عومەر دەکات بەوەی کە (شارێکی گەورەیە) شارێکی خۆش و پاکە.([2]) هەروەها دەڵێت ناحیەی دیاری رەبیعە بووە.

بەڵام یاقوت وەکو باسی دەکات و دەڵێت: بریتییە لە شارۆکەیەك کە دەکەوێتە باکووری شاری مووسڵ، خاوەن چەندین ناوچەی گرینگ و فرەوان و بەپیتە و، رووباری دیجلەی بەتەنیشتدا دەڕوات و، وای کردووە لە لایەکەوە شێوەی مانگی هیلال بدات، دواتر لە لای زەمینیشیەوە چاڵێك هەڵکەندراوە بۆ ئەوەی ئاوی پێدا بڕوات و لەسەر ئەو ئاوە ئاشییان دامەزراندووە و لە هەموو لایەکەوە بە ئاو دەورە دراوە.([3]) بۆ ئەوەی ببێتە دوورگەیەك، هەروەها یاقوت ناوی زۆرێك لە زاناکان دەهێنێت ئەوانەی سەر بە جەزیرەی ئیبن عومەر بوونە.([4])

لەو شارانەی سەر بە جەزیرەی ئیبن عومەر بووە هەردوو ناوچەی بازیدی و باقردی بەرامبەر یەك بووە کە لەسەر هەردوو لای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای رووباری دیجلە بووە،([5]) لەبەر جوانی سروشتەکەی شانسی ئەوەی بووە خەلیفەی عەباسییەکان هارون رەشید (١٧٠-١٩٤ك/٧٨٦-٨٠٩ز) گرینگییەکی زۆری پێبدات و لە باقردی کۆشکێك بۆخۆی بینا بکات.([6])

هەروەها یاقوت باسی ناوی ناحیەیەك دەکات بەناوی دەیبور بەوەی کە ئەوە یەکێکە لە شارەکانی جەزیرەی ئیبن عومەر.([7])

---

١ - االمصادر نفستن ل٢٠٣.

٢ - احسن التقاسيم، ل١٢٤.

٣ - معجم البلدان، ج٣، ل٥٧.

٤ - االمصادر نفسة، بۆ زیاتر ئاشنابوون لەبارەی ئەو شارەوە بڕوانە: سلام حسن طه، المصادر نفسة، بكة.

٥ - ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل٢٥٦.

٦ - الطبري، تاريخ الامم والملوك، تحقيق: محمد ابو الفضل ابراهيم، (بيروت:١٩٦٦) ج٨، ل٢٣٩.

٧ - معجم البلدان، ج٤، ل٣٣١.

*بەرزمەهران:

بەتەنیا یاقوت باسی ئەو شارە دەکات و دەڵێت: لە نێزیك جەزیرەی ئیبن عومەر بووە و دێری ئابونی لێبووە.([1])

*سەفان:

تەنیا یاقوت ئاماژە بۆ ئەو شارە دەکات و پێناسەیەکی سادەی دەکات بەوەی کە ناحیەیەکە دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری نەسیبین و جەزیرەی ئیبن عومەر لە دووتۆی دیار رەبیعە.([2])

*زۆزان([3])

مەقدەسی دەڵێ یەکێکە لە شارەکانی دیاری رەبیعە،([4]) بەڵام یاقوت بەو شێوەیە باسی دەکات و دەڵێت: (کۆرێکی (ناوچەیەکی) باشە دەکەوێتە نێوان ئەرمینیا و ئەخلاتی ئازەربایجان و دیاربەکر و مووسڵ، سەرەڕای نیشتەجێ بوونی ئەرمەنەکان هەندێ بنەماڵەی کوردیشی تێدا دەژێت.([5]) دواتر یاقوت لە ئیبن ئەسیر([6]) دەگوازێتەوە و لەبارەی دیاری کردن و پێگە و سنووری زۆزان دەڵێت: (ناوچەیەکی فرەوان لە رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە لە جەزیرەی ئیبن عومەر و یەکەم سنووری بە دوو رۆژ لە شاری مووسڵەوە دەست پێ دەکات و هەتا سنووری ئەخەڵات و بە سنووری ئازەربایجان و یەکەم شاری سەلماس کۆتایی دێت، کە چەندان قەڵا و شوورەی قایمی تێدایە کە سەرجەمیان هی کوردستانە.([7])

وەکو دەردەکەوێت ئەوەی ئیبن ئەسیر بۆی چووە راستتر و وردترە لە ناونانی زۆزان بە (ناوچەیەکی فرەوان، لەبەر ئەو دەستەواژەیە، کە واتاکەی فرەوانترە لە بێژەی شار، کە

---

١ - االمصادر نفسة، ج٢، ل٣٠٢.

٢ - یاقوت، معجم البلدان، ج٥، ل٤٩.

٣ - ئەوە (زەوزن) نییە، کە ناوچەیەکی بەرفرەوان بووە لە نێوان نیسابوور و هەرات. یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٤٨٨. زۆزان: وشەیەکی کوردییە بە واتای ناوچەیەك سارد واتە کوێستان.

٤ - احسن التقاسیم، ل١٢٢.

٥ - معجم البلدان، ج٤، ل٤٨٨.

٦ - الكامل في التاريخ.

٧ - معجم البلدان، ج٤، ل٤٨٨.

ناوچەیەکی بەرفرەوانتر لەخۆ دەگرێت و کۆگیرترە بە شێوەیەکی ڕێژەیی وەکو لە دیاری کردنی سنوورەکەیدا دەبینین کە ئیبن ئەسیر کێشاویەتی بۆ زۆزان، کە زەوییەکی زۆر دەگرێتەوە هەر لە جەزیرە و ئەرمینیا و ئازەربایجان و، هەروەها کوردیش بە ڕێژەی جۆراوجۆر تێیدا نیشتەجێ بوونە.

*نەسیبین[1]

ولاتناسە موسڵمانەکان بە گرینگییەوە ئاماژە بۆ ئەو شارە دەکەن لە رووی قەدەری گەورەیی و ئاوەدانیەکەیەوە[2] لە شاری دیاری رەبیعە،[3] کە مەڵبەندەکەی و دەوروبەرەکەی لەسەر دەمی رۆمەکان بنیاتنراوە.[4] ئەستەخریش بەو شێوەیە باسی دەکات: (جوانترین شارە لە جەزیرە و زۆر بەخێر و بیرە).[5] هەروەها هەر یەك لە هەمەدانی و ئیبن جەبیر ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە کورد لەو ناوچانە و دەوروبەری نیشتەجێ بوونە.[6]

ئەوەی شایەنی ئاماژە بۆ کردنە زۆرجار ولاتناسەکان[7] لە دووتۆی باسکردنی شاری نەسیبین ئاماژە بە دووپشکە بەناوبانگەکانی ئەو ناوچەیە دەکەن کە خەڵکەکەی بەدەستییەوە نالاندویانە، بۆیە یاقوت لەسەرخەسی دەگوازێتەوە و دەڵێ: بنچینەی ئەو دووپشکانە دەگەڕێتەوە بۆ ناکۆکی و ململانێی فارسەکان و رۆمانییەکان لە پێش ئیسلامدا، کاتێ پاشای ساسانییەکان ئەنو شیروانیان دەست بەسەر کردووە لە کاتی ئازادکردنی شاری نەسیبیندا بڕیاری داوە کە دووپشکی بۆ کۆبکەنەوە لە گوندی

---

١ - لێرەدا شارێکی دیکە هەبووە ناسراوە بە نەسیبینی رۆم لەسەر لێواری رووباری فورات، کە لە نێوان ئەو و شاری ئامەد نێزیکەی سێ رۆژ بووە. یاقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٣٩١.

٢ - اليعقوبي، المصادر نفسة، ل١١٨. الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٢، ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩٣-١٩٤. مؤلف مجهول، المصادر نفسة، ل١١٨.

٣ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٨٦.

٤ - ياقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٣٩٠.

٥ - الاقاليم، ل٤٠.

٦ - معجم البلدان، ج٨، ل٣٩٠.

٧ - سەیری ئەو سەرچاوانە بکە کە باسیان کردووە.

تیرانشا.([1]) كه سەر بە ناوچەی شارەزوورە، گۆزەكانیان پڕ كردووە لە دووپشك و هەڵیانگرتووە و بەسەر ئەو ناوچانەدا بڵاویان كردووەتەوە، كە بە شێوەی مەنجەنیق بووە بۆ رۆمەكان، كاتێ ئەو گۆزانە بە زەوی كەوتوونە شكاون و ئەو دووپشكانە لەو گۆزانەدا هاتوونەتە دەرەوە، پرۆسەكە بەو شێوەیە بەردەوام بووە و هەتا خەڵكەكەی بێزاربوونە و شارەكەیان تەسلیم كردووە،([2]) ئەو چیرۆكە رەنگە رای جیاوازی لەسەر بێت و زیادەڕۆیی تێدا كرابێت.

هەروەها یاقوت باسی دەكات كە لە گرینگترین شارەكانی نەسیبین شارۆكەیەكە ناسراوە بە (تور([3]) عەبدین) كە دەكەوێتە ناو ئەو چیایەی بەسەریدا دەڕوانێت و بە چیای جودی دەیبەستێتەوە.([4]) هەروەها كورەیەك لە نێوان دوو رووباردا كە ئەویش یەكێك بووە لە شارەكانی نەسیبین و هەندێ جاریش شارێك بووە سەر بە مووسڵ.([5])

*دارا:

شارێكە دەكەوێتە سەر چیا([6]) لە نێوان نەسیبین و ماردین.([7]) مەقەدەسی بەو شێوەیە باسی دەكات و دەڵێ: شارێكی بچووك و خۆشە،([8]) ئیبن حوقەلیش دەڵێت (شارێكی ئەزەلی رۆمەكانە، واتە شارێكی دێرینە. یاقوتیش دەڵێ پاشای فارسی بەناوی دارای كوڕی ئەو شارەی بنیاتناوە.([9]) ئیبن جەبیریش دەڵێ سپیەتێكی گەورە بووە.([10])

*ماردین:

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٣٩٠.

٢ - یاقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٣٩٠.

٣ - تور: واتە چیا.

٤ - معجم البلدان، ج٦، ل٣٧١.

٥ - االمصادر نفسة، ج٢، ل٤٢٠.

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٣. مؤلف مجهول، المصادر نفسة، ل١١٨.

٧ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٢٧٣.

٨ - احسن التقاسیم، ل١٢٤.

٩ - یاقوت، المشترك وضعا والمفترق لقعا، ل١١٦.

١٠ - رحلة ابن جبیر، ل٢١٥.

سەرچاوە ولاتناسییەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی ئاماژە بەو شارە ناکەن، چونکە هەردەم پەنجەنومایان بۆ رێگە و شانشینە دەرەکییەکان بووە، بەلام کە ولاتناسەکان باسی ئەو شارەیان کردووە گوتیانە دەکەوێتە سەر چیای جەزیرەوە، ئەو چیایەی دەڕوانێتە سەر شاری دارا و نەسیبین و دنەیسەر.([1]) هەروەها خەلکەکەی لە توانایدا هەبووە شارەکانی رەئس ئەلعەین و خابوور و شەنگالێ ببینێ.([2]) هەروەها ئیبن جەبیریش بە ناوچەیەکی ئاوەدان ناوی بردووە.([3])

لە لایەکی دیکەوە ئیبن ئەسیرو ئیبن شەداد ئاماژە بە دانیشتووانی ناوچەی ماردین دەکەن کە کورد بوونە.([4])

*دنەیسەر([5])

لە سەرچاوە ولاتناسییەکاندا لە سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی باسی نەکراوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەرکەوتنی وەکو شارێکی گرینگ لەسەردەمی دەولەتی مەروانی کوردییەوە بووە، کە لە ماردین نێزیکەی چوار فرسەخ (٢٤کم) دوورە و یەکێکە لە شارەکانی ئەو،([6])لە نیوەی دووەمی سەدەی شەشەمی کۆچی نێزیکترین شار بووە لە بادیە وەکو ئیبن جەبیر باسی دەکات.([7])لە سەدەی حەوتەمی کۆچی وەکو شارێکی گەورە و بەناوبانگ باسی کراوە و، لە ماردین نێزیکەی دوو فرسەخ (١٢کم) دوورە،([8]) وەکو دیارە ئەو جیاوازییە لە دیاری کردنی ماوەی نێوان ئەو شارە و ماردین

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل١٩٤. دنەیسەر وشەیەکی کوردییەو لێکدراوە، بە واتای سەری دنیا دێت.

٢ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٢٠.

٣ - رحلة ابن جبيرن ل٢١٥.

٤ - الكامل في التاريخ، ج٨، ل٢٢٧. الاعلاق الخطيرة، ج٣، ق١، ل١٤٧.

٥ - ئێستە پێی دەلێن قزەل تەپە.

٦ - ابن حوقل، المصادر نفستن ل٢٠٢.

٧ - رحلة ابن جبير، ل٢١٦.

٨ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣١٨.

لە هەردوو سەدەی شەشەم و حەوتەمی کۆچی دەگەڕێتەوە بۆ فرەوان بوونی دەنەیسەر لەم ماوەیەدا لە رووی ئاوەدانی و ئەمەش بۆتە هۆی کەمبوونەوەی ماوەی نێوانیان.([1])

*رەها (ئەلرەها) (ئورفە)

یەکێکە لە دێرینترین و گرینگترین شارەکانی جەزیرە، وەکو باسی دەکەن شارێکی مامناوەند و شوێنەواری دەگمەنی خاچپەرستەکانی تێدایە و([2]) دەکەوێتە نێوان مووسڵ و شامەوە، لە نێوانیاندا ماوەی شەش فرسەخ (٣٦کم) لەیەکترییەوە دوورن،([3]) یاقوت دەڵێت: ناوی شارەکە بە رۆمی (ئەزاسا)یە و پاشای رۆمەکان سلقۆش لەدوای مردنی ئەسکەندەر بە شەش ساڵ بنیاتی ناوە.([4])

*حەرزم:

یاقوت باسی دەکات کە شارۆکەیەکە دەکەوێتە نێو دۆڵی رووباری جار و دارستان و نێوان هەردوو شاری ماردین و دەنیەسەر و یەکێکە لە شارۆکەکانی جەزیرە.([5])

*مووسڵ ([6])

مووسڵ شانسی ئەوەی هەبووە گرینگییەکی زۆری پێ بدرێت لە لایەن وڵاتناسەکانەوە، لەبەرئەوەی گرینگترین شاری جەزیرە و ناوچەکە بووە، مەقدەسی باسی دەکات و دەڵێت: شارێکی گەورە و بیناکانی باش و ئاووهەواکەی خۆش و ئاوی سازگارە، ناوەکەی گەورە و شێوەکەی دێرینە.([7]) هەروەها دەڵێن مووسڵ پێش

---

١ - بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: هۆکارە سەرەکییەکانی سەرهەڵدانی شار لە وڵاتی کوردستان لەو بەشەدا بکە.

٢ - صورة الارض، ل٢٠٤.

٣ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤ن ل٤٥٠.

٤ - johan maconald kinneirm geographical mimoir of the perian empire.(london:1813) p33.

٥ - معجم البلدان، ج٣، ل١٣٤.

٦ - لەبارەی ئەوە بڕوانە: سليمان اللائغن تاريخ المولل، (ملر:١٩٢٣). عبد الماجود احمد السلمان، المولل في العهدين الراشدي والاموي، (المولل:١٩٨٥).

٧ - احسن التقاسيم، ل١٢٣.

ئازادکردنی ئیسلامی ناسراوە بە (خۆلان)([1]) وەکو دیارە ناو و ناسناوی دیکەی هەبووە لەسەردەمە دێرینەکان و سەردەمەکانی پێش ئیسلام.([2])

وەکو دەزانین مووسڵ لە دەرەوەی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەیە و نامانەوێ شتێك بڵێین تەنیا ئەوە نەبێت کە ئاماژە بە بابەتی کوردەکانی دانیشتووی شارەکە و دەوروبەریی بکەین، کە یەکێك بووە لە ناوچەکان کە کورد لەسەردەمە دێرینەکانەوە تێیدا نیشتەجێ بووە،([3]) ئەو راستییەش لە لایەن ژمارەیەك لە وڵاتناسەکانەوە جەختی لێکراوەتەوە و پێگە و شوێنی نیشتەجێ بوونی کورد و دەستەکانی لە مووسڵ و شارەکانی دەوروبەرییەوە دەستنیشان کراوە.([4])

ئیبن حوقەل جەخت لە زۆری شارۆکەکان و زۆری هاتوچۆ و گەوەریی شوێنەکانی فرۆشی و بازاڕی گەرم بووە.([5])

هەروەها ئیبن خوردازەبە ئاماژە بە نێزیکەی بیست ناحیەی مووسڵ دەکات کە ئەوانیش تکریت و تەیرەهان و ئەلسن و حەدیسە و مەرج جوهەینە و نەینەوا و باجلی و([6]) باحەدرێ([7]) و باعەزری و حەیتون و بانقلی و حەزە و بابگاش و ئەرمین و حەنایە و باجرمی و بەها حەیناسابور و دقوقا و خانیجارە.([8])

---

١ - هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

٢ - بۆ زیاتر بڕوانە: ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٣٠. يوسف حبي، المولل في الملارد السريانية القديمة، مستا من مجلة سومر، مج٣.ج١. ١٩٧٨، ل١٤٠. طه باقر وفؤاد سفر، المرشد الى مواطن الاثار والحضارة، (الرحلة الثالثة) (بغداد:١٩٦٦) ل١٧.

٣ - بڕوانە: الازدي، تاريخ المولل، تحقيق: علي حبيبتن (القاهرة:١٩٦٧) ج٢، ل٢٠٨.

٤ - بڕوانە: المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ل٢٥١. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩٥-١٩٦. هەروەها بڕوانە: استرنج، نرجع سابق، ل١١٥-١١٦. بكة.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩٤.

٦- بڕوانە: الكامل في التاريخ، ج٩، ل٣٥-٧٠.

٧ - لە لای قودامە یاهەدرایە، لەلای ئیبن فەقێ، بانهەدرایە، بڕوانە: الخراج، ل٢٤٥.ومختلر كتاب البلدان، ل١٣.دەردەکەوێت ئەمە لە لای لەبەرگرەوە راستکراوەتەوە.

٨ - المسالك والممالك، ل٨٥.

ئەوەی جێگەی تێبینییە نێزیکەی نیوەی ئەو کۆرانە (شارۆکانە) کۆری کوردی بوونە.

بەڵام ئیبن رستە کە هاوسەردەمی ئیبن خوردازەبە بووە هیچ ئاماژەیەك بەو کۆرانە ناکات تەنیا نۆیان نەبێت، ئەوانیش کۆری مووسڵ و تکریت و تەهەیران و ئەلسن و حەدیسە و مەروج و سیسجار و باجلی و باجرمییە.([1])

ئەوەی جێگەی تێبینییە دووان لەوانە ئیبن خوردازەبە ئاماژەی بۆ نەکردوون ئەوانیش مەرج و سیسجارە، ئەوەی وای کردووە ئیبن خوردازبە بە شێوەیەکی ورد و دیاری کراو دەستنشانی کۆر و دەڤەرەیلی بکات بوونی ئەو کارە کارگێڕییە بووە، کە ئیبن خوردازەبە وەکو خاوەن نامەبەری کاری کردووە.

بەڵام وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی بە شێوەیەکی وردتر و بە دوور ودرێژی باسییان لەو شارۆکانە کردووە، کە سەر بە مووسڵ بووە، وەکو ئیبن حوقەل باسی دەکات کە ئەو شارە لە ساڵی (٣٥٨ك/٩٦٨ز) یازدە ناوچە سەر بەو شارە بووە کە برێتی بووە لە چەندان رستاق و شارۆکە و ناحییە، بارودۆخە ئابووریی و خێروبێرەکەی فرەوان بووە، کە نێزیکەی دە ناوچەی کوردی بووە ئەوانیش: رستاقی مەرج (میرگ) و شاری بازاڕی یەك شەمە و زەوی حورە و رستاق و شاری کەفر عەزی کە شەهاریجە کوردەکانی تێدا نیشتەجێ بووە، هەروەها رستاقەکانی قەردی و بایەزیدی و رستاقی باهدرا و رستاقی خابوور و کارە فرەوانەکانی کە دراوسێی رستاقی شەنگاڵ و ناوچەکانی چیا و رستاقی مەلاسیا و فیشخابوور بووە.([2])

جەختکردنەوەی ئیبن حوقەل لەوە، بۆتە سەرچاوەیەکی متمانەپێکراو لەبارەی ئەو بابەتە بەهۆی بوونی هەردوو رەگەزی هاوسەردەمی و دیدەنییەکەی لەو زانیارییانەی خستوویەتیە روو، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە کورد پێکهێنەری زۆربەی دانیشتووانی شاری مووسڵ و شارەکانی دیکەی بوونە، لێرەوە دڵنیابوونی لسترنگ هاتووە کە خەڵکی شاری مووسڵ لە سەدەی چوارەمی کۆچی برێتی بووە لە کورد.([3])

---

١ - الاعلاق النفيسة، ل١٠٣.

٢ - صورة الارض، ل١٩٦.هةروةها برِوانة: الادريسي، المصادر نفسة، ل٢٣٠.

٣ - بلدان الاخلافة الشرقية، ل١١٦.

به روانین بۆ زۆری شارەکان کە سەر بە مووسڵ بووە و سنوورەکەی گەیشتووەتە ئازەربایجان.([1])

زیاتریش لەوە کۆر و شارەکان لە عێراق و وڵاتی چیا سەر بەو شارە بوونە لە هەندێ سەردەمدا.([2]) ئێمەش بۆیە هەر بەوەندە کۆتاییمان پێ هێنا کە کوردی تێدا دەژێت.

*مەرج (مەرجی مووسڵ)

بەڵازری لە دووتۆی پەڕتووکی (معاقل الاكراد) کە لە ساڵی (٢٠ك/٦٤٠ز) لە سەدەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب باسی ئەو شارە دەکات،([3]) هەروەها ئیبن حوقەلیش باسی دەکات کە برێتی بووە لە چەند رستاقێك کە گوند و دێهاتی زۆری هەبووە،([4]) یاقوتیش باسی دەکات کە برێتی بووە لە شوێنێك لە نێوان چیاکان و لە زەوییەکی نزمدا بووە بە شێوەی گەوەڕێك کە لەوەڕگا و گوندی تێدا بووە، ویلایەتێکی خۆش و فرەوان بووە و لەسەر چیاکانی قەڵا هەبووە.([5])

*سوق ئەلئەحەد:

لە دووتۆی رستاقەکانی مەرج بووە، کە بازرگانە کوردەکان و کەسانی دیکە لەسەردەمی جیاجیادا بۆی هاتوون، شارێك بووە زۆر جێگە و شوێنی هەبووە، بەپیت بووە و لەپاڵ چیایەك بووە لەسەر رووبارێکی نێزیك لەو، ئاوەکەی رژاوەتە زێیەکی گەورەوە.([6])

*حەزە:

ئیبن حوقەل باسی دەکات کە هەرێمێك، نێوان ئەم و شاری مەرج و رووباری زێی گەورەی لەیەکتر جیاکردووەتەوە.([7]) یاقوتیش بەوە دەیناسێنێ کە شارۆکەیەك بووە لە

---

١ - الازدي، المصادر نفسة، ج٢، ل٣٣.

٢ - شيخ ربوة الانلاري، نخبة الدهر في عجائب البر والبحر، اعادت طبعه بالاوفسيت مكتبة المثنى ببغداد عن طبعه (لايزك: ١٩٢٢) ل١٩٠.

٣ - فتوح البلدان، ل٣٢١.

٤ - صورة الارض، ل١٩٦.

٥ - معجم البلدان، ج٨، ل٢٤٤.

٦ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩٦.

٧ - االمصادر نفسة واللفحة.

نیزیك ئەربل لە زەوییەکانی مووسڵ، هەروەها شارۆکەی ناوچەی ئەربل بووە وەکو یاقوت باسی دەکات.(١)

*کفر عەزی

لە سەدەی چوارەمی کۆچی بەو شێوەیە باسی دەکەن کە شارێك بووە بەناوی (قصدە) واتە خەڵکی مەبەستیان بووە لەبەرئەوەی شارێکی پڕ خێر و بێری فرەوان بووە و بازاڕەکانی هەرزان بووە و گوندیشی زۆر لەسەر بووە، کورد لەو شارەدا نیشتەجێ بوونە لە ناوچەکانیدا، لە کاتێکدا لەنێو خودی شارەکانیدا کەسانی شەهاریجەی خاچهەڵگر نیشتەجێ بوونە.(٢) یاقوت لە سەدەی حەوتەمی کۆچی دەیناسێنێ بەوەی کە گوندێك بووە لە گوندەکانی شاری ئەربل، کە کەوتۆتە نێوان ئەربل و زێی بچووك و، قەزاکانی ئەربل سەر بەو بوونە.(٣)

*باعەزری و باهەدەر

بەلازری لە دووتۆی قسە و باسەکانیدا لەبارەی رزگارکردنی جەزیرە و مووسڵ کە شوێنگەی کوردستان بوونە دەڵێت: لە ساڵی ( ٢٠ك/٦٤٠ز)(٤) رزگارکرا، هەروەها ئیبن حوقەلیش ئاماژە بۆ گوندی باهەدرا دەکات کە گوندێکی گەورە و داهاتیشی زۆر بووە.(٥)

*ئەلعەقر (عەقرەی حەمیدیە)

یەکەمین کەسانێك لە وڵاتناسەکان کە باسیان کردبێت یاقوت بووە و دەڵێ: یەکێك بووە لە شارەکانی مووسڵ، دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ئەو شارەوە، کوردی حەمیدی تێیدا نیشتەجێ بوونە، زۆرێك لە کەسانی خاوەن زانستی لێ پەروەردە بووە، لەوانەش یاقوت باسی کەسێك دەکات کە هاوڕێی خۆی بووە و، کەسێکی ئەنسکلۆپیدی بووە و ناوی

---

١ - معجم البلدان، ج٣ن ل١٤٦.

٢ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩٦. بەلازری باس دەکات ئەو خەڵکانی شەهارجە کورد بوونە، بڕوانە: تاريخ المولل، ل١٦٣. بكة.

٣ - هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

٤ - فتوح البلدان، ل٣٢١. هةروةها: ابن خرداذبة، المصادر نفسةن ل٨٥.

٥ - صورة الارض، ل١٩٦.

شەهاب محەمەد کوڕی فەزلۆن کوڕی ئەبی بەکری کوڕی حوسێن کوڕی محەمەدی عەدەوی ئەلعەقری بووە و، کەسێکی نەحوی و فەقهی و قسەزانێکی دانا بووە، قسەو باسی ئەدەبی لە کەسانێکی خاوەن زانست وەرگرتووە.([1])

*ئەلعەمادیە (ئامێدی)([2])

ئەوەش یەکێك بووە لە شارەکانی مووسڵ، کە دەکەوێتە باکووری ئەو شارەوە. یاقوت باسی دەکات کە ئەتابەك عماد زەنکی کوڕی سەنقەر لە ساڵی (٥٣٧ك/١١٤٢ز) بنیاتی ناوە و، هەر بەناوی خۆیشی ناوی ناوە،([3]) پێش ئەوەش قەڵایەکی قایمی کوردستان بووە و لەبەر گەورەیی رووبەڕووی وێران بوون بۆتەوە و دەڵێن ئاشی ئاو بووە.([4])

*ئەلحەسەنییە:

ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ناوی حەسەن کوڕی عومەر([5]) کە یاقوت باسی دەکات و دەکەوێتە نێوان مووسڵ و جەزیرەی ئیبن عومەر، کە لە یەکەمیاندا بەلای ڕۆژهەڵاتییەوە نێزیکەی دوور رۆژ دوورە([6]) یەکێك لە وڵاتناسەکانی سەدەی هەشتەمی کۆچی باسی دەکات، کە رووبارەکەی ناونراوە (خابوور) کە خاوەن دەروازەیەکی سامناك

---

١ - یاقوت معجم البلدان، ج٦، ل٣٣٨.

٢ - مێژووی ئەو شارە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش ئیسلام، چونکە ئەوەی یاقوت باسی دەکات زۆر ورد و دیار نییە، چونکە ئاماژەکان لە سەرچاوە ئاشوورییەکان بە ناوی (امات) هاتووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەندێ شوێنەواری کۆنی لێیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش ئیسلام. طه ابقر، المرشد الی مواطن الاثار، الرحلة الثالثة، (بغداد:١٩٦٥-١٩٦٦ز) ل٥٤.

٣ - هەمان سەرچاوە، ج٦، ل٣٤٨.

٤ - اشبا: بێژەیەکی کوردییە و کورتکراوەی وشەی (ئاشی ئاوە) بەڵام سەرچاوەکانی عەباسی ئەوە بەدوور دەزانن، چونکە ئەوە دوو شوێنی لە یەکدیی جیاوازن، بە بەڵگەی ئەوەی شوێنەواری قەڵای ئاشی ئاوێ، هەتا ئێستە ماوەتەوە، کە دەکەوێتە نێزیك شارۆچکەی سەرسەنگی ئێستە، بڕوانە: امارة بهدینان العباسية، (الموصل:١٩٦٩) ل١٢. بكة.

٥ - پێشتر ماژەمان بۆ کردووە.

٦ - یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١٥٠. المشترك وضعا، ل١٥٠.

بووە لە رووی بنیاتنانەوە.([1]) هەر ئەوەش بەسەر شاری زاخۆدا جێبەجێ دەبێت، بۆیە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شاری زاخۆی ئێستە ئەوە شاری حەسەنییە بێت کەباسی دەکەن، ئەمە سەرەڕای ئەوەی هەندێ کەس ئەوە رەتدەکەنەوە.([2])

*باجورمی (باجرمەق)([3])

لە یەکەم سەرچاوەی ولاتناسیدا هاتووە کە ئیبن خوردازەبە لە دووتۆی کۆری مووسڵ باسی دەکات و ئاماژە بۆ سێ شاری دیکە دەکات کە سەر بە ناوچەی باجورمی بوونە، ئەوانیش خونیاسابوور و دقوقا و خانیجارن.([4])

هەروەها لە دووتۆی پرۆسەکانی رزگارکاریدا دیسانەوە باسی کراوە، کە سەرکردەی رزگارکار عوتبەی کوڕی فەرقەدی سەلمی لە دوای تکریت رووی تێکردووە، لە کۆرەی باجورمی سارەوە بەرە و شارەزوور چووە.([5])

بەڵام یاقوت هەر بەوەندە وازدەهێنێت و دەڵێت باجرمەق کۆرەیەك بووە لە نێزیك دقوقا([6]) هەروەها بەکری ورد نەبووە لە دیاری کردنی سنوور و پێگەی باجورمی کاتێ ئاماژەی بۆ دەکات و دەڵێت: (ناوچەیەکە لە پێش نەسیبین)،([7]) هیچ شتێکی دیکە لەو بارەیەوە ناڵێت، ئەوەی شایەنی ئاماژ بۆ کردنە ولاتناسەکان زۆر بە کەمی باسی شارەکانی ناوچەی باجورمیان کردووە، تەنیا ئەوانە نەبێت کە ئاماژەیان بۆ کردووە، رەنگە ئەوەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە لەنێو رووداوە سیاسی و سەقامگیرییەکانی ناوچەکەدا دیار نەبووە، یان رۆڵی نەبووە.

---

١ - ابن ربوة الانلاري، نخبة الدهر في عجائب البر والبحر، المصادر نفسة ، ل١٩٠.

٢ - لسترنج، المصادر نفسة، ل١٢٢-١٢٣.

٣ - بە سەرجەم ناوچەی کەرکوکی ئێستەیان گوتووە (کورە باجورمی) بۆ زیاتر بڕوانە: قادر محەمەد ئەشکەنەیی. ناوچەی کەرکووك لە سەردەمی عەباسییەکاندا، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە (٢٠) هەولێر: ٢٠٠١) ل١٠١-١١٢.

٤ - المسالك والممالك، ل٨٥.

٥ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٣٢٤. قدامة، المصادر نفسة، ل١٨٢.

٦ - معجم البلدان، ج٢، ل٢٥١.

٧ - معجم ماستعجم، ج١، ل٢٢٠.

*خانیجار (توزخورماتو)

بەوە باسی کراوە کە (شارۆکەیەکە) لە نێوان هەردوو شاری بەغدا و ئەربل، لە نێزیك شاری دقوقا.[1]

*داقوق (داقوقا)[2]

شارێکە دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری ئەربل و بەغدا، ئەو شارە (ناسراوە و ناوی لە هەواڵ و باسە رزگارکردنەکاندا هاتووە) هەر وەکو یاقوت باسی دەکات، کە ئەو شوێنە بۆتە جێگەی نیشتنەوەی خەواریجەکان و شوێنی حەوانەوەی ئەوان، خەڵکێکی زۆری لێ کوژراوە، یاقوت باسی چەند دیرە شیعری شاعیرێکی هێناوەتەوە کە بۆ ئەو شارەی هۆنیوەتەوە، کە لەو شیعرەدا بێژەی ئەو شارەی بە دوو شێوە هێناوە (داقوقا)و(دقوقا):

شباب اطاعوا الله حتى احتهم — وكاهم شار يخاف ويطمع

فلما تبووا من داقوقا بمنزل — لمعياد اخوان تداعوا فاجمعوا

دعوا خصمهم بالمحكمات وبينوا — ضلالتهم والله ذو العرش يسمع

بنفسي قيلى في دقوقا غودرت — وقد قطعت منها رؤوس واذرع

لتبك نساء المسلمين عليهم — وفي دون مالاقين ميكى ومجزع[3]

*سنجار (شەنگاڵ):

لە پەڕتووکی وڵاتناسانی سەدەی سێیەمی کۆچی ناوی هاتووە، وەکو ئەوەی یەکێك بێت لە ناوچەکانی دیاری رەبیعە، وەکو شارێکی بەناوبانگیش ناوی هاتووە.[4] دەکەوێتە بناری چیای سنجار،[5] لە نێوان هەردوو شاری مووسڵ و نەسیبین، هەر یەك

---

١ - االمصادر نفستن ج٣، ل٢١١.

٢ - سەبارەت بە باسی تەواوی ئەو شارە سەیری: محمد جميل بندى الروزبيانى، مدن كوردييه قديمه، (السليمانيه: ١٩٩٩) ل١-١٥.

٣ - ياقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٠٣-٣٠٤.

٤ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٨٦، ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٢٦.

٥ - ياقوت، معجم البلدان، ج٥، ل٧٨. القزويني، اثار البلاد، ل٣٩٣.

لەو شارانە نێزیکەی سێ رۆژ لێی دوورە، واتە نێزیکەی (١٠٨کم)([١]) هەروەها لە شاری تەلەعفەر پێنج فەرسەخ دوورە (٣٠کم).([٢])

هەروەها ناوی شارەکە لە دووتۆی پرۆسەکانی دەستبەسەرداگرتنی ئیسلامیدا هاتووە.([٣]) کە ئەو شارە کوردی تێدا نیشتەجێ بووە، یەکێك لە گەڕیدەکان بە شکۆمەندی و ئازایەتی باسیان دەکات.([٤]) ئەمە سەرەڕای ئەوەی دوای ئازادکردنی ئەو شارە لە ساڵی ١٦ك/٦٣٧ز) ژمارەیەك عارەب هاتوونەتە ناوچەکە و تێیدا نیشتەجێ بوونە.([٥])

ئەربل:

وڵاتناسانی سەدەی سێیەمی کۆچی باسیی ئەو شارەیان نەکردووە تەنیا ئیبن خوردازەبە نەبێت کە ناوچەی (دل ئیرانشەهر) دابەش دەکاتە سەر دوازدە ناوچە لەوانە ناوچەی ئوستانی شاز فەیرۆز کە پێنج ناوچەی لەخۆ گرتووە، یەکێك لەوانە ناوچەی ئەربلە.([٦]) هەروەها هیچ یەکێك لە وڵاتناسەکانی دیکەی سەدەی چوارەمی کۆچی باسی ئەو شارەیان نەکردووە، تەنیا قودامەی کوڕی جەعفەر نەبێت کە ئەویش تەنیا قسەکانی ئیبن خوردازەبەی دووبارە کردووتەوە وەکو خۆی.([٧])

بێگومان پشتگوێ خستنی پرسی شاری ئەربل بە درێژایی شەش سەدەی یەکەمی مێژووی ئیسلامی لە لایەن مێژوونووس و وڵاتناسەکانەوە، دەگەڕێتەوە بۆ بێ توانایی و بێ هێزی کاروباری شارەکە بە درێژایی ئەو ماوەیە. ئەمە سەرەڕای بوونی هەندێ چیرۆکی مێژوویی لەبارەی بوونی رۆڵی سیاسییانەی شارەکە لە نیوەی یەکەمی سەدەی پێنجەمی کۆچی، کاتێ هەزەبانییەکان ویستوویانە ئەو شارە بکەنە مەڵبەندی میرنشینەکەیان هەتا دەیەی سێیەمی سەدەی شەشەمی کۆچی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو

---

١ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٣. ياقوت، معجم البلدان، ج٥، ل٧٨.

٢ - ياقوت، معجم البلدان، ج٥، ل٧٨.

٣ - قدامة، المصادر نفسة، ل١١٤.

٤ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٧٨.

٥ - رحلة ابن بطوطة، المساة (تحفة النظائر في غرائب الاملار وعجائب الاسفار) (بيروت: ١٩٦٤) ل٢٣٧.

٦ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٧٨.

٧ - المسالك والممالك، ل١٨.

شاره رۆڵی بەدیار نەکەوتووە بە شێوەیەکی بەرچاو، هەتا سەردەمی ئەتابەکی (٥٢٢-٦٣٠ك/١١٢٨-١٢٣٣ز) کاتێ گەیشتووەتە لووتکە و گەورەیی و فرەوانی شارەکە دەرکەوتووە،([1]) بە شێوەیەك کە ئەو قەڵایەی هەیبووە نەیتوانیوە ئەو ژمارە زۆرەی دانیشتووان لەخۆ بگرێت، کە روویان تێکردووە، بۆیە بەناچاری روویان کردووەتە زەوییەکانی خوارەوەی کە دەشتایی بووە بە ئاراستەی باشوورو باشووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواییەوە.([2])

یاقوت کە باسی شاری ئەربل دەکات، ئەو سەردەمە هاوسەردەمی ئەتابەکیە، بە شێوەیەکی دوور و درێژ کە سەرجەم لایەنە جوگرافی و سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکان دەگرێتەوە، بۆیە کە شارەکە دەناسێنێ، بریتییە لە قەڵایەکی قایم و شارێکی گەورە لە دەشتاییەکی پان و بەرین، لە یەکێك لە لایەکانی قەڵات قۆرتێکی قوڵ هەیە کە بۆتە شوورەیەك بۆ شارەکە و لەنیوەی تەواو دەبێت، هەروەها باسی ئەو شارە دەکات کە لەسەر گردێکی خۆڵی بەرز بنیات نراوە، سەرەوەی زۆر پان و بەرینە،([3]) ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە تێبینی دەکەین کە دەڵێ دەکەوێتە نێوان هەردوو رووبارەکە، کە سنوورێکیان دەگاتە مووسڵ، هەروەها باسی دەکات کە شارێکی پان و بەرین و درێژە، کە شارەکە و شوورەکەی لە لایەن ئەمیر موزەفەرەدین کەوکەبری کوڕی زەینەدین کەچەك عەلی بنیاتنراوە، کە نێزیکەی لە ماوەی (٥٨٩-٦٣٠ك/١١٩٠-١٢٣٣ز) رابەرایەتی شاری ئەربلی کردووە.([4])

هەروەها ئاماژە بە بازاڕ و ئەو خانووانە دەکات کە لەسەر قەڵات هەبووە، لەگەڵ مزگەوتێك، ئەگەر تێبینی بکەین جۆرە پێکچوونێك لە نێوان قەڵای ئەربل و حەلەب هەیە، تەنیا ئەوە نەبێت یەکەمیان گەورەتر و فرەوانتر و بەرزترە. لە لایەکی دیکەوە یاقوت تێبینی ئەوەی لەسەر ئەو شارە هەیە کە لە شێوەی گوند دەچێت کاتێ دەڵێ: (ئەو شارە لە رووی بنیاتنان و سروشتەکەیەوە، زیاتر لە گوند دەچێت نەوەك شار).

---

١ - الخراج ولناعة الكتابة، ل١٥٩.

٢ - بۆ زیاتر بڕوانە: محسن محمد حسين، اربيل في عهد الاتابكي، (٥٢٢-٦٣٠ك/١١٢٨-١٢٣٣ز).

٣ - للاح الدين الجنابي، التركيب الداخلي لمدينة اربيل، دراسة مقارنة في جغرافية المدن، مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، (بغداد: كانون اول، ١٩٨٠) مج١١، ل٣١٢-٣١٣.

٤ - معج البلدان، ج١، ل١١٦.

هەروەها شارەکە چەندین قەلاّی دیکەی هەبووە، بەلاّم بەناو ئاماژەی بۆ نەکراوە، لەگەلّ ئەوەش هیچ شیناتییەك و بێستانێك و رووبارێك لە دەوروبەری شارەکە نەبووە و پێی تێپەڕ نەبووە، کە شارەکە پشتی بە ئاوی بیری قوولّ بەستووە.

یاقوت باسی هیچ کەسێك ناکات کە خاوەن کەسایەتی گەورەیی بێت تەنیا ئەبا بەرەکات کوڕی ئەحمەد کوڕی موبارەك کوڕی مەوهوب کوڕی غەنیمە کوری غالب کە ناسراوە بە مستوفی نەبێت، کە خاوەن ئەدەب و زانست و ئاین و پەڕتووك بووە، هەروەها کۆمەلّێك لەوانەی ئەهلی زانست و فەرموودە بوونە سەر بەو بوونە.(١)

بەلاّم سەبارەت بە دانیشتووانی ئەربل و دەوروبەرییەوە یاقوت جەخت لەوە دەکاتەوە کە (زۆرترین خەلّکەکەی کورد بوونە و بەعارەبکراون و سەرجەم رستاقەکان و کشتیارەکان کوردەکان بەناویان هێناوە)،(٢) بەبێ ئەوەی ئاماژە بۆ هیچ رەگەز و نەتەوەیەکی دیکە بکات لە کورد زیاتر.

لە کۆتایی باسەکەیدا لەبارەی شاری ئەربل یاقوت چەند دێرە هونراوەی یەکێك لە شاعیرەکان، ئەوانەی بەس دەلّێن و لە هەموو شێو و دۆلّێك بەس قسان دەکەن و کرداریان نییە، کە شیعری ئەنوشیروان بەغدادی ناسراو بە شەیتانی عێراقی زەرەرمەند کە شاری ئەربل و بەغدا و خەلّکەکەی جوێنباران دەکات، دواتر دەگەڕێتەوە دوای ئەوەی لەسەر زمانی دەردەچێت و جوێن بارانەکە دەبێتە ستایش، ئەو شیعرە هەندێ وشە و ناوی کوردی تێدا هاتووە، بلاّوکردنەوە و ئاماژەدان بە هەندێ لە دیرەکانی ڤالاّ نییە لە سوود.

*خانەقین:

ناوی ئەو شارە لەسەرەتاسەرێ کانیچاوە ولاّتناسییەکانەوە هاتووە، لەبەرئەوەی گوایە ئەوە یەکێکە لە کۆری ئوستانی شا فەیرۆز(٣) یەعقوبیش باسی دەکات کە ئەوە یەکێکە لە گوندە گەورەکان و زۆر گرینگ بووە،(٤) هەروەها بەلازریش ئاماژەی بۆ

١ - بۆ زیاتر بڕوانە: محسم محمد حسين، المصادر نفسة.

٢ - ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل ١١٧- ١١٨.

٣ - ابن خرداذة، المصادر نفسة، ل١٨. قدامة، المصادر نفسة، ل١٥٩-١٦٠.

٤ - البلدان، ل٣٤.

دەكات لە دووتۆی گێڕانەوەی باسەكانی لەبارەی فتوحاتی ئیسلامییەوە،([1]) بەڵام بیكری زۆر ورد نەبووە لە ناساندنی شارەكەدا، كاتێ باسی دەكات و دەڵێت: ناوچەیەك بووە لە وڵاتی فارس و تەسوجێك بووە لە تەسوجەكانی حەلوان،([2]) مەقدەسیش باسی شاری خانەقین و شارەكانی دیكە دەكات كە دەكەوێتە سەر رێگەی حەلوان، وەكو دەڵێت: هیچ بەهایەكیان نەبووە و شایەنی ئەوە نەبوونە بە بەغدا بەراوردبكرێن.([3])

بەڵام یاقوت زۆر ورد بووە لە ناساندنی شارەكە كاتێ باسی دەكات و دەڵێت: شارۆكەیەك بووە وەكو زۆربەی ناوچەكان لەسەر رێگەی نێوان هەمەدان و بەغدا، كە نێزیكەی شەش فرسەخ (٣٦كم) لە شاری قەسری شیرینەوە دوورە.([4])

ئەوەی شایەنی باسە شاری خانەقین مێژووەكەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی زۆر كۆن.([5])

*شارەزوور ([6])

لەسەردەمانی كردە رزگاركارییەكانی ئیسلامی سەر بە مووسڵ بووە، هەر بەو شێوەیەش ماوەتەوە هەتا سەردەمانی عەباسی، بە شێوەیەكی دیاریكراو هەتا دوا خەلیفەی عەباسی هارون رەشید (لەدایكبوون:١٩٤ك/٨٠٨ز)، دواتر لێی جیابووەتەوە،([7]) باسی دەكات كە یەكێك بووە لە ناوچە فرەوانەكان لە چیاكان لە نێوان هەردوو شاری ئەربل و هەمەداندا.([8]) كە چەندین شار و گوندی لەخۆ گرتووە،

---

١ - فتوح البلدان، ل٢٦٠.

٢ - معجم ماستعجم، ج٢، ل٤٨٤-٤٨٥. هەروەها: المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٦-ل١٠٤.

٣ - احسن التقاسيم، ل١٠٨.

٤ - معجم البلدان، ج٣، ل٢١١.

٥ - بۆ زیاتر بڕوانە: الروزبیانی، مدن كردیە قدیمە، ل٢٣٩-٢٤٢.

٦ - بۆ زیاتر بڕوانە: دائرە المعارف الاسلامیە، مادە (شهرزور) ج١٣ن ل٢٤٠، حسام الدین النقشبندی، الكرد فی الدینور وشهرزور، رشالە ماجستیر (جامعە بغداد:١٩٧٥) ئەمین نەقشبندی، شارەزوور و شارەزوورییەكان، گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق- دەستەی كورد. (بەغدا:١٩٨٣) بەرگی یەكەم، ل٤٢-٧٢.

٧ - البلاذري، المصادر نفستن ل٣٢٥.

٨ - یاقوت، معجم البلدان، ج٥، ل١٦٥.

دەوروبەرەکەیشی شارێکی گەورە بووە، پێیان گوتووە (نیم ئازرای)([1]) کە کەوتۆتە نیوە ڕێگەی نێوان تیسفۆن و شیز.

لەو شارانەی کە سەر بە شارەزوور بوونە شارەکانی شیز و شاری دزدان و شاری تیرانشا و شارۆکەی پیر،([2]) هەروەها شاری دیلمسان.([3])

یاقوت جەخت لەوە دەکاتەوە کە دانیشتووانی ئەو ناوچانە هەر هەموویان کورد بوونە.([4])

*سامگان

ئەوەش شارێکە سەر بە مووسڵ بووە، دوای رزگارکردنی و دواتر لەسەردەمی رەشید لێی جیابۆتەوە،([5]) کە ئەوشە لە دووتۆی سنووری چیاکان بووە، یاقوت باسی دەکات کە ئەوە ناوچەیەك لە ناوچەکانی چیاکان بووە کە بە (بمیان) دەیناسێنێ.([6]) هەروەها بەلازری لە دووتۆی گێڕانەوە و باسکردنی پرۆسەکانی رزگارکاریدا دەیگێڕێتەوە بۆ دانیشتووانی کورد.([7])

*دراباز:

ئەوەش بارودۆخی وەکو شارەزوور و سامگان بووە، کە کەوتۆتە نێزیك ئەوانەوە، چونکە ئەو سێ شارە هەمیشە لە سەرچاوە وڵاتناسییەکاندا پێکەوە ناویان هاتووە.([8]) بەلازریش ئاماژە بە دانیشتووانەکەی دەکات کە کوردن، باسی ئەوەش دەکات کە هارون

---

١ - وشەیەکی لێکدراوی کوردییە بە واتای نیوەی ڕێگە.

٢ - رەنگە ئەمە گوندی پیرانی ئێستە بێت کە کەوتۆتە ناوچەی هەورامان کە ئێستە بۆتە شارۆچکەیەك. بڕوانە: حسام الدين النقشبندي، المصادر نفسة، ل١٥. بكة.

٣ - ياقوت، معجم البلدان، ج٥، ل١٦٥.

٤ - هەمان المصادر نفسه. هەمان لاپەڕە.

٥ - الابلاذري، المصادر نفسة، ل٣٢٥.

٦ - معجم البلدان، ج٥، ل١٧٦.

٧ - البلاذرين المصادر نفسة، ل٣٢٥.

٨ - بڕوانە: الطبري، تاريخ الملوك والامم، تحقيق: محمد ابو الفضل ابراهيم (بيروت: ١٩٦٥) ج٩، ل١٧٦-١٢٨. بكة.

ڕەشید تەنیا یەك کەسی وەکو والی لە ویلایەتی شارەزوور و سامگان و دراباز داناوە و، پۆستێکی بۆ دیاری کردووە کە بەهاکەی شەش سەد دەرهەم بووە.[1]

*تیرانشا

یەکێك بووە لە ناحیەکانی شارەزوور، کە وڵاتناسانی سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی باسییان نەکردووە، بگرە گەڕیدە ئیبن مەهەلهەل[2] باسی کردووە و دواتر یاقوت لەوی گواستووەتەوە.[3]

*پیر:

وەکو باسی دەکەن ئەوە شاری حەسین بووە لە ناوچەکانی شارەزوور.[4]

*سەهرەوەرد:

لە سەدەی چوارەمی کۆچی وەکو باسی دەکەن (شارێکی بچووك بووە زۆربەی دانیشتووانەکەی کورد بوونە).[5]

*قرمیسین (کرمانشا)

وەکو باسی دەکەن شارێك بووە قەدەری گەورە بووە، خەڵکی زۆر بووە (زۆربەی دانیشتووانەکەی عەجەم بوونە لە فارس و کوردەکان).[6] پاشا قوباد کوڕی فەیرۆز بنیاتی ناوە لەبەرئەوەی خاکێکی باشی هەبووە،[7] یاقوتیش بەوە دەیناسێنێ کە بەعارەبی (کرمان شاهان کە شارێکی ناسراوە نێزیکەی سی فرسەخ (١٨٠کم) لە شاری هەمەدان دوورە و نێزیکە لە شاری دەینور.[8]

*ئازەر میدوخەت

---

١ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٣٢٥.

٢ - الرسالة الثانية، ل١٩.

٣ - معجم البلدان، ج٥، ل١٦٥.

٤ - ابن مهلهل، ملدر سابق، ل١٩ن ياقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٤٧٠.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٨. ابن حوقلن المصادر نفسة، ل٣١٤.

٦ - اليعقوبي، المصادر نفسة، ل٤٠.

٧ - ابن الفقيه الهمذاني، ل١٩٥.

٨ - معجم البلدان، ج٧، ل٣٦.

یاقوت بە تەنیا باسی دەکات و بەوەندە واز دەهێنێت کە دەڵێت شارۆکەیەکە دەکەوێتە نێزیك قرمیسین،([1]) هەروەها بە دووری نازانێت کە ئەو ناوە لە پاشا ئەزەرمیختەوە هاتبێت، کە دوا پاشای فارس بووە و کچی ئەبرویز بووە، کە لە دوای خۆشکەکەیەوە دەسەڵاتی گرتووەتە دەست بۆ ماوەی چوار مانگ.([2])

*دەینوور

بە (ماە کوفە) ناوی دەبەن، چونکە داهاتەکەی بەکاردەهێنراوە بۆ خەڵکی کوفە، بۆیە بە شاری قەدر گەورە باسیان کردووە، خەڵکەکەیشی تێکەڵییەك بووە لە عارەب و عەجەم.([3])

بێگومان زۆربەی ئەو عەجەمانە لە کوردەکان بوونە، بەڵام عارەبان لە دوای هەوڵەکانی فتوحاتی ئیسلامی نیشتەجێی ئەو شارە بوونە، هەر وەکو مەسعودی ئاماژە بۆ کوردەکانی شەهنجانی دەکات کە لەو شارەدا نیشتەجێ بوونە.([4])

ئەو شارە دەکەوێتە نێزیك شاری قرمیسین([5]) کە زۆرێك لە هەرێم و رستاقەسەرێ کانی بەو شارە بوونە،([6]) ژمارەیەکی زۆر لە خاوەندارانی ئەدەب و فەرموودە نیشتەجێی ئەو شارە بوونە.([7])

*نەهاوەند:

وەکو باسی دەکەن شارێکی گەورە و([8]) گران بووە.([9]) کەوتۆتە سەر چیا،([1]) لە شاری هەمەدان نێزیکەی چواردە فرسەخ (٨٤کم) دوورە،([2]) یاقوت کۆمەڵێ چیرۆك

---

١ - معجم البلدان، ج١، ل١٣٩.

٢ - بۆ زیاتر بڕوانە: کریستین، المصادر نفسة، ل٧٩-٨١-٤٧٨-٤٧٩. بکة.

٣ - اليعقوبي، المصادر نفسة، ل٤٠.

٤ - مروج الذهب، ج٢، ل١٣٥.

٥ - ياقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٧٠.

٦ - اليعقوبي، المصادر نفسة، ل٤٠.

٧ - ياقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٧٠.

٨ - اليعقوبي، المصادر نفسة، ل٤١.

٩ - ياقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٤٠٩.

لەبارەی چۆنییەتی بنیاتنانی ئەو شارە دەگێڕێتەوە کە هیچ لێی دڵنیا نییە، دەگێڕێتەوە و باسی دەکات کە ئەو شارە پێغەمبەر نوح بنیاتی ناوە، لە بنچینەشدا ناوی (نوح ئاوەند) بووە، دەڵێ دواتر ناویان ناوە نەهاوەند، چونکە بەو شێوەیە هاتووە.(3)

ئەو شارە نمایندەی یەکەم شاری ناوچەی ماه بەسرە بووە.(4)

بەڵام سەبارەت بە دانیشتووانی شاری نەهاوەند وەکو لە لایەن وڵاتناسەکانەوە باسکراوە، کورد رەگەزێکی گرینگی پێکهاتەی ئەو شارە بووە.(5)

*رۆجەرد:

شارۆکەیەکە دەکەوێتە نێوان شاری هەمەدان و شاری کەرەج، لە یەکەمیاندا نێزیکەی ١٨ فرسەخ (١٠٨کم) و لە دووەمیاندا ١٠ فرسەخ (٦٠کم) دوورە،(6) ئەو شارە لە لایەن وڵاتناسەکانی سەدەی سێیەمی کۆچی/ نۆیەمی زاینی باس نەکراوە، واتە ئەوە شارێکی نوێیە، بەمەش پێش ئیسلام بوونی نەبووە، ئەو شارە نمایندەی شارۆکەی دووەمی ناوچەی ماه بەسرە بووە.(7) وەزیری ئال ئەبی دەلف ناسراو بە حەمەوەی کوڕی منبەرا ئاوەدانی کردووەتەوە و(8) گوند بووە کردوویەتییە شار.(9)

*مەرج قەڵا:

---

١ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٨.

٢ - ياقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٤٠٩.

٣ - معجم البلدان، ج٨، ل٤٠٩.

٤ - قدامة، المصادر نفسة، ل١٧٣. بۆ زياتر بڕوانة: محمد علي سلطاني، جغرافياى تاريخي وتاريخ مفلل كرمانشاهان، مؤسسة فرهنطى نشر سها (جاب دوةم: ١٣٧٤ه.ش) جلد اول، ل٢.

٥ - بڕوانه: يتعقوبي، المصادر نفسة، ل٤ز المسعودي، مروج الذهب، ج٢، ل١٣٥ز حمد الله المستوفي القزوينى، نزهة، ل٨٣.

٦ - ياقوت، معجم البلدانن ج٢، ل٣٢٠.

٧ - قدامة، المصادر نفسة، ل١٧٣.

٨ - الضطخري، المسالك والممالك، ل١١٨. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٣.

٩ - ياقوت، معجم اتلبلدان، ج٣، ل٤٢٠.

وەكو باسی دەكەن ناوچەیەك بووە لە نێوان ئەو و شاری حەلوان، كەوتۆتە سەر رێگەی هەمەدان.([1]) ئیبن رستە باسی دەكات بەوەی كە قەلآیەكی گەورە بووە و لە گوندی زوبەیدیە كە (رەچەڵەكەكەی دەگەڕێتەوە بۆ خاتوو زبێدەی ژنی هاروون رەشید كە كۆشكێك و مزگەوتێكی تێدا دروست كردووە)، نێزیكەی حەوت فرسەخ (٤٢كم) دوورە.([2])

*مای داروستان (مازورستان)

شارۆكەیەك بووە لە گوندی زبێدە هەشت فرسەخ (٤٨كم) دوورە، ئیبن رستە باسی دەكات كە ئەو ماوەیە ئاو و ئاوەرۆ و درەختی زۆر بووە، بۆیە ئەو ناوچەیە (بە جێگەی مەترسیداری كوردەكان ناسراوە).([3])

*كەنكۆر (كۆشكی دزان)

ئەوە شارێكی كۆنە، ولآتناسە موسڵمانەكان باسیان كردووە.([4]) دەكەوێتە نێوان شاری هەمەدان و قرمیسین (كرمان شا) كە لە ئەسەد ئاباد نێزیكەی حەوت فرسەخ (٤٢كم) دوورە،([5]) بە كۆشكە سەرسامەكانی ناسراوە كە گرتووخانەی پاشای ساسانی (ئەپروێز) بووە.([6]) هەروەها بە كۆشكی دزان ناسراوە، چونكە موسڵمانەكان كاتێ لە پرۆسەی فتوحات لەسەردەمی خەلیفە عومەری كوڕی خەتاب گەیشتوونەتە ئەو ناوچەیە ئەسپ و وشتەرەكانیان لێ دزیون.([7])

مەسعودیش باسی دەكات كە خێڵی ماجەردانی كوردی لەو شارەدا نیشتەجێ بوونە.([8])

---

١ - االمصادر نفسة، ج٧، ل٢٤٤.

٢ - الاعلاق النفیسة، ل١٥١، محمد علي سلطاني، المصادر نفسة، مج١، ل٣٧.

٣ - هەمان سەرچاوەو همان لاپەڕە.

٤ - ابن رستة، المصادر نفسة، ل١٥٢.

٥ - یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١٥٥.

٦ - مسعر بن مهلهل، المصادر نفسة، ل٢٦، یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٦٢.

٧ - بروانة: الطبري، المصادر نفسة، ج٤، ل١٤٢.

-5 مروج الذهب، ج٢، ل٢٥١، التنبیه والاشراف، ل٨٩.

ڕەچەڵەکی ئەو شارە لە خاوەندارانی زانست بوونە، وەکو ئەبو غانم مەعروف کوڕی محەمەد کوڕی مەعروف ئەلقەسری ناسراو بە قەسری (نووسەرێکی بەهێز و خاوەن شیعری تەڕ و پاراو بووە، زۆر شیعریشی لەبەر بووە و، چەندین پۆستی ئیداریشی لە ئەستۆ گرتووە.([1])

*سیسەر([2])

ئەوە شارێك بووە سەر بە شاری هەمەدان بووە وەکو یاقوت باسی دەکات،([3]) هەروەها ئیبن فەقێی هەمەدانی لەبارەی ئەو شارەوە زۆری بەسەردا هەڵدەڵێت، ئاماژە بە هۆکاری ناونانەکەی بەو ناوەوە دەکات، دەڵێ لەبەرئەوەی (لە زەوییەکی نزمایی بووە، لە نێوان سەرکەکانی ئاکام سی بووە، وەکو دەڵێن سی سەر بووە، بۆیە سیسەر سەد کانی لێبووە، واتە سی سەر و سەد کانی هەبووە، لەبەر زۆری کانیاو و سەرچاوە ئاوییەکانییەوە)([4])

دیارە سیسەر و دەوروبەرەکەی مێرگ و پاوانی ماڵات و شوانکارە کوردەکان و ئەوانی دیکە بووە، ئەو شارە یەکێك لە خەلیفەکانی مەهدی بەناوی سلێمان کوڕی قیرات بەڕێوەی بردووە، دوای کەشێکی خراپ بەسەر کاروباری دەوڵەتدا هاتووە، خەلیفە بۆ سولەیمان و جێگرەکەی سەرکردەیەکی بەناوی لاسم تەیفوری و سوپایەکی ناردووە، بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە و دەرکردنی یاسایەك بۆ دروستکردنی شارێکی قایم بۆ ڕەواندنەوەی مەترسییەکان، ئەوەیان ئەنجامداوە و خەڵکیان تێدا نیشتەجێ کردووە، دوای ئەوەی چەندان ڕستاق و شاری دەوروبەرییان خستۆتە سەر ئەو شارە، وەکو ڕستاقی مایندەرج لە دەینوور و ڕستاقی جوزمە لە ناوچەی برزە لە ئازەربایجان، بەڵام لەو ناوچەیەدا دڵەڕاوکێکان هەر بەردەوام بووە.([5])

*سەمێرە و سیروان:

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٦١. بۆ زیاتر لەبارەی ئێستەو ئایندەی شارەکە بڕوانە: محمد علي سلطاني، المصادر نفسة، مج١، ل٢٢-٢٨. بکة.

٢ - معجم البلدانن ج٥، ل١٠٥.

٣ - معجم البلدانن ج٥، ل١٠٥.

٤ - مختلر کتاب البلدان، ل٢٢٠.

٥ - هەمان سەرچاوە، ل٢٢٠. معجم البلدان، ج٥، ل١٠٥.

ئەستەخری باسیان دەكات و دەڵێ دوو شاری بچووك بوونە.([1]) لە كاتێكدا مەقدەسی دەڵێ سەمێرە ماسبزانە و، شارێكی گەورە و ئاوەدان و زۆر بە خێر و بێر بووە، لە هەموو لایەكەوە بەرهەمی كشتوكاڵی چیاكانی بۆ هاتووە،([2])بەڵام یاقوت باسی شاری سەمێرە دەكات و دەڵێ شارێك بووە لە نێوان دیاری چیا و خۆزستاندا بووە، واتە شارێك بووە سەر بە ناوچەی مەهرجانقەزەق.([3])

*مایدەشت:

یاقوت باسی دەكات كە ئەوە قەڵایەك و شارۆكەیەكە لە ناوچەكانی خانەقین،([4]) هەتا ئێستەش بە هەمان ناو ماوەتەوە.

*دەشت:

باسی دەكات كە ئەوە شارەدێیەكە لە ناوەڕاستی چیا لە نێوان هەردوو شاری ئەربل و تەبرێز، شارێكی ئاوەدان و زۆر بەخێر و بێرە، كاتێ یاقوت سەردانی دەكات و دەڵێت خەڵكی ئەو شارە هەموویان كورد بوونە بەبێ ئەوەی دەستنیشانی پێوەندییە خێڵەكیەكانیان بكات.([5])

*ئاریۆجان:

یاقوت لە مەسعەر دەیگوازێتەوە و دەڵێ شارێكی باش و سەر بە ناوچەی ماسبزان بووە، لە شاری سیروانیش نێزیكە.([6])

*ئەسەد ئاباد

یاقوت بانگەشەی ئەوە دەكات كە ئەو شارۆكەیە لە پێش ئیسلام ئاوەدان كراوەتەوە لە لایەن كەسێكەوە ناوی ئەسەد كوڕی زەی سەرو حەمیری بووە.([7]) بەڵام ئەو قسەیە رەتدەكەنەوە، چونكە ئەو شارە دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی هەرێمی چیاكان و ئەوانەی

---

١ - المسالك والممالك، ل١١٨.

٢ - احسن التقاسيم، ل٣٢٠.

٣ - معجم البلدان، ج٥، ل٢١٤.

٤ - معجم البلدان، ج٤، ل٣٠١.

٥ - معجم البلدان، ج٧، ل٢٠٢، بۆ زیاتر بڕوانة: محمد علي سلطاني، المصادر نفسة، مج١، ل١٨.

٦ - هەمان سەرچاوە، ل١٣٨.

٧ - هەمان سەرچاوە، ل١٤٥.

نیشتەجێی ئەو شارەشن زۆربەیان کوردن، کە بەهیچ شێوەیەك حوکمی حەمیرییەکان نەگەیشتووەتە ئەو ناوچەیە، بەڵام راستتر بنچینەی ئەو ناوە (شیروایە)یە، بۆیە کە بە شێوەیەکی حەرفی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عارەبی بۆتە (ئەسەد ئاباد) ئەوەش زانراوە کە یاقوت ویستوویەتی و هەوڵی ئەوەی داوە دووبارە ناوی شار و پێگە و ناوچەکان بخاتەوە سەر بنچینەی زمانی عارەبی.

ئەو شارە لە شاری کەنکور نێزیکەی چوار فرسەخ (٢٤کم) دوورە، هەر لەو شارەدا چەندان کەسی زانا و دانای گەورەی وەکو ئەبی عەبدوڵای زوبیری کوڕی عەبدولواحید کوڕی محەمەد کوڕی زەکەریا کوڕی ساڵح کوڕی ئیبراهیم ئەسەد ئابادی ئەلحافزی لێبووە، کە لە ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی، کۆچی دوایی کردووە.([1])

*بندینجین (مەندەلی)

یەکەمین کەسێك لە وڵاتناسەکان کە باسی ئەو شارەی کردبێت ئیبن خوردازەبە بووە، لەسەردەمی ئەودا یەکێك بووە لە تەساسیجەکانی ناوچەی ئوستانی قوباد کە یەکێك بووە لە دوازدە ناوچەسەرێ کانی بە هەرێمی سەواد، بۆیە تەسوجی بندینجین پێنج رستاق بووە.([2])

لە سەدەی چوارەمی کۆچی یەکێك لەو شارانەی کە سەر بە ناوچەی حەلوان بووە لە دووتۆی هەرێمی عێراق بووە.([3]) ئەوەی جێگەی تێبینییە یاقوت لەبارەی بێژەی بندینجین سەرنجی تایبەتی هەبووە و دەڵێ: بێژەیەکی دوانەی وەهمییە، چونکە هەردوو پیتی کۆتایی (ین) بۆ ئەوانەیە کە دوانە دەکرێن لە زمانی عارەبیدا، یان ئەوەتەیە لەو بێژەیەدا هەمان واتاو مەغزای هەیە، دواتر لە ئەبی حەمزەی ئەسفەهانی دەگوازێتەوە و دەڵێ: (لە ناوچەی عێراق ئەو شارە ناوی وندنیکانە و عارەب کردوویانە بە بندینجین و واتاکەیشی شرۆڤە ناکات).([4])

---

١ - هەمان سەرچاوە.

٢ - المسالك والممالك، ل١٨-١٩-٢٦. هەروەها بڕوانە: قدامة، المصادر نفسة، ل١٦٠.

٣ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٠٤.

٤ - معجم البلدان، ج٢، ل٣٩٣. بۆ زیاتر لەبارەی بنچینەی وشکە بڕوانە: محمد جميل بندى الروزبياني، مدن كردية قديمة، ل٨٦-٨٧. بكة.

هەر وەك یاقوت دەیناسێنێ و دەڵێت: (شارۆکەیەکی بەناوبانگە لە لای نەهرەوان لە ناوچەی چیاکان و یەکێکە لەو شارۆچکانەی سەر بە بەغدا بووە، رەنگە بشگەڕێتەوە بۆ ناوچەکانی مەهرجانقەزەق.([1])

لە یەکێك لە فەقێیەکانی ئەو شارۆکەیە گێڕاوەتەوە بەناوی عەماد کوڕی کامل کوڕی بەندیجی فەقێ، کە بەندیجین ناوێکە بە کۆمەڵێك شوێنی جیاجیا دەگوترێت کە هیچ پێوەندییەکی بنچینەیان بەیەکترەوە نییە، بگرە هەر یەکە بەتەنیا و پێوەندیی بە ئەوەی دیکەوە نییە، هەروەها کۆشکی میر لە یەکێك لە گەورەترین شوێنی ئەو شارە هەبووە و ناسراوە بە (باقتنایا) کە خانووی قازیش بووە،([2]) بۆیە ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو شارە گرینگی خۆی هەبووە لە رووی کارگێڕییەوە.

*جەلەولا

یەکێك بووە لە تەساجیەکانی کۆرەی ئوستانی قوباد کە سەر بە هەرێمی سەواد بووە، پێنج رستاقی هەبووە،([3]) لە شاری خانەقین نێزیکەی حەوت فرسەخ (٤٢کم) دوورە و،([4]) دەکەوێتە سەر رێگەی خوراسان.([5])

مەقدەسی لە دووتۆی ئەو شارەی هەژمار دەکات کە دەکەوێتە نێو چوارچێوەی ناوچەی بەغداوە.([6]) لە سەرچاوە مێژوویيەکاندا بە رووداوی یەکلاییی کەرەوە ناوی هاتووە لە نێوان موسڵمانە رزگارکەرەکان و فارسەکاندا، لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٦ك/٦٣٧ز) کە ناسراوە بە رۆژی رووداوی کەوتنی جەلەولا، کە رووداوەکە بە شکستخواردنی فارسەکان کۆتایی پێهاتووە.([7])

زۆر شیعری لەبارەوە هۆنراوەتەوە:

---

١ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٣ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل١٨-٢٦.

٤ - االمصادر نفسة، ل٣١. یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٧٠-٧١.

٥ - یاقوت، معجم البلدانن ج٣، ل٧١.

٦ - احسن التقاسیم، ل١٠٤.

٧ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٢٦٠-٢٦١. یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٧١.

ويوم جلولا و الوقيعه افنيت      بنو فارس لما حوتها الكتائب.([1])

***جەبەل:**

ئیبن خوردازەبە باسی ئەو شارە دەکات لە دووتۆی باسکردنی لەبارەی ڕێگەی بەغدا بۆ بەسرە،([2]) بەڵام بەبێ ئەوەی ناساندنێك یان شتێك وەکو باسکردن بگێڕێتەوە، بەڵام ئیبن حوقەل ئاماژە بە بوونی ڕووداوێك دەکات کە لە لای ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە بووە، ئەویش لە شارێکی بچووك بووە.([3]) لە کاتێکدا مەقدەسی لە دووتۆی ناوچەی بەغدا باسی دەکات کە شارێکی ئاوەدان و خەڵکەکەی ئەهلی مزگەوت بوونە.([4])

خاوەنی پەڕتووکی (سنووری جیهان)بە تەنیا ئاماژە بە دانیشتووانی شارەکە دەکات کە زۆربەیان کوردن.([5]) لە لایەکی دیکەوە کە باسی شاری جەبەل دەکەن بەوەی کە ئاپارتمانی کەمی تێدایە.([6]) واتە بە پێچەوانەی مەقدەسییەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی مێژووی دانانی ئەو دوو پەڕتووکە زۆر لەیەکترییەوە نێزیکە، لە کاتێکدا پەڕتووکی سنووری جیهان لە ساڵی (٣٧٢-ك/٩٨٢ز) دانراوە، بەڵام مەقدەسی دانانی پەڕتووکەکەی (باشترین دابەشکردن) لە نێوان ساڵانی (٣٧٥-٣٨٠ك/٩٨٥-٩٩٠ز) داناوە، بەڵام ئەوەی مەقدەسی دەیگێڕێتەوە ڕاستترە، لەبەرئەوەی وردترە و، هەروەها مەقدەسی زۆر گەڕاوە لە لایەك و، خاوەنی پەڕتووکی (سنووری جیهان) گەڕیدە و کۆچەر نەبووە لە لایەکی دیکەوە، بگرە پەڕتووکەکەی لە دووتۆی هەندێ پەڕتووکی وڵاتناسانی پێش خۆی هەڵێنجاوە، وەکو لە پێکهاتەی پەڕتوکەکەی ئەودا بەدیار دەکەوێت، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئاماژە بەو سەرچاوانە ناکات کە زانیارییەکانی لێ وەرگرتووە.

ئەوەی جێگەی تێبینییە، دیسان بوونی کورد بەو شێوە چڕە لە شاری جەبەل کە یەکێکە لە شارەسەرێ کانی بە ناوچەی بەغدا، بەڵگەی ئەوەیە کە کورد بەنێو عێراقدا

---

١ - یاقوت، معجم البلدانن ج٣، ل٧١.

٢ - المسالك والممالك، ل٦٠-١٥٠.

٣ - صورة الارض ، ل٢١٠-٢١٩.

٤ - احسن التقاسیم، ل١٠٤-١٠٩.

٥ - مؤلف مجهول، ل١١٥.

٦ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

بڵاوبوونەتەوە، هەروەها دڵنیاشمان دەکەنەوە کە بوونیان بە شێوەی جۆراوجۆر لە شوێن و جێگەی دیکە و دەر و دراوسێی ئەو شارە هەبووە.

بەڵام یاقوت باسی شاری جەبەل بە (شارۆکە) دەکات، کە دەکەوێتە نێوان نوعمانییە و شاری واست لە لای ڕۆژهەڵاتیەوە، هەروەها جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەوە شار بووە زۆرجاریش سەردانی کردووە و وەکو گوندێکی گەورە بینیویەتی.([١]) واتە رۆڵی شارستانییانەی لە سەدەی حەوتەمی کۆچی دیارنەما بەهۆی هۆکاری نەزانراوەوە.

لە شاری جەبەل کۆمەڵێك لە خاوەندارانی زانست و پیاوی گەورە هەبوونە وەکو ئەبو عومران موسا کوڕی ئیسماعیل جەبەلی و حوکەم کوڕی سلێمان جەبەلی و ئەبو خەتاب محەمەد کوڕی عەلی کوڕی محەمەد کوڕی ئیبراهیم جەبەلی شاعیر (لەدایکبوون: ٤٣٩ك/١٠٤٧ز) کە یەکێك بووە لەو کەسانەی لە شیعر شارەزا و لە نێوان ئەو و ئەبی عەلای مەعەری شاعیری گەورە شەڕە شیعریان کردووە کە ئەبو عەلا چامەکەی خۆی گوتووە:

غیر مجد فی ملتی واعتقادی    نوح باك ولا ترنم شادی([٢])

*حەلوان:

لە سەدەی سێیەمی کۆچی شارێکی مەزن و گەورە بووە. باسی دانیشتووانەکەی دەکەن کە تێکەڵییەك بووە لە عارەب و عەجەم لە فارسەکان و کوردەکان.

وڵاتناسەکان سەبارەت بە دانیشتووانی ناوچەی حەلوان بیروڕایان جیاوازە، هەیە پێی وایە لە دووتۆی ناوچەی هەرێمی چیاکانە و، هەشە پێی وایە لە دووتۆی ناوچەی هەرێمی عێراقە، لەبەرئەوەی کەوتۆتە سەر سنووری هەردوو هەرێمەکەوە لە لایەك و دووانەی ئاو و هەواکەی کە بەشێکی دەیگەڕێننەوە بۆ ئاو و هەوای چیا و بەشێکیشیان دەیگەڕێنینەوە بۆ ئاو و هەوای عێراق.([٣])

---

١ - معجم البلدان، ج٣، ل٣٠.

٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٣ - الیعقوبي، المصادر نفسة، ل٤٠.

ئەوەی جێگەی تێبینییە ئەستەخری وێنەی حەلوان لەسەر نەخشەی عێراق دەکێشێ[1] بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە چوارچێوەی هەرێمی چیاکان باسی دەکات و دەڵێت: (شارێکە لەسەر چیا و درێژ دەبێتەوە بۆ عێراق، بۆیە لەسەر وێنەی عێراق وێنەمان کێشاوە.[2]

بەڵام لەبەرگرەوەی پەڕتووکی ئیبن حوقەل لە سەدەی شەشەمی کۆچی جەخت لەوە دەکاتەوە کە سنووری شاری حەلوان سەر بە چیاکانە، بەڵگەیشی ئەوەیە کە بەفری لێ دەبارێت.[3] وەکو دەڵێت: (هەندێ لە خەڵکان حەلوان دەخزێننە نێو عێراق، بەڵام زۆربە پێیان وایە شارێکی چیاییە و بەفری لێ دەبارێت، ئەوە دەیسەلمێنێ کە شارێکی چیاییە بەبێ ناکۆکی.[4]

یاقوت لە ئەبی زەیدی بەلخی دەگوازێتەوە و دەڵێت: (بەڵام حەلوان شارێکی ئاوادان بووە نەك لە عێراق، دوای کوفە و بەسرە و واست و بەغدا، لەوانیش گەورەتر بووە، ئەو شارە لە نێزیك چیاکان بووە نەك عێراق، شارێك بووە لە نێزیك چیا نەك ئەوانی دیکە، رەنگە بەفریشی لێ بارییێت، ئەگەر لەسەر بەرزە چیاکانیش بووبێت، ئەوا بەفری بە بەردەوام لێ باریوە).

لە لایەکی دیکەوە یاقوت جەخت لەوە دەکاتەوە کە شاری حەلوان چەندان زانای بەرهەمهێناوە، بەڵام تەنیا باسی محەمەد حەسەن کوڕی عەلی خەلال حەلوانی دەکات.[5]

بەڵام مەقدەسی کە باسی حەلوان دەکات بەوەی شارۆکەیەکی بچووك و دەشتاییی و چیاییە، نێزیکەی هەشتا رێگەی هەبووە، رێگەی خوراسان و رێگەی باقات و رێگەی مەسەلی و رێگەی یەهودی و رێگەی بەغدا و رێگەی برقیت و رێگەی یەهودی (شاری

---

١ - برِوانة: ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل١٨. اليعقوبي، المصادر نفسة، ل٤٠. الاصطخري، المسالك والممالك، ل٦٠-١١٨. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٤. المقدسي، المصادر نفسة، ل١٩٤.

٢ - بڕوانە نەخشەی ژمارە (٩) بکە.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٦٠.

٤ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٥ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

باسبان) و ڕێگەی ماجکان.([1]) هەروەها مەقدەسی باسی شاری مەدائینیش دەکات کە سەر بە ناوچەی حەلوان بووە و زۆر بچووك بووە و نەیتوانیوە باسی بکات.([2])

ئەوەی جێگەی تێبینیە بوونی جۆرێك لە ناکۆکی و جیاوازی لە نێوان تێڕوانینەکانی هەر یەك لە ئەستەخری و ئیبن حوقەل و مەقدەسی لەبارەی باسی حەلوان و دەوروبەری، ئەمە سەرەڕای ئەوە ئەوانە هاو سەردەم بوونە، بەڵام ئەوەی جیایان دەکاتەوە رۆژگاری نووسینی پەڕتووکەکانیانە کە جیاوازییەکی زۆر کەمی هەیە،([3])بەڵام دروستتر ئەوەی مەقدەسییە، زۆر بە وردی و زانستی باسی دەکات و پشت بە چاوپێکەوتنی راستەوخۆ و پشکنین لەو پرسانەی کە پێویستی بە زانیاری و شارەزایی و لێکۆڵینەوەی لەبارەی هەواڵ و باسەکانەوە هەیە، زیاتر لە وڵاتناسانی دیکە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە ئەستەخری هەندێ شتی لە پەڕتووکەکەی بەلخی وەرگرتووە و دەستەواژە و باسەکان لەبارەی شارەکە پێکچووی بۆچوونی ئەوە، ئەگەرچی بە شێوەیەکی تەواو نەیگواستۆتەوە.([4])

*هەمەدان:

یەعقوبی باسی دەکات کە (شارێکی فرەوان و قەدر مەزنە، خاوەن هەرێم و کۆری زۆرە.. هەر ئەوەشە ناوی ماە بەسرەیە، بەڵام هۆکاری ناونانی هەر ئەوەیە کە فلان باج و خەراجەکەی هەڵدەگرێت و دەیداتە خەڵکی بەسرە.([5]) هەروەها دەگێڕنەوە کە هەمەدان شارێك بووە دەست لەملانی شاری جەبەل بووە،([6]) بۆیە ئیبن فەقێی هەمەدان زۆر باسی دەکات و چۆتە نێو زۆر بیر و بۆچون و زۆر شتیشی بەسەردا زاڵ بووە.([7])

---

١ -معجم البلدان، ج٣، ل١٧٥.

٢ -- المقدسي، المصادر نفسة، ل١١٠.

٣ - بڕوانە بەشی یەکەمی ئەو لێکۆڵینەوەیە بکە.

٤ - بەراورد لەنێوان: الاصطخري، المسالك والممالك، ل٦٠-١١٨، ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٤، یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١٧٣. بكة.

٥ - البلدان، ل٤١.

٦ - ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل٢٠٣. ياقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٤٨.

٧ - هەمان سەرچاوە، ل٢٠١. هەروەها: ياقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٤٨٣-٤٨٧.

دیارە گرینگیدانی وڵاتناسەکان بەو شارە لە هەموو روویەکەوە جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەو شارە گرنکی خۆی هەبووە لەسەردەمە جیاجیاکانی مێژوودا.

ئەوەی لە پێشەوە باسمانکرد لەبارەی شار و شارۆکە کوردییەکان، ئەمە واتای ئەوە نییە ئەوانە شاری کوردستان بن، بە تایبەتی هەردوو هەرێمی جەزیرە و چیای ڕۆژهەڵات، کە مەڵبەندی شارنشینی هەر لەوانەدا کورت نابێتەوە و تەواو نابێت، بگرە ئێمە باسی دیارترین ئەو شوێنانەمان کردووە ئەویش بە شێوەیەکی کورت، رەنگە مەڵبەندی دیکەی ئاوەدانی هەبووبێت کە وڵاتناسەکان باسیان نەکردووە یان ئێمە باسمان نەکردووە، مەبەستیش لەمە نمایشێکی خێرا بووە بۆ تەواوکردنی لایەنەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیە کە هەڵگری ناونیشانی (وڵاتی کوردستان)ـــە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی درکمان بەوە کردووە کە ئێمە هەندێ جار ناچاربووین هەندێ بابەت دووبارە بکەینەوە کە ئەوانەی پێش خۆمان بە شێوەی جیاجیا باسیان کردووە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە ئەمە جەخت لەوە دەکاتەوە کە کورد هەر هەموویان کۆچەرییەکی گەڕۆك نەبوونە، بە بەڵگەی ئەوەی شار و شارۆکەی زۆریان هەبووە کە تێیدا ژیاون لە وڵاتەکەی خۆیاندا، واتە ئەوان شێوەیەك لە ژیانی شارنشینیان پێوە دیاربووە.

ب/ گوند و دێهات:

ئەوەی روون و ئاشکرایە وڵاتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان گرینگی زۆریان بە باسی شارو شارۆکەکان داوە و هەموو لایەکیان نیشانداوە بە پشت بەستن بە بینینی شوێنەکە لە دووتۆی سەردانەکانیان بۆ ئەو شارانە یان پرسیارکردن لە کەسانی زانا و دانا، یان بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی پێش خۆیان، لە کاتێکدا باسکردن لە گوند و بارودۆخی ئەو دێهاتانە شتێك نەبووە شایەنی گرینگی پێدان بێــت لە لای ئەو وڵاتناسانە، تەنیا ئەگەر شتێك ئەو دێهاتانەی جیاکردبێتەوە لە گوندەکانی دیکە.

ئەوەش واتای ئەوە نییە ئێمە لە شان و شکۆی پەڕتووکە وڵاتناسییەکان کەمبکەینەوە، چونکە خاوەنەکانیان بۆیان نەبووە لە ژیانی گوند و ناوچە دوورەکان دڵنیاببنەوە، بۆیە کێومالکردنی وڵاتێکی وەکو وڵاتی فرەوانی کوردستان و رووپێوکردنی شار و گوند و سەرجەم ناوچەکانی، پرسێك بووە زۆر ئەستەم بووە جێبەجێ بکرێت بە تایبەتی ئەو وڵاتناسانە لە بارودۆخێکدا ژیاون کە زۆر بە زەحمەت توانیویانە لە

شوێنێکەوە بچنە شوێنێکی دیکە، ئەمەش لەبەر سەرەتایی بوونی ڕێگە و ئامرازەکانی گواستنەوەدا.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی لە پێشەوە لەبارەی شارەکانەوە باسمانکرد، لە لایەن هەندێ لە وڵاتناسەکانیشەوە بە تایبەتی یاقوتی حەمەوی ناوی هەندێ گوندی کوردی هاتووە، بە تایبەتی ئەوەی کەوتۆتە هەرێمی جەزیرە و چیاکانی ڕۆژئاواوە، کە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

*ئەکل:

یاقوت تەنیا هەر بەوەندە وازدەهێنێت کە دەڵێ ئەوە گوندێکە لە ماردین.([1])

*بازیدی:

یەکێکە لە گوندەکانی جەزیرە و دەکەوێتە سەر ڕووباری دیجلە بەرامبەر بە جەزیرەی ئیبن عومەر و کە چەندان گوندی دیکەی هەیە.([2])

*قەردی:

گوندێکی نێزیك چیای جودییە لە جەزیرە و لە نێزیك ئەو، گوندی هەشتایەمین هەیە کە لە پێشەوە باسمان کرد کە سەر بە ویلایەتێکی گەورەن کە نێزیکەی سەد گوند لەخۆ دەگرێت لەوانە گوندی جودی و گوندی هەشتایەمینن.([3])

*فەیرۆزسابور:

وەکو باسی دەکەن گوندێکی گەورەیە چەندان ئاپارتمانی فرەوان و شوێنەواری تێدایە و، یەکێکە لە ناحییەکانی قەردی.([4])

*قەتەربل:

گوندێکە بەرامبەر بە شاری ئامەد لە دیاربەکر، یاقوت باسی دەکات کە ئەو گوندە شەرابیان فرۆشتووە، وەکو ئەو گوندەی کە کەوتۆتە نێوان بەغدا و عەبکرا کە ئەوانیش شەرابیان فرۆشتووە.([5])

---

١- یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٩٣.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل٣٠.

٣ - هەمان سەرچاوە.

٤ - یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٣٠.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل٦٩.

*دۆنمان:

گوندێکی گەورە بووە کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری سەروچاوە و نەسیبین و بازارێکیش بووە بۆ خەڵکی جەزیرە.([1])

*کراتا:

گوندێکە کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری مووسڵ و جەزیرەی ئیبن عومەر، لەسەردەمی یاقوت بە (گرد موسا) ناسراوە، سەروچاوەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ پیاوێك بەناوی موسا والی مووسڵ بووە لە پێش سەلجۆقییەکان، لەو شێونەدا کوشتویانە و هەر لەو شوێنەدا نێژراوە، بۆیە بەو ناوە ناسراوە.([2])

*کەفرتوتا:

وەکو باسی دەکەن گوندێکی گەورە بووە، یەکێکە لە ناوچەکانی جەزیرە و نێزیکەی پێنج فرسەخ (٣٠کم) لە شاری دارا دوورە، کەوتۆتە نێوان ئەو شارە و شاری رەئس ئەلعەین، هەروەها یاقوت دەڵێت لەو گوندەدا کەسانێك هەبوونە ئەهلی زانست و زانیاری خواز بوونە.([3])

*کەفرزەمار:

یاقوت باسی دەکات بەوەی گوندێکە لە گوندەکانی مووسڵ، دواتر بە پێی یەکێك لە گێڕانەوەکان ناحیەیەکی فرەوان بووە و یەکێك بووە لە شارەکانی قەردی و بازیدی.([4])

*کەفر عەزا:

یەکێك بووە لەو گوندانەی سەر بە شاری ئەربل و کەوتۆتە نێوان ئەو شارە و زێی بچووك، هەروەها یاقوت دەڵێت: قازی ئەربل لەسەردەمی خۆیدا خەڵکی ئەو گوندە بووە بەبێ ئەوەی هەڵگری ئەو ناوە بووبێت.([5])

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٢٣. هەروەها بڕوانە بەشی چوارەمی ئەو لێکۆڵینەوەیە بکە.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل١٢٣.

٣ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل١٤٣. هەروەها کفر، وشەیەکی یۆنانییە بە واتای گوند یان مەزرەعە دێت.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل١٤٤.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل١٤٥. هەروەها کەفر عەزا بە زۆری زاناکانییەوە ناسراوە، بڕوانە: ابن المستوفی، تاریخ اربل. بکە.

*کەفر جەدیا (کفر جدا)

یەکێك بووە لە گوندەکانی شاری (رەها -ئورفە) لە موڵکەکانی یەکێك لە منداڵەکانی خەلیفەی ئەمەوی کە ناوی (هشام عەبدولمەلیك (١٠٥-١٢٥ك/٧٢٣-٧٤٢ز) بوو.(١)

*ئەلمونسە:

ئەو گوندە لە شاری نەسیبین نێزیکەی یەك هەنگاو دوور بوو نێزیکەی (٣٧کم) بە ئاڕاستەی مووسڵ.(٢)

*نیربا:

وەکو باسی دەکەن گوندێکی گەورە و بە دارستان بووە، لە چوارچێوەی ناوچەی مەرج (مێرگ) بووە لە ڕۆژهەڵاتی مووسڵ.(٣)

*مێرگ:

گوندێکی گەورە بووە لەسەر رێگەی نەسیبین لە مووسڵ، لەوەی دواییان نێزیکەی دوو رۆژ دوور بووە، واتە (٧٢کم)، هەروەها یەکێك بووە لە شوێنەکانی پشوودانی کاروانسەرا بازرگانییەکان.(٤)

*مەمدوح ئاباد:

گوندێکی گەورە بووە لە نێزیك زێی گەورە، کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری ئەربل و مووسڵ، یەکێك بووە لە شوێنەکانی شاری یەکەم.(٥)

*زراعە:

گوندێکی گەورە بووە (رەئس ناعور)یشیان پێ گوتووە، کانێکی لێبووە ئاوێکی بەخوڕی لێهاتووەتە دەرەوە، لەبەر ئەو ئاوە رووەکی نیلۆفەر چاندراوە کە لە هەندێ

---

١ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل١٤٣.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٨، ل٣٢٢.

٣ هەمان سەرچاوە، ج٧، ل٤٢٢.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل٢٥٠.

٥ - یاقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٣١٩.

دەرمان بەکارهاتووە، ئەو گوندە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی شاری مووسڵ لە نێزیك شارۆکەی بەعشیقا.[1]

*دەحلان:

بیکری باسی دەکات و دەڵێ گوندێك بووە لە شاری مووسڵ خەڵکەکەی کورد و دز بوونە، هەروەها نموونەکی هێناوەتەوە گوایە دەڵێن (فلان دەحلانییە).[2]

*جۆزە:

یەکێك بووە لە گوندەکانی کوردی هەکاری کە کەوتۆتە نێو چیا لە ناحیەکانی مووسڵ و ئاوەدان بووە، زانای فەرمووده ئەبو محەمەد عەبدوڵای کوڕی محەمەد کوڕی عەبدوڵای جۆزی خەڵکی ئەو گوندە بووە.[3]

*باعەدرێ:

گوندێك بووە لە مووسڵ.[4]

*باسەفرا:

گوندێکی گەورە بووە لە ڕۆژهەڵاتی مووسڵ بە تەنیشت چیاوە بووە، وەکو باسی دەکەن دارستان و ڕەز و باخ و کانزای کرۆمی زۆر بووە، ترێیشی لە ناوەڕاستی زستان پێ ڕادەگەیشت.[5]

*بارما:

ئەمە سەرەڕای ئەوەی ناوی چیای بارما بوو کە بە (حەمرین)ناسراوە، گوندێك بووە لە ڕۆژهەڵاتی زێی دیجلە، ڕەچەڵەکی ددان بووە، بۆیە پێیان گوتووە ددانی بارما.[6]

*بارنجان:

وەکو گوندێك باسیان کردووە خان و کانی لێبووە لە نێزیك شاری سنجار بووە.[1]

---

١ - هەمان سەرچاوە، ج٨، ل٤٧١.

٢ - معجم ماستعجم/ ج٢، ل٥٤٥.

٣ - یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٩٢.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥٩.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥٨.

٦ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥٥.

*بلاباز:

گوندێك بووه له ڕۆژهەڵاتی مووسڵ له چوارچێوەی شاری نەینەوا، کەوتۆته نێوان مووسڵ و زێیەکە، کاروانچییە بازرگانییەکان لەوێ لایانداوه، چونکه خانی لێبووه گەشتیاران تێیدا شەو ماونەتەوه.[2]

*بەلازگرد (بلازگرد)

یاقوت هەر تەنیا بەوەندە وازدێنێ کە گوندێك بووه له نێوان ئەربل و ئازەربایجان.[3] ناوی دیکەیشی هەبووه وەکو (بەلاشکرد) و (مەلازگرد) و (مانزگرد) کەوتۆته باکووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا به سەر لێواری دەریاچەی وان، لەوێدا شەڕێکی یەکلایی کەرەوه ڕوویداوه له نێوان موسڵمانە سەلجۆقیەکان و ڕۆمەکان له ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧١ز).

*باکلبا:

گوندێك بووه سەر به شاری ئەربل، فەقێ ئەبو عەبدوڵا حوسێن کوڕی شەروین کوڕی ئەبی بەشیر جەلالی ئەلباکلبی خەڵکی ئەوێ بووه و یەکێك بووه له هاوڕێکانی یاقوت.[4]

*تەرجەلە:

گوندێکی بەناوبانگ بووه له نێوان هەردوو شاری (ئەربل و مووسڵ، یەکێك بووه له گوندەکانی مووسڵ[5]) له دواییدا شەڕێکی تێدا ڕوویداوه له نێوان سەربازەکانی پاشا زەنکی عەزەدین مەسعود کوڕی مەودود کوڕی زەنکی کوڕی ئاق سەنقەر و خاوەنی ئەربل یوسفی کوڕی عەلی کۆجەك، ئەوش له ساڵی (٥٨٠ك/١١٨٤ز) بووه[6]

*تەل خوسا:

گوندێك بووه کەوتۆته نێوان هەردوو شاری ئەربل و مووسڵ له نێزیك زێ.[7]

---

١ - هەمان سەرچاوه، هەمان لاپەڕه.

٢ - هەمان سەرچاوه، ج٢، ل٣٧٥.

٣ - هەمان سەرچاوه، هەمان لاپەڕه.

٤ - هەمان سەرچاوه، ج٢، ل٢٦٢.

٥ - هەمان سەرچاوه، ج٢، ل٤٦٧.

٦ - لەبارەی ئەو جەنگە تەماشای: محسن محمد حسين، اربيل فى العهد الاتابكى، ل٧٤-٧٦. بکە.

٧ - هەمان سەرچاوه، ج٢، ل٤٥٢.

*تەل زەبدی:

یەکێك بووە لە گوندەکانی جەزیرە.([1])

*بەیت ئەلنار (ئاتەشگە)

وەکو باسی دەکەن گوندێکی گەورە بووە لە گوندەکانی سەر بە شاری ئەربل، نێزیکەی هەشت میل لێی دوور بووە، یاقوت ناوی ئەو گوندەی فەراهەم کردووە وەکو واتایەك بۆ ئەوەی کە خەڵکەکەی رۆژێك لە رۆژان لەسەر ئاینی زەردەشتی بوونە، هەروەها لە یەکێك لە شاعیرەکان گواستویانەتەوە بەناوی عەبدولڕحمان کوڕی ئەلمستەخەف کە بەچەند دێرە هۆنراوەیەك جنێو بە شاری ئەربل دەدات.([2])

اربل دار الفسق حقا فلا      يعتمد العاقل تعزيزها

لو لم تكن دار فسوق لما      اصبح بيت النار دهليزها([3])

*بائەیوب:

گوندێکی گەورە بووە و کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری قرمیسین و هەمەدان، رەچەڵەکەکەی بۆ بانەکەی دەگەڕێتەوە، ئەبا یەعقوب دەیگێڕێتەوە بۆ بەنی جورم، چەندان خانووی رووخاوی تێدا بووە و ناسراوە بە گوندی دەکان.([4])

*بیجانین:

یەکێك بووە لە گوندەکانی نەهاوەند.([5])

*ئەلزوبەیدیە:

وەکو باسی دەکەن گوندێك بووە لەنێو چیا لە نێوان هەردوو شاری قرمیسین و مەرج قەڵا، لە هەر یەکێك لەو شارانە نێزیکەی هەشت فرسەخ (٤٨کم) دوور بووە.([6])

*ئازنری:

---

١ - هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٤١١.

٣ - دهلیز: بە عارەبی (دهله) بە واتای قەنتەرە دبێت، هەمان سەرچاوە، ل٦٨.

٤ - یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٢٥٠.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٤١١.

٦ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٤٦٩.

یەکێك بووە لە گوندەکانی نەهاوەند.([1])

*ئازیۆخان:

گوندێك بووە لە گوندەکانی نەهاوەند، یەکێك لە پیاوە گەورەکان خەڵکی ئەوێ بووە، کە ناوی ئەبو سەعد فەزل کوڕی عەبدولاّ کوڕی عەلی کوڕی عومەر کوڕی عەبدولاّ کوڕی یوسفی ئازیۆخانی بووە.([2])

*کیرکان (کرکان)

گوندێك بووە لە نێزیك شاری قرمیسین، ئەو گوندە دوپشکی زۆر بووە و ساڵانە خەڵکێکی زۆری ئەو گوندەی کوشتووە، ئیبن فەقێی هەمەدانی دەڵێ هەندێ لە پاشاکانی فارس ئەمریان لەسەر ئەستێرەناس و تەلیسم (بلیناس حەکیم) کرد بچێتە ناوچەی دووپشکەکان، ئەوەیشی کرد، لەو کاتەوە ئەو دوپشکانەی خەڵکیان دەکوشت نەما.([3])

*بندسیان:

گوندێکی نەهاوەند بووە، شەڕی نەهاوەندی بەناوبانگی تێدا روویداوە.([4])

*بێستون:

گوندێك بووە کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری هەمەدان و حەلوان، لە یەکەمیاندا نێزیکەی چوار هەنگاو (٢٤ فرسەخ-١٤٤کم) دوور بووە، لە شاری قرمیسینیش هەشت فرسەخ (٤٨کم) دوور بووە.([5])

*تورمان تا:

---

١ - هەمان سەرچاوە، ج١، ل١٣٩.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج١، ل٥٣.

٣ مختلر كتاب البلدان، ل١٩٧. القزويني، اثار الابلادن ل٤٤٥.

٤ -یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٤٣٧.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٤٠٥.

یەکێك بووە لە گوندەکانی ماسبزان، وەکو دەردەکەوێت ناوەکەی بەهۆی ئەو نەخۆشییەی لێی بووە ناونراوە، هەروەها ئەندێشەی ئەوە کراوە کە ئاگر لەناو ناخی مرۆڤ دایە، لە زستاندا کاردەکات و لە هاویندا دەکوژێتەوە، ئیبن فەقێی هەمەدانی ئەوەیشی بۆ زیادەکات کە ناسراوە بەوەی شتێکی سەرسوڕمان و سەرنجراکێشی لای خوێنەرانی پەڕتووکەکەی وروژاندووە لەسەر حسابی راستییەکان کە تای تورمان شتێك نەبووە تەنیا پروسکێکی تای ماهـ کوفە نەبێت، کە(ئەلدەینور) و بەلیناسی حەکیم کاری تەلیسمییان تێدا ئەنجام داوە.([1])

*رەز:

گوندێك بووە سەر بە شاری ماسبزان و لەنێزیك شاری بەندیجین (مەندەلی) بووە، کە خەلیفەی عەباسی ئەلمهدی([2]) تێدا مردووە(۱) (۱۵۸- ۱٦۹ك/۷۷٤-۷۸۵ز).([3])

*سەرسەخ:

یەکێك بووە لە گوندەسەرێ کانی بە شاری بندینجین و بە خوێ بەناوبانگ بووە.([4])

*دەبالآ([5])

یەکێك بووە لە گوندەکانی ماسبزان لە ناحیەی چیا لە نێزیك شاری بندیجین، یاقوت وا باسی دەکات گوایە گۆڕی خەلیفە ئەلمهەدی تێدایە، وەکو دیارە ئەو بە تەواوی دڵنیا نییە لەوە، بۆیە دژی خۆی بووەتەوە لە کاتی دیاری کردنی شوێنی گۆڕی مەهدی، کە ئەوانیش گوندی رەز و گوندی دەبالآیە، خەلیفەی عەباسی ئەلمستنجد باللە (٥٥٥-٥٦٦ك/١١٦٠-١١٧٠ز) سەردانی ئەو گوندەی لە ساڵی (٥٦٤ك/١١٦٨ز) کردووە، ماڵ و سامانی بەسەر خەڵکی ئەو گوندەدا دابەشکردووە.([6])

---

١ - مختلر کتاب البلدانن ل١٩٧.

٢ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٤٠٠.

٣ - محمود شاکر، التاریخ الاسلامي، ج٥، ل١٣٠.

٤ - یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٤٣٧.

٥ - دەبالا: وشەیەکی لێکدراوی کوردییە بە واتای دێی بالآ دێت.

٦ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٢٨.

*مەرت([1])

گوندێك بووە لە نێزیك شاری ئورمیە، وەكو باسی دەكەن گوندێكی گەورە بووە و رەز و بێستانی زۆربووە و خەڵكەكەیشی ئازا و یەكگرتوو بوونە.([2])

*شەقلد باز (شەقلدون)

وەكو باسی دەكەن گوندێكی خۆش بووە و لە بناری چیا بووە كە درێژ بۆتەوە بەسەر ئەربلدا.([3])

ئەمانە و دەستەیەك لە گوند و دێهاتی دیكەی كوردستان كە بڵاوبوونەتەوە بە ناوچەكەدا كە یاقوت و وڵاتناسەكانی دیكە باسیان كردووە، ئەوەی گومانیشی تێدانییە سەدان گوندی دیكەی كوردستان هەبووە كە وڵاتناسەكان ئاماژەیان بۆ نەكردوون بەهۆی جۆراوجۆرەوە.

دووەم: هۆكارەكانی بنیاتنان و لەناوچوونی مەڵبەندە ئاوەدانی كوردستان:

ئەوەی جێگەی مەبەست و ئاماژە بۆكردنە زاناكانی موسڵمان گرینگییەكی زۆریان بە مەسەلەی تایبەت بەشار (شارنشینی) و پلان و تیۆر و ئەوانەی باسیان كردووە داوە، كە ئەمش لایەنێكی زانیاری بابەتەكە بووە، زۆریان لەبارەی پۆلنیكردنی پیشەی شار نووسیوە، لەبارەی هەر شارێك چالاكی جۆراو جۆریان دەستنیشانكردووە وەكو كەرتی نیشتەجێبوون و كەرتی كشتوكاڵ و كەرتی پیشەسازی، هەروەها لەبارەی شێوازی دابەشكردنی رەگەزی نەتەوەكان كە تێیدا نیشتەجێ بوونە وەكو لێكۆڵینەوە نوێیەكان لەژێرناونیشانی (urban- ethnicity) گرینگیان پێداوە، ئەمە سەرەڕای كۆمەڵێك دیاردە كە لە ئێستەدا بە دوور و درێژی لێكۆڵینەوەی لەبارەوە ئەنجام دەدرێت.([4])

---

١ - وشەیەكی كوردییە لە (مەد)ــەوە هاتووە، بە واتای ئازا، ئەوەش رەنگە بۆ ئازایەتی خەڵكەكەی بگەڕێتەوە.

٢ - یاقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٢٤٣.

٣ - هەمان سەرچاوە، ج٥، ل١٥٠.

٤ بڕوانە: ولید عبدالله المنیس، التفسیر الشرعي للتمدن، نشرة البحوث الجغرافیة (جامعة الكویت:د/ت) ل٢١.

لەنێو ئەو زانایانەی گرینگیان بە شرۆڤەی یاسایی شارنشینی داوە و جەختیان لێکردووەتەوە ئیبن ئەبی رەبیع (لەدایکبوون: ٢٧٢ك/٨٨٥ز) و ئەلماوەردی (لەداکیبوون:٤٥٠ك/١٠٥٨ز) و ئبن خەلدوون (لەداکیبوون: ٨٠٨ك/١٤٠٥ز) بوونە، بەڵام ئێرە جێگەی ئەوە نییە کە تیۆر و بیرۆکەکەکان کە ئەو زانایانە لەبارەی شارنشینی و پلانی شارییەوە پێشکێشیان کردوون نمایش بکەین، بەڵام واچاکترە پێش ئەوەی بچینە نێو باسی هۆکارەکانی بنیاتنانی شارنشینیەوە، وەکو پێشەنگی ئەو سێیانە ئەویش ئیبن ئەبی رەبیع باسی کردووە کە پێویستە تێبینی ئەو هەشت مەرجە بکرێت لەوانە:

- ئاوی خواردنەوەی تێدا بێت، هەتا بە ئاسانی خەڵکان بتوانن بەبێ ئازار بەدەستی بهێنن.
- بتوانرێ رێگە و شەقامەکانی رێکبخرێ هەتا گونجاو بێت و بەرتەسک نەبێت.
- مزگەوت لە ناوەڕاستی دروستکرابێ بۆ ئەوەی لە هەموو خەڵکیەوە نێزیک بێت.
- بازاڕەکانی توانای ئەوەیان هەبێت کە دانیشتووانەکەی لە نێزیکەوە پێداویستی خۆیانی لێ دابین بکەن.
- خێڵەکان لەیەکتر جیابن کە تێیدا نیشتەجێ دەبن، بەڵام بە مەرجێك دژ بەیەك ولەیەکتر جیاواز نەبن.
- یەکێك لە نیشتەجێ بووەکان توانای ئەوەی تێدابێت کە بوار بەکەسانی دیکە بدات لە تەنیشتیەوە نیشتەجێ بن.
- شوورەیەك بەدەوریا هەبێت لە ترسی دوژمنەکانی، چونکە وەکو یەك ماڵ حسابی بۆکراوە.
- کەسانی پیشەکار بەپێی پێداویستی دانیشتووانەکەی تێدا بێت.([1])

هەر بۆ زانین لە لاپەڕەکانی داهاتوو دەبینین سەرجەم ئەو مەرجانە لە شارە کوردیە دێرینەکان و شارە نوێیەسەرێ کانیدەمی ئیسلامی هەبوونە.

أ- رۆڵی سەرچاوە ئاوییەکان لە ئاوەدانکردنەوە و پلانی ئاوەدانیدا:

---

١ - سلوك المالك في تدبير الممالك، تحقيق: ناجي التكريتي (بيروت:١٩٨١) ل١٩٢.

ولاَتناسە موسڵمانەکان پەنجەیان بۆ راستییەکی بنچینەیی راکێشاوە لەسەرهەڵدانی ئاوەدانی و دامەرزاندنی کۆمەڵگەی نیشتەجێ بوون و فرەوانبوون، کە خۆی لە گرینگی رووبار و جۆگە و سەرچاوە ئاوییەکانی دیکەدا بینیوەتەوە وەکو کانیاو و بیر کە لە ناوچە شاخاویەکاندا زۆربوونە، کە ئەوە هۆکارێکی سەرەکی بووە لە بنیاتنانی کۆمەڵگەی نیشتەجێ بوون و پلانی ئاوەدانی تێدا، لە دواتردا ولاَتی کوردستان لە پێشەوەی سەرجەم ولاَتانی دیکەوە بووە کە لانکەی مرۆڤایەتی بووە لە مێژوودا، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئاو رۆڵێکی گرینگی هەبووە لە کۆمەڵگەی نیشتەجێبووندا، لە پێشەوەی ئەو ولاَتناسانەی ئاماژەیان بۆ ئەو پرسە کردووە، ئەستەخری و ئیبن حوقەل و مەقدەسی بوونە.

کورد لە یەك کاتدا پشتی بە رووبار و بیریش بەستووە، ولاَتناسەکان لە کاتی باسکردن لەبارەی شارە کوردیەکاندا باسی دانیشتووانی شاری هەمەدانیان کردووە کە: (ئاو و بێستان و کشتوکاڵێکی زۆر و بە پیتیان هەبووە).([1]) هەروەها کانیاوەکانیان ئاوەکەی زۆر سارد بووە و([2]) دەینووریش ئاوی هەبووە.([3]) نەهاوەندیش رووبار،([4])لە سەمێرەو سیروان ئاو لەنێو مالاَن و گەڕەکەکاندا هەڵقولاَوە.([5])

بەلاَم لە هەرێمی جەزیرە لەبەرئەوەی ئەو ناوچەیە زۆری چیا بووە لە زستاناندا بارانی زۆربووە، بۆیە بە ئاوی ژێر زەوی دەوڵەمەند بووە، کانیاوی زۆر بووە، لە شاری رەس نێزیکەی سێ سەد کانی هەبووە کە ئاوەکەی زۆر پاك و بێگەرد بووە، کە ئەوە لە هیچ ولاَتێکی موسڵماناندا بوونی نەبووە.([6]) ئیبن حوقەل کە باسی جەزیرەی ئیبن عومەر دەکات بەوەی کە (خاوەن داراستان و ئاوێکی زۆر بووە).([7]) کە باسی شاری نەسیبینیش دەکات کە (دەرچەیەکی ئاوی هەبووە لە چیادا ناسراو بووە بە بالوسا، کە ئەوە

---

١ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٧. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٠٨.

٢ - المقدسي، المصادر نفسه، ل٣٠.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٧.

٤ - هەمان سەرچاوە، ل١١٨. ابن حوقل، المصادر نفسه، ل٣١٣. المقدسي، المصادر نفسه، ل٣٠.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسه، ل١١٤.

٦ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٧ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٣. صورة الارض، ل٢٠٢.

ناوچەیەك بووە زۆرترین رەز و باخ و بێستان و کشتوکاڵی تێدا بووە، هەروەها ناوچەیەك بووە خەڵکێکی زۆری تێدا نیشتەجێ بووە.([1])

بەڵام شارە نێزیکەکان لە رووبارەکان، ئەوا لە زۆر سەرچاوەی وڵاتناسی ئاماژەی بۆ کراوە، وەکو شاری میافارقین کە رووباری زۆر بووە.([2]) هەروەها شاری بازاڕی یەکشەممە لە دەوروبەری شاری مووسڵ کە بەتەنیشت چیا و رووبارێکی لە نێزیك بووە.([3]) شاری شەنگاڵیش خاون رووبار و کانیاویشی زۆر بووە.([4])

لەبەر زۆری کانیا و لە شاری ئامەد، ئەوا ئاشیان تێدا دامەزراندووە.([5]) هەروەها شاری مەعلەسیا لەسەر رووبار بووە.([6]) هەروەها شاری حەسەنیەش.([7]) شاری بەدلیس لە ئەرمینیا دەکەوتە نێو کەندێکی قووڵەوە کە دوو رووباری تێدا هەڵدەقولاّ.([8]) لە دبیلیش رووبارێکی بە خوڕ هەبوو، لە خەلاتیش رووبارێك هەبووە، هەروەها لە بارمیەش.([9])

وڵاتناسەکان باسی ئەوەیان کردووە و سەرنجی چۆنییەتی گەیاندنی ئاویان داوە بە تایبەتی ئاوی خواردنەوە بۆ گەڕەك و شوێنەکانی نیشتەجێبوون، لە رێگەی هەڵبەستنی جۆگە کە بەکاریان هێناوە وەکو لە شاری دارا کە چەندین جۆگەی هەبوو (دەگەیشتە شارەکە و لەسەر زەوی هەڵبەسترا بوو، دەچووە نێو مزگەوت و دواتر شۆڕ دەبۆوە نێو کەندێکەوە).([10]) هەر وەکو لەبەرگرەوەی پەڕتووکی ئیبن حوقەل باس دەکات کە شاری ماردین ئاوی دەگەیاندە دانیشتووانەکەی لە رێگەی کانیاوێکەوە کە بە جۆگە

---

١ - صورة الارض، ل١٩١.

٢ - ابن حوقل، المصادر نفسه، ل٢٠٢.

٣ - هەمان سەرچاوە، ل١٩٦.

٤ - هەمان سەرچاوە، ل١٩٩. المقدسی، المصادر نفسه، ل١٢٤.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسه، ل٢٠١.

٦ -المقدسی، المصادر نفسه، ل١٢٣.

٧ -هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٨ - هەمان سەرچاوە، ل٢٨٩.

٩ -هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

١٠- المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٤.

دەگەیەنرایە شارەکە، هەروەها کەند و گۆمیان بەکارهێناوە بۆ کۆکردنەوەی ئاوی باران، دوای ئەوەی ئەو ئاوە بەشی نەکردوون لەبەر زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان و فرەوانبوونی شارەکە.([1])

هەروەها ئاو هەڵقوڵاوە لە ماڵەکانی میافارقین و بازاڕەکەیەوە. ([2]) لە سەمێرە و سیروان ئاو لە گەڕەك و ماڵەکاندا هەڵقوڵاوە.([3]) لە بەعشیقا رووبارێك هەبوو بە ناوەڕاستی شارەکەدا دەڕۆیشت.([4])

زۆر بە کەمی وڵاتناسەکان ئاماژەیان بە پێگەی شارێك کردووە لە رووی سەرچاوەی ئاوەوە، لەوانەی کە ئاماژەیان بۆ نەکردووە، ئەستەخری بووە کە ئاماژەی بە سەرچاوەی ئاوی شاری نەسیبین نەکردووە کە لە ناخی چیا دەرچووە و پێیان گوتووە بالوسا.([5]) لە شاری مووسڵ (تەنیا ئاوی دیجلەیان هەبووە بۆ  خواردنەوە).([6]) شاری داراش لەسەر ئاوێکی هەڵقوڵاو کاروباریان جێ بەجێ دەکرد.([7]) هەروەها شاری رەئس ئەلعەین زیاتر لە سێ سەد کانیاوی هەبووە، زیاتر لە بیرێکی هەبووە کە پەنجەرەی دار و ئاسنی لەسەر بووە،([8]) هەروەها شاری جەزیرەی ئیبن عومەر (درەخت و ئاوی هەبووە)،([9]) ئەمە سەرەڕای ئەوەی شارەکانی رۆژئاوای هەرێمی چیاکان، شاری سیروان کانیاوی ئاوی هەڵوقلاوی هەبووە، کە لە نێوەڕاستی شارەکە هەڵدەقوڵا هەتا دەگەیشتە رووبارە گەورەکان، کە لەو ئاوە کشتوکاڵ و گوندەکان و دار و درەخت و بێستانەکان بە درێژایی رۆژ ئاویان لەبەر دەخواردەوە، هەروەها یەکێك لە سروشتی ئەو کانیاوانە لە زستاندا

---

١ - ابن حوقل، المصادر نفسه، ل٢٠٢.

٢ - صورة الارض، ل٢٠٢.

٣ - هەمان سەرچاوە، ل١١٨.

٤ - یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٢٥٩.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٢.

٦ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە، الشفه: ئاوی خواردنەوە.

٧ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٨ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٠.

٩ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٣.

گەرم و لە هاویناندا سارد بوون.([1]) شاری سمیرەش کانیاو و رووباری تیدابوو کە گوندەکان بۆ خواردنەوەو کشتوکالّی پشتیان پیّ دەبەستا.([2])

وەکو باس دەکەن شاری هەمەدان کانیاو و کەند و رووباری هەبووە.([3]) کە لە زستان و هاویناندا هەلّقولاّوە، کە خەلّکەکەی لەو ئاوانە خواردوویانەتەوە.([4]) لە شاری قرمیسین ئاویك هەبووە لە بەری رۆیشتووە.([5]) هەروەها لە شاری دەینوور و([6]) نەهاوەندیش رووباری هەبووە.([7])

لەوەی پیشەوە بۆمان دەردەکەویت کە سەرچاوە ئاوییەکان رۆلیکی گرینگیان بینیوە لە ولاّتی کوردستان کە یارمەتی ئەوەی داون ببیتە هۆی دروستبوونی یەکەی ئاوەدانی، هەر ئەوەش بووە کە ولاّتناسە موسلّمانەکان جەختیان لیکردووەتەوە.

أ- رۆلّی فاکتەری بازرگانی:

بازرگانیش وەك فاکتەریك رۆلیکی گرینگ و کاریگەری هەبووە لە بنیاتنانی کۆمەلّگەی دانیشتواندا، ئەو شوینانەی کەوتوونەتە سەر ریگەی بازرگانی زۆر بەخیرایی بوونەتە ناوچەی شارنشینی.([8]) کە هەندیّ لەو شارانە گەشەیان کردووە و بوونەتە شاری بازرگانی لە ئەنجامی ئەوەی کەوتوونەتە سەر ریگەی گواستنەوەی کاروانچییەکان.

---

١ - اليعقوبي، المصادر نفسة، ل٣٩.

٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرە.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٧. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٠٦. اليعقوبي، المصادر نفسة، ل٤١.

٤ - اليعقوبي، المصادر نفسة، ل٤١.

٥ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرە.

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٧. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٠٧.

٧ - هەمان سەرچاوە ل١١٨-٢٠٢.

٨ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢.

ئەگەر شاری حەلوان کەوتبێتە سەر ڕێگەی (خوراسانی گەورە)ی بازرگانی، ئەوا گرینگییەکی گەورەی بەدەستهێناوە، لە کاتێکدا هەمەدان لە دیارترین شاری بازرگانی بووە لە هەرێمی چیاکاندا.

لە راستیشدا ئەو هەرێمە بە تایبەتی لای ڕۆژهەڵاتی بەیەکەوە بەستنەوەی نێوەندی خەلافەی عەباسی و هەرێمی ڕۆژهەڵاتی بووە، کە قافڵەی بازرگانەکان لە بەغداوە هاتوون بۆ خوراسان و بە پێچەوانەوە، هەر ئەو ڕێگەیەش گەیشتووە بە (خوراسانی گەورە).([1])

لێرەدا مانەوە و ڕۆژاگری هەندێ لە شارەکانی هەرێمەکان رەنگە پێوەستن بێت بە پێگەی جوگرافییەوە کە کەوتوونەتە سەر ڕێگەی بازرگانییەوە.

شاری دەنەیسر باشترین نموونەیە لە بەدیارخستنی رۆڵی بازرگانی لە پێشکەوتن و گەشەکردنی بەشاربووندا، کە ئەو شارە یەکێك بووە لە شارەکانی هەرێمی جەزیرەی فوراتی، کە وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی باسییان نەکردووە، بگرە باسی دووروودرێژی ئەو شارە بۆ لەبەرگرەوەی پەڕتووکی ئیبن حوقەل لە ساڵی (٥٣٤ك/١١٣٩ز) گەیشتووەتە ئێمە، کە ئاماژە بەو شارە دەکات لە دووتۆی باسکردنی شاری قەڵای ماردینەوە، لە خوارەوەی بیابانێك هەبووە بەلای قیبلەیەوە کە چوار فرسەخ یان کەمتر لێەوە دوور بووە، ناوچەیەك بووە ناسراوە بە بازاڕی دەنەیسەر، پێش ئەوە گوند بووە، کە خەڵك هەموو رۆژێ لەو بیابانەدا کۆبوونەتەوە بۆ کرین و فرۆشتن، کە ئەمە وای کردووە کەسانی دیکە لە ناوچە جیاجیاکان کێش بکات و، خەڵکان لە هەموو شوێنەکەوە بۆی هاتوون لەوێدا نیشتەجێ بوونە و،([2]) ئەمەش بۆتە هۆی بەرزبوونەوە و بۆتە جێگەی دڵنیایی.([3])

لەو دەقەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەوە گوندێکی بچووك بووە، بەڵام بەرەبەرە بۆتە بازاڕێکی هەفتەیی لە رۆژی یەکشەممەی هەموو هەفتەیەك، دواتر گەشەی کردووە و بۆتە شارێکی ئاوەدان کە لە دواتردا بۆتە گەورەترین شاری ئیسلامی، بۆ دڵنیابوون لەو

---

١ - بڕوانە: قحطان عبد الستار الحديثي، طريق خراسان، مجلة كلية الاداب (جامعة البلرة:١٩٩١) العدد الثاني والعشرون، ل٩.

٢ - اللابيء، رسوم دار الخلافة، ل٢١.

٣ - صورة الارض، ل٢٠٢.

قەڵەمبازانەی خێرای شارنشینی کە ئەو ناوچەیە بەخۆیەوەی بینیوە، هۆکارەکەی پێوەندیی بە رێگەی گواستنەوەی دەشتایی رێگەی بازرگانیەوە بووە کە پێیدا تێپەڕبووە، دەتوانین ئەوەش لە باسێکی یاقوت هەڵبهێنجین کە باسی شارۆکەیەك دەکات کە دەڵێ: (شارۆکەیەکی گەورە و بەناوبانگ بووە لە ناحیەکانی جەزیرە لە نێزیك ماردین کە نێوانیان فرسەخێك بووە، کە ناوێکی دیکەی هەبووە کە پێیان گوتووە (قۆچ حەسار) من لە گەنجیەتیدا ئەو شارەم بینیوە، سەرەتا گوندێك بووە، دوای سی ساڵ بینیومەتەوە ببووە شارێك کە گەورەییەکەی لە رادەبەدەر بوو، خەڵکێکی زۆری لێ نیشتەجێ ببوو، بازاڕەکانی گەورەببوو، هیچ رووبارێکی تێدا نەبوو، بگرە بۆ ئاوی خواردنەوە پشتیان بە ئاوی بیری قووڵ دەبەست، کە ئاوەکەی شیرین و خاکەکەی گەرم و هەواکەی تەندروست بوو.([1])

ئەوەی بەراوردێك بکات لە نێوان پەسنەکانی لەبەرگرەوەی پەڕتووکی شێوەی زەوی و پەسنەکانی یاقوت ئەلحەمەوی، هەستدەکات جۆرە پێکچوونێکی روون و ئاشکرا لە چەندین رووەوە هەیە، لە پێشەکیدا بابەتەکان دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەك کە زۆر لەیەکترییەوە نێزیکە، سەردانەکانی هەر یەك لەمانە بۆ شوێنەکان و ناوچەکان ئەوانیش لەیەکترییەوە نێزیکە کە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی شەشەمی کۆچی، دنەیسەر لە گوندێکی بچووکەوە گەشەی کرد راستەوخۆ بۆ شارێکی گەورە، بێگومان لە رەگ و ریشەوە زۆر بەخێرایی بنەما شارستانییەکانی تێدا دامەزرا.

ب- رۆڵی فاکتەری ئاو و هەوا:

ئەوەی وای کرد گرینگی وڵاتی کوردستان هەر لەسەردەمی پێش ئیسلام لە رووی ئاوەدانی و گەشت و گوزاریی باش و لەبار بێت، بارودخی کەشوهەواکەی یارمەتیدەری بوو کە ئەمە پشکدارییەکی کارای هەبوو شانبەشانی زۆری سەرچاوەی ئاو و جوانی سروشتەکەی لە ناوچەکەدا، کە ئەمەش وای کردبوو ناوچەکەی لە باخچەیەکی سەرنج راکێش بچێت و دڵەکان بۆخۆی کێش بکات، هەر ئەمەش وای کردبوو سەرنجی

---

١ - معجم البلدان، ج٤، ل٣١٨.

ولاّتناسان و گەڕیدەکان رابکێشێت و، بە شێوەی دەقی ئەدەبی جوان کە لەناخیاندا هەڵقوڵابوو لە نووسینەکانیاندا رەنگبداتەوە.

وەکو باس دەکەن پاشای فارسەکان (ئەلئەکاسرە) لە چیاکان ناوچەیەکی گوزاری دروستکردبوو لەبەر خۆشی ئاو و هەواکەیی و خۆپارستنی لە بای ژەهراوی عێراق و ئاوە گەرمەکەیی و زۆری مێش و مەگەزەکەیەوە، لەو بارەیەوە ئەبی دەلف دەڵێت:

وانی امرؤ کسروی الفعال         اصیف الجبال واشتو العراق[1]

هەروەها دەڵێت:

الم ترني حين حال الزمان         اصيف العراق واشتو الجبالا
سموم الصيف وبرد الشتاء         حنانيك حالا ازالتك حالا
فصبرا على حدث لنائبات         فان الخطوب تذل الرجالا

سەبارەت بە بنیاتنانی شاری قرمیسین (کرمانشا) ئیبن فەقێی هەمەدانی باس دەکات کە پاشای ساسانییەکان (قوباد کوڕی فەیرۆز) تەماشای ولاّتەکەی کرد هیچ شوێنێکی نەبینیەوە لە نێوان شارەکانی وەکو مەدائن و بەڵخ کە ئاو و هەواکەی پاك و بێگەرد بێت لە شاری قرمیسین زیاتر، بۆیە ئەو شوێنەی هەڵبژارد بۆ ئەوەی تێیدا نیشتەجێ ببێت.[2]

هەروەها باسی هەردوو شاری سەمێرە و سیروان دەکات کە هەردووکیان پاك بوونە.[3] ئەمە سەرەڕای ئەوەی پێوەندیی بە شارەکانی جەزیرەوە هەیە کە شاعیران گۆرانییان پێدا هەڵگوتووە و لە بەغدایان خۆشتر بینیوە و، وەکو شوێنێکی گەشتیاری باسیان کردووە کە لەو دوو دێرە شیعرەدا باسیان کردووە:

---

١ - ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل٢١٥-٢١٦. ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٢٧.

٢ - مختلر كتاب البلدان، ل١٩٥. ياقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٥٨.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٨.

بقردى وبازيدى مصيف ومربع وعژب يحاكى السلسبيل برود
وبغداد ما بغداد اما ترابها فحمى واما بردها فشديد([1])

هەروەها باسی شاری حەدیسەیان کردووە کە کەوتۆتە سەر رووباری دیجلە لە رووی ڕۆژهەڵاتییەوە بەوەی کە زۆر پاك و جوان بووە، ئیبن حوقەل باس دەکات: لە دەوروبەری نەسیبین چەندین دیار و فرۆشی و باخچەی جوان هەبووە، کە شوێنی ئاهەنگ و خۆشی بووە، ئەو شارە یەکێك بووە لە شارەکانی جەزیرە و زۆرترین باخچە و شوێنی سەوزایی لێبووە.([2])

بەڵام شاری رەئس ئەلعەین کانیاوی زۆری هەبووە، کە ئاوەکەی زۆر پاك بووە و هەر هەموویان رژاونەتە یەك سەرچاوە و بە هەموویان رووباری (خابوور)یان پێکهێناوە، لە بەناوبانگترین لەو کانیاوانە، کانی ئالاس و سەریٚ کانی و کانی رەیاحیە و کانی هاشمی و چەندانی دیکە بوون، دەگێڕنەوە خەلیفە متەوکل (٢٢٣-٢٤٧ك/٨٤٦-٨٦١ز) هەزار درهەمی تێدا بڵاوکردووەتەوە، خەڵکی شاری مەدینەی تێدا دابەزاند، دیتیانەوە لەبەرئەوەی ئاوەکەی زۆر پاك و بێگەرد بوو، هیچ یەکێك لەو درهەمانە بزر نەبوو، واتە لەگەڵ ئەوەی ئەو کانیاوە زۆر قووڵ بووە کە نێزیکەی دە باڵ قووڵ دەبوو، بەڵام زۆر بە ئاسانی لەسەرەوە را بنی کانیاوەکە دیاربووە، لەبەرئەوەی ئاوەکەی زۆر بێگەرد بووە، یاقوت لە ئەحمەدی کوڕی تەیبی سەرخەسی دەگێڕێتەوە کە خەلیفە متەوکل لەسەر یەکێك لە کانیاوەکان کە ناویان بە زاهری بردووە، کۆشکێکی دروستکردووە، هەروەها بەلەمی بچووکی لە ئاوی کانی زاهری بەکارهێناوە هەتا ئاوی کانی هاشمی، کە خەڵکی سواری ئەو بەلەمانەبوونە بۆ گەیشتن بە بێستانەکانیان، بەڵام یاقوت دەڵێ ئەو حاڵەتە لەسەردەمی مندا بوونی نەبووە.([3])

بەڵام سەبارەت بە نەمانی رۆڵی ئەو شارانە و کزبوونی کاروبارییان و ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی ئەو لەناوچوونە، کە هەندێك لە وڵاتناسەکان پەیان پیٚ بردووە، دەیگێڕنەوە

١ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٨٦. ياقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٢٥٦.

٢ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٣.

٣ - معجم البلدان، ج٤، ل٣٨٠.

بۆ ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی لە شوێنەکە یان گۆڕانی ڕێگەی بازرگانییەکان یان هۆکاری سیاسی و چەندانی دیکە بووە.([1])

ئیبن حوقەل لەنێو سەرجەم وڵاتناسەکان پێگەی یەکەمی گرتووە لە دەستنیشانکردنی ئەو حاڵەتانە، کە تێیدا باسی کاریگەربوونی چەند شارێکی جەزیرە و لاوازبوونی کاریان دەکات بەهۆی چەند هۆکارێکی دوژمنکارانەوە کە حەمدانییەکان کردوویانەتە سەریان،([2]) بە هاوکاری ڕۆمەکان و ئەوش بۆتە هۆی پەرێشان بوونی خەڵکەکەیی و وێرانبوونی وڵاتەکەیان، یەکێك لەو شارانە نەسیبین و کفرتۆتا و دارا و ڕەئس ئەلعەین و جەزیرەی ئیبن عومەر و، هەروەها میافارقین و ئەرزن کە هیچ شتێکی بەسەر نەماوەتەوە (ئەوەی هەیبووە بردوویانە و درەختەکان و کشتوکاڵیان بڕیوەتەوە هەتا بۆتە بیابانێکی چۆڵ و هۆڵ و هیچ شتێکی تێدا نەماوەتەوە).([3])

هەروها شەڕی سەجال لە نێوان موسڵمانەکان و ڕۆمەکان هەڵهاتنی هەندێك لە دەسەڵاتدارانی موسڵمان لەو ناوچانە، بووە هۆی لەناوچوون و نەمانی ڕۆڵی هەندێك لەو شارانەی وەکو جەزیرە و ئامەد و شار و شارۆکەکانی لە کۆشك و کێڵگەکانی (هەر هەموویان لەناوچوون بەهۆی لاوازبوونیان و زاڵبوونی دوژمنەکان بەسەریاندا و کەمی دادڕەس و زۆری پیلانەکان، شتێك نەمایەوە بۆ موسڵمانەکان وەکو بەربەست، لایەکی شوورەکەیشی نەبووە هۆی قەدەخەکردن، هەرچەند شوورەکە سوودی هەبووایە، ئەوا پیاوەکان و چەکەکانیان دەگۆڕان بە چەکدارێکی دیکە).([4])

لەبەرگرەوەی پەڕتووکی شێوەی زەوی وا باس دەکات کە لە ساڵی (٥٣٤ك/١١٣٩ز) چۆتە شاری ئامەد هیچ شتێکی تێدا نەبووە تەنیا چەند پاشماوەیەکی ژیان نەبێت، دیارە زوڵم و ستەمی دەسەڵاتدارەکانی دەرهەق بە دانیشتووانەکەی ببووە هۆی (پەرش و بڵاوی هاونیشتمانیەکانی و، دوورکەوتنەوە لە خزم و خێش و براکانیان، خانووەکانیان

---

١ - سەبارەت بە نەمان و وێرانبوونی شارەکان بڕوانە: احمد علي اسماعيل، دراسات في الجغرافية المدن (القاهرة:١٩٨٥) ل٣٥. بکە.

٢ - بڕوانە: فيلل السامر، الدولة الحمدانية في المولل وحلب، (بغداد:١٩٧٠).

٣ - صورة الارض، ل١٩٢.

٤ - ابن حوقل، المصادر نفسة.ل٢٣.

هەمووی کاول ببوو، شوێنەواری نەمابوو، بازاڕەکەیشی شتێکی ئاوەدانی لێنەمابۆوە.([1])

بەڵام دوای دەست بەسەرداگرتنی شارەکە لە لایەن پاشای دادپەروەر ئەبی عەبدوڵا محەمەد کوڕی قەرە ئەرسەلان ئەرتەقی (٥٧٠-٥٨١ك/١١٧٤-١١٨٥ز) لەساڵی (٥٧٩ك/١١٨٣ز)([2]) بارودۆخەکە گۆڕا، دووبارە ژیان بۆ ئەو ناوچەیە گەڕایەوە و ئاوەدانکردنەوە دەستی پێکردەوە.([3])

لەوەی پێشەوە دەردەکەوێت کە فاکتەری سیاسی کاریگەری بەسەر ئاوەدانی و سەقامگیری هەبووە، ئەو بەراوردکردنەی حاڵەتی شاری ئامەد لە دوو سەردەمی جیاوازدا واتای ئەوەیە کە نووسەر بە شێوەیەکی قووڵ درکی بە کاریگەری هۆکارەکان کردووە لە رووی نەرێنی و ئەرێنییەوە بەسەر ناوچە ئاوەدانەکاندا.

لەبەرئەوەی جەزیرە نێوەندی کۆبوونەوە و نیشتەجێبوونی خەوارجەکان بووە، بۆیە ئەوان لەو شوێنانەدا نیشتەجێ بوونە، کە قایم و قووڵ و قەڵابووە، لەو شوێنانەش رووبەڕووی بەرژەوەندییەکانی دەسەڵات بوونەتەوە، چونکە رێگەی کاروانچییە بازرگانەکانیان گرتووە و، ئەوەش کاریگەری نەرێنانەی بەسەر شاری جەزیرەوە بووە لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، بۆ نموونە جەزیرەی ئیبن عومەر کە (لەسەر لێواری شەڕ بووە لە نێوان ترس و تکا، بازرگانییەکی هەمیشەیی تێدا بووە، ئەگەر دەسەڵاتدارەکان لێی گەڕابن، قازانجی زۆری تێدا بووە، ئەگەر دەسەڵاتی ئەهریمەنەکان و خەواریجەکان رایان نەکێشابێت بۆ نێو پێکدانەکان).([4])

هەروەها شلەژاوی بارودۆخی نێوخۆیی هەندێ لە شارەکان و ناکۆکی و ململانێ و پێکدانەکانی نێوان رۆڵەکانی شارەکە یەکێك بووە لەو هۆکارانەی بۆتە هۆی بێ هێزی و وێران بوونی شارەکە، وەکو بارودۆخی شاری سن کە دەکەوتە رۆژئاوای رووباری دیجلە لە سنووری چیای بارما (حەمرین) کە (شوورەیەکی لەسەر بوو، زۆربەی رووخابوو لەنێو

---

١ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٢ - - دیارە ئەوە بە رەزامەندی سولتان سەلاحەدین ئەیوبی بووە دوای ئەرتەقیەکان دانیان بە دەسەڵاتی سەلاحەدین ناوە. ستانلی لین بول، الدول الاسلامية، ترجمة محمد احمد دهمان (دمشق.د/ت) ق١، ل٣٥١.

٣ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢.

٤ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

خەڵکەکەیشی شەڕ و شۆڕ پەیدابووە و بۆتە هۆی نانەوەی رق و کینە، ئەویش زۆر دوور نەبووە لە وێرانکاری).([1])

هەر وەکو ئەوەی روویداوە لە نێوان دوو رووبارەکە (کە ناوچەکە دیارەیەکی تێدابووە، خەڵکەکەیشی هەتا سەردەمێکی زوو لە بەرژەوەندییان بووە، بەڵام کاتێ ئەو شتە لەسەریان زۆر کەوتووە، بۆتە هۆی نانەوەی دووبەرەکی و فتنە، بۆیە ناوچەکەیان وەکو شوێنێکی وشك و بێ ئاوی لێهاتووە و ئاوەدانی تێدا نەماوە). بەڵام کاتێ زستانی بەسەر چووە کوردە هەزەبانییەکان هاتوونە و لە وەرزی هاوین ئاوەدانیان کردووەتەوە).([2])

ئەگەر گۆڕانی بارودۆخ لە شارێکدا روویدابێت و بووبێتە هۆی نەمانی رۆڵەکەی، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ دەستبەسەرداگرتنی لە لایەن هەندێ لە رەگەزەکانی کۆچەییەکان (بەدو)، وەکو لە دەقێکی ئیبن حوقەل بەدیاردەکەوێت کە باسی دەکات، هەندێ لە کوردە کۆچەرییەکان (بەدو) کاتێ دەستیان گرت بەسەر شاری (ئیبهەر) کە یەکێك بووە لە شارەکانی رەیی و ناحیەکانی دەیلەم، ئەمە بە شێوەیەکی نەرێنی بەسەر شارەکەدا شکایەوە، (کە هەرگیز گەورەیی بۆ نەگەڕایەوە) وەکو هەیە، هەمان شت جێبەجێ دەبێت بەسەر شاری جوندیسابور کە شارۆکەیەکی ئاوەدان و گەورە بووە، بەڵام دوای ئەوەی کوردەکان لە سەدەی چوارەمی کۆچی دەستیان بەسەردا گرتووە بارودۆخەکەی گۆڕاوە.([3])

### سێیەم: نیشانەی ئاوەدانی شارە کوردییەکان:

وڵاتناسە موسڵمانەکان جەختیان لە خەسڵەتەکانی شارەکان کردووتەوە و نیشەکانیان بەدیارخستووە، کە ناکرێت بەبێ ئەمانە وەکو شار هەژمار بکرێن، لە گرینگترین ئەو نیشانانە لە زۆربەیاندا ئاوەدانییە.

---

١ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٣.

٢ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٣١٣.

٣ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

وەکو تێبینی دەکرێت ئەو وڵاتناسانە زۆربەی شارە کوردیەکان کە ئەوانەی کەوتوونەتە هەرێمە جیاجیاکان، خاوەن قەڵاو قولە بوونە، زۆربەیان شوورە و قەڵایان هەبووە بە تایبەتی هەندێکیان پێداویستی بەرگرییان هەبووە بۆ ئەو بارودۆخە باوەی کە شارەکان تێیدا ژیاون لە رووی شەڕ و ململانێ کە پێویستی کردووە هەندێ شت دروست بکرێت بۆ دابینکردنی گیانی بەرگری لەو خەڵکانەی لەو ناوچانانەدا ژیاون.

أ- قەڵا و قولە و شوورەکان:

قولە برێتییە لە بینایەکی بتەو لە شوێنێکی ستراتیژی بنیات دەنرێت لەسەر رێگەی دوژمن، رەنگە قولەیەك گەشەبکات بۆ شارێك، بیناکردنی قولە رەنگە لە ناوەڕاستی شاردا بنیات بنرێت، لەو کاتە ئەو شارە دەبێتە شارێکی پاشایی، ئەو کاتە بۆ ئەوە بینا دەکرێت تاکو پاشا و دارودەستەکەی لەو شوێنەدا نیشتەجێ بن، رەنگە قولە تەنیا شوێنێکی جەنگی بێت و کۆگەیەك بێت بۆ چەك و تەقەمەنی.([1])

بەڵام قەڵا لە زۆربەی جارەکاندا پێگەیەکی گرینگی دەبێت لە شارەکەدا، بۆیە بنیات دەنرێت تاکو پاشا یان دەسەڵاتداری شارەکە لە کاتی توندوتیژییەکان پەنای بۆ ببات.([2])

زۆرکەس جیاوازی لە نێوان سەربازگە و قولە و قەڵا دەکەن، سەربازگە تەنیا دیوارێکی قایمە لە کاتی جەنگ و هێرشدا خەڵکی ناوچەکە پەنای بۆ دەبەن. لە کاتێکدا قولە شوێنێکی قایمە گونجاوە رەنگە لە شێوەی شارێك بێت و چەند قولەیەکی دیکە سەر بەو بن، بەڵام ئەگەر قولەکە فرەوانبوو ئەو کاتە دەبێتە (قەلایەکی کۆن)، واتە قولەیەکی گەورە و شارێکی گەورە لە هەمان کاتدا.([3])

لەبەرئەوەی زۆربەی دانیشتووانی کورد کەوتوونەتە ناوچەی شاخاویەوە، بۆیە بڵاوبوونەوەی قەڵاو قولە بە شێوەیەکی زۆر بەرچاو دەکەوێت، بێگومان ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی دێرین، ئەوەی شایەنی ئاماژە بۆکردنە خاوەنی پەڕتووکی فەهرەست، باسی ناونیشانی پەڕتووکی مەدائنی دەکات کە هەڵگری ناونیشانی (قەڵاو

---

١ - شاكر ملطفى، المدن في الاسلام، (الكويت: ١٩٨٨) ج١، ل٤٥.

٢ - شاكر ملطفى، المصادر نفسة، ل٢٠٣.

٣ - جمال حمدان، المصادر نفسة، ل٤١.

کوردەکان)ی هەڵگرتووە.([1]) ئەوەش جەختکرنەوەیە لە پێوەندیی توندوتۆڵی نێوان ئەو دووانە لە لایەك و، زۆری ژمارەی قەڵاکان کە کوردەکان بینایان کردووە بۆ ئەوەی ببێتە بەربەست لەبەردەم مەترسییەکان لە لایەکی دیکەوە.

ئەوەی روون و ئاشکرایە ئەو بارودۆخە سیاسییەی باو بووە ئەو ململانێیەی لە نێوان سەرجەم هێزەکاندا هەبووە بە تایبەتی گەورەکان، واتە لە نێوان دەوڵەتی ساسانی و دەوڵەتی بێزەنتی و، دواتر لە گەڵ دەوڵەتی ئیسلامی، ئەمەش چەندان شەڕی لێکەوتەوە، ناوچەکانی دانیشتووانی کورد بوو بوو بە شانۆی رووبەڕووبوونەوەی جەنگ، لێرەوە هەر نارەزاییەك و هەر هەوڵێك بدرایە لە لایەن میرە کوردەکانەوە کارێکی پێویست بوو، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەو ناکۆکییە ناوخۆییانەی نێوان هێزە هەرێمییەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامیدا بە تایبەتی لەسەردەمی عەباسییەکاندا پێویستی بە دروستکردنی قەڵای قایم هەبووە بۆ پارێزگاریکردن لەسەربەخۆیی خۆیان کە لە دێر زەمانەوە کورد هەوڵی بۆ داوە.

دەسەڵاتدار و میرەکانی ناوچەکە هەمیشە شارەکانیان بە شوورەی بڵند و دەرگەی قایم و باش بنیات دەنا، بە تەنیشت ئەو شوورانەشەوە سەنگەری قووڵیان هەڵدەکەند، هەموو ئەمانەش بە مەبەستی بەربەست دروستکردن بوو لەبەردەم دوژمن تاکو نەگاتە نێو شارەکانیان.

هەمیشە بنیاتنانی قەڵاکان لە شوێنی قایم و زۆر بەرز بنیات دەنا، بە شێوەیەك کە زۆر بە زەحمەت دوژمن دەیتوانی بیگاتێ، هەڵبژاردنی شوێنەکەی گرینگی تایبەتی خۆی هەبوو سەبارەت بە بەرگری کردن لە شارەکە، گرینگیش ئەوەبوو شوێنکەی گونجاو بێت بۆ بەرگری و پاراستنی شارەکە، هەرچەند شوێنەکەیشی دوور بوایە، وەکو قەڵای چیای ماردین بۆ نموونە، لە شوێنێك بوو زۆر بە زەحمەت دەتوانرا دوژمن بیگاتێ، وەکو ئەستەخری باسی دەکات بەرزی چیاکە لە رووی زەوی بۆ لووتکەکەی نێزیکەی دوو فرسەخ (١٢کم) دەبوو، ئەوەش زیادەڕۆیی تێدایە.

قایمی قەڵا گرینگی زۆری هەبوو، هەندێ جار واڵی ئەو شوێنەی وەکو بارەگایەك هەڵدەبژارد، وەکو قەڵای جەرزەقیل لە زۆزان.([2])

---

١ - ابن الندیم، ل١٠٣، لە بەدبەختی ئەو پەڕتووکە ون بووە.

٢ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٤٨٨.

وەکو باس دەکەن قولەی بەرگری یەکێك بووە لە نیشانە سەرەکییەکانی شاری ئیسلامی، بگرە زۆربەی ئەو شارانە بنیاتنران وەکو سەربازگە و قەلا لەسەردەمی دەستبەسەرداگرتنی ئیسلامی.([1])

رەنگە هەندێکیان لەو سەردەمانەی پێش ئیسلامدا بنیاتنرابن، وەکو ولاتناسەکان بە دێرین باسی دەکەن و ئاماژە بە بنیاتنانەکەی دەکەن.([2])

مەقدەسی لە پێشەوەی ولاتناسەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی/ دەیەمی میلادی ناوی دێت، کە زۆر گرینگی بە شار و شارۆکەکانی کورد داوە، لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ ئەو کەرەستانەی تێیدا بەکاریان هێناوە لە باسکردنی شارەکانی چیاکان کە سەر بە هەرێمی جەزیرە بوونە بەوەی کە قەلای زۆر قایمی تێدابووە.([3]) لەبارەی قولەی کیفا دەڵێت (قەلایەکی قایمی تێدا بووە)([4]) لە نێزیك ئەو قەلایە، قولەی تالیب هەبووە کە کوردی جوبی تێدا نیشتەجێ بوونە، کە قەرە ئەرسەلان کوڕی داود کوری نوعمان خاوەنی قولەی کیفای بەسەردا زاڵ بووە لە دوای ساڵی (٥٦٠ك/١١٦٤ز)([5]) ئامەدەیش (شارێکی قایم بووە)([6]) کە لە (بەردی کەڵەگا)([7]) دروستکراوە، کە حەسەن دەبیل بە (خۆش و قایم) باسی دەکات.([8])

سەبارەت بە شاری ئورمیە ئاماژە بۆ قەلا ئاوەدانەکەی دەکەن کە قولەی هەبووە.([9]) بەلام قەلای سەرمارکی کە کەوتۆتە نێوان تفلیس و شاری خەلاتەوە وەکە یاقوت باسی

---

١ - احمد على اسماعيل، المصادر نفسه، ل٦٧.

٢ - بڕوانە: ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٣٩-ج٥، ل٣٦. بکە.

٣ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٤ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١٥٣.

٥ - ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١٥٣.

٦ -المقدسى، المصادر نفسة، ل١٢٤.

٧ - هەمان سەرچاوە، ل٢٨٩.

٨ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٩ - ەەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.القزويني، اثار البلاد، ل٢٩٣-٢٩٤.

دەكات بەوەی كە زۆر بەناوبانگ بووە،[1] قەڵای ئانی كە قەڵایەكی قایم بووە كەوتۆتە شارێكەوە لە نێوان خەڵات و كنجەوە.[2]

یاقوت یەكەمین كەسانێك بووە گرینگییەكی زۆری بە بابەتی قەڵا و قولەكان داوە، زۆر لەو قەڵا و قولانە پەسن دەكات، دواتر زانیاری لەبارەی چەندە قایم بووە و چ رۆڵێكی بینیوە لە مێژوودا، هەروەها باسی چۆنییەتی بڵاوبوونەوەی ئەو قەڵایانە دەكات، كە خاكی جەزیرە و دەوروبەری مووسڵ بڵاوبوونەتەوە، هەر بۆ نموونە باسی مەرجی مووسڵ دەكات كە ناسراوە بە مەرجی عوبیدەن لە لای ڕۆژهەڵاتیەوە (ناوچەیەك هەبووە لە نێوان چیاكان و لە دۆڵێكی قووڵدا كە وەكو گەوەرێك وابووە، مروج و گوندی تێدا بووە، ویلایەتێكی خۆش و فرەوان بووە بەسەر چیاكانیشەوە قەڵا هەبووە.[3]

لە ئیبن ئەسیر دەگێڕنەوە كە ناوچەی زۆزان لە جەزیرە قەڵای زۆری هەبووە و زۆریش قایم بوونە (هەر هەمووشیان هی كوردستانی بەشنەوی و بەخیتە بوونە).[4] لەو قەڵا و قولانە كە یاقوت باسیان دەكات:

- قەڵای خوشب: یاقوت لەوە زیاتر باسی ناكات كە یەكێك بووە لە قەڵاكانی زۆزان.[5]
- نیرەوە: یەكێك بووە لە قەڵاكانی ناوچەی زۆزان كە سەر بە مووسڵ بووە.[6]
- بەرخۆ: قەڵایەك بووە لە قەڵاكانی ناوچەی زۆزان سەر بە مووسڵ.[7]
- باز: بازی سوور قەڵایەك بووە لە ناوچەی زۆزان كە هی كوردستانی بەختی بووە.[8]
- باخۆخا: قەڵایەك بووە لە ناوچەی زۆزان سەر بە مووسڵ.[1]

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج٥، ل٤٢.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج١، ل٥٨.

٣ - یاقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٢٤٤.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٤٨٨. هەروەها بڕوانە: ابن الاثیر، المصادر نفسة بكە.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٣، ل٢٦١.

٦ - هەمان سەرچاوە، ج٨، ل٤٢٢.

٧ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٩٧.

٨ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥٦.

- بەشیر: قەڵایەکی کوردستانی بەشنەوەی بووە لە ناوچەی زۆزان.([2])
- ئەتیل: یەکێك بووە لە قەڵا ناسراوەکانی کوردستانی بەختی لە ناوچەی زۆزان.([3])
- ئاروخ: قەڵایەك بووە لە ناوچەی زۆزانی سەر بە مووسڵ.([4])
- ئەلقا: قەڵایەکی قایم بووە لە قەڵاکانی ناوچەی زۆزانی سەر بە مووسڵ.([5])
- فەنك: قەڵایەکی قایمی زۆر باشی کوردستانی بەشنەوی بووە لە نێزیك جەزیرەی ئیبن عومەر کە نێوانیان نێزیکەی دوو فرسەخ (١٢کم) بووە، لە دەرەوەی دەسەڵاتداریەتی شاری مووسڵ بووە.([6])
- ئاشب: لە جوانترین قەڵاکانی هەکاری بووە لە ناوچەی مووسڵ، کە عماد ئەلدین زەنکی وێرانی کرد،([7]) کە دامەزرێنەری دەوڵەتی زەنکی بوو، لە جیاتی ئەو شاری ئامێدی بنیاتنا لە نێزیك ئەو قەڵایە.([8])
- جلسۆری: ناوی قەڵایەکە لە چیاکانی هەکاری لە خاکی مووسڵ. ([9])
- ئاردەمشت: قەڵایەکی قایم بووە لە نێزیك جەزیرەی ئیبن عومەر لە ڕۆژهەڵاتی رووباری دیجلە لەسەر چیای جودی، لەسەردەمی یاقوت بارودۆخی وەکو سەرجەم قەڵاکانی ناوچەی زۆزان سەر بە شاری مووسڵ بووە کە دەسەڵاتدارەکەی بەدرەدین لوئلوئە بووە (٦١٥-٦٣٠ك/ ١٢١٨-١٢٣٣ز) ئاوەدان بووە و وەکو دیارە خەڵکی ئەردەمشت لە خەلیفەی عەباسی ئەلموعتەزد بیللا هاتوونەتە دەر و لەو قەڵایەدا خۆیان

---

١ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥٣.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٣٣٩.

٣ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٤٤٨.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٣، ل٢٦١.

٥ - یاقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٤٢٢.

٦ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٩٧.

٧ - بڕوانە: عماد الدین خلیل، عماد الدین زنکی (المولل:١٩٨٥).

٨ - یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٢٥٦.

٩ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥٣. جل سووری وشەیەکی کوردییە بە عارەبی کراوە کە لە (گول) و (سور) پێکهاتووە.

گیر کردووە، بە شێوەیەك کە تەسلیم نەبوونە تەنیا دوای ئەوەی خەلیفە خۆی هاتووە و داویانە بەسەریاندا، بۆیە خەڵکەکەی ناچارکراون کە قەڵاکە تەسلیم بکەن، بڕیاری رووخاندنی دەرکردووە پێش ئەوەی دایبخات و بۆی بگەڕێتەوە، لەو بارەیەوە یاقوت دەڵێت موعتەزید کاتێ قەڵاکەی کردووەتەوە دوای ئەوەی لەگەڵ دارودەستەکەی چۆتە ناوی، بینیویەتی داهاتی کەمە بڕیاری وێرانکردنی دەرکردووە و ئەو دێرە شیعرەی بۆ گوتووە:

انا ابا الوبر لصعب المقنتص وهو اڗا حقل ریح فی قفص.[1]

دواتر ناسر دەولەی مەروانی دووبارە ئەو قەڵایەی بیناکردووەتەوە.[2]

– ئەلکوشی: ئەوە ناوێکی نوێیە بۆ قەڵای ئەردەمشت لەسەردەمی یاقوت ئەو قەڵایەی باسمان کرد هیچ رێگەیەك نەبوو بۆ ئەو قەڵایە تەنیا رێگەی یەك پیاو هەبوو بۆی سەرکەوێت.[3] دەکەوێتە نێزیك شاری دهۆك.

– قەڵای کەرکەر: یاقوت ئەو قسەیە لە ئیبن ئەسیر وەردەگرێت و دەگێڕێتەوە کە ئەو قولەیە دەکەوێتە نێوان مەلاتیە و ئامەد، هەروەها دەڵێ لەوەی یەکەم نێزیکترە.[4]

– دێر زەعفەران: قەڵایەکە لە نێزیك قەڵای ئەردەمشت.[5]

– بازی ئەشهب(رەش): ئەو قەڵایە سەر بە حەمدانییەکان بووە، لەسەر چیای ماردین لە نێزیك شاری نەسیبین.[6] گەڕیدە ئیبن جەبیر وا باسی دەکات کە ئەو قەڵایە زۆر گەورە بووە و (یەکێك بووە لە قەڵا بەناوبانگەکانی دنیا).[1]

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٣٣٩.

٢ - ناسر دولەی حەمەدانی: دەسەلاتی لە مووسڵ بۆ ماوەیەکی درێژ شەقامگیر بووە کە لە (٣١٧-٣٥٦ك/٩٢٣-٩٦٧ز) بەردەوام بووە، تەنیا ماوەیەکی کەم نەبێت لەنێوان سالانی (٣١٧-٣٢٣ك) کە دەسەلاتەکەیان لە مووسڵ و دەوروبەری تێپەڕی کردووە لە دیاری رەبعەو دیاری مەزر، دواتر کوڕەکەی بەناوی ئەبو تەغلب غەزنەفر لە سالی (٣٥٦ك/٩٦٧ز) لای داوەو لە سالی (٣٥٨ك/٩٦٩ز) کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: فیلل السامر، المصادر نفسه، ل٦٧. بکە.

٣ - یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٣٤.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل١٣١.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج١، ل١٩٨.

٦ - یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل٥٥.

- قومیر: ئەو قەڵایە لەسەر چیا بووە، کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری مووسڵ و خەلات.([2])

- سەرجە: قولەیەك بووە کەوتۆتە نێوان هەر یەك لە شارەکانی نەسیبین و دەنەیسر و دارا، رۆمەکان دروستیان کردووە و هەتا سەردەمی یاقوت ماوە، ئەو باسی درێژی و پانی دەکات دوای بینیویەتی لە درێژیدا شەش تاوەر هەبووە و لە پانیەکەشی چوار تاوەر هەبووە.([3])

- ئەلجەریرە: قەڵایەك بووە کەوتۆتە نێوان دوو رووبار و کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری نەسیبین و مووسڵ، زۆرجاریش ئەو قەڵایە لەژێر دەسەڵاتدارانی مووسڵ نەبووە.([4])

- هەرور: قولەیەك بووە سەر بە شاری ئەربل بەلای چیاکانەوە لە لای باکووری، کە ئێستە بە چیای (هەریر) ناو دەبرێت.([5])

- خفیان (خفتیدکان): دوو قەڵابووە سەر بە شاری ئەربل، یاقوت باسی دەکات کە (زۆر گەورە بوونە) یەکێکیان ناسراوە بە (خفتیانی زەرزاری) کە لەسەر چیا بووە و لە ژێرییەوە رووبارێکی گەورە هەبووە و، لە ژێر ئەویشدا کەندێکی گەورە هەبووە لەسەر رێگەی مەراغە،([6]) بەڵام دووەمیان لە یەکەم گەورەتر بووە و ناوی (خفتیان سەرخاب کوڕی بەدر بووە کە یەکێك بووە لە میرەکانی عەنازین، ئەو قەڵایە کەوتۆتە سەر رێگەی نێوان ئەربل و شارەزوور.([7])

---

١ - رحله ابن جبیر، ل٢١٥.

٢ -یاقوت، المصادر نفسه، ج٣، ل٦٩.

٣ - یاقوت، معجم البلدان، ل٣٦.یاقوت باس دەکات کە ئەوە وشەیەکی فارسییە، بە واتای سەری مرۆڤ، بەڵام راستتر ئەوەی وشەیەکی کوردییە لە وشەی (سەرچاوە) واتە سەرچاوەی کانی هاتووە، بە تایبەتی ئەوە لە ناوچەی کوردستان بووە، نەك لە وڵاتی فارس.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٣، ل٣٩.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٨، ل٤٧٦.

٦ - مراغە: شارۆچکەیەکی بەناوبانگکی وڵاتی ئازەربایجانە، یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٢٣٨.

٧ - هەمان المصادر نفسه، ج٣، ل٢٤٠.

– کەرخینی: یاقوت بینیویەتی وا باسی دەکات کە قەڵایەك بووە (لە نزمایی زەوییەکی باش قوولەیەك بووە لە نێوان شاری داقوقا و ئەربل، لەسەر گردێکی بەرز بووە)، مەبەستیش لەوە قەڵای کەرکوکە.

– سەرماج: یەکێك لە گەڕیدەکان وا باسی دەکات کە یەکێك لە پیاوەکانی کورد، مەبەستی یەکێك لە میرەکانی حەسنەوییەکانە.([1]) هەندێ لەبەردەکانی گوندی ئەبی ئەیوب کە یەکێك بووە لە گوندەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیا و گواستوویەتییەوە و بە درێژایی گوندەکە قولەیەکی لێ دروست کردووە.([2]) بەڵام یاقوت زانیاری زیاتر و وردتری لەسەر باس کردووە و دەڵێ سەرماج یەکێك بووە لەو قەڵایانەی میری حەسنەوییەکان، کە ناوی بەدر کوڕی حەسنەوی کوردی بووە (٣٦٩-٤٠٥ك/٩٧٢-١٠١٤ز) کە خاوەنی شابوور خواست بووە.([3]) کە کەوتۆتە نێوان هەمەدان و خۆزستان لەسەر چیادا، هەروەها وا باسی دەکات کە یەکێك بووە لە قەڵا قایمەکان و زۆر عاسێ بووە.([4])

– ئەلهتاخ: قەڵایەکی قایم بووە لە دیاربەکر لە نێزیك میافارقین.([5])

– هرور: قولەیەکی خۆش بووە لە شاری مووسڵ بەڵای باکووری شارەکە، نێزیکەی (سی فرسەخ/١٨٠کم) لێی دوور بووە، یەکێك بووە لە شارەکانی هەکاری و لە

---

١ - لەبارەی حەسنەوەیەکان، بڕوانە: نشتمان بشیر محمد، المصادر نفسە، ل٥٤-٦٧.بکە.

٢ - مسعر بن مهلهل، المصادر نفسە، ل٢٥.

٣ - شابور خواست: شارۆچکەیەکی ویلایەتی بەنی خۆزستان و ئەسفەهان بووەن لەنێوان ئەو نەهاوەند نێزیکەی (١٢ فرسەخ/٧٢کم) بووە، لەگەڵ للوریش (٣٠ فرسەخ/١٨٠کم) بووە، هۆکاری ناوناکەیشی یاقوت دەڵێت: شابور کوڕی ئەردەشێر کاتێ دەستی لە مەملەکەتەکەی هەڵگرت و لەبەر چاوان ونبوو بە ئیحای ئەستێرەناسەکان، هەوادارانی بۆی دەرچوون و داویان کردەوە، بۆیە کاتێ گەیشتنە نیشابور گوتیان: شابوورمان لەیاد چوو، بۆیە بە نیشابوور ناونرا، دواتر کە گەیشتنە شابوور خواست و لەوێدا لێیان پرسی کە چیان دەوێت گوتیان: (شابور خواست) واتە ئێمە شابورمان دەوێ، دواتر ئەو ناوچەیە بەو ناوەوە ناونرا، دواتر کەوتنە نێو جوندیسابوور لەوێدا بینیانەوە، بۆیە گوتیان وندی شابورن واتە شابوورمان بینیەوە، دواتر بە عارەبی کراو گوتیان جند شابور، معجم البلدان، ج٥، ل٦.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٨، ل٢٤٠.

٥ - هەمان سەچاوە، ج٨، ل٢٨٦.

نێوان ئەو و عەمادییە سێ میل بووە،([1]) واتە ئەوە ئەو هرورە نییە کە لە پێشەوە باسمان کرد.

– قولەی دەسکەرە: دەسکەرە گوندێك بووە لەسەر رێگەی خوراسان لە شەهریان کە دەسکەرەی پاشا بووە، کە هورمز کوڕی سابوور کوڕی ئەردەشێر کوڕی بابەك زۆرترین شوێنی دانیشتنی ئەو بووە، بۆیە بەو ناوەوە ناونراوە.([2]) هەروەها ئەستەخری باس دەکات کە لە دەرەوەی گوندەکە (قولەیەك لە قوڕ هەبووە، بەڵام ناوەوەی بۆش بووە، بەڵام ناوی باخچەبووە).([3])

– قوولەی کورد: وەکو باسی دەکەن قوولەیەکی زۆر جوان بووە، لەسەر چیای جەلیل بەرامبەر بە شاری حمس بەلای ڕۆژئاوایەوە دروست کراوە، کە ئەو چیایە دەگاتەوە چیای لوبنان کە کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری بەعلەبەك و حمس، پێش ئەوەی لەسەر ئەو چیایە ئەو قولەیە دروست بکرێت، هەندێ لە میرەکانی شام تاوەرێکیان لێ چێ کردبوو، بەڵام دەستەیەك لە کوردەکان بۆ ئەوەی بیکەنە هێڵی رووبەڕووبوونەوەی خاچهەڵگران، ئەوا خواردەمەنیان بۆ دابین دەکردن، دواتر ئەوانە لە خودی خۆیان لە هێرشەکانی دوژمنان ترساون، بۆیە بڕیاریاندا بەرە بەرە چاکی بکەن هەتا بووە قەڵایەك و بەرپەرچی چەندان هێرشی دوژمنانی پێ درایەوە، بەڵام ئەوانەی لەو شوێنەبوون، ئەوییان فرۆشتە خاچهەڵگران، ئەوانەی هەرگیز دەستیان لە هێرشەکان هەڵنەدەگرت، هەتا دەستیان بەسەر گرینگترین ئەو شوێنەدا گرت و گۆڕیان بۆ حەمات و حەمس.([4])

وەکو دەردەکەوێ قولەی حەمات ئی کوردەکان بووە و، بێزاربوونە لە بەرگری زۆرێك لە هێرشەکانی خاچهەڵگران و درکیان بەوە کردووە، کە ئەوە لە دەرەوەی هەوڵی کۆنترۆڵی ئەوانە، بۆیە ئەوان پێیان باش بووە لەبری دەسکەوتێکی ماددی دەست لە قەڵاکە هەڵبگرن، نەك بەبێ بەرامبەر.

شوورە:

---

١ - هەمان سەرچاوە، ج٨، ل٤٧٦.

٢ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٨٧. یاقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٤٧٦.

٣ - یاقوت، معجم البلدان، ج٣ن ل١٥٢.

٤ - رحلة ابن جبیر، ل٢٩٩.

بەڵام شوورەکان یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی شارەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئیسلامی، کە شارەکان بە شوورەی قایم و قەڵا پارێزراون لە مەترسییەکانی دەرەکی.

وەکو وڵاتناسەکان و گەڕیدەکان ئاماژە بۆ چەندین شوورە دەکەن، هەندێکیان زۆر بە وردی باسییان کردووە، بە شێوەیەك کە خوێنەر زۆر بە ئاسانی دەتوانێ وێناندنی ئەو شوورانە بکات بە پێی ئەو پەسنانە و ئەو وێناندنانەوە، هەر لەو بارەیەوە ئیبن موهەلەل بە شێوەیەك باسی شوورەی شاری دزدان دەکات کە سەر بە ناوچەی شارەزوور بووە، وەکو باسی دەکات شوورەکە پان بووە کە سوار ئەسپ زۆر بە ئاسانی توانیویەتی بەسەریدا غار بدات، لەبەرئەوەی پان و بەرین بووە،([1]) هەروەها سمکی شوورەی ئازەری - شارۆکەی شارەزووری-([2]) بە هەشت باڵ مەزەندە کردووە.([3] -[4])

هەروەها ئەستەخری شوورەی شاری ئامەدی زۆر بە قایمی پەسن کردووە،([5]) بەڵام ناسر خوسرەوی گەڕیدە کە بە شارەکەدا رەتبووە لە دووتوێی گەشتەکەی بۆ حەج، زۆر بە وردی باسی شوورەی شارەکە دەکات کاتێ دەڵێت: (سەردانی ئامەدمان کرد بە بەردێك دەورە درابوو، درێژییەکەی هەزار پێ بوو، پانییەکەیشی ئەوەندە بوو، بە بەردی رەش شوورەکە دەورە درابوو، کە هەر بەردێکی کێشەکەی نێزیکەی سەد هەتا هەزار کیلۆ دەبووە،([6]) کە ئەو بەردانە بەبێ ئەوەی بە قوڕ یان گەچ بەیەکەوە بەسترابنەوە، هەروەها بەرزی شوورەکەش بیست باڵ دەبوو، کە لە دووری هەر سەد باڵێك بورجێکیان لێ دروستکردبوو، کە بە شێوەی بازنەیەك کە نێزیکەی هەشتا باڵ دەبوو، لێوارەکەیشی هەر بەو بەردە دروستکرابوو، کە لە چەند لایەکی شارەکە بە رووی ناوەوە پێبلکە لە

---

١ - الرسالة الثانية، ل١٩. ياقوت، معجم البلدان، ج٥، ل١٦٥. القزويني، اثار البلاد، ل٣٩٨.

٢ - لە لای فەزوینی (دوو باڵ) بووە کە ئەوە شارۆچکەی شارەزوور بووە. بڕوانە: اثار الابلاد، ل٣٩٨. بکە.

٣ - باڵ: وەکو قلقەشەندی باسی دەکات بە شەش پێ دەیانسێنێ، پێی مرۆڤێکی ئاسایی، کە هەر پێیەك چوار پەنجە بووە. کە هەر پەنجەیەکیش شە دنکە جۆ بووە. بڕوانە: لبح الاعشى، ج٣، ل٤٤٦.

٤ - الرسالة الثانية، ل١٨.

٥ - المسالك والممالك، ل٥٣.

٦ - الرسالة الثانية، ل١٩.

بەرد دروستکرابوو بۆ ئەوەی بتوانن بەسەر شوورەکە سەرکەون،([1])کە لەسەر هەر تاوەرێك قەڵایەك دروستکرابوو.([2])

ئەمە سەرەڕای ئەو تاوەرانە لە دەرەوەی ئەو تاوەرانەش شوورەیەکی دیکە هەبوو لە هەمان بەرد دروستکرابوو، کە بەرزییەکەی دە باڵ دەبوو لەسەرەوەیشی لەسەر لێوارەکەی کون هەبووە، کە راڕەوێکی تێدا بوو کە پیاو بە باشی دەیتوانی بە چەکەکەیەوە تێیدا هاتوچۆ بکات، بە شێوەیەك کە دەیتوانیٚ زۆر بە ئاسانی تێدا رابوەستێت و شەڕ بکات، ئەو شووره دەرەکییەش دەرگەی ئاسنی هەبوو کە زۆر جیاواز و قایمتربووە لە دەرگەی شوورەکانی ناوەوە بە شێوەیەك ئەگەر دەرگەی دەرەکییەکە بشکابایە لە لایەن دوژمنەوە، ئەوا دەرگەی ناوەوە نێزیکەی پازدە باڵ لە دەرگەی ناوەوە دوور بوو بۆ ئەوەی بگاتە شوورەی ناوەوە).([3])

لەوەی پێشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ناسر خوسەرەو زۆر بە جوانی باسی شوورەی شاری ئامادی کردووە و زۆر بە وردی پەسنی کردووە، بە شێوەیەك کە وێنەکەی زۆر لە زەینی خوێنەر نێزیك کردووەتەوە بە شێوەیەك کە وێناندنی وێنەی قەڵا و قولەکانی دەکات لەنێو دێڕەکانیدا کە یەکێکە لە شوورە بەناوبانگەکانی جیهان.

سەبارەت بە شوورەی میافارقین کە پایتەختی دەوڵەتی مەروانی کوردییە.([4]) کە بە تەنیشتییەوە شوورەیەکی گەورە هەبووە، لە بەردی سپی دروستکراوە و هەر بەردێکی کێشی نێزیکەی پێنج سەد کیلۆ دەبوو، کە لە دووری هەر پەنجا باڵێك لە شوورەکە تاوەرێکی گەورە هەبووە لە هەمان بەرد دروستکراوە، لەسەرەوەی شوورەکە کون هەبووە لە شێوەی پەنجەرەی بچووك کە ناسر خوسرەو زۆر سەرسام بووە بە چۆنییەتی بیناکردنی ئەو شوورانە، وەکو باسی دەکات (بە شێوەیەکی زۆر سەرنج راکێش بیناکراوە کە

---

١ - سفرنامة، ل٨.

٢ - بورج: زۆربەی جار بورج لەسەر قەڵاو قولە دروست دەکرێت، کە بەشێکی گرینگی سیستەمی بەرگری شارە، چونکە لەوێوە دەتوانریٚ هەموو مەترسییەکان ئاشکرا ببینرێت و بکرێت، پێش ئەوەی بگاتە شارەکە. بڕوانە: شاكر ملطفى، المصادر نفسة، ج١، ل٤٥٠. بكة.

٣ - سفرنامة، ل٩.

٤ - بۆ زیاتر بڕوانە: الفارقي، تاريخ الفارقي، (القاهرة:١٩٥٩) عبد الرقيب يوسف، الدولة الدوستكية، ج١، ل؟.

دەستێکی ڕەنگینی پێوەدیارە هەتا بەمڕۆ رادەگات).([1]) وەکو ئەستەخریش باسی دەکات دەڵێت: شوورەی ئەو شارە بازنەیی بووە.([2])

هەروەها ناسر خوسرەو ئاماژە بۆ بوونی شوورەیەکی دیکە دەکات لە لای باکووری شاری میافارقین.([3])

بەڵام لە شاری نەسیبین کە بەتەنیشتیەوە شوورەیەك هەبووە بیناکردنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی رۆمەکان، دواتریش بۆ پاشی ساسانی کە ناوی ئەنو شروان بووە و دوای دەستبەسەرداگرتنی، شوورەکەی تەواو کردووە.([4])

ب/ مزگەوت و پەرستگە و پێگەی بازاڕەکان لە وڵاتی کوردستان:

لێرەدا دوو پێگەی بنچینەیی هەبووە لە دامەزراندنی شارەکان، بەڵام لەو شارانە زیاتر لە مزگەوتێك هەبووە، زۆرجار ئەو مزگەوتانە لە نێوەڕاستی بازاڕەکاندا بووە.([5]) یان لە کۆتایی یان لە نێزیك کۆتایی شارەکە بووە، هەتا خاوەندارانی دوکان و چێشتخانەکان بە ئاسانی بتوانن بگەنە مزگەوتەکان لە کاتی نوێژەکاندا، کە ئەمەش پێوەندییەکی گیانی بەهێز هەبووە لە نێوان کەسەکان و چۆنییەتی نوێژکردن لە مزگەوتەکان، لایەنی ماددیش کە خۆی لە بازاڕ و شوێنی فرۆشتنی کەلوپەل دەنواند، وەکو مەقدەسی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و زیاتر گرینگی بەو لایەنە دەدات لە هەموو وڵاتناسەکان زیاتر بە ئاماژە کردن بۆ مزگەت و چۆنییەتی دەستنیشانکردنی شوێنی لە نێو شارەکاندا.

سەبارەت بەوەی پێوەندیی بە هەرێمی ڕۆژئاوای چیاکانەوە هەبێت، لە شاری هەمەدان مزگەوتێك هەبووە وەکو مەقدەسی باسی دەکات باریك بووە و)([6]) کەوتۆتە

---

١ - سفرنامة، ل٨.

٢ - المسالك والممالك، ل٧٦.

٣ - سفرنامة، ل٨.

٤ - بۆ زیاتر: معجم البلدان، ج٨، ل٣٩٠. القزويني، اثار الابلاد، ل٤٧٦. بكة.

٥ - بۆ زیاتر بڕوانە: عبد الرزاق عباس حسين، نشاة مدن العراق وتطورها. (بغداد:١٩٧٣) ل٢٧-٢٨. بكة.

٦ بڕوانە: لەبارەی بازاڕ، بەشی دواتر بکە.

نێو بازاڕەوە،([1]) لە شاری نەهاوەند دوو مزگەوت هەبووە.([2]) یەکێکیان کۆن و ئەوەی دیکە نوێ بووە،([3]) ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە شارەکە قەبارەی گەورە بووە، لە شاری قرمسینیش (مزگەوتێکی قەشەنگ لە نێو بازاڕەکەیدا هەبووە)([4]) بەڵام لە هەرێمی جەزیرە مزگەوتێك لەنێو شاری حەسەنیە هەبووە و کەوتۆتە نێوەڕاستی شارەکەوە.([5])

هەروەها لە شاری ئامەد([6]) وەکو ناسر خوسرەوی گەڕیدە باسی ئەو مزگەوتە دەکات، کە مزگەوتێك بووە لە بەردی ڕەش دروستکراوە بە شێوەیەك کە وێنەی نەبووە لە رووی بیناکردن ونەخشەسازییەوە، لەناوەوەیشی زیاتر لە دوو سەد ستوونی لە بەرد دروستکراو هەبووە، کە هەر ستوونێکی برێتی بووە لە یەك پارچە، لەسەر هەر ستوونێك گرێیەك لە بەرد هەبووە لەسەرووی ئەمەیشەوە ستوونێکی کورت هەبووە، بەڵام بانەکەی لە شێوەی جەمەلۆن بووە، لە گۆڕەپانەکەیشی بەردێکی گەورە هەبووە لەنێوەڕاستی حەوزێکی ئاو هەبووە، کە لە بەرد دروستکراوە، کە بەرزییەکەی بەقەد باڵایەکی پیاو بووە، لە دەورەی بازنەکەیدا دوو باڵی هەبووە، لە نێوەڕاستی حەوزەکەش بۆڕییەکی مسی هەبووە کە ئاوێکی پاك و بێگەردی فڕێداوە، وەکو ئاماژەی بۆ دەکەن شوێنی دەستنوێژ هەڵگرتن بووە([7]) و باسی ئەو مزگەوتە دەکەن بەوەی کە (زۆر گەورە و جوان بووە لە رووی دروستکردنەوە، هەروەها لە رووی باشییەوە لە شێوەی ئەو نەبووە.([8])

لە لایەکی دیکەوە هەروی گەڕیدە ئاماژە بۆ مزگەوتێکی دیکە دەکات لە شاری ئامەد و دەڵێت: مزگەوتێك هەبووە ناسراوە بە مزگەوتی جبریل، چونکە لە خەوندا قسەی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) کردووە، هەروەها مزگەوتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و

---

١ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٠٠.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل٣٠١.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٨. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٣.

٤ - المقدسي، ملدر سابق، ل٣٠١.

٥ - هەمان سەرچاوە، ل١٢٣.

٦ - هەمان سەرچاوە، ل١٢٤.

٧ - المبضاة، واتە شوێنی دەست نوێژ هەڵگرتن.

٨ - سفرنامة، ل٩.

مزگەوتی ئەبی بەکری سدیق و مزگەوتی عومەری کوڕی خەتاب هەبوونە.([1]) بەڵام مزگەوتی شاری میافارقین کە ناسر خوسرەو جەختی لێدەکاتەوە و زۆر بە دوور و درێژی باسی دەکات و بە باسی ئاودەستەکان کۆتایی پێ دێت کە دەڵێت: نێزیکەی چل ئاودەستی هەبووە دوو ڕێڕەوی ئاوی گەورەی هەبووە، یەکەمیان لە دەرەوە بووە و بەکارهێنراوە بۆ دەستنوێژ شووشتن و ئەوەی دیکە داخراو بووە بەکارهێنراوە بۆ ئاودەستەکان.([2]) واتە بۆ ڕادانی پیسی و پۆخڵی ئاودەستەکان.

ئەوەش ئەوە دەردەخات کە گرینگییەکی زۆر بە مزگەوت و شوێنی دەستنوێژ و جەختکردنەوە بووە لە پاکی و چۆنییەتی بەکارهێنانی ئاو بۆ ئەو مەبەستە.

وەکو هەروی باسی دەکات لە میافارقین هەشت مزگەوت هەبووە، وەکو دەڵێن یاوەران (ڕەزای خوایان لێبیت) بنیاتیان ناوە، ئەوانیش مزگەوتی خەزیمە و مزگەوتی تائی و مزگەوتی ئیبراهیم و مزگەوتی خەنادیق و مزگەوتی یاساین و مزگەوتی ئەبی خالید و مزگەوتی حەرمەلە و مزگەوتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بووە.([3])

لە مزگەوتەکانی شاری نەسیبین باسی مزگەوتی دەرگەی ڕۆم و مزگەوتی ئەبی هورەیرە و مزگەوتی زەین ئەلعابدین و مزگەوتی بەنی بەکرە و مزگەوتی دێرین و مزگەوتی پێغەمبەر (د.خ) و مزگەوتی باب سنجار دەکەن، کە قورئانێکی عوسمانی کوڕی عەفانی تێدا بووە وەکو لە قسەکانی هەروی داهاتووە.([4]) هەروەها یاقوت ئاماژە بۆ مزگەوتێك دەکات لەسەر قەڵای هەولێر.([5])

هەروەها مزگەوتی مەعلاسیا لەسەر گردێك بنیاتنراوە.([6]) بەڵام مزگەوت لە شاری ڕەها لەسەر ڕێگەی شەعس بووە.([7]) ڕەنگە ئەمە بۆ زۆری خاچهەڵگران بگەڕێتەوە لەو شارەدا، بۆیە مزگەوت لە ناوەڕاستی شارەکە نەبووە.

---

١ - الاشارات الى معرفة الزيارات، ل٦٥.

٢ - سفرنامة، ل٨.

٣ - الاشاراتالى معرفة الزيارات، ل٦٤.

٤ - هەمان سەرچاوە، ل٦٦.

٥ - معجم البلدان، ج١، ل١١٦.

٦ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٣.

٧ - هەمان سەرچاوە، ل١٢٥، ماتفرق من الامور، المعجم الوسيط، ج١، ل٤٨٦.

بەڵام مزگەوتی شاری دارا، ئەوا سەرچاوەیەکی ئاوی بەناودا ڕۆیشتووە.([1]) مزگەوتێکیش لە شاری شەنگاڵ هەبووە کە کەوتۆتە شوێنەکانی ئەسکافییە([2])، کە زۆر بووە لە شارەکەدا([3]).

یاقوتیش باسی مزگەوتێکی گەورە دەکات لە شاری بەعشیقا کە منارەیەکی باشی هەبووە([4])،

بەڵام لە ئەرمینیا مزگەوتێکی زۆر هەبووە وەکو ئەوانەی لە نێزیك بازاڕەکان هەبووە، وەکو مزگەوتی بیرزەعە.([5]) و مزگەوتی ئەخلات و مزگەوتی سەلماس([6])، هەروەها مزگەوتێك لە دەبیل لەسەر پانتاییەکی گەورە دروستکراوە کە لە تەنیشتی کلێسەیەك هەبووە،([7]) ئەوەش بەڵگەی ئەوە بووە کە پێوەندییەکی باش لە نێوان موسڵمانەکان و ئاشوورییەکان هەبووە لە پایتەختی ئەرمینیا، هەندێ جار مزگەوت لە یەکێك لە بازاڕەکان چێ کراوە، وەکو مزگەوتی ئورمییە لە یەکێك لە بازاڕەکانی کوتاڵفرۆشەکان.([8])

هەروەها باسی مزگەوتی شاری قەندەرییە دەکەن، کە کورد ئاوای کردووە گوایە زۆر جوان بووە.([9]) بەڵام بەبێ ئەوەی باسی شوێنەکەی بکەن.

---

-١ المقدسی، المصادر نفسه، ل١٢٤.

٢-الاسکافه: واتە دروستکار جا هەر شتێك بێت.

٣ -المقدسی، المصادر نفسه، ل١٢٤.

٤ -معجم البلدان، ج٢، ل٢٥٩.

٥ -المقدسی، المصادر نفسه، ل١٢٤.

٦ - هەمان سەرچاوە، ل٢٨٨.

٧ - هەمان سەرچاوە، ل٢٨٩.

٨ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٩ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

ت-نیشانە ئاوەدانەکانی دیکە:

سەرەڕای مزگەوت و پەرستگەکان، ولاتناس و گەڕیدە موسلمانەکان دەستنیشانی زۆرێك لە نیشانە ئاوەدانییەکانی دیکەیان لە شارەکان کردووە، وەکو کۆشك و ئاپارتمانی گەورە و گران و گەرماو و خانەو قەنتەرە و پرد و چەندانی دیکە.

لە شاری مووسڵ (گەرماوی نهێنی و خانووی رازاوە هەبووە)([1])، هەر وەکو شارەکە (میوانخانەی خۆشی هەبووە کە لەسەر هەموو دەروازەیەك میوانخانەیەك هەبووە)([2])، لە شاری میافارقین خانە و گەرماو هەبووە([3]). لە شاری ماردین خانە هەبووە([4])، وەکو باسی نەسیبین دەکەن کە بە گەرماوی خۆش و کۆشکی رازاوە بەناوبانگ بووە([5])، هەروەها لە گوندی مۆنسە کە نێزیك شاری نەسیبین بووە و کەوتۆتە سەر رێگەی مووسڵ، خانەیەك هەبووە خاوەنەکەی ناوی سیابوقە دەیبلی کە یەکێك بووە لە بازرگانەکان هەمیشە لە خزمەت میوانەکانی بووە، لە دەوروبەری ساڵی (٥٦٥ك/١١٦٩ز)([6]) هەروەها لە یەکێك لە گوندەکانی نێزیك شاری شەنگاڵ خانەیەك هەبووە ناوی بارنجان بووە.([7])

یەکێك لە ولاتناسەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی سەرسوڕمانی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بە گەرماوەکانی شاری شەنگاڵ وەکو دەڵێت: "لەو گەرماوانە خۆشترم نەدیوە."([8])

---

١ - المقدسی، المصادر نفسه، ل١٢٢.

٢ -هەمان سەرچاوە، ل١٢٣.

٣ -نالر خسرو، المصادر نفسة، ل٨.

٤ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٤. القزويني، اثار البلاد، ل٢٦٠. ياقوت، معجم البلدان، ج٧، ل١٩٤.

٥ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٢.

٦ - ياقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٣٤٨.

٧ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥٥.

٨ - القزوينی، اثار البلاد، ل٣٩٣، بە شێوەیەك باسی ئەو گەرماوانە دەکات، کە دەڵێت: زۆر بەرفرەوان و خۆش بووە، لەژێر هەر بۆڕییەکدا حەوزێك هەبووە، کە زۆر گەرم و خۆش بووە، لە بانەکەیدا شووشەی

هەروەها لە بن قەڵای حەسەن کێفا (شوێنێکی ئاوەدان هەبووە کە بازاڕ و گەرماو و میوانخانە و شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆشی هەبووە).([1])

وەکو تێبینی دەکرێت هەندێ لە ئاپارتمان و کۆشکەکان بەناوی کچەکانیانەوە بووە، بۆیە ئەو ناوانە زاڵ بووە بەسەر ئەو بینا و کۆشکانەوە وەکو کۆشکی (کتیر) لە ناحیەی دەینور کە ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کتیری کوڕی شەهابی حارسی، کە واڵی هەمەدان و دەینور بووە لە لایەن موغەیرەی کوڕی شوعەبە لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب.([2]) لە دووری چوار فرسەخ (٢٤کم) لە مەرج قەڵا کۆکشێك هەبووە پێیان گوتوە کۆشکی یەزید. ([3]) وەکو مەقدەسی باسی دەکات عەزدی دەوڵەی بوەیهی ئەو کۆشکەی لەسەر رێگە دروستکردووە.([4]) دەڵێن خانوویەکی زۆر خۆش بووە.([5])

هەروەها قەسری شیرین یەکێك بووە لە تەلارە گەورە و بەرزەکان کە هەیوانی زۆر بووە و پێکەوە بەستراو بووە، شوێنی خەڵوەت و کۆگە و کۆشك و پەنجەرە و دەلاقە و رێڕەو و حوجرەی زۆر بووە، کە ئەوەش بەڵگەی شتێك بووە ئەویش بەڵگەی هێز و شکۆ و سامی توند بووە.([6])

بێگومان ئەو ئاماژە وڵاتناسیانە بۆ کۆشك و میوانخانە و گەرماوە بەربڵاوەکان لە شارە کوردییە جۆراوجۆرەکاندا رەنگدانەوەی لایەنێکی گرینگی شارنشینی کۆمەڵگەی کوردی بووە لە سەردەمی ئیسلامیدا.

لە لایەکی دیکەوە هەندێ ئاماژەی وڵاتناسی دیکە هەبووە بۆ چەندین قەنتەرەی دانراو لەسەر رووبار و کەندەکاندا کە هاتوچۆکردن زۆر ئەستەم بووە بەبێ ئەوانە، وەکو

---

رەنگاورەنگ هەبووە بە وێنەی سوور و زەرد و سەوز و سپی بە شێوەی نەخش و نیگار، دانیشتن لەو گەرماوانە زۆر خۆش بووە وەکو ئەوەی لە ماڵ دانیشتبیت، ل٣٩٣.

١ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢.

٢ - یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٦٤.

٣ - ابن رستة، المصادر نفسة، ل١٥١.

٤ - جادە، بە واتای نێوەندی رێگە، یان رێگەی سەرکیی، کە هەموو رێگەکان هاتوونەتەوە سەر ئەو شارێگەیە، المعجم الوسیط، ج١، ل١٠٩.

٥ - احسن التقاسیم، ل٣٠١.

٦ - یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٥٨. ابو دلف، المصادر نفسة، ل٢٠.

قەنتەرەی سنجە کە لەسەر رووبارەوە بووە، کە لە ئورمیەوە هاتووە لای شاری حەسنیە،(1) کە لەسەردەمی ئەراتیقەکان بیناکراوە،(2) کە لە نێزیك حەسەن کێفا قەنتەرەیەکی بڵند هەبووە زۆر جوان چێ کراوە لەسەر رووباری دیجلە.(3) هەروەها ئەبو دەلف ئاماژە بۆ قەنتەرەیەکی دیکە دەکات، بەناوی قەنتەرەی نوعمان، کە ئەویش پاشای مەنازیرە نوعمان کوڕی مونزر لەسەر زێی گەورە بنیاتی ناوە لە نێزیك شاری قرمسین، ئیبن کەلبیش دەڵێت (ئەوە قەنتەرەیەکی کۆن بووە و شایەکان بینایان کردووە، کە ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پاشا نوعمان کوڕی مەقرن، قەنتەرەکەیشی بەناوی خۆیەوە ناو ناوە، چونکە سەرباز بووە لای ئەو، (4) هەر وەکو ئیبن رستەش ئاماژە بۆ قەنتەرەیەك دەکات کە لەسەر رووبارێك لە نێوان قرمسین و دەکان بینا کراوە).(5)

لە نێوان سەمێرە و تەرحان قەنتەرەیەکی گەورە هەبووە وەکو ئەبو دەلف باسی دەکات و دەڵێت (زۆر جوان و جێگەی سەرسوڕمان) بووە،(6) کە دوو هەندەی قەنتەرەی خانەقین بووە، وەکو باسی ئەو قەنتەرەیە دەکات گەورە و گران بووە و لە بەردی کەرپووچ دروستکراوە.(7) کە نێزیکەی بیست و چوار تاق بووە، کە هەر تاقێك نێزیکەی بیست

---

١ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢.

٢ -فەخرەدین قەرە ئەرسەلان کوڕی داود: ئەراتقە، ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەراتیق کوڕی کەسکی تورکمانی، کە یەکێك بووە لە سوڵتانەکانی مەمالیکی مەلکشای سەلجوقی، دامەزرێنەریماڵباتی ئەرتەقیکە موعینی دەولەی سەقمان کوڕی ئەرتق بووە، کە دەستی بەسەر حەسەن کێفا دا گرتووە لە ساڵی (٤٩٥ك/١١٠١ز) دواتر ماردینیشی خستووەتە سەر، لە ساڵی (٦٠٢ك/١٢٠٥ز) دەوڵەتی ئەراتقە بۆتە دووبەش، بەشی یەکەم لە ساڵی ٦٢٠ك/١٢٢٣ز) لەسەر دەستی ئەیوبییەکان کۆتایی هاتووە، لە کاتێکدا بەشەکەی دیکە تەمەنی درێژ بووە و بەردەوام بووە هەتا ساڵی (٨١٣ك/ ١٤٢١ز) کاتێ لەسەر دەستی قەرەقۆینلۆوەکان کەوتووە، بەناوی محەمەد خدری بەگ، المصادر نفسه، ل٤٥٢.عماد الدين خليل، الامارات الارتقيه فى الجزيره والشام (٤٦٥-٨١٢ك/١٠٧٢-١٤٠٩ز). مؤسسة الرسالة، ط١، (بيروت:١٩٨٠).

٣ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢.

٤ - الرسالة الثانية، ل٢٣. ياقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٩٦.

٥ - الاعلاق النفيسة، ل١٥١.

٦ - الرسالة الثانية، ل٢٠. ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٢١١.

٧ - ابن رستة، المصادر نفسة، ل١٥٠.

باڵ بووە و ڕێگەی خوراسانی بەسەرەوە بووە،([1]) هەروەها لەسەر رووباری حەلوان قەنتەرەیەك هەبووە،([2]) لە نێزیك چیای سەمیرەش قەنتەرەیەکی گەورە هەبووە کە بیناکردنەکەی جێگەی سەرسامی بووە کە لەسەر رووبارێکی زۆر قووڵ دروستکراوە.([3])

وەکو باسی قەنتەرەی ئەزیج دەکەن کە یەکێك بووە لە شتە سەرسوڕمانەکانی جیهان، چونکە لەسەر رووبارێکی وشك و قووڵ و لە بەرد دروستکراوە.([4])

أ- کەرەستەی بیناکردن:

وەکو دەزانین دروستکردنی یەکە ئاوەدانییەکان بۆ ئەوەی بگونجێت لەگەڵ پێداویستیەکانی ژیانی دانیشتووان، پێویستی بەوە بووە کەرەستەی بینای جۆراوجۆری تێدا هەبێت و دەست بکەوێت، بۆیە وڵاتناسەکان باسی ئەو جۆرە کەرەستانەشیان کردووە کە ئەوان بەکاریان هێناوە لە دروستکردنی ئەو کۆشك و بینایانەدا، لە دووتۆی باسکردنی شارە کوردیەکان وەکو باقی شارە ئیسلامیەکان، ئەو جۆرە کەرەستانەش وەکو قوڕ و خشت و بەرد و کەرپوچ و گەچ و دار و چەندانی دیکە، بێگومان گرینگی هەریەك لەمانە لەیەکتر نێزیك بووە بە بەراورد بەوانی دیکە.

لە نێوان شارەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان ئەوان قوڕیان بەکارهێناوە بۆ دروستکردنی بینا و خانووەکانیان، وەکو وڵاتناسەکان باسی شاری نەهاوەند دەکەن کە لە (خانووەکانی لە قوڕ دروستکراوە).([5]) هەروەها هەمەدانیش.([6]) شاری حەلوان (لە قوڕ و هەروەها خانوویشی تێدابووە لە بەرد دروستکراوە).([7]) لە شارەکانی جەزیرە

---

١ - ابودلف، المصادر نفسة، ل٢٤.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل٤١. یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل٢٢٩.

٣ - ابودلف، المصادر نفسة، ل٢٤.

٤ -هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٨٨.

٦ - هەمان سەرچاوە، ل١١٨.

٧ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٨.

شاری نویٚ هەبووە وەکو مەقدەسی باسی دەکات کە (بینایەکانیان لە قوڕ دروستکراوە).([1]) هەروەها شاری مەعلەسایاش.([2])

ناسر خوسرەو باسی یەکێك لە دەرگەکانی شاری میافارقین دەکات کە لەسەرەوەی تاقێکی بەردی هەبووە، دەرگەیەکی ئاسنی هەبووە نەك دار.([3])

لە شتە سەرسامەکانی دیکەی دنیای ئاوەدانی لە بەرد دروستکراو وەکو کۆشکی دزەکان لە قرمسین، کە پانتاییەکەی بە شێوەیەك بووە، کە نێزیکەی سەد باڵ جاران سەد باڵ بووە و بەرزییەکەی بیست باڵ چوارگۆشە بووە، بەردەکانی بە بزماری ئاسن بە شێوەیەکی مەحکەم و قایم بەیەکەوە بەستراوەتەوە کە دیار نەبوو، درزی بەردەکان بە شێوەیەك بە یەکەوە نووساو بووە، کە سەیرت دەکرد وات دەزانی ئەوە یەك بەردە، وەکو یەکێك لە شتە سەرسامەکانی پاشی زەوی بێت.([4]) ئەبو حامدی غەرناتی باسی ئەو کۆشکە دەکات و دەڵێت: " چەندان دەرگەی بەرز و بەهێز و کۆڵەگەی قایمی هەبووە، کە لەبەردی رەش دروستکراوە کە بە هیچ شێوەیەك ئاسنی تێدا بەکار نەهاتووە.([5])

دیارە گەچ یەکێك بووە لەو کەرەستانەی لەسەرتاپای دنیای ئاوەدانی بەکار هاتووە، لەوانەش ناوچەکانی نیشتەجێ بوونی کورد، ئەوانیش ئەو کەرەستەیەیان بەکارهێناوە لەبەرئەوەی لە ناوچەکەیاندا زۆر بووە و خاوەن پەسنی باش بووە وەکو کەرەستیەکی باش و قایم و گونجاو بووە لەگەڵ ساردی و گەرمی شان بەشانی خشت و قوڕەکەیەوە، وەکو ئیبن حوقەل جەخت لەوە دەکاتەوە کە سەرجەم شارەکانی چیاکان تەنیا شاری رەی نەبێت کە بیناکانی لە گەچ بووە،([6]) لە ئاماژەکانی دیکەی وڵاتناسی لە چۆنییەتی بەکارهێنانی ئەو کەرەستانە باسی شاری سەمێرە و سیروانیان نەکردووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەوان بچووك بوونە وەکو مەقدەسی وای بینوە کە دەڵێت (بینایەکانیان زۆربەیان

---

١ - المقدسي، المصادر نفسه، ل١٢٣.

٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٣ - سفرنامة، ل٨.

٤ -ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٩٩. القزويني، اثار البلاد، ل٤٣٣.

٥ - تحفة الالباب ونخبة الاعجاب، ل٢٢١.

٦ - صورة الارض، ل٣١٥.

له بەرد و گەچ بووە).([1]) هەر وەکو شاری مووسڵیش.([2]) هەروەها دانیشتووانی شاری ڕەئس ئەلعەین کە ئەوانیش بینایەکانیان لە بەرد و گەچ بووە.([3]) هەروەکو شاری حەسن کێفاش هەروا بووە.([4])

وەکو تێبینی دەکەین بەکارهێنانی بەرد وەکو کەرەستەیەکی بنچینەیی و بەربڵاو لە زۆربەی بیناو خانووەکانی شارە کوردییەکان، هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بەئاسانی دەسکەوتن و زۆربوونی ئەو جۆرە کەرەستانە لە ناوچەکەدا، بۆیە دانیشتووانی شاری چیاکان لە هەرێمی جەزیرە خانووەکانیان لە بەرد و قوڕ دروستکردووە،([5]) هەروەها دانیشتووانی جەزیرەی ئیبن عومەر خانووەکانیان لە بەرد بووە،([6]) شاری دارا خانووەکانیان لە بەردی ڕەش و کلس بووە.([7]) بینایەکانی شاری ئامەد هەر هەمووی لە بەردی ڕەش بووە لە کاتێکدا شاری میافارقین بینایەکانیان لە بەردی سپی بووە.([8])

---

١ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٨.

٢ - الادريسي، المصادر نفسة، ج٥، ل٦٧٧.

٣ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٤.

٤ - ابن حوقلن المصادر نفسة، ل٢٠٢.

٥ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٤.

٦ - هەمان سەرچاوەو همان لاپەڕە.

٧ - هەمان سەرچاوەو همان لاپەڕە.

٨ - نالر خسرو، المصادر نفسه، ل٩.

# بەشی چوارەم

## لایەنە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی وڵاتی کوردستان وەکو وڵاتناسەکان باسیان کردووە:

ئەگەر بەراوردێك لە نێوان لایەنەکانی ئابووری و لایەنەکانی کۆمەڵایەتی بکەین لەوەی کە وڵاتناسە موسڵمانەکان گرینگییان زیاتر بە کام لایەن داوە، ئەوە دەبینین لایەنی یەکەم شانسی زیاتری لەو گرینگیپێدانە بەردەکەوێت. تێبینی ئەوەش دەکەین کە سەرچاوە کۆنەکان لە گرینگیدان بە لایەنە کۆمەڵایەتییەکان شتێکی وای تێدا نییە ئەگەر بەراورد بکرێت بە لایەنەکانی دیکەی ژیانەوە.

بەڵام سەرچاوە وڵاتناسییەکان سەرەڕای ئەوەی چەندانیان چوونەتە سەر باسکردنی پرسە کۆمەڵایەتییە جۆر بەجۆرەکانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بابەتانە سنووردار و دیاری کراون، ئەگەر بەراورد بکرێت بە لایەنەکانی ژیانی ئابوورییەوە کە بوارێکی گرینگی داگیرکردووە لەو سەرچاوانەدا، بە تایبەتی ئەگەر ئەو بابەتە تایبەت بێت بە وڵاتێکی دەوڵەمەندی وەکو وڵاتی کوردستان، کە سەرجەم چالاکییە ئابوورییەکانی تێدا بەرجەستە دەبێت وەکو کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی و ئەوانەی پێوەندییان پێوە هەیە، بۆیە ئەمە بۆتە جێگەی گرینگیپێدانی گەڕیدە و وڵاتناسە موسڵمانەکان.

یەکەم: دەرکەوتە ئابوورییەکان کە ئەمانە دەگرێتەوە:

أ- کشتوکاڵ:

کشتوکاڵ پانتاییەکی گەورەی لە چالاکی ئابووری وڵاتی کوردستان داگیر کردووە، هەر ئەوەش لە پێشەوەی ئەو لایەنانەوە هاتووە کە وڵاتناسە موسڵمانەکان باسییان کردووە، چونکە ژمارەیەکی زۆری دانیشتووانی کوردستان بە تایبەتی ناوچەی جەزیرە لە دێر زەمانەوە ئەو پیشەیەیان ناسیوە و وەکو چالاکییەکی سەرەکی خۆیان بەکاریان هێناوە، بە حوکمی ئەوەی سەرجەم پێداویستییەکانی ژیانی کشتوکاڵی لە خاك و ئاو و هەوا و سەرچاوەکانی ئاو بەهەرەمەندج بووە..هتد.

لە لایەکی دیکەوە جیاوازی لە نێوان جۆرەکانی زەوی کشتوکاڵی دێمی و ئاوی و، هەروەها جۆری بەروبوومەکان، ئەمانە پرسێکی پێویستی پێوانە و پێوەری باج و خەراج بووە، ئەمە سەرەڕای زیادبوونی چالاکی کشتوکاڵی و، جۆراو جۆریەتی بەروبوومەکان هۆکاری کاریگەر بوونە بەسەر چالاکی پیشەسازی و بازرگانی لەیەك کاتدا، چونکە ژمارەیەك بەروبوومی کشتوکاڵی چوونەتە نێو پرۆسەی پێشەسازی جۆراو جۆرەوە، ئەمە سەبارەت بە بەرووبوومە ئاژەڵیەکانیش کە پێوەندییان بە کشتوکاڵەوە هەیە، بۆیە ئەو بەرهەمانەی زیادبوونە لە خۆیان هەناردەی ناوچەکانی دیکەیان کردووە.

زۆری شارەزایی لە وڵاتی کوردستان ڕەنگدانەوەی بووە بە تایبەتی زۆری بەرهەمە کشتوکاڵییەکان بەسەر ئاستی داهاتی گوزەرانی دانیشتووانەکەی و دواتر ئەو باج و خەراجەی کەوتۆتە سەریان، کە ئەمە ساڵانە بە ملیۆنان دینار مەزەندە کراوە، بۆیە زۆرێك لە وڵاتناسەکان لەو بارەیەوە لیستی تایبەتیان بڵاوکردووەتەوە.([١]) وەکو ئیبن خوردازەبە و([٢]) قودامەی کوڕی جەعفەر.([٣])

وڵاتناسەکان بە چەند دەستەواژەیەك باسێکی گشتییان لەبارەی ئاستی گرینگیپێدانی کشتوکاڵ لە لایەن دانیشتووانی وڵاتی کوردستانەوە خستووەتە ڕوو، لەوەی ئەو ناوچانە بە پیت و زۆری ئاو و بێستان و چەندان شتی دیکەی لێبووە.

سەبارەت بە هەندێ شاری جەزیرە ئەستەخری کە باسی شاری ئامەد دەکات و دەڵێت: (زۆری درەخت و کشتوکاڵی هەبووە).([٤]) هەروەها شاری میافارقین (زۆر بە

---

١ - بڕوانە: محمد ضياءالدين الريس، الخراج في الدولة الاسلامية، (القاهرة:د.ت) ل٤٢٢-٤٤٥.

٢ - المسالك والممالك، ل٢٦-٣٢-٤٧.

٣ - الخراج، ل١٨٢.

٤ - المسالك والممالك، ل٥٣. هەروەها بڕوانە: القزويني، اثار البلاد، ل٤٩١. بكة.

پیت و ئاوی زۆر بووە).([1]) بەڵام (بێستانی کەمبووە).([2]) کە باسی شاری سەعردیش دەکات دەڵێت (خاکی بە پیت بووە).([3])

ئیبن حوقەلیش کە باسی جەزیرەی ئیبن عومەر دەکات و دەڵێت (درەختی بەردار و ئاو و خاکی بە پیتی هەبووە).([4]) هەروەها لەبارەی ماردینەوە دەڵێت (میوەی زۆر و بەتام و هەوایەکی خۆش و تەندروستی هەبووە).

کە باسی سەمێرە و سیروان دەکات بەوەی کە (ئاوی تێدابووە و درەخت و کشتوکاڵ و هەر خۆی باخچەیەك بووە بۆ خۆی).([5]) هەروەها ئیبن حوقەل شاری نەسیبین بە گرینگترین شاری جەزیرە هەژمار دەکات بەوەی کە (گرینگترین ناوچەی جەزیرە بووە لە رووی میوەجات و ئاو و باخچە و کەسکایی و خۆشییەوە).([6])

لەبارەی شاری رەهاوە گوتویانە (میوەجاتی گەلێك زۆر بووە).([7]) یاقوتیش لەسەر زمانی خەڵکەکەیەوە ئەوەی گواستۆتەوە کە (لەنێو شار و گوندەکانیدا چل هەزار بێستان و باخی میووە هەبووە).([8])

کە باسی حەیزانیش دەکەن کە شارێك بووە (درەخت و بێستانی زۆر و ئاوێکی بەخوڕی هەبووە).([9]) بەڵام شەنگاڵ بە حوکمی شوێن و سروشتی ئاو و هەواکەی میوەجاتی هاوینە و زستانەی زۆر بووە.([10])

بەڵام سەبارەت بە کاروباری شارەکانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان، ئیبن خوردازەبە لەسەر زاری یەکێك لە پاشاکانی ساسانی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: باشترین ناوچە لە رووی

---

١ - هەمان سەرچاوە، ل١١٢.

٢ - احسن التقاسيم، ل١٢٥.

٣ - الاصطخري، المصادر نفسة، ل٥٣.

٤ - صورة الارض، ل٢٠٢.

٥ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٢٠٠. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٤.

٦ - صورة الارض، ل١٩١.

٧ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٤.

٨ - ياقوت، معجم البلدانن ج٨، ل٣٩٠.

٩ - هەمان سەرچاوە، ج٣، ل٢٠٤.

١٠ - ابن حوقل، المصادر نفسه، ل١٩٩.

میوەجاتەوە شارەکانی مەدائن و سابور و ئەرجان و رەیی و نەهاوەند و حەلوان و ماسبزانە.([1]) واتە ئەو سێ شارەی دواییان کە زۆربەی دانیشتووانەکەی کورد بوونە نیوەی بەرهەمی وڵاتی ئێرانیان دابینکردووە لەسەردەمی ساسانییەکاندا.

ئەبو دەلفیش کە باسی شاری سەمێرە دەکات دەڵێت بەرهەمەکانی چیاکان و دەشتەکانی کۆکردووەتەوە.([2]) وەکو تێبینی دەکەین وڵاتناسەکان کە باسی کشتوکاڵیان کردووە، باسی جۆرەکانی بەروبوومی وڵاتی کوردستانیان کردووە، لە بەناوبانگترینیان:

- باخی میوە: لە بەناوبانگترین جۆرەکانی (ماسبزی) کە ریشە و بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شاری ماسبزان.([3]) هەروەها جۆرێکی دیکەی هەبووە لە شارەزوور کە ناسراوە بە ترێی (سۆنایا)([4]) کە (ساڵێك بەرهەمەکەی ترێ و ساڵێکی دیکە بەرهەمەکەی وەکو جێزەری سوور و سەرەکەی رەش بووە پێیان گوتووە ماڵئاوایی).([5]) ئیبن حوقەلیش بەو شێوەیە باسی شاری شنۆ دەکات کە (ترێی زۆر بووە).([6]) هەروەها شاری ماردین و رەئس ئەلعەین بە باخی میوەجات بەناوبانگ بووە.([7]) لە شاری نەسیبینیش ترێ گەلێك زۆر بووە بە شێوەیەك کە زۆر هەرزان بووە.([8])

یاقوت کە باسی گوندی شەقلاباد (شەقلاوەی ئێستە) دەکات بەوەی کە (باخی میوەی زۆر و دارستانی فرە بووە). بە شێوەیەك کە ترێی ئەو ناوچەیە هەناردەی ناوچەکانی ئەربل کراوە بە درێژایی ساڵ، کە بە شێوەیەکی بەرچاو خواستی خەڵکەکەی دابینکردووە.([9])

---

١ - المسالك والممالك، ل١٤٧. ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٩٤-٢٣٢.

٢ - الرسالة الثانية، ل٢٣.

٣ - ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٩٩.

٤ - ابو دلف، المصادر نفسة، ل٢٠.

٥ - القزويني، اثار البلاد، ل٣٩٨.

٦ - صورة الارض، ل٢٩٨.

٧ - هەمان سەرچاوە، ل٢٠٠-٢٠٢.

٨ - هەمان سەرچاوە، ل١٩١.

٩ -معجم البلدان، ج٥، ل١٥٠.

- هەنجیر: شاری حەلوان بە هەنجیر بەناوبانگ بووە.([1]) باشییەکەیی و جۆرەکەی بە شێوەیەك بووە ناویان ناوە (شای هەنجیر)([2]) وەکو باسی دەکەن وێنەی نەبووە لە هیچ شوێنێکدا،([3]) هەروەها لە جەزیرەی ئیبن عومەریش چێنراوە.([4])

- هەنار: لە حەلوان زۆربووە.([5]) هەروەها جۆرەکەیشی زۆر باش بووە.([6])

- هەرمێ: شاری شنۆ بەناوبانگ بووە بە هەرمێ، هەروەها جۆرەکەی زۆر باش بووە، بۆیە هەنارده کراوە بۆ ناوچەکانی دەوروبەریەوە.([7])

- مزرەمەنی: لەوانەش نارنج و ترنج کە لە شەنگاڵ زۆر بووە،([8]) لیمۆ و شەمامە و کاڵەك و گوندۆرە لە سیروان و سەمێرە([9])

-زەیتوون: لە شاری سەمێرە چێنراوە،([10]) هەروەها لە ماردین سوود لە رۆنەکەی وەرگیراوە کە یاقوت بە دیرە شیعرێك باسی دەکات و دەڵێت:

یاخزر تغلیب ان اللوم حالفکم ما دام فی ماردین الزین

- گوێز: وڵاتناسەکان هەردوو شاری سیروان و سەیمرەیان([11]) بە دیارترین شوێن ناوبردووە لەوەی گوێزی زۆر بووە، هەروەها شەنگاڵ کە چیاکانی بە پیت ترین شوێن بووە بۆ گوێز و بادام کە بە ناولەپ شکێنراوە کە لەسەر زاری یەکێکیانەوە ئەوە

---

١ - الجاحظ، التبلر بالتجارة، ل٣٤. الاصطخري، المسالك والممالك، ل٨٧-٢٠٠.

٢ -یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١٧٣.

٣ -هەمان سەرچاوە، ل١٧٣، القزويني، اثار البلاد، ل٣٧٥.

٤ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٣.

٥ - الجاحظ، التبلر بالتجارة، ل٣٤. الاصطخري، المسالك والممالك، ل٨٧-٢٠٠.

٦ - القزويني، اثار البلاد، ل٣٥٧.

٧ - یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٦٤.

٨ - هەمان سەرچاوە، ج٥، ل٧٨.

٩ - دەستنبویە، جۆرێکە لە گوندۆرەی زەرد، بە عارەبی دەسنبۆی واتە شەمامە، کە شوەیەکی لێکدراوە لە (دەست) و (بۆن) بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل٦٣. بکە.

١٠ - ابو دلف، المصادر نفسة، ل٢٣.

١١ - ابو دلف، المصادر نفسة، ل٢٣. الاصطخري، المسالك والممالك، ل٢٠٠. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٤.

گوتراوه، واته گوێزەکەی ئەوەندە ناسك بووه.[1] هەروەها لە جەزیرەی ئیبن عومەریش زۆر بووه.[2]

- باوی: لە جەزیرەی ئیبن عومەر و،[3] و چیای شەنگاڵ هەبووه.[4]

- بوندق: ئەمە لە جەزیرەی ئیبن عومەر و[5] حەیزان [6] و بەرزەعە زۆر بووه، هەروەها کەباسی بوندەقەیان کردووە گوتویانە لە بوندقی سەمەرقەند زۆر باشترە.[7]

شابەڕوو: وەکو باس دەکەن حەیزان تاکە شوێن بووه لە هەموو ناوچەکانی وڵاتی عێراق و جەزیرە و شام، کە بەو بەڕووە بەناوبانگ بووه[8].

خورما: چاندنی خورما لە وڵاتی کوردستان بە شێوەیەکی کەم بووه، تەنیا چەند شارێك نەبێت کە خورمای تێدا چێنراوە ئەویش لەچەند ناوچەیەکی بەرتەسك بووه، وەکو ئەستەخری ئاماژەی بۆ کردووە دەڵێ لە شاری حەلوان هەبووه[9]، کە ناوچە جوگرافییەکەی و سروشتی ئاو و هەواکەی یارمەتی دەر بووە بۆ چاندنی ئەو رووەکە، هەرچەند بەفریشی لێهاتووه، بەڵام ناوچەیەکی زۆر گەرم بووه.[10]

لە حەلوان دوو درەختی خورمای بەناوبانگ هەبووە لەسەر رێگەی سابلە، کە ئەمانە بوونەتە سەرچاوەی بەهرەی شیعری بۆ شاعیران، کە گۆرانییان پێدا هەڵگوتووە و یادگارییەکانی خۆیان پێ یاد کردووتەوە.[11]

---

١ - ابن سعيد المغربي، بسط الارضن ل٩٠.

٢ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٣.

٣ - هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

٤ - ابن سعيد المغربي، المصادر نفسة، ل٩٠.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٣.

٦ - ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٢٠٤.

٧ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٨٣.

٨ - ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١٢٤. القزويني، اثار البلاد، ل٣٦٠.

٩ - المسالك والممالك، ل٢٠٠.

١٠ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

١١ - ياقوت، معجم البلدان ج٣، ل١٧٤. القزويني، اثار الابلاد، ل٣٥٧.

هەروەها ئەستەخری باسی هەردوو شاری سەمێرە و سیروان کە تاکە دووشارن هەندێ درەختی خورمایان لێبووە لە هەرێمی چیاکاندا، وەکو دەڵێت: قەسپ و گوێزی هەبووە، کە ئەمە لە شاری سرود و جرۆم نەبووە،([1]) هەروەها لە شاری بندیجین درەختی خورما هەبووە.([2])

لە لایەکی دیکەوە کە باسی هەرێمی چیاکان دەکەن بەناوبانگ بووە بە زەعفەران.([3]) بە تایبەتی لەو شارانەی کەوتۆتە ڕۆژئاوای هەرێمەکەوە وەکو نەهاوەند و قرمسین و رۆزراور، کە هەتا هەندێ لە ناوچەکە بەوە ناسراوە و ناویان بە (خاکی زەعفەران ناوبردووە).([4])

بەڵام دانەوێڵە: بێگومان ناوچەیەکی بەرفرەوان لە خاکی کوردستان بەکارهێنراوە بۆ چاندنی دانەوێڵە، بە تایبەتی چاندنی گەنم، کە مادەیەکی سەرەکی گوزەران بووە دوای ئەوەی کردوویانە بە ئارد و ئینجا نان، کە ئەمە خۆراکی سەرەکیی کوردەکان بووە، لە دوای ئەویش جۆ گرینگی خۆی هەبووە.

دیارە گەنم و جۆ لە ناوچەی کوردستان چێنراوە بە تایبەتی لە هەرێمی جەزیرە وەکو نەسیبین و بازبدی و باعەدرێ و جەزیرەی ئیبن عومەر.([5]) کە ئیبن حوقەل جەخت لەوە دەکاتەوە کە ناوچەی نەسیبین بە شێوەیەکی بەرفرەوان گەنم و جۆی تێدا چێنراوە.([6])

بێگومان زۆری خێر و بێری جەزیرە و زۆری کشتوکاڵ بە تایبەتی کشتوکاڵی گەنم و جۆ لە هەموو ناوچە و دێهاتەکانیدا وای کردووە کشتیارەکانی داهاتێکی زۆریان بێت،

---

١ - المسالك والممالك، ل٢٠٠. (سرود جروم) دوو وشەی کوردین و بە عارەبی کراو، ئەوانیش لە وشەی (سارد) و(گەرم) هاتوون.

٢ - ياقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٣٩٣.

٣ - زەعفەران گیایەکی ناسراوە وەکو پیاز وایە، سەلکەکەی دەگوشرێت و دەکرێتە شەربەت وەکو شیر. القزويني، عجائب المخلوقات وغرائب الموجودات (القاهرة: ١٩٥٦) ل٢٨٥. هتر لتو رووةكة بؤيتى زةعفتران وةردةطيريَت.

٤ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٩٩. ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل٢٣٦. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٣.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩١-١٩٧-١٩٩-٢٢٩.

٦ - هەمان سەرچاوە، ل١٩١.

که ئەمە بۆ دەوڵەت سوودێکی زۆری هەبووە لەو باج و خەراجەی دەسکەوتی بووە.([1])
بەڵام ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان ئەوا بە چاندنی گەنم بەناوبانگ بووە و ناوچەیەکی بەرفرەوان بەو کشتوکاڵە داچێنراوە.([2])

بەڵام سەبارەت بە کشتوکاڵی زستانە لە وڵاتی کوردستان، ئەوا دیسان ئەو کشتوکاڵەش چالاك بووە بەهۆی ئەو بارانە زۆر و بەخوڕەی داباریوە و هەندێ جار بە لافاو کۆتایی هاتووە، بۆیە دانیشتووانی جەزیرە ئەو سەرچاوە ئاوییەیان بەکارهێناوە بە ڕێگەی (کۆکردنەوەی لە گۆماو و قۆرتی بیر و کانیاو)([3]) و بەکارهێنانی لە کاتی پێویستیدا.

سەبارەت بەو بەرهەمانەی چۆتە نێو بواری هەندێ پیشەسازییەوە، ئەوا ئیبن فەقێی هەمەدانی ئاماژە بۆ ئەو لۆکەیە دەکات کە ناوچەی هەرێمی چیاکان بە شێوەیەکی گشتی پێی بەناوبانگ بووە،([4]) هەروەها یاقوت ئاماژە بۆ چاندنی قامیشی شەکر دەکات لە شاری ئازج لە هەرێمی خۆزستان، کە کوردی لووڕ لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوونە، بە شێوەیەك کە قامیشی شەکری ئەو ناوچەیە زۆر باشتر بووە لە هەموو جۆرەکانی قامیش لەناوچەی ئەهواز بە ڕێژەی چوار بۆ هەر دەیەیەك.([5])

بەڵام سەبارەت بە ئامرازەکانی ئاودێری کە کورد بەکاریان هێناوە هەندێ لە وڵاتناسەکان باسییان کردووە و ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە یان ئەوەتەیە ڕێگەی جۆگەی دەستکردیان بەکارهێناوە یان لە ڕێگەی بارانی وەرزییەوە، ڕێگەی یەکەم زۆر بەربڵابووە لە شارەکانی جەزیرە وەکو نەسیبین و سەرێ کانی و ئەوانی دیکە، هەروەها لە شاری شەنگاڵیش.([6])

---

١ - هەمان سەرچاوە، ل١٩٦-١٩٧.

٢ - المقدسي، احسن التقاسيم، ل٣٠١.

٣ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢.

٤ - مختلر كتاب البلدان، ل٢٣٢.

٥ - ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل٢٢٩.

٦ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢.

کە ئەو ئاودێرییە پشتی بە ئاوی هەڵقوڵاو لە کانیاو و جۆگە یان ئەو ئاوەی لە بەرئەنجامی باران و کۆبوونەوەی لە رووبار و کارێزەکانەوە رژاوە.([1]) بە تایبەتی لەکاتی بێبارانیدا.([2])

هەروەها یاقوتیش ئاماژە بۆ کشتوکاڵی شاری ئایزج دەکات کە پشتیان بە باران بەستووە.([3])

ت- سامانی ئاژەڵی:

بەخێوکردنی سامانی ئاژەڵی پیشەیەکی تەواوکاری کشتوکاڵە و پێوەستە پێیەوە، کە ناکرێ یەك لەوەی دیکە دابېرێت، سەبارەت بەوەی پێوەندیی بە وڵاتی کوردستانەوە هەیە، ئەوا زۆر دەوڵەمەند بووە بە سامانی ئاژەڵی، ئەمەش بۆ ئەو سروشتە لەبارە دەگەڕێتەوە کە گونجاو بووە بۆ پیشەی شوانکارەیی.

ئەستەخری و ئیبن حوقەل باسی گوندنشینەکانی کورد و عارەبان دەکەن کە لەو ناوچەیەی کەوتۆتە نێوان دەسکرە و حەلوان کە ناسراو بووە بە کەمی شوێنی نیشتەجێ، کردوویانەتە شوێنی لەوەڕاندنی ماڵاتەکانیان.([4]) هەروەها ناوچەی شارەزوور بە شوێنی شوانکارەیی بە پیت و بەناوبانگ بووە، کە ئەبو دەلف ئاماژەی بۆ دەکات و دەڵێت: نێزیکەی شەست هەزار ماڵی خێڵەکان لە ناوچەی شارەزوو خەریکی شوانکارەیی بوونە کە مەڕ و ماڵاتیان تێدا بەخێو کردووە.([5])

ئەو بارودۆخە سەرنجی وڵاتناسەکانی راکێشاوە بە تایبەتی ئیبن حوقەل کە وەکو گەواهیدەرێك ئەوە باس دەکات. ئیبن حوقەل دەڵێت لە شاری نەسیبین مەڕێکی زۆر

---

١ - کارێز: زەوی هەڵدەکۆڵن تا دەگاتە ئاوەکە و ئینجا ریزە بە ڕیزە بیری بۆ هەڵدەکەنن تاکو ئاوەکە لە شوێنێك سەر زەوی دەکەوێت.

٢ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢.

٣ - معجم البلدان، ج١، ل٢٢٩.

٤ - المسالك والممالك، ل٦١، صورة الارض، ل٢١٩-٢٢٠.

٥ -الرسالة الثانية، ل١٨-٢٠.

هەبووە، هەروەها لە ناوچەکانی مووسڵ و دەوروبەری ماڵات و مەڕی زۆرییان هەبووە.([1])

لە لایەکی دیکەوە ئیبن حوقەل بەراوردێك لە نێوان هەردوو شاری ماردین و هەندێ شاری دەوروبەری دەکات لە چەند ڕوویێکەوە لەوانە: سەرکەوتوویی لە رووی سامانی ئاژەڵییەوە، نەك وەك شارەکانی ئەرزن و میافارقین کە خاڵی بووە لە بەخێوکردنی ئاژەڵ و سەر ئاژەڵییان زۆر کەمبووە.([2])

باسی ناوچەکانی جەزیرە و دەوروبەری بە شێوەیەکی گشتی دەکات کە (زۆر قەرەباڵغ و گوندی زۆر بووە و ماڵاتیشی زۆربووە)([3]) وەکو مەقدەسی کە باسی هەرێمی جەزیرە دەکات کە زۆر بە بەرهەم بووە.([4])

هەر ئەوەش سەرنجی ئیبن جەبیری گەڕیدەی ڕاکێشاوە لە دووتۆی سەردانیکردنی شاری دنەیسر لە ناوچەی دیاربەکر کە مەڕ و ماڵاتێکی زۆری هەبووە، وەکو دەڵێت: بینیمان مەڕ و ماڵاتێکی زۆری لێبووە، کە خەڵکەکەی خەریکی بەخێوکردنی بووە.([5])

دیارە کوردەکانی هەرێمی چیاکان بە پلەی یەکەم پشتیان بە بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات بەستووە،([6]) بەڵام نیشتەجێبووەکانی ناوچەی فارس، ئەوا (خاوەنی مەڕ و مایین و ئێسترییان کەمبووە).([7])

بەڵام کوردەکانی مازنجان ئەوانەی کە لە سنووری ئەسفەهان نیشتەجێ بوونە، ئەوا خاوەنی مایینی کەحێل بوونە، زۆربەیان خاوەنی زین و لغاو و کەلوپەلی خۆیان بوونە.([8])

---

١ -صورة الارض، ل١٩٦.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل٢٠٣.

٣ - هەمان سەرچاوە، ل١٩٦.

٤ -احسن التقاسيم، ل٤١.

٥ - رحلة ابن جبير، ل٢١٧.

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٢٠٣.

٧ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٤٠.

٨ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٤٠.

ئیبن حوقەل کە باسی شاری مەرج قەلا لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان دەکات بەوەی کە (مەڕی بەلاشبووە).([1]) لەبەرئەوەی مەڕی ئەوەندە زۆر بووە، لە رووی نرخەوە زۆر هەرزان بووە.([2])

بەڵام کوردەکانی نیشتەجێ شوێنەکانی دیکە، وەکو دەردەکەوێت ئەوانیش گرینگییان بە سامانی ئاژەڵی داوە وەکو باسی کوردەکانی شاری ئەشترج (ئەندخز) لە هەرێمی خۆراسان دەکرێت بۆ نموونە: بەوەی (خاوەنی مەڕ و ماڵات و ئیستر بوونە).([3])

أ- کانزا و کانیاوەکان لە وڵاتی کوردستان:

لە پەڕتووکە وڵاتناسەییەکان دەردەکەوێت کە وڵاتی کوردستان بە یەکێك لە وڵاتە دەوڵەمەندەکان دەژمێردرێت لە رووی سامانی کانزاییەوە، کە چەندان جۆر لە کانزا و کانیاوی کانزایی تێدایە.

بۆیە لە پێشەوەی وڵاتناس و گەڕیدەکان ئەوانەی ئاماژەیان بە شوێنەکانی کانزایی دابێت ئەستەخری و ئەبو دەلف و یاقوت بوونە، ئەستەخری دەڵێت لە چیاکانی ماردین گەوهەر و شووشە هەیە.([4]) لە رووی جۆر و باشییەوە لە هەموو گەوهەرەکانی دیکە باشترە.([5]) لە چیای بارما (حمرین) چاوگەی نەوت و قیر هەیە.([6])

---

١ - هەمان سەرچاوە، ل٣٠٦.

٢ - ئەوە بەڵگەی زۆری مەرو ماڵات و ئەسپ بووە لە ناوچەی میری کوردستان بەدر کوڕی حەنوسی (٣٦٩-٤٠٥ك/٩٧٩-١٠١٤ز) کە بە کارە خێو چاکەکارییەکانی ناسراوە کە لە پێناوی خودا نێزیکەی هەزارو حەوسەد ئێسترو هەزار سەر مەڕی بەخشیوە. ابن الجوزي، المنتظم في اخبار الملوك والامم، (حيد اباد ١٣٥٧ه) ج٧، ل٢٧٢. ابن كثتير، البداية والنهاية، (القاهرة:١٩٨٨) ج١١، ل٣٥٤.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٥٣. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٧٠.

٤ - المسالك والممالك، ل٧٢.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩٤.

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٧٥. ياقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٢٥٥.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەستەخری ئەوەی ڕەتکردووەتەوە کە لەسەرجەم وڵاتی هەرێمی چیا کانزای زێڕ و زیو و هەبێت.[1] کە دواتر ئاماژە بەو شوێنانە دەکەین کە لە (چییایەك کانزای زێڕ هەبێت).[2]

ئیبن فەقێی هەمەدانی تێبینی ئەوەی کردووە لە بوونی کانزای ئاسن لە چیای ئامەد، هەروەها سەرنجی ئەوەی داوە کە شێوەکەی موگناتیسیبووە، کە لێکۆڵینەوەیەکی باشی لەو بارەیەوە نووسیوە و دەڵێت: (لە شتە سەرسامەکانی چیای ئامەد ئەوەبووە کە خەڵکی ئەو ناوچەیە تووشی لاربوونەوە بوونە، ئەوەی شمشێری راکێشاوە و دەرهێناوە تووشی لاربوونەوە و راکێشان بووە و شمشێرەکەی لەدەستی بەربۆتەوە، ئەگەر ئەوە بەهێزترین پیاویش بووبێت). دواتر باسی شتێکی دیکەی سەرسوڕمان دەکات کە ئەو چیایە (هەتا چەقۆ یان ئاسن یان شمشێر بەو چیایە دابهێنرێت، ئەوا هەڵگرتنی ئەو شمشێرە یان ئەو چەقۆیە ئاسنە راکێشانی زیاتر دەبێت لەوەی کە موگناتیس هەیەتی، شتێکی دیکەی سەرسوڕمان ئەوەیە کە بەردی ئەو شوێنە ئاسنی راکێشاوە، کاتێ چەقۆ یان شمشێریان لێخشاندووە، ئەوا ئاسنی راکێشاوە، شتێکی دیکەیشی هەبووە ئەگەر سەد ساڵ پێیەوە مابێتەوە، ئەوا هەمان هێزی هەر هەبووە و ماوەتەوە.[3]

ئەمە سەرەڕای ئەوەی لەوەی پێشەوە باسمانکرد و سەرنجمان لێدا لەوەی تا چەند ئەوە زیادەڕۆیی تێدایە لەو شێوازەی کە ئیبن فەقێی هەمەدانی باسی کردووە، بەڵام جەخت لەوە کراوەتەوە کە چیای ئامەد بەوە ناسراوە کە ئاسنی زۆر و ڕێژەی موگناتیسیەکەیشی زۆر بووە.

هەروەها ئاسن لە شاری (حانی) هەبووە لە دیاربەکر و هەناردە کراوە بۆ ناوچەکانی دیکە،[4] لە شاری هروری چیاییش هەبووە کە کەوتۆتە باکووری مووسڵ.[5] ئەمە سەرەڕای ئەوەی مادەی مۆمیشی هەبووە.[1]

---

١ - المسالك والممالك، ل٢٠٣.

٢ - الاقاليم، ل٨٨.

٣ - مختلر كتاب البلدا، ل١٢٧. ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل٥٦.

٤ - ياقوت، معجم البلدانن ج٣، ل١١٠.

٥ - هەمان سەرچاوەو، ج٨، ل٤٧٦.

له لایەکی دیکەوە ئەبو دەلف ئاماژە بۆ بوونی ئاسن دەکات له شاری ئایزج بەبێ ئەوەی جۆرەکەی دیاری بکات.([2]) هەروەها دەڵێت له شاری خانەقین کانیاوی نەفت هەبووە و زۆر دەوڵەمەند بووە.([3]) واته گرینگییه ئابوورییەکەی زۆر بووە.

یاقوت ئاماژە بۆ بوونی هەندێ بەرد دەکات له شوێنێك که نێزیك له کەندی کورد بووه له نێزیك دەریاچەی ئورمییه.([4])

ئەوە شتێکی سروشتی بووە بوونی کانزا له وڵاتی کوردستان وای کردووە پیشەسازی کانزاکاری هەبێت و ببێته هۆی پڕکردنەوەی پێداویستی دانیشتووانەکەی تا ئاساتێکی باش.

بەڵام کانیاوە کانزاییەکان له وڵاتی کوردستان جۆراو جۆر و له چەند شوێنێك هەبوونه وەکو له پەڕتووکەکانی وڵاتناسیدا هاتووە، وەکو ئەبو دەلف یەکێکه لەوانەی سەرنجی سوود و قازانجی ئەو کانیاوانەی داوە له رووی تەندروستییەوە، هەروەکو تێبینیش دەکرێت ئەو گەڕیدەیه له رووی بزیشکیەوە گرینگی بەو شتانه داوە.

ئەبو دەلف باسی شاری ئاریۆجان دەکات که سەر به ناوچەی میهرناقەزەق بووە که کەوتۆته دەشتاییەکەوە له نێوان ئەو چیایانەی ئاوی گەرم و کبریت و شووشه و گردی خوێی لێبووە.([5]) هەروەها ئاماژە بۆ شوێنەوارە کاریگەرەکانی تەندروستی دەکات که ئاوی ئەو کانیاوانه له لایەن خەڵکییەوە بەکارهێنراوە بۆ نەخۆشییەکانی سکچوون و سەریەشه و شتی دیکە.([6])

هەروەها له کەندی کورد که به تەنیشت شاری سەلماسەوە بووە، کانییەك هەبووە ناسراوە به (زەراوەند) وەکو باسی دەکەن زۆر بەسوود بووە و هەموو لایەك کۆك بوونه لەسەر ئەوەی که ئەوەی لەو کانیاوە دەرچووە ئاوی کانزایی بووە لەو زەوییەدا، ئەوەی

---

١ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٢ -الرسالة الثانية، ل٤١. ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل٢٢٩.

٣ - الرسالة الثانية، ل٢٠، ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٢١١.

٤ - ياقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٤٧١.

٥ - الرسالة الثانية، ل٢٣. ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٣٨.

٦ - الرسالة الثانية، ل٢٣، ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٩٦.

شیفای بۆ هاتبێ بەو ئاوە لە زۆر نەخۆشی دیکە چاکبۆتەوە، ئەوەی جێگەی سەرسامیش بووە ئاوەکەی زۆر زولاڵ و سارد بووە.([1])

هەروەها باسی شاری ماسبزان دەکەن بەوەی کە کانیاوی کبریت و شووشە و گردی خوێی زۆر بووە، هەروەها کانیاوی وای تێدا بووە جێگەی مەترسی بووە، کە خڵتی زۆر بووە، ئەوەی خواردبایەوە تووشی ژانە سەر و سکچوونێکی توندی دەکرد.([2])

هەروەها لە دەوروبەری شاری حەلوان چەند کانیاوێکی کبرێتی هەبووە بۆ چەندان نەخۆشی باش بووە.([3])

لە گوندی (تەرجەلە) کە کەوتۆتە نێوان ئەربل و مووسڵ (کانیاوی کبرێتی و ئاوی زۆر هەبووە).([4]) لە شاری سەرێ کانیش لە هەرێمی جەزیرە (کانیاوی وا هەبووە ئاوەکەی سەوز بووە و بۆنی خۆش نەبووە، کە لە رووبارێکی بچووك هەڵقوڵاوە و لە دەوری بیرێك فوارەی داوە و لەگەڵ کانیاوێکی دەرەوە تێکەڵبۆتەوە لەیەك شوێندا). دواتر لە شوێنێکی دیکە هەڵقوڵاونەتەوە و رووباری خابووریان پێکهێناوە.([5])

مەقدەسی زۆر سەرسام بووە بە بوونی کانیاوێك لە شاری نەسیبین کە تێیدا کلسی سپی هەڵقوڵاوە و بەکاریان هێناوە لە گەرماو و ماڵاندا.([6]) واتە وەکو بەکارهێنێکی خاوێنکەرەوە.

ب- پیشەسازی لە وڵاتی کوردستان:

لە وڵاتی کوردستان وەکو سەرجەم وڵاتانی دیکە چالاکی بازرگانی تەنیا لەسەر شمەك و کەلوپەلی سادەی ناوخۆیی بووە وەکو ئەو شتومەکانەی لە پیشەسازی بەرهەمەکانی کشتوکاڵی و ئاژەڵی و کانزاییەوە بووە.

---

١ - الرسالة الثانية، ل١٤ز ياقوت، معجم البلدانن ج٤، ل٤٧١.

٢ - القزويني، اثار الابلاد، ل٢٦٠.

٣ - هەمان سەرچاوە، ل٣٥٧.ياقوت، معجم البلدانن ج٣، ل١٧٣.

٤ - ياقوت، معجم البلدا، ج٢، ل٤٣٧.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٨٠.

٦ - احسن التقاسيم، ل١٢٩.

لەبەر زۆری داری بەرهەم لەو وڵاتەدا بۆیە کشتیاری وەبەرهێن هەندێ لەو بەرهەمانەی لە بواری کارگە دەختەکار بۆ بەکارهێنان یان بۆ هەناردەکردن بۆ دەرەوەی ناوچەکەی خۆی، وەکو جۆرەکانی پیشەسازی مرەبا و رۆن و شیرنەمەنی و خوردانەوەکان.

هەروەها لەو وڵاتەدا هەندێ پیشەسازی رستن و چنینی کەتان و لۆکە هەبووە، هەروەها پیشەسازی رۆن و سابوون و هەندێ پیشەسازی دیکەی وەکو دانەویلە و بەردی کلسی هەبووە، ئەمە سەرەڕای بەرهەمەکانی سامانی ئاژەڵی کە هەندێ ناوچە پێی بەناوبانگ بووە و یارمەتی ئەوەی داون کە بەرهەمە ئاژەڵیەکانیان جۆراوجۆر بێت لە ماست و پەنیر و گۆشت و پێستەوە.

لەبەر زۆری ماڵاتەکانیان بەرهەمی سوف و خوری بە بڕی زۆر بەرهەم هاتووە، بۆیە کارگەی رستن و چنین و سوف و خوری دامەزراوە، بۆ دروستکردنی کوتاڵ و لباد و مافور و شتی دیکە.

لە لایەکی دیکەوە لەبەر فرەوانی پانتایی دارستانەکان و درەختی زۆر، ئەوە کاریگەری هەبووە بۆ دروستکردنی کارگەی تەختە، هەروەها لە هەندێ ناوچە کارگەی کانزاکاری هەبووە وەکو ئاسن و برۆنز و زیو و شووشە.

هەر لەو بارەیەوە وڵاتناسەکان باسی زۆرێك لەو پیشەسازیانەیان کردووە لەگەڵ دیاری کردنی ناوچە و شوێنی پیشەسازییەکە، وەکو ناوبانگی ناوچەی هەرێمی چیاکان بە پیشەسازی ماست و پەنیر بە تایبەتی ئەو ناوچانەی بەرهەمەکەی زۆر باش بووە و گەیشتۆتە لووتکە وەکو ئەستەخری باسی دەکات،([1]) هەروەها مەقدەسی ئاماژە بە پەنیری دەینور دەکات.([2]) هەروەها شاری رۆزراور لە رۆژئاوای هەرێمی چیاکان بە زۆری بەرهەمی پەنیر بەناوبانگ بووە.([3])

لە گێڕانەوەیەکدا ئیبن سەعد باس دەکات کە بازرگانێك هەبووە پەنیری شاری حەلوانی بردووە بۆ شاری کوفە.([4]) هەروەکو ئیبن حوقەلیش ئاماژە بۆ گرینگی

---

١ -المسالك والممالك، ل١١٨.

٢ - احسن التقاسيم، ل٣٠٤. دائرة المعارف الاسلامية مادة (دينور) ج٩، ل٣٧٢.

٣ - hudud-alam,p.132

٤ - الطبقات الكبرى، (بيروت:١٩٨٠)ج٩، ل٣٨٥.

پیشەسازی ماست و پەنیری دانیشتووانی هەرێمی چیاکان دەکات بە شێوەکی گشتی و دەڵێت: بە زۆری خەڵکی چیاکان مەڕیان بەخێو دەکرد بۆ ماست و دۆکەیان، ئەوانە خاوەن ماستی بەتام و چێژ بوون و.([1]) پەنیرەکەیان لە رووی جۆرەوە زۆر باش بوو بۆ زۆربەی ناوچەکانی ئەو ناوە هەناردە کراوە.([2])

بۆیە مەقدەسی هەرێمی چیاکان جیادەکاتەوە لە هەموو هەرێمەکانی دیکە لە رووی (باشترین جۆری ماست و هەنگوین و نان و زەعفەران).([3]) هەروەها جاحز و ئیبن فەقێی هەمەدانی لەو کەسانە بوونە کە زۆر سەرسام بوونە بە ناوچەی چیاکان لە رووی بەرهەمەکانی پەنیر و لۆرو ماستەکەیەوە.([4])

هەروەها ناوچەی جەزیرە بە پیشەسازی شیرەمەنی بەناوبانگ بووە، لەو شارانەی کە بەو بەرهەمانە بەناوبانگ بووە مووسڵ و مەعلاسیا و حەسەنیە.([5]) کە بە پەنیر و کەلوپەلی ناوماڵ بەناوبانگ بووە،([6]) هەروەها نەسیبین بە ماست و دۆ بەنابانگ بووە،([7])

دیارە مەقدەسی ئاماژە بە پیشەسازی رۆن و میوەی وشککراوەی هەردوو شاری نەسیبین و حەسەنیە دەکات.([8]) بۆ سوود وەرگرتن لەو میوەجاتانە لە هەموو وەرزەکان، هەروەها ئاماژە بە حەلوای باش دەکات کە لە شاری هەمەدان دروستکراوە.([9])

بەڵام پیشەسازی رستن و چنین و لۆکە لە چەندین شوێنی وڵاتەکە هەبووە وەکو وڵاتناسەکان ئاماژەیان بۆ کردووە، شاری ئامەد یەکێك بووە لەو شارانەی بە پیشەسازی

---

١ - المايستنج : به كوردى (ماست)

٢ - صورة الارض، ل٣١٧.

٣ - احسن التقاسيم، ل٤١.

٤ - التبلر بالتجارة، ل٢٥. مختلر كتاب البلدان، ل٢٣٢.

٥ - المقدسي، ملد سابق، ل١٢٨.

٦ - ماستی مەیی. قاموس المحيط، ج٦، ل؟

٧ - . قاموس المحيط، ج٦، ل؟

٨ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٨.

٩ - احسن التقاسيمن ل١٢٨.

کوتاڵی خوری و مەرەز و پەڕتووکی ڕۆمی لەسەر شێوەی سەقلی هەبووە،([1]) چونکە بزنی مەرەزی زۆر بووە.([2]) لە شاری ماردنیش کوتاڵ بۆ زۆربەی ناوچەکانی دەوروبەر هەنارده کراوە.([3]) وەکو مەقدەسیش باس دەکات هەرێمی ئاقوور (جەزیرە) یەکێك بووە لە بەناوبانگترین ناوچەکان لە رووی لۆکە و پێستەوە.([4])

هەروەها یاقوتیش باسی جۆرە کوتاڵێك دەکات، کە لە شارۆکەیەکی نێزیك ئەربل بەرهەم هاتووە، وەکو باسی دەکات جۆرەکەی نەسافی بووە (حەزیە) لە لۆکە دروستکراوە و زۆر باش نەبووە.([5])

شاری تستریش (شۆشتەر) کە کوردی لووڕی تێدا نیشتەجێ بووە لە هەرێمی خۆزستان بە کوتاڵی تستەر هەمان ناوی شارەکەی هەبووە بەناوبانگ بووە، ئەو کوتاڵە ئەوەندە بەناوبانگ بووە هەتا لە شارەکانی بەغدا بە ناوی (تۆستەرییەکان) ناوی هاتووە، کە کەوتۆتە لای ڕۆژئاوای نێوان رووباری دجلە و دەرگەی بەسرە، کە تۆستەرییەکان تێیدا نیشتەجێ بوونە و کوتاڵی تۆستەرییان بەرهەمهێناوە.([6])

ئیدریسیش باسی شاری میافارقین دەکات کە بە پیشەسازی (تکەك)([7]) بەناوبانگ بووە، رەنگە ئەمە زۆر باشتربووبێت لەوەی لە شاری سەلماس بەرهەم هاتووە. کە جامانە و هەوری تێدا دروستکراوە.([8])

---

١ - هەمان سەرچاوە، ل٣٠١.

٢ - مەرعەز، بە کوردی پێی دەڵێن مەرز، کە بە مووی بزنی مەیلەو سوور دەگوترێت.

٣ - ابن السعيد المغربي، بسط الارض في الطول والعرض، تحقيق: قرنيط معهد مولاي حسن، (تطوان:١٩٥٨) ل٩٠.

٤ - احسن التقاسيم، ل١٢٩.

٥ - احسن التقاسيم، ل١٢٩، المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٩.

٦ - ياقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٤٤٤.

٧ - تکەك: قوماشێکی درێژ بووە، لەسەر شەروال بەستوویانە وەکو بە کوردی پێی دەڵێن پژدێن. المعجم المفلل، ل٨٢.

٨ - نزهة المشتاق، قسم الجزيرة والعراق، تحقيق: ابراهيم شوكتن مجلة الاستاذ، كلية التربيتن (جامعة بغداد: ١٩٦٣) مج١١، ل١١.

لە شاری دبیل (دوین)یش کە زۆربەی شارەکە کوردی تێدا نیشتەجێ بووە، جۆرەها کوتاڵی خوری تێدا بەرهەم هاتووە لە رایەخ و لباد و سەرین و چەندان جۆری دیکە، کە خورییەکەیان بە رەنگی قورمزی رەنگ کردووە.([1])

بەڵام ئەوەی لە درەخت دروستکراوە، وەکو مەقدەسی باسی دەکات لەبەر زۆری درەخت لە هەرێمی چیاکان (لە زستان دار و خەلووز زۆر بووە)([2]) وەکو باسی دەکەن لە شاری نەهاوەند درەختی بی (شەنگەبی) باش هەبووە([3]) کە بۆ دروستکردنی گۆپاڵ بەکارهێنراوە.([4]) کە ئەو درەختە لە وێنەی نەبووە لە هیچ شوێنێکی دیکە لە رووی باشییەوە.([5])

لە دەقێکدا دەردەکەوێت کە ئیبن فەقێی هەمەدانی باسی کردووە هەندێك لە شارە کوردییەکان لەسەردەمی ساسانییەکان بە پیشەسازی چەك بەناوبانگ بووە وەکو دەڵێت: قوباز کوڕی فەیرۆز هەرێمەکەی .. وەکو زانیومانە خەڵکی چوار هەرێمەکەی بە دروستکردنی چەك بەناوبانگ بووە ئەوانیش: هەمەدان و حەلوان و ئەسبەهان و شارەزوور بوونە.([6])

هەروەها ئیبن فەقێی هەمەدانی لە بابەتێکی دیکەدا باسی خەڵکی هەمەدان دەکات کە چالاك بوونە لە پیشەیەکی دیکە وەکو قاپ و قاچاغ و مەنجەڵی مس و کەوچك و شتی دیکە، هەروەکو باسیان دەکات کە (لە هەموو خەڵکی سەرڕووی زەوی سەرکەوتووتر بوونە).([7])

مەقدەسی کە باسی شاری شەنگاڵ دەکات لە سەدەی چوارەمی کۆچی بەوەی کە (کڵاشی زۆریان هەبووە)، زۆرێك لە خەڵکی ئەو شارە کەوشدروو بوونە، ئەوەی زۆر جێگەی سەرنجە بەکری کە یەکێکە لە وڵاتناسەکانی وڵاتی مەغریب تەنیا ئەو نەبێت لە

---

١ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٨٨. حدود العالم، ل١٩٩.

٢ - احسن التقاسيمن ل٢٩٥.

٣ - شجر خلاف: داری بي، شتنطة بي، الرائد، ج١، ل٦٣٧.

٤ - سوالج: طؤثالَ. الرائد، ج١، ل٦٣٧.

٥ -ابو دلف، المصادر نفسة، ل٣٠. ياقوت، معجم البلدان، ج٩، ل٤٠٩.

٦ - مختلر كتاب البلدان، ل١٤٩.

٧ - مختلر كتاب البلدان، ل١٤٢.

وڵاتناسەکان باسی پیشەسازییەکی گرینگ دەکات لە شاری (ڕەها) ئەویش پیشەسازی کاغەزە.([1]) وەکو باسی دەکات کە (زۆر گونجاو بووە بۆ کاغەزی پەڕتووك).([2])

هیچ جێگەی نامۆیی نییە ئەگەر ئەوە بزانین شاری ڕەها لە پێش ئیسلام لە دیارترین شوێنی ئاینی ئاشووری بووە لە ناوچەکەدا. کە قوتابیانی زانست لە شوێنەکانی دیکەوە روویان تێکردووە بۆ ئەوەی لەسەر دەستی کەسانی زانای ناوچەکە زانستی ئاینی بخوێنن.([3])

گەرەکمانە بابەتی پیشەسازی بە پیشەسازی شەراب و خواردنەوە گازییەکان کۆتایی پێبهێنین کە هەندێك لە ناوچەکانی جەزیرە کە زۆربەیان خاچ پەرست بوونە وەکو دێر حویشا لە شاری سەعرت، کە شەرابەکەیان زۆر بەناوبانگ بووە.([4]) هەروەها دێر ئاکمن کە لە نێزیك چیای جودی بووە کە شەرابەکەیان بە (زۆر باش بووە).([5])

بەڵام لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان لە شاری قرمسین بە (فقاع: بیرەی جۆ)([6]) بەناوبانگ بووە.([7])

ت- بازرگانی و بازاڕ:

أ- بازرگانی:

بەرفرەبوونی هەندێ لە بەرهەمە ئابوورییەکان لە ناوچە جیاجیاکان و نەبوونی لە هەندێکی دیکەدا، پێویستی بەوە بووە جۆرە ئاڵوگۆڕییەك لەو بەرهەمانەدا بکرێت لە نێوان ئەو وڵاتانە و ناوچەکانی دیکەدا، وەکو ئیبن فەقێی هەمەدانی باشترین دەستەواژە بەکاردێنێت کە دەڵێ: (ئەگەر خودای گەورە بە لوتف و کەرمی خۆی هەر وڵاتێك لە وڵاتان و هەرێمێك، بەرهەمێکی پێ بەخشیبێت جیا لەوەی دیکە، ئەوا بازرگانی بوونی نەدەبوو و، پیشەسازی باری دەکرد، هیچ کەسێك نامۆ نەدەبوو و، هیچ پیاوێك گەشتی

---

١ - احسن التقاسیمن ل١٢٤.

٢ - معجم ماستعج، ج٢، ل٦٧٨.

٣ - بروانة: احمد میرزان، هةمان المصادر نفسةنل٦٢. بکةز

٤ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٣٢.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٣٤.

٦ - فقاع: شەرابێك بووە لە ئاوی جۆ دروست کراوە، المعج الوسیط، ج٢، ل٧٠٥.

٧ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٠١.

نەدەکرد، لە دوایشدا هیچ جۆرێك لە کڕین و فرۆشتن و ساتوسەودایی نەدەبوو، بەڵام خودای گەورە و میهرەبان بۆ هەر ناوچەیەك جۆرە خێر و بێر و بەرهەمێکی پێ بەخشیوون، بۆ ئەوەی کەسانی ناوچەکانی دیکە گەشت بۆ ئەو وڵاتە بکەن و خەڵکی ئەو وڵاتە هەست بە جۆرە چێژ و تامێك بکەن و بتوانن پێداویستیەکانی خۆیانی تێدا دەستەبەر بکەن).([1])

ئەو ماوەیەی تۆژینەوەکەی تێدا ئەنجام دراوە هەست بە گەشانەوەیەکی ئابووری دیار دەکرێت لە دووتۆی ئەمەشدا چالاکی بازرگانی فرەوان کە سەرجەم ناوچەکانی دەوڵەتی عەباسی گرتووەتەوە، کە سیستەمی رامیاری و ئیداری بە لامەرکەزیەت و نەرم و نیانی ناوی دەرکردووە، ئەمەش یارمەتی ئەوەی داوە کە چەندان دەوڵەتۆچکە و میرنشینی ئیسلامی لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات سەرهەڵبدەن، هەر ئەمەش وای کردووە لە نێوان ئەو ناوچە و هەرێم و میرنشینانەدا جۆرە پێوەندییەکی بازرگانی توند و تۆڵ لەگەڵ ناوەندی دەسەڵاتی جێنشین سەرهەڵبدات.

وڵاتی کوردستانیش لە نێوان ئەو ناوچانەدا بووە کە چالاکییەکی بازرگانی باش و جۆراوجۆری بەخۆوە بینیوە، ئەویش لەبەر زیادبوونی ئەو بەرهەمانەی تێدا بووە، هەر ئەو باشییە ئابوورییە شانسی ئەوەی پێ بەخشیوە کە لەلایەن وڵاتناسە موسڵمانەکان گرینگی زۆری پێبدرێت و ببێتە جێگەی سەرنجی ئەوان و لە لایەکی دیکەشەوە لەبەرە بوونی بازرگانی لەو ناوچەیە گەڕیدەکان سەردانی ناوچەکەیان کردووە.

هەندێ لە گەڕیدەکان شمەك و کەلوپەلیان بۆ ناوچە کوردیەکان بردووە، هەروەها کەلوپەلیشیان لێ هاوردە کردووە. ئەوانەی لێیان هێناوە جۆرەها میوەجات و بەرهەمی کشتوکاڵی و شیرەمەنی و پۆشاك و هەندێ کەلوپەلی دروستکراو بووە لە کانزاکاری و هی دیکە.

وەکو تێبینی دەکرێت مەقدەسی چاکی پێکاوە کاتێ باسی هەناردەکانی ناوچە کوردیەکان دەکات لەو کاتدا، وەکو باس دەکات لەنێو ئەو شتە هەناردەکراوانەدا لە شاری شەنگاڵ بەرهەمەکانی بادام و هەنار و قەسپ و سماق بووە.([2]) لە شاری نەسیبین بەرهەمەکانی میوەجات و چای و بەڕوو بووە، وەکو باسی دەکەن (لە بوندوق گەورەتر و

---

١ -مختلر كتاب البلدان، ل٢٥١.

٢ - احسن التقاسيمن، ل١٢٨.

زۆر شیرین بووە).([1]) هەروەها جەزیرەی ئیبن عومەر گوێز و بادام و بوندق و هەنگوین و گەزۆ و کونجی و پەنیر و هەنجیر و میوژ بووە،([2]) لە کاتێکدا شاری حەسەنیە جۆرەها میوەجاتی بەتام و مێوژی هەبووە.([3]) لە مەعلاسیاش میوەجاتی باشی وەك ترێ و هەنار هەناردەکراوە.([4])

هەروەها مەقدەسی باسی هەرێمی ئاقور (جەزیرە) دەکات بە شێوەیەکی گشتی گەنم و سماق و دەنکە هەناریان هەناردە کردووە،([5]) هەروەها شاری مەعلاسیا بە هەناردەکردنی گۆشتی سوور کراو (لە خوێ نراو) بەناوبانگ بووە([6]) و جەزیرەی ئیبن عومەریش بە هەناردەکردنی گۆشت و ئەسپی کەحێل بۆ دەرەوەی شارەکە بەنابانگ بوو،([7]) شاری حەسەنیەش بە هەناردەکردنی کەو و بولبول ناسراو بووە.([8])

ئەستەخریش گەواخی ئەوە دەدات کە دانیشتووانی مووسڵ شتێکیان نەبوو لە رووباری دیجلە، تەنیا شتێك نەبێت لە کشتوکاڵ لە لای ڕۆژهەڵاتی رووبارەکە کە برێتی بوو لە (چاندنی سەوزایی و میوەجاتەکانیان هەموو دەوروبەرەکەی دەگرتەوە.([9])

لێرەوە تێ دەگەین کە شار و ناوچەکانی کوردنشین و دەوروبەری پێگەیەکی باشیان هەبووە لە هەناردەکردن و پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی شاری مووسڵ لە دانەوێڵە بە تایبەتی میوەجاتەکەی.

لەگەڵ ئەوەشدا مەقدەسی باسی چەندان کەلوپەلی دروستکراو و ئەوانەی دروستکراو نەبوو لە لایەن شاری مووسڵەوە هەناردە دەکرا، وەکو دانەوێڵە و هەنگوین و رەژوو و

---

١ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە. کە بە شابەڕوو ناسراوە.

٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٣ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٤ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە. شەهدانك، بە کوردی شادەنکی هەنا، واتە دنکەکەی زۆر گەورەو جوان بووە.

٥ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٨.

٦ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٧ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٨ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٩ - المسالك والممالك، ل٥٣.

ڕۆن و پەنیر و بادام و سماق و دەنکە هەنار و قیر و ئاسن و ستل و چەقۆ و رم و خەنجەر و ئاسنگەری و ماسی وشك كراوە[1] لەگەڵ زنجیر.[2]

بێگومان ئەو دەقە رەنگدانەوەی توانای بێشوماری شاری مووسڵ و دەوروبەری دەسەلمێنیٚ لە بەرهەمهێنانی هەموو ئەو کەلوپەلە جۆراوجۆرانەی بەرهەمیانهێناوە و لە هەمانکات لە بازرگانیشدا سوودیان لیٚ وەرگرتووە.

یاقوت جەخت لەوە دەکاتەوە کە شاری ئەربل پێداویستی خۆی لە میوەجات و سەوزەوات دابینکردووە لە ژیاکانی دەوروبەرییەوە.[3]

بەڵام ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان بە جۆرەها بەرهەمی شیرەمەنی دانسقە بەناوبانگ بووە، کە تاکە ناوچەبووە لە رووی ئەو بەرهەمانەوە بۆ نموونە پەنیرەکەی گەیشتۆتە کەشکەڵانی فەلەك.[4] بۆیە زیادەی پەنیری شاری رۆزدارەوەر هەناردەی ناوچەکانی دەوروبەری کراوە.[5] کە هەندیٚ ناوچەی کوردەکان لە هەرێمەکە بە هەناردەکردنی میوە و سەوزە ناسراوە وەکو نەهاوەند کە میوەکەی لە رووی جۆرەوە زۆر باش بووە و هەندێکی لیٚ هەناردەی وڵاتی عێراق کراوە.[6]

هەروەها شاری شنۆ کە بە میوەی هەرمیٚ ناسراوە باشییەکەی بە جۆرێك بووە هەناردەی ناوچەکانی دەوروبەری کراوە.[7] هەروەها ئەو شارە شوێنەکانی دەوروبەری و ناوچەکانی نێزیك لەو بە مەڕ و ماڵات و هەنگوین و جوێز و گەزۆ و مۆم و چەندان میوەی دیکە ناسراو بووە و لە بازرگانیدا بەکارهاتووە.[8]

لە لایەکی دیکەوە چیاکانی وڵاتی کوردستان دەوڵەمەند بووە بە دارستانی سروشتی، ئەمەش وای کر دووە یارمەتی دەربێت بۆ ئەوەی کوردەکان گرنکی بە کاری داربڕین

---

١ - تەریخ: ماسی وشك کراوە. محیط المحیط، ل٥٤٧.

٢ - احسن التقاسیم، ل١٢٨.

٣ - معجم البلدان، ج١، ل١١٦.

٤ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٨. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٧.

٥ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٨.

٦ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٨. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣٠٩.

٧ - یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١٦٤.

٨ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٨٩.

بدەن وەکو سەرچاوەیەکی بنچینەیی بۆ خۆ گەرم کردنەوەو پیشەسازی پێداویستیەکانی ناومالْ لە لایەکی دیکەوە، لێرەدا چەندان ئاماژەی ولاٚتناسی هەیە کە ئاماژە بە هەناردەکردنی دارو درەخت دەدات بۆ ناوچەکانی دەوروبەری، وەکو ئیبن فەقێی هەمەدانی باسی (چیای باجرمێ دەکات کە داری ئیسکی گەورەی هەبووەو بڕیویانەو بردوویانە بۆ عێراق.([1]) هەروەها شاری مەعلاسیا رەژووی هەناردە کردووە.([2])

بەلاٚم پۆشاك و جل و بەرگ وەکو جاحیز باسی دەکات لەوەی لە ولاٚتان هێنراوە، باسی جل و بەرگی ئاوریشمی و جامانە([3]) و پەردە و([4]) نان و گونیەی دروستکراو لە خوری کە شاری ئامەد پێی بەناوبانگ بووە ـ کە لەوێوە هەناردە کراوە بۆ دەرەوە.([5]) وەکو دەردەکەوێت لەبەرئەوەی سنووری شارەکە لە ولاٚتی رۆمەوە نێزیك بووە، ئەوا پیشەسازییەکەیان کاریگەر بووە بە پیشەسازییەکانی ولاٚتی رۆم، وەکو هەندێ لە پۆشاکەکانیان بە (رۆمی) ناسراوە.([6]) هەروەها شاری ماردینیش کیسەی بۆ دەرەوە هەناردە کردووە.([7])

لەسەر ئاستی کانزاکاریش، لێرەدا هەندێ ئاماژەی ولاٚتناسی هەیە لەبارەی بازرگانی چەند شارێکی جەزیرەی ولاٚتی کوردستان لەبارەی چەندان پیشەی کانزاکارییەوە، کە لە چیاکانی ماردینەوە شووشەیەکی بەناوبانگی هەبووە لەسەر ئاستی سەرجەم شارەکانی جەزیرە تاك بووە.([8]) هەتا لەسەر ئاستی ولاٚتانی رۆمیش.([9]) هەروەها ئاسن لە شاری

---

١ -مختلر كتاب البلدان، ل١٢٥.

٢ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٨.

٣ - مەندیل، قوماشێکە لە لۆکە دروست دەکرێت، لە پشت دەبەسترێت و لەمل دەکرێت بۆ سڕینەوەی دەم و چاو. بڕوانە: دوزي، المصادر نفسة، ل٣٣٥.

٤ - المخلل، ج٤، ل٧٥.

٥ - التبلر بالتجارة، ل٣٠.

٦ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٨.

٧ - ابن سعيد المغربي، بسط الارض، ل٩٠.

٨ - الادريسي، نزهة الامشتاق، قسم الجزيرة والعراق، تحقيق: ابراهيم شوكت، ل١٠.

٩ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩٤.

دیاربەکرەوە هەناردەی وڵاتانی جۆراوجۆر کراوە.(1) لە شاری نەسیبینیش رەساس هەناردە کراوە.(2)

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەلوپەلی هەناردەکراوی وڵاتی کوردستان، لێرەدا هەندێ ئاماژەی وڵاتناسی هەیە لەبارەی چەندان مادەی دیکە کە لە وڵاتی کوردستانەوە هەناردە کراوە وەکو (مادەی جوانکاری) لە بۆن و بەرام و شتی دیکە، وەکو مەقدەسی باس دەکات کە شاری نەسیبین بە باشترین بۆنی گوڵاو بەناوبانگ بووە.(3) هەر ئەو شارە وەکو باسی دەکات بە (تایبەتمەند بووە بە گوڵی سپی، کە لەسەر ئاستی وڵاتانی دیکە تاك بووە.(4) هەروەها هەر لەو شارە کەوازین(5) هەناردە کراوە.

لە شاری دارا و دەوروبەری (محەلەبی) هەناردە کراوە و عارەب زۆریان حەز لێکردووە.(6)

بەڵام شارەکانی ئازەربایجان و ئەرمینیا و ئاران وەکو خاوەنی پەڕتووکی (سنووری جیهان) باسی دەکات کە شوێنێکی ئاوەدان و بازرگانی بووە کە مادەی قورمز و(7) شەرواڵ و پۆشاکی خوری و پەمۆ و ماسی و هەنگوین و مۆم بەناوبانگ بووە، هەروەها کوتاڵی رۆمی و ئەرمەنی و بەجناکی و خزری و سەقلی بۆ هاتووە.(8)

بەڵام سەبارەت بە کەلوپەلی هاوردە بۆ وڵاتی کوردستان شتێك نییە تەنیا چەند ئاماژەیەکی کەم نەبێت کە لە لایەن وڵاتناسانەوە کراوە وەکو بەراوردێك لەوەی هەناردەیان کردووە، چونکە وڵاتی کوردستان وەکو سەرنج دەدەین چەندەها کەلو پەل و

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج٣، ل١١٠.

٢ - الجحاظ، التبلر بالتجارة، ل٣٢.

٣ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٨.

٤ - ابن سعيد المغربي، بسط الارض، ل٨٩.

٥ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٨. کەوازین: جۆرە رووەکێکی بۆن خۆشە، بۆ خۆشکردنی رۆن بەکارهێنراوە. محيط المحيط، ل٧٧٤.

٦- یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٢٧٣.

٧ - قورمز: کرمێکی سوورە لە رۆژانی بەهاراندا دەردەکەوێت، بۆ رەنگکردنی خوری بەکاریان هێناوە. بان الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل٢٧١. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٩٤.

٨ - مؤلف مجهول، ل١١٩.

بەرهەمیان هەناردە کردووە، ئەوەش واتای دەوڵەمەندی ئەو وڵاتە دەگەیەنێت، بۆیە ئەو شتانەی هەناردەیان کردووە زۆر زیاتر بووە لەوەی هاوردەیان کردووە.

وەکو ئیبن حوقەل ئاماژە بۆ هەرێمی چیاکان دەکات، ئەمە سەرەڕای هەرێمەکانی عێراق و فارس و خوراسان و خۆزستان کە پۆشاك و کوتاڵی بەناوبانگی لە خوری و بەریسم و پەمۆ لە ئەسفەهانەوە بۆ هاتووە، وەکو ئاماژەی بۆ دەکات ترێی ئەسفەهان بەناوبانگ بووە لە رووی باشی جۆرەکەیەوە.(1)

هەروەها مادەی زەعفەرانی شاری ئەسفەهان بۆ سەرجەم شارەکانی هەرێمی چیاکان و تەواوی ناوچەی جەزیرەو دەوروبەری هەناردەکراوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی زەعفەرانی شاری رۆزراور گەیشتۆتە نەهاوەند.(2)

هەروەها شارەکانی وڵاتی کوردستان لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان لەنێو ئەو ناوچەیەدا بووە کە شەکری لە شاری جونیسابوور لە خۆزستان بۆ هاتووە.(3)

بەڵام ئەوەی پێوەندیی بە لایەنی بازرگانییەوە هەبێت کە لە نێوان وڵاتی کوردستان و وڵاتی رۆم ئەنجام دراوە، هیچ ئاماژەیەکی وڵاتناسی روون و ئاشکرا نییە کە جەخت لەمە بکاتەوە، بەڵام ئەوەش واتای ئەوە نییە کە هیچ جۆرە شتێك لەو بارەیەوە نەبێت، چونکە هەندێ کەلوپەل کە لە وڵاتی رۆمەوە بۆ ناوچەکانی ترابزون لە ئەرمینیاوە گەیشتووەتە ناوچەکانی کوردستان کە دراوسێی ئەوان بووە.

دیارە ترابزۆن دەروازەی خەڵکی ئەرمینیا بووە بۆ وڵاتی رۆم، کە ناوچەیەك بووە بازرگانی تێدا کۆبووەتەوە و چوونەتە نێو وڵاتی رۆمەوە بۆ بازرگانی، کە هەر کەلوپەلێك بۆ ناوچەکە هاتبێ لەو دەروازەیەوە بووە.(4)

لە کۆتایی قسەمان لەبارەی بازرگانییەوە پێویستە ئاماژە بە ناوچەکانی شارە کوردیەکان بکەین کە هەندێکیان بە هەندێکی دیکەی هەرێمەکانی دیکەوە بەسترابوونەوە وەکو تۆڕێك لە رێگەی بازرگانی، کە ئەمەش کارەکەی ئاسان کردبوو، وەکو وڵاتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان ئاماژەی بۆ دەکەن و ماوەی نێوانیان دیاری

---

١ - صورة الارض، ل٣٠٩.

٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٣ - المقدسي، ل٣١٣.

٤ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١١.

کردووە.([1]) لێرەشدا ئەوە پێویست ناکات باس بکرێت، چونکە لە پاژەکانی دیکە بە درێژی باسی ئەوەمان کردووە.([2])

٢- بازاڕ:

ئەوە شتێکی ئاساییە بازاڕ گرینگییەکی ئابووری گەورەی هەیە و راستەوخۆ پێوەستە بە بازرگانییەوە، کە شوێنێکە بۆ ساغکردنەوەی کەلوپەلی بازرگانی، کە تێدا چالاکی کڕین و فرۆشتنی تێدا ئەنجام دەدرێت، هەمیشە شارەکان بازاڕی ساغکردنەوەی کەلو پەل بەرهەمەکانی گوند و دیهاتەکان بوونە، بە دانانی ئەوەی شارەکان شوێنکن بۆ کڕین و فرۆشتنی جۆرەها کەلوپەل، هەروەها خەڵکی دێهاتەکانیش روویان کردۆتە ئەو شارانە بۆ فرۆشتن و کڕینی کەلوپەلەکانیان.([3])

دیارە یەکەم وڵاتناس و گەڕیدە لە دووتۆی گەڕانەکانی بەنێو شارەکاندا، بازاڕی بینیوە کە تێدا خەڵێکی زۆر کۆبۆتەوە بۆ کڕینی پێداویستیەکانیان، ئەگەر ئەو بازاڕە ئاوەدان و نرخەکانی گونجاو بووبێت ئەوە بەڵگەی تەندروستی ئابووری ئەو شارە و گەشانەوە و پێشکەوتنی بازرگانییەکەی بووە، بۆیە مەقدەسی گەڕیدە جەختی لە سروشتی بازاڕە بڵاوەکان کردووە لە شارەکاندا و سەرنجی ئەوەی داوە کە بازاڕ کەشێکی زیندووی گرینگی بۆ شارەکان دروست کردووە.

بازاڕ لە شارە کوردیەکان لە لایەن وڵاتناسەکان بە بێژە و زاراوەی جۆراوجۆر باس و پەسنی کراوە وەکو (زۆر)([4]) و (گەورە)و([5]) (جوان)([1]) و (باش)([2]) و(فرەوان)([3]) ناوی

---

١ - بۆ نموونە سەیری: ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٣٢-٣٣-٤٦-٤٧-٥٩-٨٧. قدامة، المصادر نفسة، ل٧٧-١٢٩. الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٢-١١٦. المقدسي، المصادر نفسة، ل١٣١-٢٩٣-٢٩٤-٣٠٧-٣٠٨. الادريسي، نزهة المشتاق، قسم الجزيرة والعراق، ل٦-١٨. انس المهج وروض الفرج، ل-١٨٨-١٩٢. بكة.

٢ - بڕوانە: نشتمان بشير، المصادر نفسة، ل١٤١-١٤٩. قادر محمد حسين، الامارات الكردية، ل١٤٥-١٦١. بكة.

٣ - عبدالعزيز الدوري، تاريخ العراق الاقتلادي في قرن الرابع الهجري، (بغداد:١٩٤٨) ل١٣٣.

٤ - ياقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٢٠٨-١٩٤.

٥ -الاصطخري، المسالك والممالك، ل٧٦.

هاتووه.(ولاّتناسەکان کە باسی بازاڕیان کردبێ لە هەرێمی جەزیرە و چیاکان ئەوە بەڵگەی ئاستی گەشانەوەی ئەو ناوچەیە بووە کە دانیشتووانەکەی زۆربەی کورد بوونە، ئەو بازاڕانەش یان هەمیشەیی یان وەرزی بووە کە لە هەندێ ڕۆژانی هەفتە هەبووە، شاری ماردین بە بازاڕە زۆرەکانی ناسراو بووە،([4]) بازاڕی شاری نەسیبین لە دەرگەوە بۆ دەرگە([5]) هەمووی بازاڕ بووە، ئەمەش بەڵگەی توانایی شارەکە بووە.

بەڵام میافارقین لە سەدەی شەشەمی کۆچی (بازاڕەکانی تەسك بووە)([6])وەکو یاقوت باسی شارۆکەی مەجدەل دەکات بەوەی کە (شارۆکەیەکی خۆش بووەو لەسەر خابوور بووە، بە تەنیشتیەوە گردێك هەبووە لەسەر ئەو گردە کۆشکێك هەبووە و بازاڕی زۆر و فرۆشگای هەمیشەیی هەبووە).([7]) هەروەها گردی هەفتون (بازاڕی باش و خێر و بێری زۆری هەبووە).([8]) لە بەعشیقەش بازاڕی گەورە هەبووە.([9])

یاقوت لەسەرخەسی وەرگرتووە و دەبێژێ: شاری ئازرمە کە سەر بە نەسیبین بووە لەسەردەمی خەلیفەی عەباسی (موعتەزید) بازاڕێکی هەبووە ژمارەی دوکانەکانی گەیشتووەتە نێزیکەی دووسەد دوکان، بەڵام لەو ماوەیەی کە یاقوت تێیدا ژیاوە ئەو حاڵەتە گۆڕاوە و بۆتە گوندێکی سادە و ساکار.([10]) سەبارەت بە شاری دۆغامیش هەمان حاڵەت هەیە کە کەوتۆتە نێوان هەردوو شاری سەرێ کانی و نەسیبینەوە، وەکو باسی دەکەن گوندێکی گەورە بووە و بازاڕێکی لێ بووە بۆ خەڵکی جەزیرە، مانگی

---

١ - ناسر خسرو، المصادر نفسة، ل٧.

٢ - یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٤٥٥.

٣ -هەمان سەرچاوە، ل٢٥٩.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٧، ل١٩٤.

٥ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٤.

٦ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢.

٧ - معجم البلدان، ج٧، ل٢٠٨.

٨ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥٥.

٩ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥٩.

١٠ - معجم البلدان، ج١، ل١١١-١١٢.

جارێك تێیدا كۆبوونەتەوە،[1] واتە بازاڕێكی وەرزی بووە و جیاواز بووە لە بازاڕەكانی هەفتانەوە، كە تێیدا كرداری كڕین و فرۆشتنی بۆ یەك ڕۆژ یان زیاتر لە هەفتەیەكدا تێدا ئەنجام دراوە، ئەوەش واتای ئەوەیە كە فرەوانتر و زۆرتر رەواجی هەبووە، لەبەرئەوەی تەمەنی درێژتر و، هەروەها ئەو خەڵكەی تێیدا كۆبۆتەوە بۆ كڕین و فرۆشتن ژمارەیان زۆربووە، بەڵام یاقوت باسی هیچ بازاڕێك ناكات لە دۆغان، بگرە دەڵێت (بازاڕێكی هەبووە بۆ خەڵكی جەزیرە)، بەڵام دواتر دەگەڕێتەوە سەری و دەڵێت چەند جارێك سەردانی كردووە، بەڵام هیچ بازاڕێكی تێدا نەبینیوە.[2]

لە بازاڕە گرینگەكانی دیكە لە جەزیرە بازاڕی دەنەیسرە بووە، وەكو ئەستەخری باسی بازاڕی[3] دەنەیسەر دەكات كە گەورە و لە پێنج شەممە و هەینی و شەممە و یەك شەممە خەڵكی وڵاتی لە دوورەوە تێدا كۆبۆتەوە و ئەوەی پێویستیان بووە كڕیویانە.[4] هەروەها لەبەرگرەوەی پەڕتووكی (صوره الارچ) لە نیوەی یەكەمی سەدەی شەشەمی كۆچی كە لە دووری چوار فرسەخ (٢٤كم) لە میافارقینەوە بە ئاڕاستەی باشوور بووە(ناوچەیەك هەبووە ناسراو بووە بە بازاڕی دەنەیسەر، پێش ئەوە گوندێك بووە كە خەڵكی هەموو ڕۆژی تێدا كۆبۆتەوە لە بیابانەكەیدا بۆ كڕین و فرۆشتن، كە ئێستە بینای زۆر و خانە و بازاڕی بۆ كرین وفرۆشتن تێدا دروستكراوە، كە لە هەموو لایەكەوە خەڵكی بۆخۆی كێش دەكات.[5]

هەروەها هەندێ ناوچە هەبووە كە ناویان بە بازاڕ بردووە، ئەو بازاڕە لە ڕۆژی یەكشەممە لە هەموو هەفتەیەكدا بوونی هەبووە، ئەو ناوچەیە لە سەدەی شەشەمی كۆچی گەشەی كردووە و ئەو ناوچەیە بەهۆی بازاڕێكی هەفتەییەوە لە رابردوو بۆتە شارێكی ئاوەدان و بازاڕی زۆری تێدا دروستكراوە.

شاری دەنەیسەر توانیویەتی پارێزگاری لە گرینگییە بازرگانییەكەی بكات لەو كاتەی كە ئیبن جەبیر سەردانی كردووە، كە نێزیكەی سێ ساڵی خایاندووە (٥٧٨-

---

١ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٢٣.

٢ -هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٣ - بازاڕ: وشەیەكی كوردییە.

٤ - المسالك والممالك، ل٧٦.

٥ - صورة الارض، ل٢٠٢.

٥٨١ك/١١٨٢-١١٨٥ز) بۆیه كه باسی دەكات و دەڵێت بازاڕی گەورە و فرەوان و رزقێكی زۆر فرەوانی هەبووە و بازرگان و خاوەندارانی مامەڵەچی كه له شام و دیاربەكر و ئامەد و وڵاتی رۆمەوە بۆی هاتوون.([1]) كه بازاڕەكانی له رۆژانی پێنج شەممە و هەینی و شەممە و یەك شەممە له رۆژانی هەفتە بوونی هەبووە و ناویان ناوە (بازاڕ). دیارە رۆژانی هەر بازاڕێك زانراو بووە).([2])

ئیبن حوقەل جەخت لەوە دەكاتەوە كه هەردوو شاری ئورمیه و مەراغه خێر و بێری زۆر بووە به هەوڵ و باشی كوردە هەزەبانیەكان، كه (بازاڕی بازرگانی هەبووە له رۆژانی ساڵدا، كه خێر و قازانجی زۆر و كڕین و فرۆشتنی گەرم و قازانجی بەرفرە بووە).([3])

سەبارەت به شارەكانی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاكان و ئەرمینیا وەكو وڵاتناسەكان ئاماژە بۆ بازاڕەكانیان دەكەن، هەر بۆ نموونه شاری دەینوور (بازاڕەكانی كۆمەڵ بووە و مزگەوت و بازاڕی لەتەك یەك بووە).([4]) بازاڕەكانی شاری هەمەدان سێ ریز بووە.([5]) واتە دوكان له ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی زۆربەی جار به شێوەی ریز ریز له یەك شوێن دروستكراوە.([6]) ئەمەش بەڵگەی چالاكی بووە كه پرۆسەی كڕین و فرۆشتن له شاری ئەسەد ئاباد بەخۆوەی بینیوە وەكو مەقدەسی باسی دەكات بەوەی كه (بازاڕەكەی گەرم بووە).([7])

كه باسی شاری دەبیل (دوین) دەكەن (بازاڕەكەی بەشێوەی خاچ بووە، ئەردەبیل (بازاڕەكەی به شێوەی خاچ بووەو چوار لای هەبووە).([8]) واتە شێوەی خاچی هەبووە، هەروەكو لەبەرگرەوەی پەڕتووكی شێوەی جیهان باسی شاری ئەخلات دەكات له نێوەی

١ - رحلة ابن جبير، ل٢١٦.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل٢١٧.

٣ -صورة الارض، ل٢٨٩.

٤ - ياقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٢٣.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٢.

٦ - عمر رضا كحالة، دراسات اجتماعية في العلور الاسلامية (بغداد:١٩٧٣) ل٢٤-٢٥.

٧ - احسن التقاسيم، ل٣٠٢.

٨ - هەمان سەرچاوە، ل٢٨٨.

سەدەی شەشەمی کۆچی بەوەی کە (بازاڕی گەرم) بووە،([1]) واتە چالاکی و جوڵەی زۆربووە.

بێگومان زۆری ئاماژەدانی وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی بۆ بازاڕە بەربڵاوەکان لە شارە جۆراوجۆرەکاندا، هەڵقوڵاوی پێشکەوتنی ژیانی ئابووری ناوچەکە بووە لە ژێر سایەی میرەکانی حەسنەویەکان، ئەوانەی گرینگییەکی زۆریان بە بازاڕ داوە، بە تایبەتی میر بەدر کوڕی حەسنەوی (٣٦٩-٤٠٥ك/٩٧٩-١٠١٥ز) کە لەو سەردەمدا هەوڵە بازرگانییەکان زۆر گرینگ بوونە و بوونەتە هۆی دروستکردنی بازاڕی زۆر و، هەروەها ڕاکێشانی سەرجەم کەلوپەل و شمەك ئەوانەی خەڵکی ناوچەکە پێویستیان پێی هەبووە و بە نرخێکی هەرزان، واتە چەندە کشتیارەکان پارەیان خەرج کردبێت لە بازاڕە زۆر و زەوەندەکاندا، ئەو پارەیە لە گەنجینەی میرنشینەکە کۆبۆتەوە و دواتر لە پرۆژەی ئاوەدانی و ئابووری خەرج کراوە.([2])

لەو بازاڕانەی کە لە ڕۆژانی دیاری کراو هەبووە، وەکو ئەستەخری باسی بازاڕی بەراغە دەکات کە لەسەر دەرگەی کوردەکان بووە و ناویان ناوە (بازاڕی کەرکی)([3]) کە بازاڕێکی فرەوان بووە بە پانایی فرسەخێك بۆ فرسەخێك واتە نێزیکەی (٣٦کم٢) بووە، کە ڕۆژانی یەك شەممە خەڵکی لە هەموو ناوچەکانەوە ڕووی تێ کردووە لەوانەش عێراق.([4]) وەکو باسی دەکەن ناوی کەرکی بەسەر ئەو ڕۆژەدا زاڵ بووە و گوتیانە (ڕۆژی شەممە ڕۆژی کەرکییە و ڕۆژی دووشەمەش).([5])

ئەستەخری هەندێ زیادەڕۆیی دەکات کاتێ باسی ئەو بازاڕە دەکات و دەبێژێت: لە بازاڕی کۆرسەرە گەورەتر بووە.([6]) بەڵام ئیبن حوقەل هەندێ لەو پرسەی کەمکردووەتەوە

---

١ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٢ - صورة الارض، ل٢٩٥.

٣ - محمد امین زکی، خولالەیەکی تاریخی کوردو کوردستان. ج٢، ل٦٨-٧٠.

٤ - لسترنج دەڵێ وشەی (کەرکی) لە وشەیەکی یۆنانییەوە هاتووە (قویاقوس kuriakos) بڕوانە: بلدان الخلافة الشرقية، ل٢١٢.

٥ - الاصطخري ، المسالك والممالك، ل١٠٩.

٦ - هەمان سەرچاوە، ل١٨٣. ابن حوقل، المصادر نفسه، ل٢٩١.

و دەڵێت: (هیچ بازاڕێك نەبووە وەکو کۆرسەرە)([1]) ئەمە بەدیاری دەخات ئەو چالاکییەی بازاڕی بەراغە بەخۆوەی بینیوە لە سەدەی چوارەمی کۆچی لە سەدەکانی دیکە بەردەوام نەبووە، وەکو یاقوت ئاماژەی بۆ دەکات بەوەی کە (ئەو باسکردنە کۆنە، بەڵام ئێستە هیچ شتێك لەمانە نەماوە، ئێستە ئەوانە بوونیان نەماوە و لە گوندەکان هەندێ خەڵکی تێدا نیشتەجێیە و بار و گوزەران خراپە.([2])

وەکو لێرەدا باسی دەکات لە نێوان هەردوو شاری جەزیرەی ئیبن عومەر و نەسیبین (بازار و فرۆشگا) هەبووە لە ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە لە هەموو هەفتەیەکدا.([3]) هەروەها لە یەکێك لە ناوچەکانی شاری مووسڵ کە ناودەبرێت بە (باشی بازاڕەکانی)([4]) شارێك هەبووە ناسراو بووە بە (بازاڕی یەك شەممە) کە لەو بازاڕەدا بازرگان و جوتیاری کورد تێیدا کۆبوونەتەوە و کرداری کڕین و فرۆشتنیان تێدا ئەنجام داوە.([5])

لە کۆتایی بابەتی بازاڕ زۆر پێویستە ئاماژە بە بارودۆخی کەشوهەوای شارە ئیسلامییەکان بکەین بە شێوەیەکی گشتی پێویستی بە تارمە هەبووە.([6]) بۆ پاراستن و پارێزگاری لە مامەڵەچی بازاڕەکان ئەویش پاراستنیان لە گەرما و باران، لێرەدا هەندێ ئاماژەی وڵاتناسی لەو بارەیەوە هەیە، وەکو باس دەکەن زۆربەی بازاڕەکانی شاری مووسڵ (سەرگیراو بوونە) هەروەها بازاڕەکانی گردی فاقان لە نێوان دیجلە و ڕەزم لە ناحیەی چیا.([7]) بەرزەعە (بازاڕەکانی بە شێوەی کۆمەڵ بووە).([1]) شاری تەرز کە کەوتۆتە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان (بازاڕەکەی چەتری هەبووە).([2])

---

١ - کۆرسەرە: شاری ئازەربایجان لە ئەردەبیلەوە ١٢ فرسەخ دوورە کە دەکاتە نێزیکەی (٧٢کم) لە هەموو سەری مانگێك بازاڕی لێ دەکرایەوە، خەڵکی لە هەموو لایەك و لە هەموو ڕەگەزێکی تێدا کۆدەبۆوە کە شمەك و کەرەستەیان تێدا نمایشدەکراو دەفرۆشرا، هەمیشە نموونەیان پێ دیەهێنایەوە لە رووی چڕی چالاکی بازرگانی و قەڵەباغییەوە. ابن حوقل، المصادر نفسه، ل٣٠١.

٢ - بەراوردی: الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٠٩. لةطةلَ ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٩١. بکە.

٣ - یاقوت، معجم البلدان، ج٢، ل٣٠١.

٤ -المقدسي، مصدرسابق، ل١٢٢.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩٦.

٦ - بۆ زیاتر بڕوانە: احمد اسماعیل، المصادر نفسة، ل٦٧. بکە.

٧ -المقدسی، هەمان سەرچاوە، ل١٢٥.

وەکو دەزانین وڵاتی کوردستان بە خێر و بێری زۆر ناسراوە و دەرامەتەکانی بەرفرەوان بووە، ئەوەش یارمەتی بەرزبوونەوەی ئاستی گوزەرانی دانیشتووانەکەی داوە و تا رادەیەکیش نرخەکان لە بازاڕەکاندا نزم بێت، ئەو دیاردەیە سەرنجی وڵاتناسان و گەڕیدەکانی راکێشاوە کە لە دووتۆی پەڕتووکەکانیاندا ئاماژە بە چەندان شتی لەو بابەتە بکەن، لەوانە ئیبن حوقەل لەبارەی شاری نەسیبینەوە دەنووسێت (هەتا ئێستەشی لەگەڵدا بێت و لەسەرەتای ئیسلامەوە ئەو شارە بە زۆری بەرهەم و هەرزانی لە رووی نرخەوە ناسراوە).([3]) لەبارەی گردی فاقانەوە دەڵێت: (کەلوپەل زۆر هەرزانە) لەبارەی عیناساوە دەڵێت: (خێرا و هەرزان) لە خابوور (کەلوپەل زۆر هەرزانە([4]) لە تەرز (نرخ کەم و نان زۆر هەرزانە)([5]) لە هەمەدان (نان زۆر هەرزانە)([6])

مەقدەسی باسی شارەکانی ئازەربایجان دەکات کە دراوسێی هەرێمی چیاکان بووە بە شێوەیەکی گشتی (خۆش و خێر و بێری زۆربووە، کانزا زۆر هەرزان و بەروبووم و گۆشت و ڕۆژاکی خۆش بووە).([7]) کە هەرزانی لە نرخ بە شێوەیەکە لە هەندێ شاری هەرێمەکە یەك مەڕ بە دوو درهەم بووە، لە هەندێکی دیکە لە نرخی کەمتر لە درهەمێك تێپەڕی نەکردووە.([8])یان سێ ئەوەندە واتە یەك درهەم.([9])

هەروەها لە شاری ئەسەد ئاباد لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان کە بە هەنگوینی زۆر ناسراوە.([10]) بە شێوەیەك بووە کە ئەو هەنگوینە زۆر هەرزان بووە، وەکو ناسر خوسرەو لە گەشتەکەیدا باسی دەکات، دوای دەگاتە شاری بەدلیس سەد شووشە هەنگوینی

---

١ - هەمان سەرچاوە، ل٢٨٨.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل٣٠١.

٣ - صورة الارض، ل١٩١.

٤ - المقدسی، هەمان سەرچاوە، ل١٢٥.

٥ - هەمان سەرچاوە، ل٣٠١.

٦ - هەمان سەرچاوە، ل٣٠١.

٧ - هەمان سەرچاوە، ل٢٩٠-٢٨٧.

٨ - فالتر هانس، المصادر نفسة، ل٤٥.

٩ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٢.

١٠ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٠٢.

کرِیوە بە یەك دینار، لەبەرئەوەی ئەو بەرهەمە زۆر بووە لەو شارە.([1]) هەروەها ئاماژە بە نرخی تریێ دەکات لە شاری ئەرزن، کە بەرسیەکان([2]) سەد قەرتارە تریێ بە یەك دیناریان فرۆشتووە لە ناوەڕاستی زستان.([3]) ئەمە ئاماژە بووە بۆ هەرزانی، هەروەکو ئاماژە بۆ جۆری ترێیەکە دەکەن و بە رەزی ئارمانۆش ناویان بردووە.([4])

بازاڕەکانی سروشتێکی تایبەتمەندی وەرگرتووە لە زۆربەی شارەکانی ئیسلامیدا لەوانەش شاری کوردەکان، یان ئەو شارانەی کوردیان تێدا نیشتەجێ بووە بە رێژەی زۆر، مووسڵ بۆ هەر رەگەزێك بازاڕێك دووان و سیان و چوار هەبووە، واتە لە هەر بازاڕێك نێزیکەی سەد دوکان یان زیاتر هەبووە.([5]) وەکو مەقدەسی ئاماژە بۆ بازاڕی کوتاڵفرۆشان دەکات لە ئورمیە.([6]) بەناوبانگترین بازاڕ لە هەمەدان بازاڕی داڕشتنکاران داڕشتنکاران بووە.([7])

لەوەی پێشەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەو زانیاریانەی لەبارەی بازاڕ لە وڵاتی کوردستان باسکراوە لە دووتوێی ئاماژە و سەرنجی وڵاتناسان و گەڕیدە موسڵمانەکاندا، ئەگەر سادە و ساکاریش بووبێت، بەڵام لە هەمان کاتدا هەندێ تێبینی و سەرنجمان لا گەڵاڵە دەکات لەبارەی هەندێ پرسی گرینگ سەبارەت بە بازاڕەکان کە تەوەری سەرەکی چالاکی ئابووری و ئالوگۆڕی بازرگانی بووە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی یەکێك بووە لە نیشانە دیارەکانی شاری ئیسلامی، کە ئەوەش رەنگدانەوەی لایەنێکی گرینگی دنیای شارستانییەتی ئەو وڵاتانە بووە.

---

١ - سفرنامة، ل٧.

٢ - برسییەکان: ئەو فارسنانەبوون کە پارێزگارییان لە ئولی زەردەستی خۆیان کردووە، لە سەردەمی دەستبەسەرداگرتنەکانی ئیسلامدا نەهاتنە سەر ئاینی ئیسلامەوە، دووریش نییە لەنێو ئەوانەدا کوردیش هەبووبێت ئەگەر بە پێی شوێنی جوگرافی بێت.

٣ - سفرنامة، ل٨.

٤ - رەز: وشەیەکی کوردییە واتە ئەو باخچەیەی کە میوەجاتی لێ دەچێنرێت.

٥ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩٥.

٦ - احسن التقاسیم، ل٢٨٩.

٧ - لسترنج، المصادر نفسة، ل٢٩٩.

هەروەها باسنەكردنی هەندێ بازاڕی شاری دیكەی كوردەكان لە لایەن وڵاتناسەكانەوە بە واتای ئەوە نییە كە ئەو شارانە بازاڕی تێدا نەبووە، چونكە هەموو شارێك لە شارەكان بازاڕێك یان زیاتری تێدا هەر هەبووە.

٣- سیستەمی نەختینەیی:

وڵاتناسەكان بە تایبەتی وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی كۆچی/ دەیەمی زاینی هەندێ لایەنی سیستەمی نەختینەیی و شێوازی مامەڵەی دارایی هەرێمی جیاجیان بۆ باس كردووین، كە ئەو شێوازە لە هەرێمێكەوە بۆ هەرێمێكی دیكە و لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دیكە لەنێو یەك هەرێمدا جیاواز بووە، بۆیە دراوەكان یەكسان نەبوونە لە رووی كێش و قەبارە و بەهاوە، هەروەها لە رووی بەهاوە دوو جۆر بووە: یەكەمیان دراوی بەهێز لە رووی ئەو كانزایەی لێی دروستكراوە، دووەمیان دراوی سادە بووە كە ئامادەی گۆڕان بووە، بۆیە هەر یەكە لە ئیبن حوقەل و مەقدەسی لەبارەی دراوەوە باسی بەهای پارەیان كردووە بە پێی ناوچەكان و ئەو شوێنەی تێدا زۆر بووە.([١])

بەڵام لەبارەی رێگەی بەكارهێنان و مامەڵەی پارەوە یان ئەوەتا بە كێشان بووە یان بە ژمارە، دیارە كێشی پارە زانراو و جێگیر بووە و مامەڵە پێكردنی زۆرجار بە ژمارە نەبووە،([٢]) هەندێ جار بە كێشان بووە.([٣]) هەروەها بنەمای سیستەمی نەختینەیی لە وڵاتی كوردستان یان بە دیناری زێڕ یان بە درهەم ([٤]) و زیو بووە، واتە دراوی فەرمیلە یەك كاتدا  بە هەردوو جۆری دینار و درهەم بووە.([٥])

---

١ - بۆ نموونە بڕوانە: صورة الارض، ل٦٢-٢٦٣. احسن التقاسيم، ل٩٤-١٢٩-٣٢٠. بكة.

٢ - الدوري، المصادر نفسة، ل١٤٦.

٣ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١١٥.

٤ - درهەم، یەكێك بووە لە یەكەكانی دراوی زیوی وڵاتی ئیسلامی، ئەو درهەمە لە مس و سكەت لە شووشە لێدراوە، لە دوای درهەم دیناری زێر هەبووە، كە مووسڵمانەكان لە فارسەكانیان وەرگرتووە لە سەردەمی ئەمویەكان، ئەوانیش كاتی خۆی لە دراخمای یونانیان وەرگرتووە. احمد عگيه الله، القاموس السياسی، مج٢ن ل٣٦٤ز هەر درهەمێك شەش دوانگ بووە. الملباح المنير، ل٣١٣.

٥ - المسكوبة، تجارب الامم، ج١، ل٣٤٠.

ئەستەخری و ئیبن حوقەل ئاماژە بۆ دراوی بەکارهێنراوی سەرجەم ناوچەکانی هەرێمی چیاکان دەکەن کە پێکهاتووە لە زێڕو زیو.([1]) بەڵام (زێر زیاتر بەکارهاتووە لە زیو)([2]) ئەمە سەرەڕای نەبوونی ئەو دوو کانزایە لە هەرێمەکەدا.([3]) هەروەها پارەی ئازەربایجان و ئاران و ئەرمینیا کە ئەو ناوچانە کوردێکی زۆری تێدا نیشتەجێ بووە زێڕ و زیو بووە.([4]) تەنیا ناسر خوسەرەوی گەڕیدە نەبێت باسی شێوازی مامەڵە لە شاری ئەخلات دەکات کە بە پارەی مسی بووە.([5])

بەڵام سەبارەت بە پارەی بەکارهێنراوی هەرێمی خۆزستان مەقدەسی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات وەکو رۆژهەڵات بە زێڕ بووە بە شێوەی دەوانیق.([6]) هەر پێوەرێکیش لەمە چل و هەشت تمەن بووە کە ئەوەش ناوی دراوێك بووە بەناوی ئەزە.([7]) دیارە بەهای پارە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە لە نێو یەك هەرێمدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە، وەکو مەقدەسی باسی پارەی خۆزستان دەکات هەر بۆ بەراوردکردن (دەڵێت هەر هەزار درهەمێك لە ئەسفەهان کێشی کەم دەکات بە پێوانەی بیست و پێنج دستەر، واتە دستەرێك لە ئەهواز بە شەش درهەم بووە، هەر سەد دینارێکیش کێشی لە قەزوین زیاتر بووە لە پێنج دستەر یان چوار دەوانیق، هەر سەد درهەمێکیش لە خوراسان کێشی دوو درهەم بووە، ئەوان قیراتیان نەزانیوە.([8])

### ٤- کێش و پێوانە:

---

١ - المسالك والممالك، ل١٢٠. صورة الارض، ل٣١٧.

٢ -صورة الارض، ل٣١٧.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٢٠٣. الاقاليم، ل٨٨. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٧.

٤ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١١٣.

٥ - سفرنامة، ل٧.

٦ - هەر دانقێك بەرامبەر بە هەشت حەبەو پێن لەسەدی حەبەیەك بووە. الملباح المنير، ل٣١٣. بەڵام ئەمە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە جیاواز بووە. بڕوانە:احمد عطية الله، القاموس السياسي، ل٣٠. بکە.

٧ - تمونەو ئەزە: جۆرێك بوونە لە دراو کە لە هەرێمەکانی رۆژهەڵات بەکارهاتووە، بەڵام لە سەرچاوەکاندا باسیان نەکراوە.

٨ - احسن التقاسيم، ل٣٢٠.

بێگومان کێش و پێوانە لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی دیکە جیاواز بووە بە پێی دۆخی هەرێمەکە، بگرە هەندێ جار لەنێو یەك هەرێم و لە شارێکەوە بۆ شارێکی دیکی جیاواز بووە، ئەمەش لەبەر فرەوانی ولاَــی ئیسلام و لە لایەکی دیکەشەوە لەبەر نەبوونی سیستەمێکی جێگیر و یەکتایی بۆ کێشانە و پێوانە، بەلاَم وەکو سەرنج دەدەین لە دووتۆی ئاماژەکانی ولاَتناسیەوە یەك جۆرە پێوانە هەبووە، کە لەسەرجەم ولاَتانی ئیسلامی پێڕەوکراوە ئەویش یەکەی (ئەلمون)([1])بووە. کە پێشتر مەقدەسی و ئیبن حوقەل و هەندێکی دیکە لە ولاَتناسان ئاماژەیان بۆ چەندان جۆری پێوانە و کێش کردووە و بەهای هەر یەکێکیان دیاری کردووە([2]) بە رەتل([3]). لە هەرێمی جەزیرە (ئاقور) بە پێی دەستەواژەی مەقدەسی پێوانەیان بە مەد کردووە([4]) کە ئەمە یەکسانە بە ٣/١ ربە، کە ئەوەش دەکاتە (٢/٥ لتر) بۆ یەك ربە(المكوك).([5])و قەفیز([1]) و

١ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٩٤.

٢ -بڕوانە بۆ نوونە: ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٦٢.-٢٦٣. المقدسي، المصادر نفسةن ل٣٠٥-٢٩٣-٣٥٤. بكة.

٣ - رەتل: رەتلی شەرعی کە مەلاو فەقێکان وەکو پێوەرێك بەکاریان هێناوە بۆ سیستەمی شەرعی ئەویش رەتلی بەغدادی یان عێراقی بووە، کە رەتلی رەسمی دەولَەت بووە، ئەوەش بۆ پێوانەی شتەکان بەکارهاتووە بۆ باج و خەراج، رەتلی عێراقی بەرامبەر بە ١٣٠ درهەم بووە. فالتر هنتس، المكيال والاوزان الاسلامية، ل٣٠-٣١-٣٥.

٤ - مەد: لە سەردەمی ئیسلام یەکسان بووە بە (٤/١ساع) مەد دوو رەتلی بەغدادی بووە، بە پێی قسەی ئەبی یوسف دەکاتە (٣/١-١) رەتل، هەر هەمووشیان دەکاتە (٨٢/٥غ) گەنم، بۆیە مەدی شەرعی برێتییە لە (١/٥) لتر، بۆیە کەیل بە مەد لە عێراق کەم بووە. ابو یوسف، الخراج، ل٣١. فالتر هنتس، المصادر نفستنل٧٤.

٥ - مەکوك: ربە: لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە جیاواز بووە، ربەی ولاَتی نێوان دووئاوان بەرامبەر بە (١٥ رەتل) بووە، یان (٦,٧٤کغم) گەنم بووە، بە پێی قسەیەکی دیکە ربەی عێراقی (٨/١) قەفیز بووە، واتە (٦,٨٤کغم) گەنم بووە، بەلاَم ربەی مووسڵ و دەوروبەری بڕەکەی گەورەتر بووە، کەبەرامبەر بە (١٤/١) غەرادی دیمەشقی یان بەرامبەر بە (٣٣/٧٥) رەتل ئار –(١٣/٥٨٩کغم) بووە، کە بەرامیەر بە (١٨/٨لتر) بووە. فالتر هنتس، المصادر نفستن ل٧٨.

(کاره)([2]) بووه. هەروەها مەقدەسی ئاماژە بۆ یەکەیەکی دیکە دەکات بۆ کێشان، بەڵام ئەوە لە هەرێمەکانی دیکە نەبینراوە و ناویان ناوە (فرق) وەکو باسی دەکەن (فرقەکەیان بەغدادی بووە کە برێتی بووە لە سی و شەش رەتل)([3]) دواتر باسی بەهای هەر پێوانەیەکیان بە رەتل بووە، کە هەر روبەیەك پازدە رەتل بووە، هەر مەدێکیش چارەگە کارەیەك کە کردوویەتیە دووسەد و چل رەتل، قەفیزیش چارەکی بووە، روبەش چارەگی قەفیز بووە، رەتلیش بەغدادی بووە.([4])

بەڵام لە هەرێمی چیاکان کێشانە و پێوانە جیاوازی هەبووە، تەنیا سپاردەکانیان نەبێت، ئەویش شاری رەی لێ دەربچێت کە (مونەکانیان) لەسەرتاپای هەرێمەکە چوارسەد بووە.([5]) لە هەمەدان و ماهات چوارسەد درهەم بووە.([6]) پێوانەکانیان جیاواز بووە.([7]) کە برێتی بووە لە دە قەفیز و شەش مست.([8])

---

١ - قەفیز: نرخی ئەمە لە دەوڵەتی ئیسلامی جیاجیا بووە، لە سەردەمی راشدین نرخی سێ درهەم بووە، لە سەردەمی ئەمەوی چوار درهەم بووە، لە سەردەمی عەباسی پێنج درهەم بووە، کە لە عێراق و جەزیرە بەرامبەر بە (٣٠ مون) بووە، واتە (٦٠ رەتل) کە هەر رەتلێك (١٣٠درهەم) بووە. ابو یوسف، المصادر نفسة، ل٣١. فالتر هانتس، المصادر نفسة، ل٦٦. المقدسي، المصادر نفسة، ل١١٥.

٢ - کارە: مەقدەسی دەڵێت ئەو مەکیالە لە عێراق کاری پێکراوە کە بەرامبەر بە دوو قەفیز بووە یان (١٦ مەکوك بووە، کارەی گەنم-٢٤٠ رەتل بووە، کارەی جۆ و نیشك و نۆك -٢٠٠ رەتل بووە، کارەی برنج-٣٠٠ رەتل بووە، کارە یەکسانە بە (١٢٠لتر). احسن التقاسیم، ل؟ فالتر هانتس، المصادر نفسة، ل٦٩.

٣ - احسن التقاسیم، ل١٢٩.

٤ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٥ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٩.

٦ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٧ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٨ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٢٠.

بەڵام سەبارەت بە کێشانەی شاری ئورمیە هەر ڕەتلێکیان سێ سەد بووە، هەشیان بووە شەش سەد، بەڵام قەفیزی مەراغە و مەدەکەیان بریتی بووە لە دەئەمنان و کولیجەیەك.[1] شەش یەکی قەفیز.[2]

لە خۆزستانیش لە هەرێمەکە لە پێوانەی ماسی و گۆشت تەنیا ئەهوازی لێ دەربچێت ڕەتلیان بەکارهێناوە و بۆ نان مەکی و لە ئەهوازیش هەموو پێوانەیەکی بەغدادی بەکارهێنراوە.[3] ئەوەش بەدیار دەکەوێت کە بۆ کێشانە چەندان جۆر پێڕەو کراوە بە پێی جۆری مادەکە.

پێوانەی خۆزستان جیاواز بووە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە، ئەویش بریتی بووە لە روبە و کورِ و مەختوم[4] و مست و قەفیز.[5]

## دووەم: دەرکەوتە کۆمەڵایەتییەکان:

أ- شێوە و ڕەگەزی کورد:

بابەتی شێوە و ڕەگەزی کورد لە سەرچاوە ئیسلامیەکانەوە گرینگییەکی زۆری پێدراوە، مەبەستیش ئەوەیە نییە بزانین ئەوانە سەر بەچی بوونە لەو بابەتەدا، چونکە ئەمە دوورمان دەخاتەوە لە مەبەستەکەمان کە وڵاتناسە موسڵمانەکان لەو بارەیەوە باسیان کردووە.

بگرە نهێنی گرینگیدانیان زیاتر بە کورد لە نەتەوەکانی دیکە، ئەوەیە کە عارەبە موسڵمانەکان کوردیان ناسیوە و، ئەو ناسینەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە وڵاتی کوردستان لە جەزیرە و چیاکان لە باشوور و ڕۆژهەڵات یەکەمین وڵاتانێك بووە کە

---

١ - کولیج: لە سەدەی چوارەمی کۆچی هەر کولیجەیەك سێ یەکی مەکوك بووە کە دەکاتە ٦٠٠ درهەم بەرامبەر بە ١٨٧٥ غم گەنم، یان بە شێوەیەکی وردتر دەکاتە ٢، ٥لتر. الخوارزمي، مفاتيح العلوم، (ملر:١٣٤٢ك) فالتر هنتس، المصادر نفسة، ل٧١.

٢ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٩.

٣ - هەمان سەرچاوە، ل٣٢٠.

٤ - جۆرێك بووە لە مکیال و پێوەر لەو هەرێمەدا بەکار هاتووە.

٥ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٢١.

موسڵمانەکان بۆ یەکەمین جار لە ڕێگەی پرۆسەی فتوحاتی ئیسلامیەوە گەیشتوونەتە ئەو ناوچەیە لە دەیەی دووەمی سەدەی یەکەمی کۆچییەوە.

لەسەر ئەو بنەمایە زۆر پێویست بووە ئەو کەسانەی لەگەڵ ئەو فتوحاتەوە هاتوونەتە ناوچەکە و، لەگەڵ خێزانەکانیان نیشتەجێ بوونە لەو ناوچەیە، ئەوەش وای کردووە شارەزایی ژیان و گوزەران و ڕەچەڵەکی دانیشتووانەکەی ئەو ناوچەیە بن، دواتر هێڵی پێوەندیی و سیلەی پێکەوە ژیان لە نێوانیاندا لەژێر ئەو سیستەمە نوێیە دروستبکەن.

وەکو دەزانین عارەبان گرینگییەکی زۆریان بە ڕەچەڵەك داوە، چونکە ڕەچەڵەکی هەر کەسێك لەلای ئەوان ناسنامە بووە، هەروەها ناوبانگی ڕەچەڵەك پێگەی کەسەکەی لەنێو کۆمەڵگەی خێڵەکی دیاری کردووە، هەروەها گرینگی دانیان بە ڕەچەڵەکی مرۆڤەکە شتێك بووە بۆ گرینگی دانیان بە ڕەچەڵەکی ئەسپ و باڵندەوە، هەر لەبەرئەوە بووە شارەزایان و پیادەکاران مافی خۆیان بووە لە ڕووی زانینی ڕەچەڵەك و جیاکردنەوەیان لەیەکتری پەرتووکی تایبەتی لەو بارەیەوە ئامادە بکەن.

هەر لێرەوە بووە هەندێ لە وڵاتناسە عارەبان باسی بنەچە و ڕەچەڵەکی کورد بکەن، لە پێشەوەیاندا مەسعودی چەندان بیروڕای هەبووە لەبارەی بنەچە و ئەو ڕەگەزەی کورد هەیبووە، دوای ئەوەی بڕیاری دا بە (تێکدانی ئەو سەرەتایەی لێیەوە دەستیان پێکردبوو). بەپێی دەستەواژەی خۆی.([١]) ئەو بیروڕایەش ئەوەیە کە دەڵێ([٢]):

١- بنەچەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ ڕەبیعەی کوڕی نزار کوڕی مەعد کوڕی عەدنان کە لە بەکری کوڕی وائل بووە. (لە دێر زەمانەوە بە تەنیا ڕووی کردۆتە چیاو دۆڵ و نیهال کە دۆخەکە وای کرد بچن بۆ ئەوێ، میللەت و نەتەوەی دیکەی نیشتەجێی شارەکانی وەکو فارس و عەجەم بۆی هاتوونە و لەگەڵ زمانی ئەوان ڕاهاتوونە و زمانەکەیان بۆتە عەجەمی).

وەکو تێبینی دەکەین لەبارەی ئەو بیروڕایەی مەسعودی هیچ جۆرە مێژوویەکی دیاری نەکردووە لەوەی کە کوردەکان ساڵی چەند شوێن و جێگەی خۆیان بەجێ هێشتووە و، ڕوویان کردۆتە چیاو دۆڵ و نیهالەکانی نێزیك لە وڵاتی فارسەکان، هەروەها هۆکاری ئەو کۆچەشیان دیاری ناکات کە بۆ ڕوویان کردۆتە ئەو ناوچەیە، هەر تەنیا بەوەندە

---

١ -مروج الذهب، ج٢، ل٢٤٩.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٤٩-٢٥٠.

وازدەهێنێت کە (دۆخەکە وای کرد بچن بۆ ئەوێ)، هەروەها باسی ئەو جۆرە پێوەندییەش دەکات کە لەگەڵ ئەو کەسانەی بۆ ئەوێ هاتوونە و زمانی سەرەکی خۆیان لەیاد کردووە.

٢- لێرەدا وای دەبینێ کە کورد رەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ موزەر کوڕی نەزار کە ئەوانە کوڕی کورد کوری مەرد کوڕی سەعسەعەی کوڕی هۆزان بوونە.(١) کە ئەوانەش لە دێر زەمانەوە دابڕاون لەبەر ئەو رووداوەی لە نێوان ئەوان و غەسان روویداوە.

لە رای دووەمیش ئەوە دەردەکەوێت کە خاوەندارانی ئەو رایە هەوڵدەدەن بنەچەی کورد (رەگەزەکەی) بگەڕێننەوە بۆ ناوی (ناسراو)ی عارەبی خەیاڵی، کە ئەو کات لای عارەب ئەوە باوبووە رەچەڵەکی هەر خێڵێك بگەڕێننەوە بۆ ناوێکی (ناسراو)ی دیاری کراو، واتە هەوڵبدەن هەمان نەریتی عارەبی کە پێی ئاشنا بوونە بەسەر کورددا بیسەپێنن، ئەمە سەرەڕای لەیەکجیایی رەچەڵەکی کورد لەگەڵ عارەبدا.

دیارە ئەو رایەش وەکو ئەوەی پێشەوە هیچ مێژوویەك دیاری ناکات کە هەندێ لەو کوردانە بە کۆمەڵ لە جەزیرەی عارەبییەوە بەهۆی شەڕو ناکۆییەوە لەگەڵ بەنی غەسان نیشتمانی خۆیان جێهێشتووە.

٣- لێرەدا هەیە پێی وایە بنەچەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ رەبیعە و موزەری عارەبییەوە، ئەوانە ئاوارە بوونە بۆ چیاکانی دەوروبەر بۆ گەڕان بەدوای ئاو و پاوان، بە بەسەر چوونی کات زمانی عارەبان لەبیر کردووە و زمانی نەتەوەکانی دەوروبەریان وەرگرتووە!

---

١ - ئەو بیوبۆچوونەی هەبووە لە گەڕاندنەوەی کورد بۆ بنەچەی عارەبی یان فارسی یان خێو و درنج هەر تەنیا لەو پەڕتووکانەدا نییە کە ئەو لێکۆڵینەوەیە پشتی پێ بەستووە، بەڵکو لە سەدەمەکانی دواتریش زۆرێك لە مێژوونووسەکان لە پەڕتووکەکانیاندا ئاناژەیان بۆ هەمان بۆچوون کردووە بەبێ ئەوەی یەك بەڵگەیان هەبوویێت و بە نەزەری عیتبار ئەوەیان وەرگرتبێت کە عەقڵ قبووڵی بکات. بۆ ئەمە بڕوانە: المقریزی، المواعظ والاعتبار بذکر الخطط والاثار (بیروت:د/ت) ج٢، ل٢٣٢.

شەرفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، ل؟. مەلا مەحمودی بایەزیدی، عادات و رسوماتنامە، ل٤٧-٤٩. مەلا مەحمودی بایەزیدی، داب و نەریتی کوردەکان، وەرگێڕانی لە رووسییەوە: شوکریە رەسول، (بەغدا، ١٩٨٤) ل٩٤.

بەڵام چۆن ئەو هەموو خەڵکە زمانی خۆیان بیرچۆوە، کە ئەوانە پێکەوە ژیاون شانبەشانی یەکتر، کە ئەمەش وابکات زمانەکەیان ببێتە زمانێکی دیکە یان زیاتر لە زمانێك.

ئەو سێ بیروڕایەی باسمان کردن، ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین هەوڵدەدەن رەگەزی کورد بگەڕێننەوە بۆ رەچەڵەکی عارەبی،([1]) لە دۆخێکی نادیاردا، کە ئەمە لە گریمانەیەك زیاتر نییە و زۆر دووریشە لە ڕاستییەوە، بگرە لە سۆز و ئەندێشەوە نێزیکە، ئەو جۆرە ئاڕاستانە هەڵقولاوی هەوڵەکانی عارەبە موسڵمانەکان بووە بۆ دروستکردنی جۆرە پردێك لە ژیان و گوزەران لەگەڵ کوردەکان هەر لەگەڵ فتوحاتی ولاتەکانیان لەسەرەتای سەدەی یەکەمی کۆچییەوە، بە تایبەتی ولاتی ئەوان یەکەمین ولاتانێکی ناعارەبی بووە، کە موسڵمانەکان روویان تێ کردووە بەهۆی هۆکاری جوگرافییەوە، کە بە ماوەیەکی کەم توانیویانە ئەو ناوچەیە دەستبەسەردابگرن.

مەسعودی دەڵی دەستەیەك لە کوردەکان کە برێتی بوونە لە (شۆهجان لە ناوچەی کوفە و بەسرە کە خاکی دەینور و هەمەدان بوونە، کە ئەوانە لە کوڕەکانی رەبیعە کوڕی نەوار ([2]) کوڕی مەعەد([3]) بوونە، لە بابەتێکی دیکەدا دەڵێت (نەتەوەیەکی پاشکەوتوو لە کوردەکان کە خاوەن زانیاری بوونە وەکو ئەوانەی بینیمان و باسمانکردن لە ولات، کە ئەوانە لە کوڕەکانی کورد کوڕی مەرد کوڕی سەعسەعە کوڕی حەرب کوڕی هۆزان بوونە، هەشە پێی وایە ئەوانە لە سەبیع کوڕی هۆزان بوونە، حەرب و سەبیع لە موزەر هیچی بەدوا نەهاتووە، بگرە هۆزان کوڕی بەکر کوڕی هۆزانی بەدوادا هاتووە،

---

١ - مستەفا جەواد لەو بارەیەوە دەڵێت: بێگومان بەستنەوەی کورد بە ڕەچەڵەکی عارەبییەوە، ئێستە بۆتە شتێکی بەتاڵ لای ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون و وردبینی دەکەن، رەنگە هۆکاری ئەوە هەبووبێت کە ئەوان بران لەوەی ڕەچەڵەکیان لە رووی ئاینیەوە یەك بووە، بۆیە ڕەچەڵەکناسەکان ئەو ڕەچەڵەکەیان پێشنیاز کردووە، ئەو رایەش راستە ئەگەر بزانین کە کوردەکان زۆر پابەند بوونە بە هۆکاری ئاینی، ئەمەش وای لێکردوون ئەوەیان قبووڵ بێت کە وایان گوتووە. بڕوانە: جاوان القبيلة الكردية المنسية، منشوارات المجمع العلمي العراقي (بغداد:١٩٧٣) ل٨.

٢ -جمهرة انساب العرب، (القاهرة: ١٩٦٢) ل٩.

٣ - التنبيه والاشراف، ل٦١.

لەو کوردانەش کە هەیە وای بۆ دەچێت کە لە رەبیعە بوونە دواتر لە بەکری کوڕی وائل.([1])

لەوەی پێشەوە تێبینی ئەوە دەکەین کە مەسعودی رای وایە رەچەڵەکی (کورد لە بنچینەدا عارەببیە)، کە کورد وەکو رۆڵەیەکی خیڵی شۆهجانن وخۆی لە گەورە پیاوانی کوردی پرسیوە لەو بارەیەوە.

بەڵام ئەم هەڵوێستە ناتوانرێ وەکو بەڵگەیەکی روون پشتی پێ ببەسترێت بۆ روونکردنەوەی ئەو رەچەڵەکە هەتا بەڵگەیەکی عەقڵی و زانستی نەبێت لەو بارەیەوە. چونکە بە تێڕوانینی هەر کەسێك کە رەچەڵەکەکە بگەڕێنێتەوە بۆ فلان کەس ئەوە بەهیچ شێوەیەك بەس نییە بۆ روونکردنەوەی راستەیەکە، رەنگە ئەوە بە خواستی کورد خۆی بوو بێت کە خۆیان لە زیاتر لە عارەب نێزیك بکەنەوە.([2]) کە جۆرە پێوەستنیەکی هاوبەش کە ئەویش بوونی ئۆلی ئاینی ئیسلامییە بەیەکیان ببەستێتەوە و وای کردبێت کەسە بە باوەڕەکان برای یەکتر بن، هەروەها کوردیش خاوەنی سۆز و سادە و ساکارییە ئەو دووپاڵنەرە کە کورد پێی دەناسرێتەوە، زۆرجار کورد باجی ئەو سۆزانەی خۆی داوە، کە ئەم سۆز و نیەتە باشانە لە لایەن میللەتانی دیکەی دراوسێ وەکو عارەب و تورك و فارسە مووسڵمانەکان بەکارهێنراوە و وای کردووە کورد لەو ناوەدا مافەکانی بخورێت و پێشێلبکرێت بە درێژایی مێژوو، چونکە پرسەکان بە پێوەری دادپەروەری کە ئیسلام لەسەری دامەزراوە نەپێوراوە، بگرە بەپێی کێشانە و پێوانەی بەرژەوەندی و هەواو هەوەسی دەسەڵاتداران بووە کە ئەمە هەمیشە دژ بە ماف و دادپەروەری بووە.

٤-لەو خەڵکانەی پێوەندییان پێوە کردوون، ئەو گێڕانەوەیە لە بنچینەدا هەڵبەستراوە، کە ئەوە ناچێتە ژێر باری پێگەی پەیامبەران و پیاوچاکانەوە، ئەوە لە لایەك، لە لایەکی دیکەوە ئەو بیروڕایە زیاتر لە بانگەشەیەك زیاتر نییە و، خۆی لەبەردەم بچووکترین زاراوە و دەربڕینی لۆژیکی و ئاوەزی ناگرێت، چونکە هەم جن و هەمیش مرۆڤ دروستکراوی خۆیان هەیە و، ناکرێت ئەوانە لەگەڵ رەگەزی دیکەدا زاوزێ

---

١ - گێڕانەوەی ڕەچەڵەکە بۆ بنەچەی عارەبی شتێکی ئاسایی بووە لە سەرجەم ولاَتانی ئیسلامی بەهۆی پاڵنەری ئاینیەوە هەتا ئەو سەدانەی ئێستە.

٢ - Arfa the apoli tical and socipl study, (london:1966)p14.

بکەن، خۆ ئەگەر مەسعودی باسی ئەو جۆرە جادوانەی نەکردایە ئەوا زۆر باشتربوو بۆ خۆی، چونکە بەرهەمەکانی ئەو بە باشی دەناسرێت لە نێوان کۆی ئەو هونەر و زانیاریانەی هەیە، بەڵام جۆرە بیروڕایەکی لەو شێوەیە کە هەندێ لە نووسەران داویانەتە بەر سەرنجی رەخنە و تێبینی وەکو ئیبن خەلدوون، ئەمەش وای کردووە زۆرێك لەو بیروڕایانەی راستگۆیی و زانستیەتی خۆیان ون بکەن، وەکو ئیبن خەلدوون کە رەخنە لە مەسعودی و ئەوانی دیکە دەگرێت و دەڵێت: (زۆرێك لە مێژوونووسان و شرۆڤەکاران تووشی هەڵەبوونە لە کاتی گواستنەوەی چیرۆکەکان و راستییەکاندا، چونکە ئەوانە تەنیا پشتیان بە گواستنەوەیەکی رووت بەستووە جا ئەوە لاواز یان دەوڵەمەند بووبێت، ئەوان نەگەڕاونەتەوە بۆ بنەچەی شتەکە و بابەتەکەیان بە پێوانە و کێشانەی دانایی نەپێواوە و لە سروشتی ئەو بوونەوەرانەیان نەڕوانیوە و بەدوای هەواڵی راست و دروستی نەکەوتوونە، ئەوەش بۆتە سەرەتایەك لە کەوتنە هەڵە و بیرۆکەی ئەندێشاویەوە.([1])
هەروەها دەڵێت: (پەڕتووکەکەی مەسعودی و واقدی پڕە لە ستایش و نادیاری و هیچ شتێکی تێدا نییە لە سەلماندن لە نێوان دیاری کردن و متمانە بێت.([2])

دەکرێ بڵێین مەسعودی ئەو بیروڕایەی باسی کردووە لەبارەی بنەچەی کورد و چۆنییەتی پیوانەکردنی بە پێکچووەکانی، بە پێوانە و کێشانەی دانایی و بە چاوی کراوە سەیری نەکردووە، چونکە ئایا دەکرێ میللەتێکی گەورە کە پانتاییەکی زۆری لە خاك داگیرکردبێت و ژیانێکی خۆش و باشی بۆ نەوەکانی دروستکردبێت و چەندان هەزار نەوەی لەدوای خۆیدا خستبێتەوە لە پیاوانی ئازا و بەجەرگ و ناوبانگیان گەیشتبێتە هەموو لایەکی دنیا، بەڵام ئەوانە لە رەگەز و رەچەڵەکی ئەهریمەن بن؟ دیارە ئەمە لە قسەیەکی پووچ و بێ واتا زیاتر نییە؟!

دواتر دەستەواژەی (اکردوهن الی الجبال) (دەریانکردن بۆ چیاکان) لە رووی زمانەوانییەوە هەڵگری کۆمەڵێك مەغزای تایبەتە بە ئامانجی ئەوەی کورد ببەستێتەوە بە وشەی (رەگەز) بە بێژەی (اکردوهن) کە ئەوە وشەیەکی عارەبییە، لە وشەی (کرد)ـــەوە هاتووە بە واتای (دەرکردن)([3]) دێت، واتە (دەریان کردن) ئایا پەیامبەر

---

١ - مقدمة ابن خلدون، (بیروت:د/ت) ل١٠٠٩.

٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٣ - المعجم الوسیط، ج٢، ل٧٨٨.

سلێمان (ر.خ) عارەب بووە هەتا بەو شێوەیە گفتوگۆ بکات؟ دواتر ئەمانە تەئویل و تەخویلی ئەوەیان بۆ بکرێت و رەچەڵەکیان بکەنە عارەبی؟ دواتر ئایا هەموو شتێك لە رووی زمانەوانییەوە دەکرێ بگەڕێنرێتەوە سەر شێوەی عارەبییەوە؟ چونکە هەر بە ڕاستی ئەو سەرنجە، تێڕوانینێکی کورتبینە ئەگەر پرسەکانی پێ پێوانە بکرێت.

ئەوەی جێگەی باسکردنە زۆررێك لە نووسەرانی عارەب لە گەڕانەوەیان بۆ بنەچەی وشەکان بە تایبەتی وشە عەجەمیەکان شێوەکەیان گەڕاندۆتەوە بۆ بنەچەی عارەبی، جا ئەوە کاریان پێ بووبێت یان نا، ئەوە لە توانای ئەواندا بووبێت یان نا، بێگومان ئەوەش لەسەر حسابی راستییە زانستیەکان و مێژووییەکان بووە، چونکە تەنیا پێکچوونێك لە نێوان بێژە و زاراوەکاندا لە رووی ناو و شێوەوە واتای ئەوە نییە یەك جۆرە بنەچە و شێوە و واتایان هەبێت.

٥-خەڵکانێك هەبوونە رایان وابووە کە زوحاك خاوەن دەمێکی گەورە بووە، کە عارەب و فارس ناکۆکییەکیان لەسەری هەبووە کە لە کام لەو لایەنە بووە.([١]) هەروەها لەسەر شانیدا دوو مار هەبووە و تێریان نەخواردووە تەنیا بە مێشکی سەری مرۆڤ نەبێت، ئەمەش بۆتە هۆی لەبن هێنانی میللەتی فارس، بۆیە خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە و شەڕیان لەدژی کردووە، ئەوانە ئالایەکیان هەڵگرتووە پێیان گوتووە دەرفش کاویان، ئافردیدونی زوحاك کە خۆی لە چیای دنباوەند ناوە.([٢]) وەزیری زوحاك

---

١ - ئاشتیاگ، لە رووی مێژووییەوە ئەوە روونبۆتەوە کە ئەوە زوحاکە کە چەندان ناوی دیکەی هەبووە وەکو (بیوراسب، اژدهاك، لشتومیکۆ، ایخ تومکو) کە دوا پاشای میدیەکان بووە کە پایتەختەکەیان هەمەدان بووە، کە لەسەر دەستی پاشای ئەخمینیەکان بەناوی کۆرش لە ساڵی ٥٥٠ پێش زاین کەوتووە، نەیانتوانیوە زوحاك بگرن، بەلاّم لە شوێنێکی دوور لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە، بڕوانە: داکونوق، میدیا، وەرگێڕانی بورهان قاینع، (بغدا:١٩٨٧) ل٥٧٧. بکە.

٢ - دنباوەند: چایەکی گەورەیە لە ناوچەکمانی رەی، بەفری سەر چیاکە ناتوێتەوەو هیچ کەسێك ناتوانێ سەرکەوێتە سەر لوتکەکەی، ئەو چایەش بە چیای بیوراسف ناسراوە، کە پەیوەستە بە چیرۆکی ئافەرەیدون و زوحاکەوە، کە ئافەرەیدون توانیویەتی لەژێر دەستی ئەو ستەمکارە زوحاك ·بیوراسف) رزگاریان بکات، پێش ئەوەی ئەو پاشایە بچێتە چیای ناوبراو، دەڵێن ئەو گەنجانەی کە وەزیری پاشا کە ناوی (ئەرمائیل) بووە رزگاریان بکات هەتا نەبنە خواردنی ئەو دوومارەی لەسەر شانی زوحاك بووە، دەی ناردنە ئەو چیایەوە، بەلاّم وەکو تێبینی دەکرێت کە ئیبن فەقێی هەمەدانی و مسعەری کوڕی موهەلهەل و یاقوت هیچ

هەموو رۆژی پیاوێك لەگەڵ بەرانێکی سەربڕیوە و مێشکی کەللەسەری ئەوانەیان تێکەڵکردووە و مارەکانی سەرشانی زوحاکیان پێ تێرکردووە، بۆیە بۆ دەربازبوون لەو ستەمەی زووحاك خەڵکەکە پەنایان بۆ چیا بردووە و لەوێ ماوەنەتەوە، ئەوانە سەرەتای دروستبوونی رەچەڵەکی کورد بوونە و چەندان تیرە و هۆزیان لێ بۆتەوە.([1]) دواتر مەسعودی شتێکی دیکەی دەخاتەسەر (ئەوەی باسمان کرد لەبارەی زوحاکەوە فارس نکوڵی لەمە ناکەن و، هەتا خاوەندارانی مێژووی کۆن و نوێش ئەوە رتناکەنەوە، فارسەکان لەسەروکارییان لەگەڵ زوحاك و ئەهریمەن هەواڵی سەیریان هەیە و ئەوەش بوونی هەیە لە پەڕتووکەکانیاندا.([2])

ئەوەش واتای ئەوەیە کورد جۆرە کۆچەرییەکی فارس بوونە و بە چیاکاندا بڵاوبوونەتەوە، ئەو گێڕانەوەیە لە بۆتەیەکی فارسیدایە لەبارەی بنەچەی کوردەوە، هەروەها ئەوش ناڵێت کە ئەو گێڕانەوەیە عارەبی بێت وەکو باسمان کرد، دیارە ئەوەش سروشتێکی جادویی و پڕوپوچی ئەفسانەیی بەسەریدا زاڵە کە ئەدەبی فارسی پێ دەناسرێتەوە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی مەسعودی باسی دەکات لەبارەی ئەو هەواڵانەوە کە خاوەندارانی مێژووی فارسی لەسەری کۆکن، بەڵام ئەوەش واتای بەڵگەی تەواو نادات بەدەستەوە، چونکە رێگەی گواستنەوەی خوارەوە بۆ سەرەوە لە دیارترین دیاردەی نووسینەوەی مێژووی سەردەمە کۆنەکان بووە، زۆرجاریش ئەو دیاردانە رووبەڕووی رەخنە و شیکردنەوە نەکراونەتەوە، ئەوەی شایەنی باسکردنە مەسعودی دوای خستنەڕووی ئەو شەش بیروڕایەی کە باسمان کردن، تەنیا پشت بە یەك بیروڕا دەبەستێت، کە ئەویش بنەچەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ وەلیدی کوڕی رەبیعە کوڕی نزار، بۆیە پشت بەو رایەش دەبەستێت، گوایە زۆرتر بڵاوە لەنێو خەڵکیدا.

---

ئاماژەیەکیان بەوە نەکردووە کە بنەچەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسە ئازادبووانەی ژێر دەستی زوحاك: بڕوانە: مختلر كتاب البلدان، ل٢٥١-٢٥٣. ياقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣١٦-٣١٧.

١ - مروج الذهب، ج٢، ل٢٥٠.

٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٦-کورد له لای فارسەکان له نەوەی وەلید کورد کوڕی ئاسفندیار کوڕی منوشەهر بوونه.([1]) ئەو گێڕانەوەیە وەکو مەسعودی بانگەشەی بۆ دەکات گێڕانەوەیەکی فارسییە وەکو ئەوانەی پێشەوە، بەڵام ئەمە تێپەڕی شتی پڕوپوچی ئەفسانەیی کردووە کە زاڵ بووە بەسەر گێڕانەوەکەی پێشوودا، له جیاتی ئەوە ناوێکی (ناسراو)ی ئەندێشەی وەکو (کورد) دەگۆڕێت و پێوەستنی دەکات بە بنەچەی کوردەوە، کە ئەوەش پێکچووی بیروڕایەکی عارەبییە لەبارەی ئەو بابەتەوە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بنەچەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ (کورد کوڕی مەرد کوڕی سەعسەعە).

هەموو ئەو بیروڕایانە کە لەبارەی بنەچە و رەچەڵەکی کوردە گوتراوە کە مەسعودی دەیانگێڕێتەوە له پەڕتووکەکەی بەناوی (مروج الذهب) و(التنبیه والاشراف) دیارە پێشکێشکردنی ئەو گێڕانەوانە بەبێ ئەوەی پشت بە هیچ بەڵگەیەك ببەستێت، لەگەڵ ئەوەشدا له پەڕتووکەکاندا دەستاودەستیان پێکراوە و نووسیویانەتەوە له کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە، دواتر بنەچە و رەچەڵەکی کورد له چوارچێوەی عارەبی و فارسی دەرنەچووە.

ئەوەی یارمەتی ئەوەی داوە ئەو بیروڕا پووچ و بەتاڵانە خۆیان بگرن و بمێننەوە، دەسەڵاتداریەتی و هەژموونی نەتەوەکانی فارس و عارەبی بووە بەسەر وڵاتی کورد و نەتەوەکەیدا لە رووی رامیاری و رۆشنبیریی و، هەروەها پەرش و بڵاوی کورد([2]) و بیروڕاکان و بێدەنگی لەبەرامبەریان و وەرنەگرتنی بابەتەکە بەشێوەیەکی جدی، ئەمە

---

١ - التنبیه والاشراف، ل٩٤. منوشهر: یەکەم پاشای فارس بووە له چینی دووەم بە پێی دابەشکردنی مەسعودی، کە پاشایەتیەکەی نێزیکەی ١٢٠ ساڵی خایاندووە، کە فارسەکان بە پیرۆزی و گەورەیی سەیرییان کردووە. کە حەوت منداڵی هەبووەو زۆربەی ڕەچەڵەکی میللەتی فارس بۆ ئەو دەگەڕێتەوە. التنبیه والاشراف، ل٩٤.

٢ - مەبەست قەڵەمبەدەستانی بواری رامیارییە نموونە: پاشای یەمەنی ئەیوبی ئەلمەعەز ئیسماعیل کوڕی سەیفئەلئیسلام کوڕی تەفتکین کوڕی ئەیوبە، هەروەهەا بانگەشەی ئەوەی دەکرد مکە ئەو قورەیشیەو لە بەنی ئومەیەیە. بڕوانە: المختلر فی اخبار البشر، (بیروت:١٩٩٧) ج١، ل١٣٣، ج٢، ل١٩٢. هەروەها شەرەفخانی بەدلیسی و مەلا مەحمودی بایەزیدی و چەندانی دیکە، بڕوانە: شەرەفنامە، ل٤٧-٥٠. داب و نەریتی کوردەکان، ل١٩-٢١.

سەرەڕای ئەوەی بیستوویەتی بەرپەرچی نەداوەتەوە و ئەوەی نووسراوە لەبارەیانەوە خوێندویەتیەوە بەبێ ئەوەی بە شێوەیەکی زانستی رەخنەیان لێ بگرێت.

ئەو بیروڕایانە بەردەوام بووە لە گواستنەوە و ئاڵوگۆڕی لە سەرچاوە ئیسلامیەکاندا هەتا سەدەی هەشتەمی کۆچی ئەو کاتەی جیهانە زاراوەییەکەی ئیبن فەزلەللا ئەلعومەری (لەدایکبوون ٧٤٩ك/١٣٤٨ز) کە رایەکی نوێ و ئازایانەی بڵاوکردەوە کە پڕ بوو لە ئینسافی و دروستی کە (کوردەکان رەگەزێکی تایبەتن) ئەوان (دروستکراوێکن سەربەخۆ و میللەتێکن لەناوناچن).[1]

بەڵام وڵاتناسەکانی دیکە ئەوانەی لەدوای مەسعودیەوە هاتوون هەندێکیان بە شێوەیەکی دیکە باسی بنەچەی کوردیان کردووە، وەکو ئەستەخری ئاماژەی بۆ دەکات لە دووتۆی قسەکردنی لەبارەی کوردەکان لە ناوچەکانی فارس کە زیاتر لە پێنج سەد هەزار ماڵ بوونە، لەگەڵ ئەوەی (ئەوانە بە عارەب ناوبراون).[2] ئەستەخریش لەو دەستەواژەیە زیاتر نابێژێت و هیچ سەرنج و هیچ شیکردنەوەیەکی بۆناکات.

رەنگە نیازییان قووڵکردنەوە و زیادکردنی دەسەڵاتیان بووبێت لە هەرێمی فارس، هەروەها جۆرێك لە شکۆمەندی و شانازی بەخۆکردن بێت لەوەی بەرپەرچی ئەوەیان بداتەوە کە ئەوانە بنەچەیان عارەب بێت، کە لەوکاتدا ئەوان هێزێکی گەورە بوونە و خاوەن رێز و دەسەڵات بوونە بەهۆی ئاینی ئیسلامیەوە.

بەڵام ئیبن حوقەل لە دووتۆی باسکردنی بابەتەکانی ناوچە کوردیەکاندا لە هەرێمی فارس و ژمارەی خانووەکانیان، ئەو رەچەڵەکیان بۆ ئیبن دورەید[3] دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: ئیبن دورەید لە نەتەوەی عارەب بووە، ئەوانە زیاتر لە ولید کورد کوڕی مەرد کوڕی عومەر کوڕی عامر بوونە، هەروەها ئەبوبکر محەمەد کوڕی حەسەن کوڕی دورەید

---

١ - التعریف بالملطلح الشریفن تحقیق: محمد حسین شمس الدین، (بیروت:١٩٨٨) ل٥٨.

٢ - المسالك والممالك، ل٧٢.

٣ - ابن دورەیەد: ناوی ئەبوبکر محمد کوڕی حوسێن کوڕی دورەید کوڕی عتاهیەی ئیزیدیە لە شاری بەسرە لەدایك بووە لە ساڵی (٢٢٣ك/٨٣٧ز) هەر لەوێ خوێندوویتی، بە دیارترین زانای زمانەوانی سەردەمەکەی خۆی ناسراوە، دیارترین رەخنەگری شیعر بووە، نێزیکەی بیست و پێنج پەڕتووك و دانراوی لە چەندان بواردا هەیە، بڕوانە: ابن دورید، الاشتقاق، تحقیق: عبدالاسلام محمد هارون، منشوارت مکتبة المثنى (بغداد:١٩٧٩) ل٥-٣٠-٣٢-٣٣. دائرة المعارف الاسلامیة، مادة (ابن دروید) ج١، ل١٥٩.

بوونە، ئەوانەی زانیاری عارەبی و هەواڵەکانیان لێ وەرگرتوون، بەهانە بۆ قسەکانی دەهێنێـەوە و تەسلیم بەکسانی دیکەی دەکات لەو دەروازیە و ئەوانی دیکەوە.[1]

بەو شێوەیە سەرنج دەدەین ئیبن حوقەل لەبەرئەوەی متمانەکەی بە ئیبن دورەید و زانیارییەکەی لەدەست چووە، ئەمە وای لێکردووە پاڵپشتی بکات کاتێ بلەو رایەدا، بەبێ ئەوەی دوودڵ بێت لەو رایە جا ئەوە پێوەندیی بە رەچەڵەکی کورد بێت یان ئەوانی دیکە.

وەکو ئیبن حوقەل باسی کوردەکانی نیشتەجێی هەرێمی کرمان دەکات ئەوانەی بە قەفەس ناسراون و بە عارەب ناویان دەبات.[2]

بەڵام بەکری چەندین جار رایەکەی مەسعودی دووبارە دەکاتەوە لەو بارەیەوە، بەڵام بەشێوەیەکی کورت، ئەوەی ئەو باسی کردووە (دەڵێن کوردەکان خواردنی بیوراسفیان لا گرینگ بووە، چونکە هەموو رۆژی دوو مرۆڤیان سەربڕیوە، لە گۆشتەکانیان خواردنیان دروستکردووە، وەزیرەکەیان ناوی ئارمائیل بووە، یەکێکیان سەردەبڕێت و لەوەی دیکەیان شەرم دەکات و دەیباتە چیاکانی فارس، لەو شوێنەدا ژیان دەکەن و زۆر دەبن).[3]

لە لایەکی دیکەوە بەکری لە جەیهانی گواستۆتەوە و دەڵێت (بابەتی کوردەکان کە سەرەتاکەیان لە نێوان زەوی یەهودا لە زەوییەکانی شام و نێوان جەزیرەی عارەب بووە.[4] بەڵام ئەو رایە رێك ناکەوێت لەگەڵ هیچ راستییەك، هەروەها هیچ بەڵگەیەکیش نییە، چونکە کورد لەو شوێنەدا ژیان کردووە پێش هەزاران ساڵ وەکو لە پێشەوە باسمان کرد.

بەڵام ئیدریسی دوا کەس بووە بیروڕاکانی لە ئیبن دورەید گواستۆتەوە لەبارەی ئەو رایەی کە بنەچەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ کورد کوڕی مەرد کوڕی سەعسەعە.[5]

---

١ - صورة الارض، ل٣٤٠.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل٢٦٩.

٣ - المسالك والممالك، ل٣٤٣.

٤ - هەمان سەرچاوە، ل٣٤٤.

٥ - نزهة المشتاق، (طبعة لندن:١٩٧٠)ج٣، ل٤١٩.

بەو شێوەیە پێنج لە وڵاتناسانی ئەو ماوەیەی تۆژینەوەکەی تێدا ئەنجامدراوە باسی بنەچە و رەچەڵەك و رەگەزی کوردیان کردووە، وەکو سەرەنج دەدەین مەسعودی یەکەمیان بووە، بەڵام ئەوانەی دواییان شتێکی نوێیان نەگوتووە تەنیا بیروڕاکانی ئەویان گواستۆتەوە، هەموو ئەو رایانەش بەرامبەر بە یەکێك لە دێرینترین و کۆنترین نەتەوەی رۆژهەڵات ستەمکارانە بووە. بۆیە ئەو بارودۆخە خودی و بابەتیەش کە بەسەر ئەو راستیانەدا تێپەڕبووە، هیچ تۆژینەوەیەکی نوێ و زانستی هەموو ئەو شتانەی نەسەلماندووە.([1]) لەو بارەیەوە مێژوونووسی کورد محەمەد ئەمین زەکی بەگ دەڵێت: شوێنەواری ئیسلامی و چیرۆك و گێڕانەوەکانی دروستبوونی کورد، زۆر لەسەر تۆژینەوە و دۆزینەوەی بنەچە و رەچەڵەکی کورد ناوەستن).([2])

بەڵام سەبارەت بە زمانەوە، وەکو سەرنج دەدەین ئاماژەکانی وڵاتناسەکان بۆ زمانەکانی نەتەوەکان زۆر کەمە، وەکو دەردەکەوێت بە شێوەیەکی گشتی ئەوان هەڵوەستەیان لەسەر لەیەك جیاکردنەوەی زمانەکان و شێوە زارە جیاجیاکان نەکردووە، بەڵام تێکەڵیان کردووە، زۆر کەم لە باسەکەیاندا لەسەر ئەوە وەستاون کە ئەوە (عەجەمیە) بە واتای ئەوەی ئەوە عارەبی نییە، هەر بۆ نموونە دەبینین مەقدەسی لەبارەی قسەکردنی لە (هەرێمی عەجەم) کە هەشت بوونە، دەڵێ (قسەکردن لەبارەی ئەو هەشت هەرێمەوە بە عەجەمی هەیانە کراوە، هەیانە داخراو، سەرجەمیشیان ناویان ناوە فارسی، جیاوازیان هەبووە عەجەمیشی تێکەڵاو کراوە).([3])

بێگومان ئەوەی مەقدەسی باسی لێوەکردووە هەمووی بەتاڵە، چونکە زمانەکانی عەجەمی هەر هەمووی فارسی نییە، ئەگەر شێوازی هاوبەشیشیان هەبێت، بەڵام زاڵکردنی زمانی فارسی لە لایەن دەسەڵاتدارانی رامیاری و ئیمبراتۆریەتەکانی ئێرانی

---

١ - بۆ زیاتر لەبارەی بنەچەی کورد بڕوانە: ئیحسان نوری پاشا، مێژووی ڕەچەڵەکی کورد، وەرگێڕانی لە فارسییەوە، حەمەکەریم عارف (هەولێر:١٩٩٨). محمد امین زەکی، خولالەیەکی تەئریخی کوردو کوردستان، (سلێمانی:٢٠٠٠) بەرگی یەکەم، ل٥١-٦٥. ارشاك بۆلادیان، الاکراد حسب الملادر العربیة، نقله الی العربیة: خشادور لاریان و عبدالکریم ابازید، (بریفان:د/ت) ل١٠٤-١٤٠. لیرخ، دراسات حول الکورد، ترجمە عبدی حاجی، (حلب:١٩٩٢) ل٩-١٨.

٢ - خولاصەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان، چاپ و ئۆفسێتی دەزگای سەردەم، (سلێمانی:٢٠٠٠) ل٣٩.

٣ - احسن التقاسیم، ل٢١١.

یەك لەدوای یەك پێش ئیسلام، وای کرد ئەم زمانە ببێتە سەردەستەی هەموو زمانەکان لە ناوچەکەدا.

لە لایەکی دیکەوە وڵاتناسە موسڵمانەکان لەو کێشەیە تێنەگەیشتوون کە لە نێوان زمانەکانی ناوچەکە و زاراوەکانی یەك زماندا هەیە، لێرەوە ئەوان باسی زمانی (کوردیان) نەکردووە، تەنیا مەسعودی لێ دەربچێت کە واتای بەکارهێنراوی (زاراوە) لەیەکجیاوازەکانی خێڵە کوردییەکانی باس کردووە، کاتێ رایدەگەیەنێت کە (هەر جۆرێك لە کورد زمانەکەی کوردییە).[1]

بە شێوەیەکی گشتی سەرجەم وڵاتناسان درکی ئەوەیان نەکردووە کە کورد زمانی سەربەخۆ و تایبەت بەخۆی هەیە، نەك یەکێك بێت لە زاراوە فارسییەکان، بگرە هەر خۆی خاوەن چەندان زاراوەیە.[2]

### أ- خێڵ و تیرە کوردییەکان:

بێگومان کۆمەڵگەی ئیسلامی بە شێوەیەکی گشتی بە تایبەتی لەو ماوەیەی کە توێژنەوەکە دەیگرێتەوە، ئەوا سروشتی بەداوەت (کۆچەری) یان گوندیاتی بەسەریدا زاڵبووە، لەوەی دیاری کردنی جۆری ژیان و ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە زیاتر سروشتێکی شارنشینیان هەبێت.

دیارە کۆمەڵگەی کوردیش یەکێك بووە لە کۆمەڵگەکانی ئیسلامی هەمان حاڵەتیان بەسەردا جێبەجێ دەبێت، چونکە پێوەستنیەکان لە نێوان تاکەکان لەسەر بنەمای (خێڵ)[3] یان (هۆز)[1] بووە، لە لایەکی دیکەشەوە کۆچکردن و گەڕان لە شوێنێکەوە

---

١ -مروج الذهب، ج٢، ل٢٤٩.

٢ - بۆ زیاتر بڕوانە: شەرەفخان، المصادر نفسە، ل٥٠-٨٧. ئەمین زەکی، المصادر نفسە، ل٢٠٦-٢٢٥. فوئاد حەمە خورشید، التوزیع الجغرافي للهجات الکردیة، (بغداد: ١٩٨٦) ل؟ زبیر بیلال اسماعیل، تاریخ اللغة الکوردیية، (بغداد: ١٩٧٧).

٣ - عەشیرەت: یان خێل: لە چمارەیەکی کەم لە خەڵکی پێك دێت و بە ڕەچەڵەك دەگەڕێنەوە بۆ بنەماڵەیەك، هەروەش دەبێتە هۆی دروستکردنی تیرە بە پێی عورفی عەشایری، لە راستیدا نموونەی عەشیرەتی کوردی هەتا ئێستە لەسەر بنەمای هاوبەشی ناوچەییە. بڕوانە: شاکر خصباك، الاکراد، (بغداد:١٩٧١) ل٤٣٦.

بۆ شوێنێکی دیکە بۆ گەڕان بە دوای پاوان، یەکێك بووە لەو دیاردانەی کە وڵاتناسە موسڵمانەکان تێبینیان کردووە و هەڵوەستەیان لەسەر کردووە، بۆ ئەوەی زانیاری بەسوودمان لەبارەی ئەو خێڵ و هۆزو تیرانەوە پێشکێش بکەن، کە بە دەستە یان تیرە دەربڕینیان لێکردووە لە رووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە.

لە پەڕتووکە وڵاتناسەیەکاندا ناوی چەندان هۆز و تیرە و خێڵ و بنەماڵەی کورد هاتووە، کە لەنێو هەرێمە جۆربەجۆرەکانی کوردیدا بڵاوبوونەتەوە، یان لەو شوێنانەی کە کورد بە شێوەیەکی چڕ تێیدا نیشتەجێ بوونە، ئەگەر وڵاتناسانی سەدەی سێیەمی کۆچی ئاماژەیان بە دەستە و بنەماڵە کوردییەکان کردبێت لە هەرێمەکانی فارس و ئازەربایجان و خۆزستان- واتە لە دەرەوەی شوێنگەی سەرەکی کوردستان- هەندێ جار.([2]) بەڵام شانازییەکە بۆ وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی دەگەڕێتەوە لە دیاری کردنی ناوی زۆرێك لە خێڵ و هۆز و بنەماڵەی کوردەکان و، شوێنی نیشتەجێبوونیان یان راگوزارییان، بە تایبەتی مەسعودی و ئیبن حوقەل و ئەستەخری و مەسعەری کوڕی موهەلهەل.([3])

بەڵام یاقوت پەڕتووکەکەی پڕە لە باسکردنی دەیان هۆز و گروپە کوردییەکان بە تایبەتی ئەوانەی نیشتەجێی شوورە و قەڵاو قوللە بەربڵاوەکانی وڵاتی جەزیرە و چیاکان بوونە وەکو لەمەودوا باسی دەکەین.

ئەگەر خێڵ و تیرە و هۆزەکان لە هەناوی عارەبیدا رەچەڵەکەکەی بگەڕێتەوە بۆ کەسانێك کە نمایندەی باپیران یان شێخەکانیان بێت، بە روانین بۆ سروشتی جوگرافیای وڵاتی عارەبی کە جۆرە سروشتێکی بیابانی هەیە، ئەمشە وای کردووە لەبەر بارودۆخی

---

عبد ربه سكران ابراهيم الوائلي، اكراد العراق (١٨٥١-١٩١٤) اطروحة دكتوراه مقدمة الى كلية الاداب، (جامعة القاهرة:١٩٨٧) ل٨٢.

١ - قەبیلەك هۆز: لە چەند عەشیرەتێك پێك دێت، بەڵام ئەوانە بۆ یەك بنەماڵە دەگەڕێنەوە، بەڵام پێکهاتەی عەشیرەتی کوردی جیاوازی ناکات لەنێوان عەشیرەت و قەبیلەدا، یان راستر قەبیلە هەر نییە. الوائليز المصادر نفسة، ل٨٢. توما بوا، مع الاكراد. وەرطێرانی: ئاواز زەنطەنة (بغداد:١٩٧٥)ل٣٨.

٢ - بڕوانە: ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل٥١. ابن رستة، المصادر نفسة، ل؟ ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٨٨. قدامة بن جعفر، المصادر نفسة، ل٣٣٨-٣٧٨-٣٨١-٣٨٥.

٣ - زنجیرەکە بەپێی گەورەترین دەستەو تائیفەی کوردی بووە.

ئاو و هەواو شێوەی ژیانی پڕ لە چەرمەسەری کە پێویستی بەوە بووە هەموو خەڵکی ناوچەکە لەدەوری کەسێکی بەهێز کۆببنەوە بۆ ئەوەی بیانپارێزێت لە جەردە و مەترسی و ستەمەکانی رۆژگار، هەروەها ناکۆکی و کێبڕکێ لە نێوان تیرە و گروپە مرۆڤایەتیەکان (هۆزەکان) لە پێناوی ژیانی باشتر و پڕ لە ئاسایش، هەموو ئەمانە وای کردووە رەچەڵەکەکانی عارەب بگەڕێتەوە بۆ کەسانێك کە خۆی لە (باپیران) نواندووە، بەڵام وەکو تێبینی دەکەین رەچەڵەك و ریشەی کورد زۆرجار دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی جوگرافی کە ئەوان تێیدا ژیانیان کردووە بە شێوەی گروپ و کۆمەڵە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان، چونکە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ژینگە جوگرافییەی کە خاوەن سروشتێکی شاخاوی بووە- زۆرجار، هەروەها ناوچەکەش خێر و بێر و سەرچاوی ئاوی زۆر بووە، وەکو دەردەکەوێت ژینگەی جوگرافی تا ئاستێکی زۆر دەبێتە هۆی دیاری کردنی شێوەی ژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، هەروەها رەنگدانەوەیشی دەبێت بەسەر دەرکەوتە و ئاکار و رەوشتی کەسەکانەوە، وەکو مەسعودی جەخت لەوە دەکاتەوە کە دانیشتووانی چیاکان کە کورد بووینە بە رەقی و وشکی باسیان دەکات وەکو دەڵێت (بۆیە ئاکار و رەوشتی دانیشتووانەکەی وشك و دڵڕەق بوونە).[1]

بەڵام دەستە و تیرە کوردییەکان کە مەسعودی لە پەڕتووکەکانی (مروج الزهب)([2]) و (التنبیە والاشراف)[3] باسیان دەکات برێتییە لە:

- شوهجان: لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوونە کە کەوتۆتە نێوان ئەوەی پێی دەڵێن کوفە و بەسرە کە خاکی دەینور و هەمەدان بووە.
- ماجەردان: ئەوانە لە کەنکور بوونە کە کەوتۆتە نێوان هەمەدان و قرمیسین (کرمانشا) لە هەرێمی ئازەربایجان.
- هەزەبانی.[4]
- شازنجان لە هەرێمی چیاکان.

---

١ - مروج الذهب، ج٢، ل٩٦-٩٧.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٢، ل٢٥١.

٣ - التنبیە والاشراف، ل٧٨.

٤ - بڕوانە: احمد عبدالعزیز محمود، الهزبانیون في اذربیجان واربل والجزیرة الفراتیة.

- لوور: له هەرێمی چیاکان.
- مادنجان — (بازنجان)
- بارسان (بارسیان)[1]
- خالیه (گەلالی) (جەلالی)
- جابا روقیه: یەکەم کەسێك باسی کردبێت ئیبن خوردازەبەی وڵاتناس بووە.[2]
- گاوانییەکان.[3]
- مستەکان.
- دەبابله (دەنابله) که له وڵاتی شام نیشتەجێ بوونه.
- یەعقوبیەکان: ئەوانه خاچ پەرست بوونه.
- جۆرقان (جۆزقان) ئەوانەش خاچ پەرست بوونه.
- سەرات (شورات) ئەوانه رایان وەکو رای خەواریج بووە.
- جروغان.
- کەیکان.

ئەوەی شایەنی باسکردنه تیرە و هۆز و بنەماڵە کوردییەکان هەر ئەوەندە نییە که مەسعودی ناویان دەبات، بگرە هەندێکی لێ باسکردووە، بە بەڵگەی ئەوەی وەکو له پێشەوە باسمان کرد بە کورتی ناویان هاتووە، بەڵام بە پەرتی و گوتراوە (لەوانه) واته ئەو دەسته و تیرانه تەنیا بۆ نموونه ناویان هاتووە، دواتر باسی هەندێکیان دەکات وەکو دەڵێت (ئەوانی دیکه له رێبەرانی فارس و کرمان و سجتان و خوراسان و ئەسفەهان و خاکی چیا له ناوچەکانی کوفەو بەسرە- دەینور و هەمەدان و ماسبزان و یەگارین که برێتی بووە له بورج و کەرەج ئەبی دەلف و هەمەدان و شارەزوور و دەرابادو سامگان و ئازەربایجان و ئەرمینیا و ئاران و بیلکان

١ -رەنگه ئەوە له باسیان هاتبێتن بازیان ناوچەیەکه کەوتۆته نێوان قەزای چەمچەمال و پارێزگەی سلێمانیەوە.

٢ - المسالك والممالكن ل٢٧.

٣ - گاوانی کوردی ئەو هاوەله مەزنەی پێغەمەبەر(د.خ) سەر بەو خێڵەیه که کوڕەکەی ئەبو بەسیری کوردی چەندان فەرمودەی گێڕاوەتەوە. بڕوانەك ابن حجر العسقلانی، الالابه فی التمییز اللحابه، تحقیق: علی محمد البجاوی (القاهره:د/ت) ج١ن ل٤٢٩. هەروەها له بارەی گاوان و گاوانییەکان بڕوانه: ملگفی جواد، هۆزی لەبیرکراوی گاوان، وەرگێڕانی: هەژار، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، (بەغدا:١٩٧٣).

و، هەروەها دەروازەیەك لە دەروازەكانی جەزیرە و شام و تگور.([1]) بەڵام ئەستەخری باسی خێڵ و دەستە و بنەماڵە كوردییەكانی نەكردووە تەنیا ئاماژەیەكی كەمی بە هەندێ لەسەركردەی كوردەكان كردووە لە هەرێمی فارس.([2])

بەڵام ئیبن حوقەل لە باسكردنەكەی خۆیدا تیشكی خستووەتە سەر سەركردەی كوردەكان و شوێن و پێگەیان لە وڵاتی فارس.([3]) هەروەها لە باسكردنەكەی باسی چەند دەستە و تیرەی كوردی كردووە، هەروەها شوێنگە و پێگەیان وەكو حەمیدی و ئاری و هەمەدانی([4]) لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاكان و هەرێمی جەزیرە و شوراتەكان لە شاری سەهەرەورد.([5])و لور لە هەرێمی خۆزستان([6]) و هەمەدانی لە هەرێمی ئازەربایجان.([7]) و رەوادی لە ناوچەكانی ئەبهر و رەزقان سەر بە هەرێمەكان كە ناومان بردن.([8])و شەهارجیەكان لە جەزیرە([9])و مازنجان لە وڵاتی فارس لەسەر سنووری ئەسفەهان.([10])

ئەوەی جێگەی سەرنجە سەرەڕای گرینگی پەڕتووكەكەی مەقدەسی، بەڵام هیچ جیاوازییەكی لەگەڵ وڵاتناسانی دیكە نییە، چونكە ئاماژەی بەناوی هیچ هۆز و تیرە و خێڵێكی كوردی نەكردووە، تەنیا باسی چەند سەرۆكێكی كوردی لە وڵاتی فارس كردووە.([11]) رەنگە ئەوە ئارەزووی لەوە نەبووبێت شتەكان دووبارە بكاتەوە، چونكە تێبینی دەكەین بە شێوەیەكی گشتی پەنای بۆ دووبارە كردنەوە نەبردووە.

---

١ - التنبيه والاشراف ل٧٨.

٢ - المسالك والممالك، ل٨٧.

٣ - صورة الارض، ل٢٣٦-٢٣٩-٢٤٠.

٤ - هەمان سەرچاوە، ل١٩٥-٢٠٥-٣١٥.

٥ - هەمان سەرچاوە، ل٣١٤.

٦ - هەمان سەرچاوە، ل٢٣٢.

٧ - هەمان سەرچاوە، ل٢٨٩.

٨ - هەمان سەرچاوە، ل٢٨٩.

٩ - هەمان سەرچاوە، ل١٩٦.

١٠ - احسن التقاسيم، ل٣٣٩-٣٤٠.

١١ - هەزەبانی: توێژەرەكان بیروڕای جیاوازیان لەبارەی بنەچەی زمانەوانی ئەو وشەیە، یان سەرەتای چالاكیەكانیان دەگەڕێتەوە بۆ كۆتایی سەدەی سێیەمی كۆچی، لەوێوە هاتوونەتە نێو دەسپێكی ناكۆكی و

بەڵام مەسعەری کوڕی موهەلهەلی گەڕیدە، لە باسکردنی کورددا باسی هەزەبانییەکانی نیشتەجێی باشووری ڕۆژئاوای ئورمیەی کردووە، هەروەها باسی بنەماڵەی جەلالی[1] و باسیان[2] و حەکیمە[3] و سولی[4] کە نێزیکەی شەست هەزار ماڵ بوونە و نیشتەجێی شارەزوور بوونە.[5]

بەڵام وڵاتناسی مەغربی (بەکری) ئاماژەی بە شەش بنەماڵەی کورد کردووە و دەڵێت (لە رەگەزەکانی کورد: شۆهجان و ماجەردان و مازنجان و کەیکان و بارسیان

---

ململانێکانیان لەگەڵ هێزە ناوخۆییەکان بە تایبەتی حەمدانیەکان ئەوانەی وایان لێکردن لە زیدی خۆیان هەڵبکەنرێن لە ناوچەی هەکاری و دواتر بتوانن میرنشینێك لەوێ دابمەزرێنن کە مەڵبەندەکەی ئەربل بێت، لە سەرتای سەدەی پێنجەمی کۆچی و زیاتر لە سەدەیەك دەسەلاتیان بەردەوام بوو، بۆ زیاتر بڕوانە: احمد عبدالعزیز، الهزبانیون في اذربیجان واربل والجزیرة الفراتیة.

١ - جەلالی: توێژەرەکان لەسەر ئەو رایە کۆکن کە جەلالی و (گەلالی) هەردووکیان یەك شتن، واتە هەردووکیان یەك ناون بۆ یەك عەشیرەت. بڕوانە: عباس العزاوی، عشائر العراق الکردیە، مگبعە المعارف، بغداد:١٩٤٧، ل١٧. محمد امین زکی بگن خلالە تاریخ الکرد وکردستان. بەلاّم یەکێك لە توێژەران گەیشتۆتە رایەکی جیاواز کە وشەی جەلالی و گەلالی لەیەکتر جیاوازن، کە هەر یەکێکیان دەگەڕێتەوە بۆ ناوی عەشیرەتێك، گەلالی ئەوانە ئێستە بونیان هەیەو لە ناوچەی کوردستانی ئێران نیشتەجێن، بەلاّم جەلالی، ئەوانەش عەشیرەتێکن لەناوچەی سێگۆشەی سنووری لەنێوان ئێران و تورکیاو ئازەربایجان ی ڕۆژئاوا نیشتەجێن، هەروەها هەندێ لەو مالاّنە لە ناوچەکانی کوردستانی عێراق نیشتەجێن. بۆ زیاتر بڕوانە: حسام الدین نقشبندین الرسالة الثانیة، لمسعر مهلهل وشهرزور، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژمارە (٨) ساڵی ٢٠٠١، ل٢١٧-٢١٩.

٢ - زۆربە پێیان وایە ئەمە (بازیانی) ئێستەیە.

٣ - عەباس ئەلعەزاوی باس دەکات کە حەکیمە ڕەچەڵەکی بۆ مەروان کوڕی حەکەمی ئەموی دەگەڕێتەوە، ئەوەش گوتنێکە ئیچ بنەمایەکی نییە، بڕوانە: عشائر العراق الكردية، ل١٧.

٤ - سولی: رەنگە (سیوەیل) بێت، ئەوە ناوچەیەکە سەر بە پارێزگەی سلێمانی، وەکو عەمەری لە سەدەی هەشتەمی کۆشی بە ناوی (سول) ناوی بردووە، مسالك الابلار، الدار فؤاد سزکین، السفر الثالث، ورقة ١٢٤، العزاوی، عشائر العراق الكردية، ل١٧.

٥ - الرسالة الثانية، ل١٨.

(مارسیان) موستاکان و چەندانی دیکە)[1] شوێنی نیشتەجیٚ بوونیشیان دیاری دەکات لە خاکی دەینور و هەمەدان و وڵاتی ئازەربایجان و وڵاتی شام لە خاکی مووسڵ هەتا دەگاتە چیای جودی. دواتر باسی هەندیٚ خاچ پەرست دەکات کە بەڕای ئەو ئەوانە یەعقوبی بوونە.[2] کە ئەوەش تاکە وڵاتناسە ئاماژەی بۆ ئەوە کردبێت.

هەر لە کۆتاییەکانی سەدەی پێنجەم هەتا دەیەی دووەمی سەدەی حەوتەمی کۆچی هیچ شوێنەوارێك دیارنییە لەوەی کەسێك باسی هۆز و تیرە و خێڵی کوردی کردبێت لە پەڕتووکە وڵاتناسییەکاندا، بەڵام بە دەرکەوتنی یاقوتی حومەوی و پەڕتووکە دیارەکەی ئەم واقیعە گۆڕانی بەسەردا هات، کە یاقوت لەبارەی ئەو بابەتەوە بە دەیان جار زیاتر لە وڵاتناسەکانی دیکەی پێش خۆی کە لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە دەست پێدەکات ئاماژەی بە هۆز و تیرە و خێڵی کورد دەکات.

– هەزەبانییەکان: وەکو باسیان دەکات ئەوانە نیشتەجێی ناوچەکانی مووسڵ بوونە، باسی کەسێکی هەزەبانی دەکات کە ناوی ئەمیر شەرفەدین یەعقوب کوڕی حوسێن هەزەبانی بووە، بە دڵنیاییەوە لە کەسی ناوبراوی گواستووەتەوە کە ئەو لە دیمەشق بووە، زانیاری وڵاتناسی ورد لەبارەی وڵاتی شام و جەزیرەی عارەب هەبووە.[3] ئەوەی گرینگەو بەسوودە لەوەی یاقوت لەبارەی هەزەبانیەکانەوە نووسیویە ئەویە (ئەزرەح: ئەوە ناوی شارێکە لە دەوروبەری شام لە شارەکانی شورات بووە، دواتر ناوچەکانی بەلقا و عومان و دەوروبەری خاکی حیجاز، میر شەرەفەدین یەعقوبی کوڕی حوسێن هەمەدانی خۆی قسەی بۆکردم کە خێڵێکە لە کوردەکان، لە ناوچەکانی مووسڵ نیشتەجێن، هەروەها دەڵێت: ئەزرەح و جەربام زیاتر لە جارێك بینیوە نێوانیان هەر میلێك دەبوو، بگرە کەمتر، چونکە بە پێوە ئەو ئەوی دیکەی دەبینی، پیاوێکم بینی لەو ناوچەیە و دەڵێت ئێمە لە دیمەشقین و دواتر بۆم دەرکەوت ئەو راست دەکات، دوای

---

١ – المسالك والممالك، ل٣٤٤.

٢ – هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٣ – بڕوانە: معجم البلدان، ج١، ل١١٠. ج٣، ل٢١٢. ج٤. ل٣٠٢. ج٥. ل٥٢.ج٧، ل٧٣-٢٢٦. ج٦، ل٣٧٢، ج٨ل٢٨٤-٤٤٠.

چەند کەسێکی دیکەم لەو ناوچەیە بینی ئەوان هەمان قسەی ئەویان دووپات دەکردەوە).[1]

– زەرزاری: یەکێك لە قەڵاکانی بە ئەربل بەناوی ئەوانەوە ناسراوە. کە ناوی خەفتیانی زەرزاری بووە.[2]

– حەمیدییەکان: ئەوانە نیشتەجێی قەڵای عەقر حەسینە بوونە لەو چیایانەی کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی مووسڵ.[3] شارۆکەکانی وەکو شۆش[4] و غیزە و[5] جوجەر و[6] ئەوانی دیکە.

– داسنی: یاقوت دەڵێت: (داسن ناوی چیایەکی گەورەیە لە باکووری شاری مووسڵ بەلای ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلەوە، کە زۆرێك لە دەستە و بنەماڵەی کوردی لێبووە پێیان گوتون داسنی).[7]

– جۆبیەکان: ئەوانە نیشتەجێی یەکێك لە قەڵاکانی حەسەن کێفا بوونە.[8]

– جەلالی: یاقوت لە مەسعەری کوڕی موهەلهەل دەگوازێتەوە کە ئەوانە بەشێك بوونە لە کوردەکان کە دەیان هەزار ماڵ بوونە و نیشتەجێی شارەزوور بوونە.[9] لە بابەتێکی دیکەی پەڕتووکەکەی ئاماژە بە گوندێك دەکات بەناوی (باکەلبا) کە سەر بە ئەربل بووە لەبارەی کەسێکەوە قسەدەکات بەناوی فەقی سدیق کە ناوی ئەبو عەبدوڵا حوسێن کوڕی شەروین کوڕی ئەبی بەشیر جەلالی باکیلی بووە، فەقێی شافیعی بووە و لە چەندین قوتابخانەی مووسڵ و حەلەب خوێندوویەتی، ئەو قسەیەی لە کۆمەڵێك

---

١ - معجم الابلدان، ج١، ل١١٠.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٣. ل٢٤٠

٣ - هەمان سەرچاوە، ج٦، ل٣٣٨.

٤ - هەمان سەرچاوە، ج٥، ل١٦٢.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٦، ل٤٠٣.

٦ - هەمان سەرچاوە، ج٣، ل٨٧.

٧ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٢٨٤.

٨ - هەمان سەرچاوە، ج٣، ل١٥٣.

٩ - هەمان سەرچاوە، ج٥، ل١٦٥.

بیستووه، كه گه‌نجانی گه‌وره و دووربین بوونه، كه جه‌لالی ره‌چه‌ڵه‌كی ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ هۆزه كورده‌كان).[1]

– هه‌كاری: (ره‌چه‌ڵه‌كیان له شارۆكه و ناحیه و گونده‌كانی مووسڵ بووه له شاری جه‌زیره‌ی ئیبن عومه‌ر، كه كورد تێیدا نیشته‌جێ بووه و پێیان گوتووه هه‌كاری).[2]

– به‌شنه‌وی و بۆختی: ئه‌وانه دوو هۆزبوونه له ناوچه‌ی زۆزان نیشته‌جێ بوونه، به تایبه‌تی له قه‌ڵا و قولله‌كاندا.[3] كه ئه‌و ناوچه‌یه (خه‌ڵكه‌كه‌ی ئه‌رمه‌ن و هه‌ندێ بنه‌ماڵه‌ی كوردی تێدا بووه).[4]

– لوور: ئه‌وانه نه‌وه‌یه‌ك بوونه له كورده‌كان له چیاكانی نێوان ئه‌سفه‌هان و خۆزستان، ئه‌و ناوچه‌یه‌ش به‌ناوی ئه‌وانه‌وه ناونراوه.[5]

– جۆزقان (جۆرقان) ئه‌وانه‌ش نه‌وه‌یه‌ك بوونه له كورده‌كان له حه‌لوان نیشته‌جێ بوونه، ره‌چه‌ڵه‌كیان ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئه‌بو عه‌بدولای حوسێن كوڕی ئیبراهیم كوڕی حوسێن كوڕی جه‌عفه‌ر جۆزقانی[6] ئه‌وانه گۆران بوونه.

– زوومان: ئه‌وانه ده‌ستیه‌ك بوونه له كورده‌كان و خاوه‌ن ویلایه‌تێك بوونه، كه له یه‌كێك له ناوچه‌كانی ئه‌رمینیا نیشته‌جێ بوونه و دواتر له مووسڵ له ناوچه‌ی زووم.[7]

– به‌نو ئه‌یوب: یاقوت له دووتۆی باسكردنی شاری (دوین) ئاماژه بۆ ئه‌وه ده‌كات كه (پاشای به‌نو ئه‌یوب) به‌بێ ئه‌وه‌ی ئاماژه بۆ ئه‌وه بكات كه ئه‌وانه له كوردی ره‌وادی بوونه، كه یه‌كێكن له تیره‌كانی هه‌زه‌بانی.

– كورده‌كانی شام: ئه‌وانه له قولله‌ی كوردستان نیشته‌جێ بوونه، كه شوێنێكی خۆش و دڵگیر بووه و له‌سه‌ر چیایه‌كی ره‌نگین كه به زنجیره چیای لوبنانه‌وه بووه له نێوان

---

١ - هه‌مان سه‌رچاوه، ج٢، ل٢٦١.

٢ - هه‌مان سه‌رچاوه، ج٨، ل٤٨٠.

٣ - ته‌ماای: به‌شی دووه‌می ئه‌و تۆژینه‌وه‌یه بكه‌ن.

٤ - معجم البلدان، ج٤، ل٤٨٨.

٥ - معجم البلدان، ج٧، ل١٧٧.

٦ - هه‌مان سه‌رچاوه، ج٣، ل٩١.

٧ - هه‌مان سه‌رچاوه، ج٤، ل٤٨٩.

بەعلەبەك و حمس، هەر بە ناوی ئەوانەوە ناوبراوە، چونکە ئەوان لەو ناوچەیە کۆبوونەتەوە، بۆ ئەوەی ببنە لەمپەرێك بەرامبەر خاچپەرستەکان.[1]

لە بابەتێکی دیکە و لە دووتۆی باسکردنی مێژووی شاری میافارقین کە بەناوبانگترین شاری دیاربەکرە، ئاماژە بەو چیایە کراوە و دەگوترێ کە (هەندێ لەسەرکردەی کوردی شامی تێدا نیشتەجێ بووە).[2] رەنگە ئەوە واتای ئەوە بێت کە ژمارەیەك لە کوردەکانی نیشتەجێی قەڵای کوردستان گواستبوویانەوە بۆ ئەو شوێنە، دوای قەڵاکەیان لەدەست چووە.

هـ- هەندێ پەسن و سروشتی گشتی:

وڵاتناس و گەڕیدە موسڵمانەکان ئاماژەیان بە چەندان پرسی کۆمەڵایەتی پێوەستن بە کوردەکان کردووە، وڵاتناسانی سەدەی چوارەمی کۆچی بەوە جیادەکرێنەوە لەوانی دیکە، مەقدەسی رێزی پێشەوەی گرتووە لەنێو ئەواندا کە لە پەڕتووکەکەیدا بەشێکی تایبەتی تەرخان کردووە بۆ قسەکردن لەبارەی رەوشی گشتی هەر هەرێمێك لەو پێنج هەرێمەی باسی کردووە.

هەندێ وڵاتناسی دیکە باسی پەسنە گشتییەکانی خەڵکی یەك هەرێمیان کردووە، یان هەندێ تایبەتمەندی کۆمەڵایەتی دانیشتووانی شارێکیان باس کردووە.

یەعقوبی یەکەم وڵاتناسە باسی کوردی کردووە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بەوەی کە دڵڕەقیان تێدا بووە، ئەوەش لە دووتۆی پێناسەکردنی وڵاتی هەرێمە جیاجیاکان، کە باسی شاری چیا دەکات کە (خەمبار و خراپ و بەستراو بوو).[3] وەکو ئەوەی (ماڵی کوردستان جەرگ ئەستووران).[4] لەو دەقە ئەوە دەردەکەوێت کە یعقوبی لە نێوان سروشتی کۆمەڵایەتی ئەوان و دۆخی ئاو و هەوای وڵاتەکەیانەوە جۆرە گونجانێکی کردووە،بە دەستەواژەیەکی دیکە کە باسی کورد و وڵاتی کوردستان دەکات بە دڵڕەقی و خراپی، رەنگە ئەمە رەنگدانەوەی سەختی و ئەستەمی ناوچەکە و ناخۆشی ئاو و هەوای سەخت بێت، هەر ئەوەشە مەسعودی جەختی لێدەکاتەوە کە هۆکاری جوگرافی

---

١ - هەمان سەرچاوە، ل١٥٢.

٢ - معجم البلدان، ج٨، ل٣٤٥.

٣ - معجم البلدان، ل٦.

٤ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

کاریگەری بەسەر سروشتی ئاکار و ڕەوشتی دانیشتووانی چیاکان بووە.[1] لەو دەقانەش ئەوەمان بۆ دەروەست دەبێت کە خراپی و دڵڕەقی کە کوردی پێ پەسن کراوە بەڵگەی بەهێزی و توندوتیژی و بەرگەگرتنی ئەو بارودۆخە سەختەی ئاو و هەوای ناخۆش و ئەو سروشتە سەختەی وڵاتەکەیان گرتووە، ئەوەش وای کردووە میللەتەکە توندوتیژ و جەرگ ئەستوور بن.

بەڵام قەزوینی باسی چیاو خەڵکەکەی بە شێوەیەکی ئەرێنی دەکات وەکو دەڵێت: (خۆشترین شوێنە لە رووی هەوا و ئاو و خاکەوە، خەڵکەکەی باشترین کەسن لە رووی میزاج و باشترین شێوەیان هەیە).[2] لەو گێڕانەوەیە سەرنجی ئەوە دەدەین دیسانەوە جۆرە گونجانێك لە نێوان ئاو و هەواو سروشتی کەسەکان هەیە.

بەڵام ئیبن رستە جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەستێرە و بورج و ڕۆژ کاریگەرییان بەسەر سروشتی کەسەکانەوە هەیە وەکو دەڵێت: (ڕۆژ کاریگەری بەسەر ناسنامە و پێکهاتەی کەسەکان و دەروونی ئاژەڵیانە و میزاجەوە هەیە لە شار و دروستکراو و ئاکار و ئاین و کانزا و رووەك و دروستبوونیان بە ڕێپێدانی خودای گەورە).[3] وەکو دەزانین پێوەندیی نێوان گەردوون و سروشتی مرۆڤەکان جۆرە هزرێکی کۆنە.

بەڵام مەقدەسی واباسی خەڵکی چیاکان دەکات بەوەی کە (هێمنی و رووخۆشییان تێدایە).[4] وەکو باسی زۆری کار و گەورەیی عەقڵیان دەکات، وەکو باسیان دەکات کە تێیاندا هەیە (زانستی زۆر و عەقڵی چاپووك و سووربوونیان هەیە).[5] ئەوەش واتای ئەوە نییە کە کوردەکانی چیاکان شەڕانگێز بووبن، وەکو هەندێ لە شاعیران لە شیعرەکانیاندا باسیان دەکەن وەکو دەڵێن:

---

١ - مروج الذهب، ج٢، ل٢٤٨.

٢ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٢٩.

٣ - الاعلاق النفیسة، ل١٢.

٤ - احسن التقاسیم، ل٣٠٣.

٥ - یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٧٥.

کم قطعنا من عدو شرس زط[1] زاکراد وقفس[2] قفس

شاعیرێکی دیکه دەڵێت:

ولو اصبحت بنت القطاي دونها جبال بها الاكراد صم صخورها

لباشرت ثوب الخوف حتى بنفس اذا كانت بارض تزورها[3]

ئەو دێڕانە بەڵگەی ئەوەیە کە تا چەند ترس و هەیبەت لە کوردەکانی چیاکان بینراوە، وەکو شاعیر باسی دەکات کە ئەو ئامادەی ئەوە بووە سواری مەترسییەکان بێت، تەنیا بگاتە خۆشەویستەکەی، بۆ ئەمەش چەندان ناوچە و چیای عاسێی بڕیوە کە کوردەکان تێیدا نیشتەجێ بوونە لەپێناوی ئەودا.

هەندێ لە وڵاتناسەکان ئاماژە بۆ سروشت و تایبەتمەندی هەندێ لە خەڵکانی وڵات و هەرێمەکان کردووە، ڤاڵا نییە لە قسەی خۆش و نوکتە، بەڵام ئەمە بە ڕێکەوت نەبووە، وەکو دەڵێن قوباد کوڕی فەیرۆز هەرێمەکەی خۆی کە حوکمی تێدا کردووە دابەشکردووە هەتا دەگاتە ئەوەی کە هەر هەرێمێك لەوەی دیکە جیابکرێتەوە، وەکو عاقڵترینیان خەڵکی حەوت ناوچە بوونە لەوانە ماسبزان و هەمەدان و بە فێلترینیان یازدە شار بووە لەوانە ماسبزان و مهرجانقەزەق و تستەر بووە، هەروەها کەمترین خەڵکی وڵاتەکەی کە کورت بین بووە هەشت شار بووە لەوانە ماسبزان و مهرجانقزەق و بندینجین بووە.[4]

وەکو سەرنج دەدەین ئیبن فەقێی هەمەدانی باسی هەندێ شوێنی کردووە لەوەی پەسنەکانیان چۆن بووە، جۆرە هاودژییەك بەدی دەکرێت وەکو شاری ماسبزان، کە باسی خەڵکەکەی دەکەن بەوەی هەندێ جار عاقڵترین کەس بوونە، هەندێ جاریش کورت بین بوونە، ئایا چۆن عاقڵ و کورتبین پێکەوە کۆدەکرێتەوە.

---

١ - زگ: بە عارەبی (جت) تێکەڵیەکن لە خەڵك بە نور ناسراون، ڕەچەڵەکیان هیندی ئاسایە کە لە لێوارەکانی کەنداو لە خوارووی عێراق نیشتەجێن، ڕۆڵی سەربازی و سیاسییان هەبوو لە سەدەی سێیەمی کۆچی، بڕوانە: محمد الخضري بك، المصادر نفسة، ل١٩٥-١٩٦. بكة.

٢ - قەفەسك ئەوانە نەوەیەکن لە کرمان لە ژیانیاندا وەکو کوردەکانن، پێیان دەڵێن قەفەس و بلوج. یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٧٥.

٣ - یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل٧٥.

٤ - ابن الفقيه الهمداني، المصادر نفسة، ل١٩٤.

بەڵام ئەبو حامیدی غەرناتی دوا کەس بووە کە گوتوویەتی کەسانی پێشان وایان داناوە ئاکار و رەوشتی خەڵکی هەر وڵاتێك وەکو ئەوە نییە هەر شارێك پێی ناسراوە لە سروشتەکان، وەکو دەبینین خەڵکی دەشت حەوت شار بوونە لەوانە: حەلوان و ماسبزان و نەهاوەند بوونە، بە فێڵترین خەڵکی دنیا خەڵکی ماسبزان و مهرجان و ئازەربایجان و مووسڵ و ئەرمینیا و شارەزوور و سانعان بوونە، رەزیلترین خەڵکی دەشتیش خەڵکی ماسبزان و دەبیل و دەینور و حەلوان بوونە.[1]

غەرناتی ئەوەیشی باسکردووە کە (خەڵکی جەزیرە ئازاترین سوارچاك بوونە.[2] هەروەها ئیبن حوقەل باسی خەڵکی جەزیرە بە شکۆمەندی دەکات،[3] وەکو مەسعودیش ئاماژە بۆ خەڵکی جەزیرە دەکات بەوەی کە (ئازا و خاوەن سام و چاونەترسین).بێگومان ئەو باسکردنەی کوردەکان بەو شێوەیە لە ئازایەتی و چاونەترسی ئەوە بەدیار دەخات کە کورد رۆڵی سەربازیانەی خۆی بە درێژایی مێژوو لە ناوچەکەدا هەبووە.

وەکو ئیبن فەقێی هەمەدانی باسی لایەنێك لە ژیانی پاشا و میرەکانی چیاکان لە زستاندا دەکات، کە ئەوان (ژیان و گوزەرانێکی ئەوتۆیان نەبووە تەنیا لە رۆژانی زستان نەبێت).[4] ئەوەش لەبەر چێژوەرگرتنیان لەو پۆشاکە باشەی کە گەرمترین پۆشاك بووە کە لە فەرووی ئاژەڵی کێوی دروستکراوە، هەروەها لەنێو ماڵەکانیاندا باشترین فەرشی گرانبەهایان راخستووە وەکو ئاوریشم و ئەرمەنی و خوری و مەرەزی و چەندانی دیکە، هەروەها لە پەڕتووکەکەیدا هاتووە چۆن ئەو پاشایانە دیوەخانی خۆیان لە شەوانی وەرزی زستان گەرمکردووە بە دانیشتن و قسە گێڕانەوە کە بە شەوانی درێژ ناوی دەبەن (پاشاکان چێژیان لە خواردنەوەی بەردەوام بە درێژایی شەو و کەمی خەوتن وەردەگرت، کە ئەوە هاورێی خۆیان و ژیانی ئەبەدی بوو بۆ ئەوان، ئەوەش هۆکاری تەمەن درێژی و تەندروستی جەستەیان بووە).[5]

---

١ - تحفة الالباب، ل٢١٦.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل٢١٥.

٣ - صورة الارض، ل١٩٠.

٤ - مختلر كتاب البلدان، ل٢١٦.

٥ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

ئەمە سەرەڕای ئەو پەسنە گشتییانە کە وڵاتناسان ئاماژەیان بۆ کردووە، هەندێك لەوانە باسی شتی تایبەتی هەندێ شاریشیان کردووە، وەکو بەراوردکردنی پەسنی شارێك لەگەڵ شارێکی دیکە، وەکو ئەوەی ئەستەخری کە باسی شاری دەینور دەکات کە (خەڵکەکەی باشترن لە خەڵکی هەمەدان)[1] یان مەقدەسی ئەویش دەڵێت (باشترین خەڵکن)[2] هەروەها باسی خەڵکی نەسیبین دەکات بەوەی کە (خاوەن چاکە و رووخۆشی بوونە)،[3] هەروەها باسی کوردەکانی شنۆیان بەوە کردووە کە نەتەوەیەکن (چاکە و توڕە و توند بوونە، هەمیشە لەسەر پێ بوونە، ئەگەر داوای پاراستنیان لێکرابێت).[4]

هەروەها باسی خەڵکی ماردین دەکات کە دڵڕەق و زمانیان بەهێز بووە و توانیویانە هەر کەسێك رازی بکەن بە هەر جۆرێك بێت، بۆیە هەندێ پیاوچاك بەو شێوەیە لەبارەیانەوە گوتویانە:

في ماردين، حماها الله، لي سكن        لولا الضرورة ما فارقتها نفسا

لاهلها السن لان الحـــــــديد لها        وقلبهم جبلي قد قسا وعسا[5]

بەو شێوەیە شیکردنەوە و شرۆڤەی کارەکەیان دەکەن هەتا دەگاتە چالاکی بازرگانی هەمیەشییان لە شارەکە و، چۆنییەتی تێکەڵاوبوونیان بە بازرگان و هاوڕێکیان لەگەڵ گەشتیاران لەسەر ئاستێکی بەرفرەوان، ئەوەش واتای ئەوە دەدات، بازاڕ و خانەی زۆر هەبووە لە شارەکەدا.[6]

لەبەرگرەوەی پەڕتووکی ئیبن حوقەل باس دەکات کاتێ چۆتە شاری ئامەد لە ساڵی ٥٣٤ی کۆچی بینویەتی کە خەڵکەکەی (خاوەن چاکە و پیاوەتی و شکۆمەندی و زۆر رێزیان لە کەسانی غەریب گرتووە).[7] لە باشکردنی ناوچەی شارەزووریش یاقوت تاوانبار دەکات بەوەی کە کوردەکانی نیشتەجێی چیاکانی ئەو ناوچەیە، بەوەی کە هەر

---

١ - المسالك والممالك، ل١٩٨.

٢ - احسن التقاسيم، ل٣٠٢.

٣ - هەمان سەرچاوە، ل١٢٤.

٤ - ياقوت، معجم البلدان، ج٦، ل١٦٧. القزويني، اثار الابلاد، ل٤٣٢.

٥ - ياقوت، معجم البلدان، ج٦، ل١٩٤. القزويني، اثار الابلاد، ل٢٦٠.

٦ - ياقوت، معجم البلدان، ج٧، ل١٩٤.

٧ - صورة الارض، ل٢٠١.

کەسێك چووبێتە ناویان یان بەتەنیشت شار و گوندەکانیان رابردبێ زۆریان لێکردوون، (خەڵکیان ترساندووە) بەبێ ئەوەی هیچ شتێك هەبووبێت و سلیان لە هیچ بەربەستێك کردبێتەوە).[1]

یاقوت هەر بەوەندە ناوەستێت لە شێواندنی راستییەکان، بگرە تێپەڕی ئەوە دەکات و سیفتە خراپەکان دەگشتێنی بەسەر تەواوی کورددا کاتێ دەڵێت: (ئەوە سروشتی کوردەکانە و رەوشت و رەفتاریان زانراوە و نێوچەوانیان نیشانەکراوە). ئەمە سەرەڕای ئەو قسانەی، ئاماژە بە ژمارەی مندالبوونی ناوچەی شارەزوور دەکات کە ژمارەکە بە شێوەیەکە گەمارۆ نادرێت. (لە پێناوی ئەوان و گەورەییان و زانا و دانا و خانەدان و قازی و فەقێکان)، ئەوانە لە بەنی شارەزووری و بەنی عەسرون بوون.[2] ئەوانەی لە بواری دادوەری دەرکەوتن و خزمەتێکی مەزنیان پێشکێش بە گەل کرد.

ئەوە نکوڵی ناکرێت لەوەی کە یاقوت باسی کردووە بێدادەیەکی زۆری دەرهەق بە مافی کورد کردووە، ئەوانەی رۆڵێکی دیارییان لە مێژووی شارستانییەتی ئیسلامی لە هەموو سەردەمەکان هەبووە، بۆیە دەکرێ ئەو چەمکە هەڵانە و، ئەو بڕیارە چەوتانەی کە دەرهەق بە کورد کراوە راستبکرێنەوە، بە تایبەتی ئەوەی سەلاحەدینی ئەیوبی کە سولتانێکی کورد بووە کردوویەتی، کە چ دەسکەوت و چ خزمەتێکی بە گەلی ئیسلامی کردووە لە لاپەڕەی ململانێی ئیسلام و خاچ پەرستەکاندا.

وەکو دیارە کورد بەدەست دەسەڵاتدارانەوە بە درێژایی سەردەمەکان ناڵاندوویەتی، لەبەر ئەوان حەزیان بە ئازادی ژیان و سەربەخۆیی بووە، بۆیە دەسەڵاتی دەسەڵاتدارانی نامۆیان رەتکردووەتەوە، کە ئەوەش یەکێك لەو پەسنانە بووە کە رەنگدانەوەی سروشتی جوگرافی وڵاتی کوردستان بووە، کە پاڵی پێوەناون تەنگ بەو دەسەڵاتە هەڵبچنن کە هەوڵی داوە مافەکانیان پێشێل بکات و سەربەخۆییان لێ زەوت بکات، بۆیە کارەکانیان گەیشتووەتە ئەوەی هەر کەس بەتەکیاندا رابردبێ یان لێیان نێزیك ببێتەوە، ئەوا هەست بە نیازپاکی بکەن و، هەوڵی خۆیان بدەن.

هەتا ئەگەر هەندێ لەو دەستە و رەگەزە کوردییە کۆچەریانەی هەوڵیاندابێت رێگری لەو کاروانانە بکەن، کە بێگومان وڵاتناسەکان درکیان بەم کارە کردووە، بەڵام ئەوە

١ - معجم البلدان، ج٥، ل١٦٥.

٢ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

شتێکی ئاسایی بووە و جۆرە کارێك بووە نەك هەر چەند گروپێکی کوردی، بگرە عارەبان و دلێم و ئەوانی دیکەش ئەو کارەیان ئەنجام داوە، کەواتە ئەگەر ئەم کارە دزێوانە لەنێو هەموو میللەتەکان بوونی هەبوویێت و، بەسەر گشتیاندا جێبەجێبکرێت، ئەی بۆچی تەنیا بخرێتە ئەستۆی کورد (ئەوە سروشتی کوردەکانە و رەوشت و رەفتاریان زانراوە و نێوچەوانیان نیشانەکراوە). ئەی بۆچی یاقوت دژ بە رایەکانی خۆی دەبێتەوە کاتێ باسی گەورەیی زانا و قازیەکانی ناوچەی شارەزوور دەکات؟

ئەوەی یاقوت دەیڵێت پێکچووی هەمان رای ئیبن جەبیرە تەنیا شوێنەکەیان جیاوازە، وەکو دەردەکەوێت ئەندەلوسی گەڕیدە کە بە ڕۆژهەڵاتدا هاتووە، بەبێ ئەوەی شتێك لەبارەی ئەو ناوچەیەوە بزانێت و شارەزابێت، بە تایبەتی سروشتی نەتەوەکان، بینیویەتی کوردەکانی جەزیرە رێگە دەگرن و کاری خراپ و گەندەڵی لە رێگەی نێوان شاری نەسیبین و دنەیسەر بڵاودەکەنەوە، ئەمەش وای کردووە رێگە ئەمین نەبێت بەهۆی هێرشەکانی کورد، ئەمەش بۆتە ئافاتێك بۆ وڵات بەپێی بانگەشەکردن و چاوتێبڕینیان)[1]

بە دڵنیاییەوە ئەوەی ئیبن جەبیر باسی کردووە تەنیا ئەوەبووە کە گوێی لێبووە، گوێ لێ بوونیش شتێك نییە راستی بسەلمێنێ، لە واقیعدا هەموو ئەو کارە چەکدارییانەی کە بە ناشەرعی باسی دەکەن، کە لە دواتر سروشتێکی کۆمەڵایەتی وەرگرت، بێگومان رەگ و ریشەیەکی سیاسی هەیە، کە هەڵقوڵاوی هەست و سۆزی خەڵکی ناوچەکە بووە کە کورد بوونە، کە ماف و دەسەڵاتی خۆ رێبەریکردنیان لێ زەوت کراوە، هەروەها خێر و بێری وڵاتەکەیان کەسانی دیکەی غەیرە نەتەوە بردوونی، ناوچەکەیان بۆتە گۆڕەپانی ململانێی هێز و نەتەوە جۆراوجۆرەکان و ئەوانیش بە پلەی یەکەم زەرەرمەند بوونە، هەر ئەمەش بۆتە هۆی دروستبوونی هەستێکی نەتەوەیی دژ بەم بویەرە.

لە لایەکی دیکەوە ئیبن جەبیریش وەکو ئەوانی دیکە دوا کەس نییە هەوڵی دابێت هیچ جۆرە پێوەندییەك لە نێوان سەلاحەدینی ئەیوبی و کورد نەکات و زیادەڕەوی تێدا نەکات، ئەویش مەدح و سەنایەکی زۆری سەلاحەدین کردووە کە بە کردەوەش سەرکردەیەك بووە هەموو سیفاتێکی سەرکردایەتی و، هەروەها موسڵمان و پێوەستن بە

---

١ - رحلة ابن جبير، ل٢١٥.

ئاینەکەی بووە، کە لەو کاتدا قەیرانێکی گەورە لە ریزی میللەتانی ئیسلامی هەبووە و ئەو یەکلایی کردووەتەوە، بەڵام ئەو دەربڕینە هیچی لەو حوکمە ناڕەوایە کەم نەکردووەتەوە کە دەرهەق بە بنەماڵەی سەلاحەدین کردوویەتی.[1]

ئەوەی جێگەی سەرنجە دیسانەوە وڵاتناسان و گەڕیدەکان زۆر بە کەمی ئاماژەیان بە داب و نەریت و جەژن و بۆنەکانی کوردستان داوە کە ئاهەنگیان بۆ کردووە، ڕەنگە ئەوە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە هەر لەگەڵ هاتنی کورد و کەسانی دیکەی غەیرە کورد بۆ نێو ئیسلام هەموو بۆنە و جەژنە دیاری کراوەکانیان ڕۆژی ئاوابووبێت و، تەنیا ئەو بۆنە هاوبەشانە بۆتە کەلتوور و یادکردنەوەیان و بۆتە نەریت و جێگەی گرینگیپێدان، وەکو جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان.

ڕەنگە ئەمە جۆرە شیکردنەوەیەك هەڵبگرێت بەوەی کە ئەو کوردانەی وڵاتناسان و گەڕیدەکان لەبارەی وڵاتەکانیانەوە شتیان نووسیوە ڕەنگە شتێکی سەرسوڕهێنەر یان ناوازە، نەبووبێتە جێگەی سەرنجی ئەوان لەوەی پێوەستن بووبێت بە دابونەریت یان بەها کۆمەڵایەتییەکان، کە دوور بووبێت لە بەها پرەنسیپە ئیسلامییەکان کە بووبێتە جێگەی دیاری کردن، وەکو ئەوەی پێوەستە بە نەتەوە و میللەتانی دیکەی وەکو خەزەر و هیندستانییەکان و چەندانی دیکە.

لە دەقێکدا کە بەلازری لەبارەی ئەوەی تا چەند کوردەکانی نیشتەجێی باشووری ئازەربایجان سووربوونە لەسەر زیندوو راگرتنی بۆنە و جەژنەکانیان و دەرخستنی سۆز و خۆشی خۆیان بەو ڕێگەیەی کە ئەوان لەسەری راهاتوون لە شایی و گۆڤەندو دیلان، بۆیە مەرزەبان مەرجی هەبووە بۆ هاتنی سەرکردەی دەستبەسەرداگرتنی ئیسلام کە دەست نەخاتە نێو کاروباریان و قەدەخەیان نەکات لە پیادەکردنی چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانیان و بۆنە و جەژنەکانیان، لە بەرامبەریشدا ئەو ڕێگە بە موسڵمانەکان بدات بێنە نێو وڵاتەکانیانەوە، سەرکردەی موسڵمانانیش بەوە رازی بووە، وەکو لەو دەقەدا هاتووە (مەرزەبان ساڵح حەزیفە لە جیاتی هەموو خەڵکی ئازەربایجان لەسەر ئەوە بمێننەوە، کە

---

١ - بۆ زیاتر بڕوانە: محسن محمد حسین، سەرنجەکانی ئیبن جوبەیر لەسەر سەلاحەدین و دەوڵەتەکەی لە ڕێی دیدەنیەکانیەوە، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە ٢٣، هەولێر بەهاری ٢٠٠٢، ل٢١-٣٤.

کوردەکانی بەلاسجان و سەبلان و ساترودان[1] هەروەها خەڵکی شیز بە تایبەتی لە بۆنە و یاد کردنەوەی جەژنەکانیان قەدەخە نەکرێن و چۆن یادیان کردووەتەوە بیکەنەوە).[2]

کاتێ خەڵکی ئەسفەهان یادی جەژنی نەورۆزیان دەکردەوە، کە سۆز و خۆشی خۆیان بۆ ماوەی حەوت رۆژ دەردەبڕی و جوانترین جل و پۆشاکی رازاوەیان دەپۆشی، جۆرەها خواردن و خواردنەوەی خۆشیان ئامادە دەکرد، شایی و گۆڤەندیان ساز دەکرد، بە هەزاران درهەمیان لەو بۆنەیەدا خەرج دەکرد، بەڵام ئەسفەهانیەکان تاکە کەس نەبوون ئەو بۆنەیان یاد دەکردەوە، بگرە خەڵکانی دیکەی دەوروبەریش بەهەمان شێوە یادی ئەو جەژنەیان دەکردەوە.[3] هەروەها راستتر خەڵکانی دیکەی کوردی سەر بە هەرێمەکە یان هەرێمی چیاکان ئەوانیش یادی ئەو جەژنەیان دەکردەوە.[4]

ئیبن حوقەل جەخت لەوە دەکاتەوە ئاهەنگێڕانی نەورۆز خاوەن ئازادییەکی تەواو بوون بەبێ ئەوەی هیچ دەسەڵاتدارێکی غەیرە کورد دەستبخاتە نێو کاروباریانەوە بە درێژایی ئەو ساڵانە.[5] ئەوەش واتای ئەوەبووە کە تا چەند نەتەوەکانی ئێران خاوەنی تەواوی ئازادییەکانی خۆیان بوونە لە بۆنە و یادکردنەوە و جەژنە نەتەوەیەکان لە لایەك و، هەروەها تا چەند (نەورۆز) کاریگەری لە دەروونیان کردووە کە بەشێوەیەك ئاسان نەبووە دەست لەو یادە هەڵبگرن.

بەڵام ئەو زانیارییانەی وڵاتناسە موسڵمانەکان لەبارەی جلوبەرگ و پۆشاك لە هەرێمە جیاجیاکانی وڵاتی ئیسلام بە شێوەیەکی گشتی باسیان کردووە زۆر چرووکە، تەنیا هەندێکیان نەبێت لە پێشەوەیاندا ئیبن حوقەل، بەڵام دیسانەوە ئەو باسی جل وبەرگ و پۆشاکی تایبەت بە کوردیان نەکردووە، بگرە تەنیا جەختیان لە جلوبەرگی تایبەت بە نەتەوە و هۆزەکانی هەرێمە دوورەکان کردووە، وەکو هەرێمی مەغریب و ئەندەلوس و فارس و سەند و خەزەر و خوراسان و وڵاتی پشت رووبار و چەندانی دیکە، لە کاتێکدا

---

١ - بڕوانە: الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٠٣-١٠٤-١٢٩.

٢ - لای یاقوت (ئاوی رۆذان) بووە، معجم البلدان، ج١، ل١٠٩.

٣ - فتوح البلدان، ل٣١٧. یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٠٩.

٤ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٠.

٥ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

باسی جلوبەرگ و پۆشاکی خەڵکی جەزیرە و چیاکان و وڵاتی عارەب و شام و میسریان نەکردووە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ئاماژەیان بۆ جل وبەرگی خەڵکی عێراق و خۆزستان و فارس کردووە کە ئەوەش هەندێ سوودمان پێدەگەینێ لە زانینی جلوبەرگی کوردەکان و خوردکردنەوەی تێڕوانینمان، چونکە ئەوانیش ژمارەیەکی زۆریان دانیشتووی هەمان هەرێم بوونە، کە هەمان سیفات و پەسنی جلوبەرگی وڵاتی باسکراو بەسەریاندا جێبەجێ دەبێت کە تا ئاستێکی زۆر جلوبەرگ و پۆشاکی نەتەوەی کورد وەکو کراس و کەوا[1] و کورتەك[2] یان ئەو جامانەیەی کە لە ژێرەوەی کڵاو هەیە[3] یان لەو ناوچانەی کە لە نێوەندی پیاواندا بڵاوە و دەیپۆشن.[4]

د- ئول و ئارەزووە ئاینیەکان:

وڵاتناسەکان بە شێوەی جۆراوجۆر و جیاواز باسی لایەنی باوەڕ و ئۆل و ئارەزووە مەزهەبی و ئاینیەکانی کوردیان کردووە.

وەکو دەزانین زۆربەی خەڵکی کوردستان لەسەر ئاینی ئیسلامن لە دوای فتوحاتی ئیسلامیەوە، هەرلەو کاتەوە دەست لەملانی ئاینە نوێکەیان بوونە، یەکێك لەو ئاماژانەی ئەو ئاینەش بوونی ئەو هەموو مزگەوت و پەرستگەیەیە کە لە شار و گوند و دێهاتی کوردستان هەیە،[5] ئەمە سەرەڕای بوونی خانەقا و تەکییە،[1] هەروەها بوونی دیاردەی سەردانی کردنی گۆڕی پیاواچاکان.

---

١ - صورة الارض، ل٢٢٩. الارز: واتای ئەو پۆشاکە دەگەیەنێت کە ئافرەت سەرتاپای جەستەی خۆی پێ داپۆشیوە، دیارە دوو جۆرە پۆشاك هەبووە بۆ خۆداپۆشین کە یەکێکیان بۆ داپۆشینی جەستە بووە بەش ێوەیەکی ئاسایی، بەڵام مئزەر: پارچەیەك قوماش بووە کە لە سەرەوە تا خوارەوە جەستەی ئافرەتی داپۆشیوە. تەمشای: دوزي، المعجم المفلل باسماء الملابس العربية الاسلامية، ترجمة: اكرم فاضلن (بغداد:١٩٧١) ل٤٠.

٢ - صورة الارض، ل٢٨٠. قرات: بە کوردی واتای کورتەکە. ادي شير معجم الالفاظ الفارسية المعربة، ل١٢٤.

٣ - بڕوانە: ابن سيدةن المصادر نفسة، ج٤، ل٩.دوزي، المصادر نفسة، ل٤٥.

٤ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٥٣.

٥ - ثيَشتر ئاماذةمان بة مزطةوت و ثةرستطاكان كرد لة بةشةكاني ثيَشةوة.

ولاّتناسان و گەڕیدەکان ئاماژەیان بۆ زۆرێك لەو دیاردە ئاینیانە کردووە، لەوانە لە شاری ماردین چەندین خانەقا و تەکیە هەیە، هەروەها سێ شوێنی کۆبوونەوە لە شاری نەسیبین هەیە، شوێنی یەکەم بەناوی عەلی کوڕی ئەبی تالیب و دووەم شوێن بەناوی سەر، لەسەری تیر، وەکو دەڵێن سەری ئیمام حوسێن کوڕی عەلی (ر.خ) پێوە بەدار وەکراوە کاتێ لە بەشامدا هاتووە، ئەوەی سێیەم شوێنی خاڵە، دەڵێن خوێنی سەری ئیمام لەو شوێنە بووە.[٢]

وەکو هەروری کە پسپۆر بووە لە کاروباری شوێنە پیرۆزەکان و مەزارەکان ئاماژە بە شوێنی دایکی یەمەن و شوێنی خدر لە شاری دارا[٣] دەکات، هەروەها شوێنی ئیمام عەلی کوڕی ئەبی تالیب لەسەر چیای شەنگاڵ.[٤]

دەکرێ بڵێین بنیاتنانی ئەو شوێن و پەرەستگا و ئەنجوومەنانە کارێك بووە هەر لە خۆوە نەبووە و بنەمایەکی مێژوویی و واقیعی هەبووە، چونکە بریارڕدانیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کوردەکانیش خاوەن جۆرێك لە باوەڕی هەر لەخۆوە و سۆزی ئاینی بوونە، هەتا ئەو پرسە ئەگەر کارێکی ناواقیعیش بووبێت.

وەکو هروری ئاماژە بە زۆرێك لە گۆڕ و مەزاری پیاو چاکان لە شاری دنەیسەر و ئامەد و ئورمیەو دارا و شەنگاڵ و جەزیرەی ئیبن عومەر و چەندانی دیکە دەکات.[٥]

بەڵام لە رووی مەزهەبییەوە لێرەدا هەندێ ئاماژەی کەم هەیە لەو بارەیەوە، وەکو مەسعودی باس دەکات کە (کوردەکان لەسەر رای خەواریج بوونە و بێ بەری بوونە لە عوسمان و عەلی).[٦]

دیارە مەزهەبی هەرێمی ئاقور (جەزیرە) سەر بە ئەهلی سونە و جەماعە بوونە.[٧] لەسەر مەزهەبی ئەبی حەنیفە و شافعی (ر.خ) بوونە، ئەوانە بوونیان هەبووە لەگەڵ

---

١ - یاقوت، معجم البلدانن ج٧، ل١٩٤.

٢ - اهروي، المصادر نفسة، ل٦٥.

٣ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٤ - هەمان سەرچاوە، ل٦٤.

٥ - الاشارات، ل٦٤-٦٦.

٦ - مروج الذهب، ج٢، ل٢٥١.

٧ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٦.

هەندێ لە حەنبەلی شیعە، بەڵام فیقهیان شتێك نەبووە شایەنی دەمەتەقێ و وروژاندن بووبێت و پابەندبوونە بە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە خوێندنەوەی عەبدوڵای کوڕی عامر.[1]

لە کاتێکدا دانیشتووانی شاری سەهرەورد لە شوراتەکان بوونە (خەواریج)[2] هەروەها شارەزوورییەکان زۆربەیان لە شوێنکەوتەی خەلیفە عومەر کوڕی عەبدولعەزیز[3] بوونە.

هەروەها دانیشتووانی هەرێمی چیاکان بە شێوەیەکی گشتی دوو بەش بوونە لە نێوان حەنبلەیەکان و لایەنگیری و خۆشەویستیان بۆ معاویە بووە لە لایەك و، هەندێکیشیان مەیلی خەواریجیان هەبووە کە وەکو ئەوان کفریان کردووە.[4] کە ئەوانە لە هەردوو حاڵەتەکەدا بە هەڵەدا چوونە.

مەقدەسی لە باسی دانیشتووانی هەرێمی رەحاب (ئازەربایجان و ئەرمینیا و ئاران)دا کە ژمارەیەکی زۆری دانیشتووانیان کورد بووە، دەڵێت مەزهەبەکانیان چەند شێوەیەك بووە، ئەهلی فەرمودە و، هەروەها حەنبەلی بوونە، لە کاتێکدا خەڵکی شاری دوین (دبیل) ئەوانی دیکە لە شارەکانی هەرێمەکە لەسەر مەزهەبی ئەبی حەنیفە بوونە.[5]

بەڵام دانیشتووانی چیاکان ئەوەی ناسراوە بە هەرێمی کرمان و ئەوەی ئیبن حوقەل باسیان دەکات کە (هەندێ لە کوردەکان بەڵام بە عارەبیان ناودەبەن)[6] ئەوانە کاریگەر بوونە بە بانگەشەی فاتمییەکان، بوون بە شیعە، ئیبن حوقەل رەچەڵەکیان دەگەڕێنێتەوە بۆ هەندێ لە زانایانی ئەو نەتەوەیە بەوەی کە دەڵێن ئەوانە ماڵ و سامانێکی زۆریان کۆکردووەتەوە و چاوەڕوانی ئیمامی زەمان[7] دەکەن، واتە ئیمام مەهەدی چاوەڕوانکراو.

---

١ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٢ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٣١٥.

٣ - مسعر بن مهلهل، المصادر نفسة، ل١٨.

٤ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٢٩٥.

٥ - هەمان سەرچاوە، ل٢٩١.

٦ - صورة الارض، ل٢٦٩.

٧ - صورة الارض، ل٢٦٩.

بەڵام ئول و باوەڕی دیکەی وەکو زەردەشتی و مەسیحی و یەهودی ئەوانە بە شێوەی جۆراوجۆر لە وڵاتی کوردستان هەبووە، وەکو دەردەکەوێت زەردەشتی[1] لە هەرێمی چیاکان زۆر تر بڵاوبۆتەوە لە ئاینی مەسیحی و یەهودی، بە روانین بۆ ئەوەی کە زەردەشتی لە سەدەی حەوتەمی پێش زاین لە وڵاتی کوردستان –میدیا- دەرکەوتووە، بەردەوام بووە لە بڵاوبوونەوە هەتا ئاینی فەرمی لە دەوڵەتی ساسانی ڕۆژی ئاوابووە.[2]

لە دوای سەرهەڵدانی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە ڕێگەی فتوحات و گەیشتنی پێشەنگانی فەتحکاران بۆ وڵاتی کوردستان، ئەو کاتە دانیشتووانەکەی دەست لەملانی زەردەشتی بوونە لەوانەش وڵاتی کوردستان، هەندێکیان هاتنە نێو ئیسلام و هەندێکیشیان لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە و، لەبری ئەوە پارە و سامانیان وەکو سزایەك دەدا.[3]

یەکێك لە ڕۆژهەڵاتناسەکان باس دەکات دوای سێ سەدە لە هاتنی ئیسلام بۆ هەرێمەکانی ئاران لە هەر ویلایەتێك لە ویلایەتەکان ئاتەشگەیەك هەبووە.([4]) هەروەها هەندێ ئاماژەی وڵاتناسی هەیە جەخت لەوە دەکاتەوە، وەکو ئیبن رستەی گەڕیدە دەبێژێت لە گوندی ئاخەرین کە کەوتۆتە نێزیك گردی حەلوان ئاتەشگەیەك هەبووە، کە زۆر گەورە بووە و خەڵکی لە شوێنی دووری وڵاتەوە بۆی هاتوون بە مەبەستی خوداپەرستی.[5]

هەروەها لە گوندێکی نێزیك هەمەدان ئاتەشگەی دێرین هەبووە، یەکێك لەو سێ ئاتەشگە سەرەکیانەی هەبووە، زەردەشتییەکان پێشەنگبوونە لە پیرۆزکردنی، بەڵام دوو پەرستگەکەی دیکە ئاتەشگەی (ئەزەر خزە) و ئاتەشگەی (جم شیز)ـــە، وەکو ئیبن

---

١ - سەبارەت بە زەردەستی و رێنماییەکانی بڕوانە: الجاحظ، الحيوان، تحقيق: عبدالاسلام رؤوف، (بيروت:١٩٦٩) ج٥، ل٣٢٥-٣٢٧ز المسعودي، التنبيه والاشراف، ل٢٧٩. الشهرستاني، الملل والنحل، تحقيق: احمد فهمي محمد (القاهرة:١٣٦٨ه)ج١، ل٢١٩. ارثر كريستينسن، المصادر نفسة، ل١٣٠-١٦٧.

٢ - ارثر كريستنسن، المصادر نفسة، ل١٣٠.

٣ - ابو يوسف، الخراج (القاهرة:١٣٦٩ه) ل١٣٩.

٤ - بروان، تاريخ الادب في ايران، ترجمة الى العربية: احمد كمال الدين حلمي، (جامعة الكويت:١٩٨٤)ج١، ل٣١٠.

٥ - الاعلاق النفيسة، ل١٥١.

فەقیێ هەمەدانی باس دەکات، ئەو پەرستگەیە لە ساڵی ٢٨٢ك/٨٩٥ز) ئاواکراوە، واتە لەسەردەمی خەلیفەی عەباسی موعتەزید(٢٧٩-٢٨٩ك/٨٩٢-٩٠١ز)[١]

مەقدەسی جەخت لەوە دەکاتەوە کە زەردەشتیەکان لە ناوچەی چیا زۆربوونە.[٢] وەکو وڵاتناسەکان باسی ئاتەشگەی شیز دەکەن، کە کەوتۆتە نێوان شاری مەراغە و زەنجان و شارەزوور و دەینور بەوەی کە زۆر گەورە و پان و پۆڕ بووە، لەسەر گۆمەزەکەی مانگێکی هیلال هەبووە، وەکو دەڵێن یەکێك لە شتە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەو ئاتەشگەدەیە بۆ ماوەی حەوسەد ساڵە ئاگری تێدا دەسووتێت و خۆڵەمێشی نییە،[٣] هەروەها لە یەکێك لە شارۆکەکانی نێزیك شاری حەلوان هەیوانێکی گەورە هەبووە و لەناوەوەی ئاگردانێك هەبووە، وەکو یەکێك لە گەڕیدەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی سەرنجی داوەتی.[٤] هەروەها لە شاری یەشتر کە کەوتۆتە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان پەرستگەی زەردەشتییەکان هەبووە.[٥]

ئەبو دەلفی گەڕیدە باس دەکات لە شاری ئایزەج کە کەوتۆتە نێوەندی چیاکان لە نێوان ئەسفەهان و خۆزستان ئاتەشگەیەك هەبووە هەتا سەردەمی هارون رەشید ئاگری تێدا نیڵەی داوە.[٦]

ئەوەی جێگەی ئاماژە بۆکردنە چەندان شوێنەوار هەیە ئەوەیان ئاشکرا کردووە کە لە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان پەرستگە و ئاتەشگە و نەخشی هەڵکەنراو بەسەر شاخەکانەوە هەیە، ئەوانە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمە جیاجیاکان کە ئاینی زەردەشتی تێدا باو بووە.[٧]

---

١ - مختلر كتاب البلدان، ل٢٢٦.

٢ - احسن التقاسيم، ل٣٠٣.

٣ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل١٠٦. مسعر بن مهلهل، المصادر نفسة، ل٨. ياقوت، معجم البلدانن ج٥، ل١٧١.

٤ - القزويني، اثار الابلاد، ل٤٥١.

٥ - حمد الله المستوفي القزويني، المصادر نفسة، ل١٢٧.

٦ - بڕوانە: كريستينسن، المصادر نفسة، ل٢٤٢ز مسعود كلزاري، المصادر نفسة، ل٦٧٠-٦٧٥-٦٨٠. بكة.

٧ - الرسالة الثانية، ل٤١. ياقوت، معجم البلدان، ج١، ل٢٢٩.

بەڵام لە هەرێمی جەزیرە مەقدەسی جەخت لەوە دەکاتەوە کە هیچ ئاگەرپەرستێك نەماوەتەوە دوای ئەوەی زەردەشتییەکان هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، هەروەها یاقوت ئاماژە بۆ ئەوە دەکات یەکێك لە گوندەکانی شاری ئەربل بەلای مووسڵەوە کە نێزیکەی هەشت میل لە ئەربلەوە دوور بووە، ئاتەشگەی لێ بووە.[1] و ناوی ئاتەشگەکەش بەسەر گوندەکەدا براوە.

بەڵام خورەمی[2] کە درێژبۆوەی مەزدەکی بووە.[3] خورەمی لەسەردەمی ئیسلام سەری هەڵداوە کە هەمان مەزدەکی بووە.[4] دیارە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان لە دیارترین شوێنی ئەوان بووە، کە خاوەنی چەندان قوڵڵەو قەڵا بوونە،[5] لەسەردەمی عەباسییەکان ئامادەییەکی ئاشکرایان هەبووە لە هەمەدان و دەینور و گوندەکانی ئەسفەهان.[6] کە هەندێ لە چیاکانی هەرێمەکە بە چیای خورەمی[7] یان خورمەدینی ناسراوە،[8] لەبەر بوونی خورەمیەکان لەو ناوچەیە و، ئەمەش بۆ ڕەچەڵەکی بابەکی خورەمی دەگەڕێتەوە، ئەستەخریش باس دەکات سەرەڕای بوونی مزگەوت لە گوندەکانیان، بەڵام قورئانیش

---

١ - یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل٤١١.

٢ - خورەمی: ئەمانە دەستیەکی ئاینی بوون، لەسەر شێوازی ئێرانی کۆن وەکو زەردەشتی و مەزدەکی، کە لە سەدەی دووەمی کۆچی دەرکەوتن، کە بابەکی خورەمی سەرکردایەتی دەکردن لە سەرتاکانی سەدەی سێیەمی کۆچی و هەر بەناوی ئەوەوە ناونراوە، بڕوانە: الاسفرایین، ل٨٠.

٣ - مەزدەکی، ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەرەکەی بەناوی مەزدەك، کە لە سەردەمی پاشای ساسانی قوباز (٤٨٨-٥٣١ز) دەرکەوت، کورتەی بیروباوەڕەکەیان ئەوەبوو: خەڵکی بەیەکسانی لە دایکدەبن و هیچ جیاوازییەکیان لەنێواندا نییە، کاتێك کێشە لەنێوانیاندا دروست دەبێت بە هۆی ئافرەتە یان پارەو سامانە، چارەسەرەکەی خۆی لە بەرفرەیی دەبینێتەوە، خەڵکان هافپشکن وەکو ئەوەی پشکداربن لە ئاو ئاگرو خواردن، بڕوانە: المسعودي، مروج الذهب، ج١، ل٢٨٩. ابن الندیم، المصادر نفسة، ل٤٠٦. الشهرستانی، الملل والنحل، ج١، ل٢٢٩. احمد شلبي، مقارنة الادیان، ل٤٢. کریستنسن، المصادر نفسة، ل٣٣٠.

٤ - ابن الندیم، المصادر نفسة، ل٤٠٦.

٥ - مسکویة، تجارب الامم، (ملر:١٩١٤) ج١، ل٢٧٨.

٦ - الیعقوبي، البلدان، ل٤١-٤٤.

٧ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل١٢٠.

٨ - المقدسي، المصادر نفسة، ل٣٠٦.

خوێندراوە، وەکو دەڵێت (ئەوان لە ناخەوە دینداریان نەکردووە تەنیا ئەگەر مۆڵەت پێدراو نەبێت).[1]

بەڵام مەقدەسی کە سەردانی شوێنەکەی کردووە و هەندێ سەرنجی خۆی جێ هێشتووە و جەخت لەوە دەکاتەوە کە خەڵکەکەی تکاکار بوونە، ئەوان دەموچاویان نەشوشتووە و لە گوندەکەیان مزگەوت نەبووە، کاتێ گفتوگیان لەگەڵ کردوون لەو بارەیەوە کە نهێنی نەبوونی مزگەوت چییە لە گوندەکەیان، ئەوان گوتویانە کە لە لایەن موسڵمانەکانەوە غەز و نەکراون و یەکگر بوونە لەوەی هەموویان باج و سەرانە لەبری ئەوە بدەنە سوڵتان.[2]

بەڵام لەبارەی ئاینی مەسیحیەوە، ئەوا لە زۆربەی ناوچەکانی هەرێمی جەزیرە و ناوچەی هەکاری و ئەربل و ناوچەکانی کە کەوتۆتە ژێر حوکمی بیزنتیەکان ئەو ئاینە بوونی هەبووە، پێش دەرکەوتنی ئیسلام و گەیشتنی بۆ تەواوی ناوچەکە.[3] بۆیە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ناوچەکە هەر لەسەر ئاینی خۆیان مانەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی ئیسلام باوەڕی بە برایەتی و پێکەوەژیان و ئازادی ئۆل و بیروباوەڕ هەبوو تا رادەیەکی زۆر.[4]

وەکو ئیبن حوقەل ئاماژە بە خەڵکانێك دەکات لە شەهارجە (خاچ پەرست و خاوەن ئاسانی) دەکات کە نیشتەجێی شاری کەفر عەزی بوونە.[5] وەکو دیارە خەڵکی شەهارجە کورد بوونە و، هاوکاری موسڵمانەکانیان کردووە لە دەستبەسەرداگرتنی شاری تکریت، بەڵام دواتر راپەڕینیان کردووە لە دژی دەسەڵاتی عەباسییەکان لە ساڵی (١٤٨ك/٧٦٥ز) لەسەردەمی خەلافەتی ئەبو جەعفەری مەنسور.[6]

---

١ - المسالك والممالك، ل١٢٠.

٢ - احسن التقاسيم، ل٣٠٦.

٣ - الهروي، المصادر نفسة، ل٦٤-٦٦.

٤ - بڕوانە: توما المرجي، كتاب الرؤساء، عربه ووضع الحواشية الاب البيريونا (المولل:١٩٦٦) ادي شيرن تاريخ كلدو اشور (بيروت:١٩١٣) ج٢، ل٥. الرهاوي، تاريخ الرهاوي المجهول، ترجمة البيربونا (بغداد:١٩٨٦).

٥ - صورة الارض، ل١٩٦.

٦ - بڕوانە: الازدي، المصادر نفسة، ل٢٠٨-٢٠٩.

مەسعودی جەخت لەوە دەكاتەوە كە كوردستانی شاری یەعقوبیە و جۆرقان، ئەوانەی نیشتەجێی ناوچەكانی تەنیشت مووسڵ و نێزیك چیای جودی بوونە.[1]

وەكو دەردەكەوێت برایەتی و پێكەوەژیانی موسڵمانەكان لەگەڵ ئەوانی دیكە، وای كردووە ژمارەی كەنیسە و دێر و پەرستگەی ئاینی دیكە بوونی زۆر بێت لە ناوچەكەدا، وەكو ولاتناس و گەڕیدە موسڵمانەكان ئاماژەیان بۆ كردووە، هەر ئەمەش زیاتر سەرنجی ئەوانی كێش كردووە زیاتر لە هۆكارەكانی دیكە، بە تایبەتی یاقوت كە باسی دەیان دێر و پەرستگە دەكات كە بوونیان هەبووە لە هەموو لایەكی جەزیرەدا، وەكو باسی پێناسەی دێر دەكات و دەڵێت: (دێر ماڵێكە خواوەندی تێدا دەپەرسترێت، ئەوە بوونی نەبووە لە میسری گەورە، بگرە لە بیابان و لەسەر چیاكان بوونی هەبووە، ئەوەی لە میسر هەبووە كەنیسە یان بەیعە بووە، رەنگە جیازاوی لە نێوان ئەو دوانەدا ئەوە بووبێت كەنیسە بۆ یەهود و بەیعە بۆ خاچهەڵگرانبووبێت.[2]

ئەوەی زیاتر سەرنجی گەڕیدەكانی كێشكردبێت كەنیسەی شاری رەها بووە، چونكە بە شێوەیەك بووە كەنیسەی وا گەورە و مەزن وێنەی نەبووە لە ولاتی موسڵماناندا.[3] كە هیچ بینایەكی بەردینی لەو شێوەیە نەبووە.[4] بۆیە بە یەكێك لە شتە سەرسوڕهێنەرەكانی دنیا دانراوە.[5] وەكو دەڵێن لەو شارە سێ سەد و شەست دێر هەبووە.[6] هەروەها مورید و راهیبی زۆر بووە.[7]

ناسر خەسرە و باسی كەنیسەیەك دەكات كە نێزیكی مزگەوتێك بووە لە ئامەد كە زۆر گەورە و دەوڵەمەند بووە بە نەخش و نیگار، هەمووی لە بەرد دروستكراوە، زەوییەكەی ناوی بە فەرشی مەڕمەڕی رەنگا و رەنگ راخراوە، دواتر دەڵێت (بینیم تارمەیەكی هەیە، شوێنی خوداپەرستی خاچهەڵگرانبوو، دەرگایەكی لە ئاسنی

---

١ - مروج الذهب، ج٢، ل٢٥١.

٢ - معجم البلدان، ج٤، ل٣٣١.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٤. ابن حوقل، المصادر نفسة، ل٢٠٤.

٤ - ابن خرداذبة، المصادر نفسة، ل١٣٥.

٥ - المقدسي، احسن التقاسيم، ل١٢٥.

٦ - ابن الفقيه الهمذاني، المصادر نفسة، ل١٢٧.

٧ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٤.

موشەبەك  هەبوو شتی وام نەدیبوو لە هیچ شوێنێك.[1] هەروەها لە حەسن كێفا كەنیسەی زۆر هەبووە.[2]

بەڵام لەبارەی دێرەكانی هەندێ شاری جەزیرە، باسی دێری زەكی دەكەن كە كەوتۆتە دەروازەی شاری رەها و زۆر بەناوبانگ بووە.

لە نسیبینیش دێرێكی گەورە هەیە كە مورید و راهیبی زۆری هەبووە.[3] لە دووری شەش فرسەخ (لە لای یاقوت لە دووری دوو فرسەخە) لە میافارقینەوە دێرێك هەیە بەناوی مار تۆما كە جەستەیەكی وشككراوە هەیە و دەڵێن ئەوە ئی حۆریەكانە.[4] خەڵكێكی زۆریش بەو مەبەستەوە زیارەتی دەكەن. ئەوەش عەقڵ قبووڵی ناكات.

هەروەها دێری مارگۆرگیس لە نێوان جەزیرەی ئیبن عومەر و شارۆكەیەك لە دووری سێ فرسەخ و زیاتر لە چەند خولەكێك هەیە، لەسەر چیایەكی بەرز دروستكراوە.[5] دێر ئابوون (ئەبیون) لە نێوان جەزیرەی ئیبن عومەر و گوندی هەشت لە نێزیك ناحەیی باسورێن لە ناوچەكانی مووسڵ بە رووی ڕۆژهەڵاتی رووباری دیجلەوە هەیە، ئەو دێرە لای خەڵكی ئەو ناوچەیە زۆر گەورە و پیرۆزە و راهیب و موریدی زۆری هەبووە، وەكو دەڵێن گۆڕی پێغەمبەر نوحی تێدا بووە،[6] دواتر یاقوت هەندێ دێرە شیعر باس دەكات كە ئی یەكێكە و باسی خۆشەویستەكەی دەكات كە كورد بووە و لەنێزیك دێرێك عاشقی بووە:

| | |
|---|---|
| فيا ظبية الوعساء هل فيك مطمع | لصاد الى تقبيل خديك ظمان |
| واني الى الثرثار واحضر حلتي | ودارك دير ابون او برزمهران |
| سقى الله الدير غيثا لاهله | وما قد حواه من قلال ورهبان(٧) |

١ - سفرنامة، ل١٠.

٢ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٥.

٣ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٥٤.

٤ - المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٩.

٥ - ياقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٦٢.

٦ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٣٢.

٧ - ياقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٣٢.

له ڕۆژهەڵاتی مووسڵ دێر مەنسور مەتل لەسەر ڕووباری خابوور هەبووە، کە دێرێکی گەورە و ئاوەدان بووە لەسەردەمی یاقوت.[1] دێر زەعفەران هەبووە کە بە ناوی عومەر زەعفەران ناویان بردووە، لەبەرئەوەی زەعفەران لەو ناوچەیەدا چێنراوە، لە نێزیك جەزیرەی ئیبن عومەر لەژێر قەڵای ئاردەمشت لە لۆفەی چیاکە، کە خەلیفە موعتەزید لەو شوێنە دابەزیوە لەکاتی دەورەدانی ئەو قەڵایە هەتا توانیویانە ئازادی بکەن، وا باسی دەکەن کە (دێر نزە بووە و خەڵکەکەی ناوی بە بینینی ئەو دڵشاد بوونە، ئەویش هەندێ دروشمی هەبووە).[2] هەروەها لە دەرەوەی شاری نەسیبین چەندان دێر و پەرستگە هەبووە.[3]

- دێر غرس: کە ئەوە لە جەزیرەی ئیبن عومەر سێزدە فرسەخ (٧٨کم) دوور بووە، لەسەر چیایەکی بەرز دروستکراوە و راهیب و موریدی زۆر بووە.[4]
- دێر باغوت: لەسەر لێواری ڕووباری دیجلە بووە لە نێوان هەردوو شاری مووسڵ و جەزیرەی ئیبن عومەر، زۆر گەورە و موریدی زۆر بووە.[5]
- دێر جوب: لە ڕۆژهەڵاتی شاری مووسڵ و نێوان ئەربل بووە، دێرێکی بەناوبانگ بووە و خەڵکی سەردانیان کردووە بە مەبەستی چاکبوونەوە لە نەخۆشی فێ.[6]
- دێر ئەکمن (ئەکمل) لەسەر ترۆپکی چیا بووە لەنێزیك جودی.[7]
- دێر جودی: لەسەر چیای جودی دروستکراوە.[8]
- دێر عەبدون: لە نێزیك شاری جەزیرەی ئیبن عومەر بووە.[9]

---

١ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٦٤.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٦٤.

٣ - ابن حوقل، المصادر نفسة، ل١٩١. یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٣٤٤.

٤ - یاقوت، معجم البلدانن ج٤، ل٣٥٤.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٣٥.

٦ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٣٧.

٧ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٣٤.

٨ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٣٨.

٩ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٥٢.

- دێر کۆم: ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ گوندی کۆم کە نێزیك عەمادیە بووە لە ناوچەی هەکاری، لەسەردەمی یاقوت ئاوەدان بووە.([1])

- دێر ئەحویشا: واتە دێری جیش بووە بە ئاشووری، ئەوە لە شاری سەعرت بووە لە دیاربەکر، دێرێکی زۆر گەورە بووە و نێزیکەی چوارسەد موریدی هەبووە.([2])

- دێرسەگ: لە نێوان باعەدرێ و جەزیرەی ئیبن عومەر بووە، مورید و راهیبی زۆر بووە، بۆیە بەو ناوەوە ناونراوە، چونکە یەکێك سەگ گازی لێگرتووە و، هێناویانە بۆ لای راهیبی ئەو شوێنە و، دوای چل رۆژ رابردنی بەسەر حاڵەتەکەی چاکبۆتەوە.([3])

- دێر مەتی([4]): دەکەوێتە ڕۆژئاوای مووسڵ، لەسەر چیای سەرکەشی مەتی دروستکراوە، کە سەر بە ناوچەکانی نەینەوا و مەرج بووە، زۆر باش دروستکراوە و، زۆربەی خانووەکانی لە بەرد دروستکراوە و نێزیکەی سەد موریدی هەبووە، یاقوت زۆر بە وردی باسی دەکات، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە یاقوت سەردانی ئەو شوێنەی کردووە.([5])

بەڵام جوولەکە زۆر کەمبووە لە ئەوانی دیکە لە وڵاتی کوردستان، چونکە کەمترین ئاماژەی وڵاتناسان بۆ ئەوە کراوە، مەقدەسی باسی یەکێك لە دێرەکانی شاری حەلوان دەکات کە پێدەچێت دێری جوولەکان بووبێت، دێرێکی دیکە هەیە بە دێری جوولەکان([6]) ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شارێکی جوولەکە لە ئەسفەهان، هەروەها ئاماژە بۆ بوونی کەنیسەی جوولەکە لە دەرەوەی شاری حەلوان دەکەن و، گەورەی دەکەن کە لە گەچ و بەرد دروستکراوە.([7])

---

١ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٥٨.

٢ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٣١

٣ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٣٥٨.

٤ - هەمان سەرچاوە، هەمان لاپەڕە.

٥ - هەمان سەرچاوە، ج٤، ل٤٦٠.

٦ - المقدسی، المصادر نفسه، ل١١٠.

٧ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

# بەشی پێنجەم

## لایەنی سەربازی و رامیاری وڵاتی کوردستان وەکو  وڵاتناسان و گەڕیدەکان باسیانکردووە

وڵاتناسە موسڵمانەکان ئەوەندە نەپرژاونەتە سەر لایەنەکانی سەربازی و رامیاری و گرینگیان پێ نەداوە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە، ئەوە واتای ئەوە نییە کە پەڕتووکەکانیان خاڵی بێت لە هەواڵی تایبەت بە کاروباری رامیاری و رووداوی جەنگەکانەوە، تا ئەوەندەی پرسەکە پێوەندیی بە بابەتی تۆژینەوەکەمان هەبێت، باسی ئەو رووداوانە دەکەین کە پێوەندییان بە فتوحاتی ئیسلامی و هەندێ لایەنی مێژووی رامیاری و هەندێ بابەتی پێوەستن بە میرە کوردەکان دەکەین ئەوانەی لەسەردەمە جیاجیاکان دەرکەوتوون، هەروەها ئەو بابەت و زانیاریانە لە پەڕتووکێکەوە بۆ پەڕتووکێکی دیکە لەیەك جیایە، بەڵام پەڕتووکەکەی بەلازری (فتوح البلدان) پێگەیەکی دیار و سەرەکی گرتووە لە باسکردنی جووڵانەوەکانی فتوحاتی ئیسلامی، کە یەکەم پەڕتووکە چارەسەری ئەو بابەتەی کردبێت و سەرچاوەیەکی سەرکیشە کە مێژوونووسە موسڵمانەکانی دوای ئەو پشتیان پێ بەستبێت.

قودامەی کوڕی جەعفەر بە تەنیا دەروازەیەك لە پەڕتووکەکەی لەبارەی (فتوح النواحی والامصار) تەرخان کردووە، کە سەرجەم هەواڵ و بابەتەکانی لە بەلازری وەرگرتووە، بەڵام بە شێوەی کورت.

بەڵام یەعقوبی هەندێ ئاماژەی بۆ (دەستبەسەرداگرتنەکانی ئیسلام) کردووە، بەڵام بەسەرپێیی هەندێ مێژووی شەڕەکان و ناوی هەندێ لەسەرکردەکان پێش دەسەڵات و باسی هەندێ شار و شارۆکە و دەرامەتەکانی دەکات..هتد.

بەڵام ئیبن خوردازەبە و ئیبن رستە ئەوانە بەهیچ شێوەیەك لەبارەی دەستبەسەرداگرتنەکانی ئیسلامی نەیانووسیوە، بەڵام ئیبن فەقێی هەمەدانی سەردەم باسی هەواڵ و دەستبەسەرداگرتنەکانی بە شێوەیەکی درێژ کردووە بە پشت بەستن بە پەڕتووکەکانی تایبەتی وەکو (فتوح البلدان) و (فتوح الشام).

ئەوەی شایەنی باسکردنە هەواڵەکانی دەستبەسەرداگرتنی ئیسلامی لە پەڕتووکەکانی وڵاتناسانی هەردوو سەردەی پێنجەم و شەشەمی کۆچی شوێنیان دیار نییە، هەتا لە سەدەی حەوتەمی کۆچیش، تەنیا یاقوت نەبێت بە حوکمی سروشتی پەڕتووکەکەی چەند گێڕانەوەیەکی لەبارەی دەستبەسەرداگرتنی وڵاتان کردووە بەپشت بەستن بە سەرچاوە مێژووییەکانی وڵاتناسانی پێش خۆیەوە، زۆرجاریش لەمانە ئاماژە بۆ خاوەنەکانی گێڕەوەکان دەکات کە هەواڵ و چیرۆکەکانی لێ وەرگرتوون.

بە ڕوانین بۆ پێگەی جوگرافی سەرجەم وڵاتی کوردستان لە پێشەوەی وڵاتانی ناوچەکە بوونە لە ناسینی ئیسلام کە سەرکردەکانی ئیسلام لەگەڵ خۆیان هێنایانە ناوچەکە، ئەمەش بووە هۆی گۆڕانی ریشەیی لە بارودۆخ و جۆری ژیانیان لەسەرجەم لایەنەکانی باوەڕ و ئۆل و رامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە.

یەکەمین کەسانێك لە وڵاتناسەکان لەوەی باسی بابەتی دەستبەسەرداگرتنەکانی ئیسلامی کردبێت وەکو ئاماژەمان بۆکرد بەلازری و قودامە و یاقوت بوونە، بۆیە زۆر پێویستە هەڵوەستە لەسەر نووسینەکان و گوتنەکانیان بکەین ئەوەندەی پێوەندییان بە وڵاتی کوردستانەوە هەبێت، بەبێ ئەوەی بچینە نێو درێژەی بابەتەکەوە، کە لە پێش ئێمە لێکۆڵڤانان لە نامەی تۆژینەوە زانستیەکەیاندا ئاماژەیان بۆ کردووە.([1])

---

١ - بڕوانە: فتئزە محمد عزت، الكرد فی اقليم الجزيرە شهرزور، ل٨٤، لە دوای ئەویش: احمد میرزا، المصادر نفسة، ل٧٨.

## یەکەم: دەستبەسەرداگرتنی وڵاتی کوردستان و چۆنییەتی لە پەڕتووکە وڵاتناسییەکاندا

### دەستبەسەرداگرتنی جەزیرە:

لێرەدا مەبەستمان نییە باسی چالاکی سەربازی بکەین کە لە ماوەی دەستبەسەرداگرتنەکانی ئیسلامی لە ناوچەی جەزیرە رویانداوە، چونکە ئەمە پێویستی بە رووپێوێکی گشتگیر هەیە و، ئەمەش دوورمان دەخاتەوە لە بابەتە سدەرەکییەکەمان، بگرە تەنیا بە باسکردنی هەندێ ئاماژەی دیار لەو شارانەی دەستیان بەسەرداگیراوە و مێژوو و ناوی سەرکردە موسڵمانەکان ئەوانەی لەسەر دەستی ئەوان کاری دەستبەسەرگرتنەکە ئەنجام دراوە، هەروەها ئاشکراکردنی جۆری دەستبەسەرگرتنەکە کە بە ئاشتی یان بە شەڕ بووە وەکو هەندێ لە وڵاتناسە موسڵمانەکان باسیان کردووە.

ئەوەی شایەنی باسکردنە تەبەری جەخت لەوە دەکاتەوە کە جەزیرە (ئاسانترین شار و ئاسانترین دەستبەسەرداگرتن).([1]) بووە.

یاقوت بەو شێوەیە شرۆڤەی ئەمە دەکات و دەڵێت: (خەڵکەکەی بینیان نێوان عێراق و شام بەدەست موسڵمانەکانەوەیە، بۆیە ملیان کەچ کرد، بۆیە لەگەڵ عەیازی کوڕی غەنەم ئاشتەواییان کرد کە سەرانە و باج بدەن).([2])

لە راستیدا جۆرێك لە ناکۆکی لە نێوان سەرچاوە مێژووییەکان و وڵاتناسییەکاندا هەیە لەبارەی مێژووی دەستبەسەرداگرتنی جەزیرە، لێرەدا هەیە پێی وایە ئەمە لە ساڵی (١٧ك/٦٣٨ز) روویداوە، هەشە پێی وایە ئەمە لە ساڵی (١٩ك/٦٤٠ز) بووە، لە کاتێکدا بەلازری پێی وایە دەستبەسەرداگرتنی جەزیرە([3]) لە نێوان ساڵەکانی (١٨-

---

١ - تاريخ الامم والملوك، ج٤، ل٥٤.

٢ - معجم البلدان، ج٣، ل٥٤.

٣ - الطبري، المصادر نفسة، ج٤، ل٥٣.

١٩ك/٦٣٩-٦٤٠ز) بووه([1]) دیاره ئەوەیان پەسندتر و نێزیکترە لە ڕاستییەوە، چونکە جەزیرە هەرێمێکی فرەوانە و دەستبەسەرداگرتنی دووساڵی دەوێت بە لایەنی کەمییەوە.

کاتێ سەرکردەی موسڵمانان عەیازی کوڕی غەنەم([2]) فەرمانی ئەوەی وەرگرت دەست بەسەر تەواوی جەزیرەدا بگرێت، لەدوای سەرکردە ئەبی عوبیدەی کوڕی جەراح کە ئەو بەنەخۆشی تاعون لە ساڵی (١٨ك/٦٣٩ز) پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات عەیاز بووە جێنشینی، خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (ر.خ) بۆی نووسیبوو کە لەدوای ئەو، کارەکە بگرێتە ئەستۆ، ئەوەش لە ڕۆژی پێنجشەممەی نیوەی مانگی شەعبانی ساڵی ناوبراو بوو.([3]) هەر لەو کاتەدا هێزەکەی عەیاز جووڵە دەکات کە نێزیکەی پێنج هەزار چەکدار دەبوون، ڕوویان لە ناوچەی جەزیرە کرد و دەستیان بەسەردا گرت.

سوپای عەیاز چوونە نێو شاری ڕەقە([4])و سەلحا([5]) بۆ ئەوەی بەرەو شاری ڕەها بچن، بەڵام لە یەکێك لە دەروازەکانی ئەو شارەدا چەند ڕۆژێك مانەوە، لەو ماوەیە دەستیان کرد بەچاوەدێری کردنی سووڕانەوە و کۆکردنەوەی نهێنی لە دەوروبەری شارەکە، بۆ ئەوەی هێز و لاوازی و هەڵوێستی پارێزەرانی شارەکە بزانن.([6])

بەڵام دوای ئەوە بەتاریکی شارەکە کەسێك دەنێرێت بۆ لای سەرکردە عەیاز و داوای ئاشتیان لێدەکات، بۆیە لە پێناوی پاراستنی ئاسایشی گشت خەڵکەکە و سەر و ماڵ و شارەکەیان ئاشتەوایی دەکەن، عەیاز دەڵێ: خاك بۆ ئێمەیە و نیشتمانی ئێمەیە،

---

١ - فتوح البلدان، ل١٧٢-١٨٠.

٢ - عەیازی کوڕی غەنەم: یەکێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر، چل ساڵ پێش کۆچکردنەکە لەدایکبووە لە ساڵی ٥٨٣ز، پێش جەنگی حودەیبیە ئیسلام بووە، بەشداری لە دەستبەسەرداگرتنەکانی شام و عێراق کردووە، شاعیرو پیاوچاك و لێبوردە بووە، بە دەستکراوەیی ناسراوە، لە شام کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی (٢٠ك/٦٤٠ز) کە شەشت ساڵی تەمەنی تەواو کردووە. بڕوانە: ابن سعد، الطبقات الكبرى، (بيروت:١٣٧٦هـ)ج٧، ل٣٩٨.

٣ - لێرەدا زیاتر لە گێڕانەوەیەك هەیە لەو بارەیەوە، بۆ زیاتر بڕوانە: فتوح البلدان، ل١٧٢-١٧٣.بکە.

٤ - ڕەقە: شارێکی بەناوبانگ بووەو شارۆچکەی دیارە بەنی مەزەر بووە، لەسەر لێواری ڕووباری فورات. المقدسي، المصادر نفسة، ل١٢٥.

٥ - یاقوت، معجم البلدان، ج٤، ل٤١٤.

٦ - فتوح البلدان، ل١٧٣.

بەدەستمان هێنا و بڕیارماندا بەدەست خۆیانەوە بمێنێتەوە و باج و سەرانەمان بدەنێ، ئەوەندەی خەڵکەکەی ڕەزامەند بوون موسڵمان بوون، بۆیە سزامان خستە سەر شانیان و، ناچارمان کردن هەر پیاوێك لە هەر ساڵێکدا دینارێك و ئافرەت و منداڵیشمان لێ هەلاوێردن، هەروەها لەگەڵ ئەو دینارە هەندێ لە گەنم و شتێکیش لە ڕۆن و خەل و هەنگوین بدەن.([1])

وەکو بەلازری لە دەقێکدا باسی ئەو دوو بەڵگەیەی پێوەستە بە مەرجەکانی ئاشتەوایی و ئاسایش لە نێوانیاندا کە سەرکردەی ناوبراو دەری کردووە، یەکەمیان بە یارمەتی ئەسقافیەی شاری ڕەها و ئەوەی دیکە لەگەڵ خەڵکەکەی بووە.

گرینگی ئەو ڕێککەوتنە لەوە بەدیار دەکەوێت کە بۆ بنچینەیەك لە پشت بەستن و لە دواییدا لە ڕێکخستن و پێوەندیی لە نێوان سەرکردەی مسوڵمانان و خەڵکی جەزیرەدا لە هەردوو رووی ماف و خواستەکان و ئەرکەکاندا بووە، لێرەوە دەبینین ئاشتەوایی شاری ڕەها پێگەیەکی باشی لە نێو لاپەڕەکانی مێژووی دەستبەسەردا گرتندا هەبووە.

دیارە دەقی نووسراوی یەکەم بەو شێوەیە: (بەناوی خودای گەورە ئەو نووسراوە لە لایەن عەیازی کوڕی غەنەم بۆ ئەسقافیەی ڕەها، ئێوە دەروازەی شارتان بۆ ئێمە خستە سەر پشت کە هەر پیاوێك دینارێك و هەندێ گەنم بدەن بە ئێمە، ئێوە ئێستە ئاسایشی خۆتان و ماڵتان پارێزراوە، لەسەریشتان پێویستە ڕێنمایی خۆتان بکەن و ڕێگە و پردەکان چاکبکەنەوە و ئامۆژگاری موسڵمان وەربگرن، گەواهی بەخودا بێنن، گەواهی هێنان بەخودا کۆتاییە).([2])

بەڵام دەقی نووسراوی دووەم کە ئاڕاستەی خەڵکی ڕەها کراوە بەو شێوەیە: (بەناوی خودای گەورە، ئەو نووسراوە لە عەیازی کوڕی غەنەم و تەواوی ئەو موسڵمانانەیە بۆ شاری ڕەها: من خوێن و ماڵ و منداڵ و ئافرەت و شارەکەتان و ئاشەکانتان دەپارێزم، ئەگەر ئەو مافەی لەسەرتانە بیدەن، لەسەر ئێمەش پێویستە پردی

---

١ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٧٤. قدامة، المصادر نفسة، ل٣١٢. بۆ زیاتر بڕوانە: ابن الاعثم الكوفي، كتاب الفتوح (بیروت: د/ت) ج١، ل٣٢٩-٣٣٢. الطبري، المصادر نفسة، ج٤، ل٥٣.

٢ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٧٤.

ئاشتەوایی چاکبکەین و بیٚ باوەڕان هیدایەت بدات، فریشتە و موسڵمان گەواهی بۆ خودا دەدەن).[1]

وەکو سەرنجی ئەو دوو دەقە دەدەین دەبینین موسڵمانان ئاسایش و ئەمانیان داوەتە دانیشتووانی شاری ڕەها لەوەی خۆیان و خەڵك و ماڵ و سامانیان پارێزراو بێت کە پێوەندیی ڕاستەوخۆی بە ژیان و گوزەرانی ڕۆژانەیانەوە هەیە، لەبەرامبەردا ئەوان هەندیٚ پارە و ماڵ وەکو سزا بدەن و هاوکاری لەگەڵ موسڵمانەکان بکەن و ڕێنماییان لیٚ وەربگرن بۆ هێنانەکایەی تەناهی و ئاسایش لە شارەکەیان، هەروەها ڕێگەوبان و پردەکان چاکبکەنەوە، چونکە ئەمانە چەند پێداویستییەکی گرینگن بۆ ئەوان کە خەڵکی نامۆن لە ناوچەکە، هەروەها لەبەرئەوەی ئەوان بەردەوام لە گواستنەوە و ڕۆیشتن و هاتوچۆی پرۆسەکانی دەستبەسەرداگرتنن.

عەیازی کوڕی غەنەم لە هێرشەکانی دەستبەسەرداگرتنی ڕەها و سەقامگیربوونی، رووی هێرشەکەی کردە شارەکانی سروج و راسکیفا و خاکی سپی و چاککردنی خەڵکی قەڵاکان، وەکو ئەوەی خەڵکی شاری ڕەهایان چاککرد، دوای ئەوە دەستیان بەسەر ئامەدیشدا گرت،[2] بە هەمان شێوەی ئەوان[3] لە ساڵی (٢٠ك/٦٤١ز)[4]

بەڵام شاری میافارقین سەرەڕای جەختکردنەوەی بەلازری لەسەر ئەوەی کە سەرکردەی ناوبراو ئەو شارەی گرتووە، وەکو ئەوەی چۆن لە ڕەها روویدا، بەڵام یاقوت وەکو ئەوەی لە هەندیٚ پەڕتووکی ژیاننامەدا گواستوویەتیەوە بەو شێوەیەیە.

هەردوو سەرکردە خالیدی کوڕی وەلید و ئەشتەر نەخەمی روویان کردە شاری میافارقین بە سوپایەکی گەورە و دەستیان بەسەردا گرت، هەروەها (دەڵێ ئاشتەواییمان

---

١ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٧٥.

٢ - واقدی پێی وای شاری ئامەد لەسەر دەستی سەرکردە خالیدی کوڕی وەلید ئازاد کراوە، بەلاٌم گێڕانەوەی یەکەم ڕاسترە. بڕوانە: فتوح الشام، (القاهرة: ١٩٥٤)ج٢، ل١٠٣-١١٠.

٣ - دیسان ڕایەکی دیکە هەیە پێی وایە سەربازەکانی ڕۆم لەو شارە ژمارەیان نێزیکەی بیست هەزار کەس دەبوو، ئەو سەربازانە گشتیان لەسەردەستی فەتواکاران کوژراون پێش ئەوەی ئاشتەواییان لەگەڵ بکریٚ وەکو ئاشتەوایی ڕەها. بڕوانە: ابن الاثیر، الكامل في التاريخ، ج٢، ل٣٧٤. ابن شداد، المصادر نفسة، ج٣، ق١، ل٢٨١.

٤ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٧٦، قدامة، المصادر نفسة، ل٣١٣.

کرد) لەسەر پەنجا دینار. (کە هەر پیاوێکی بالغ چوار دینار بدات، هەروەها دەڵێت دوو دینار و هەندێ گەنم و ڕۆن و خەل و هەنگوین بدات، هەروەها هەرماڵێك سێ ڕۆژ موسڵمانێك میوانداری بکات کە بەوێدا دەڕوات و شوێنی پاراستنی ڕێگەوبان بۆ موسڵمانان دابین بکات، ئەوانەی پارێزگاری لە کۆگەی چەکەکان دەکەن[1]. بڕیاریاندا یەك لەدەی ماڵ وسامانیان ببەن)[2].

ئەوە ئەو نووسینەیە کە یاقوت بۆمانی گواستووەتەوە لە پەڕتووکێك کە ناوی نەبردووە، چەند زانیارییەکی گشتی لەسەر سروشت و بەندەکانی ئاشتەوایی تێدایە کە لەگەڵ ئەوان مۆریان کردووە، لەوانەش وەکو سەرنج دەدەین موسڵمانەکان لە شارەکەدا شوێنی تایبەتیان هەبووە کە چەکدارەکان تێدا ماوەنەتەوە بە مەبەستی چاوەدێری و هەر شتێکی لەناکاو، ئەمە سەرەڕای ئەو پێوەست نەبوونە داراییەی کە خەڵکی شارەکە بە موسڵمانانیان دەدا، هەروەها یاقوت دەنووسێت هەرگیز بە تۆبزی ئەوە لە میافارقین نەسەنراوە و، بەراوردی دەکات بە شاری ئامەد، کە سەرەڕای ئەوەی لە یەکەم باشتر بووە، باشتر بووە تەنیا هەندێ جار بە شمشێر لێیان سەنراوە.[3]

بەڵام شارەکانی کەفرتوتا و نەسیبین و تۆرعەبدین و ماردین و دارا هەموو ئەمانە وەکو شاری ڕەها چاکسازیکراون.[4] دەکرێ تێبینی ئەوە بکەین وەکو ئەوەی ئیبن فەقێی فەقێی هەمەدانی سەبارەت بە دەستبەسەرداگرتنی شاری نەسیبین کە دەیگێڕێتەوە بۆ پەیامبەری خودا (د.خ) کە دەڵێ: (کە شەو رابرد شارێکمان بینی و سەرسامی کردم و گوتم ئەی جوبریل ئەو شارە چییە؟ گوتی نەسیبینە، گوتم: ئەی خودایە دەستبەسەرداگرتنەکەی خێرابکە، ئەوش بووە بەرەکەتێك بۆ موسڵمانەکان).[5] لەگەڵ باری سەرنجمان، ئەو فەرموودەیە لە پەڕتووکی فەرموودە ڕاستەکان ناوی نەهاتووە،

---

١ - کۆگەی چەك و تەقەمەنی، کە هەر کۆگەیەك سەربازێك بە چەکەوە چاوەدێری و پارێزگاری ئەو شوێنەی دەکرد. المعجم الوسيط، ج١، ل٤٤٤.

٢ - معجم البلدان، ج٨، ل٣٥١. ابن شداد، المصادر نفسة، ج٣، ق١، ل٢٨١. اللحابة، (بغداد:د/ت) ج٣، ل٣٢. ابن الاثير، اسد الغابة (القاهرة:د/ت) ج٤، ل٢٩٤-١٤٤.

٣ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٧٧. قدامة، المصادر نفسة، ل٣١٤.

٤ - هەمان سەرچاوە، ل١٧٧.

٥ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

ئەمەش ئەوە بەدیار دەخات کە بابەتەکە و مەبەستەکە لەوە زیاتر گرینگیدان و پیرۆزکردنی شارەکەیە بەوەی لەسەر زمانی پەیامبەر کە سەرسام بووە بە جوانی شارەکە، وەکو دەزانین شەورۆیی پێغەمبەر (د.خ) لە شاری مەکە و پێش کۆچکردنی بووە، کە ئەو رۆژانە موسڵمانان لە خراپترین رۆژانی ژیانیان بوونە بەدەست بێ باوەڕەکانی مەکەوە، کە ئەو کاتە شتێك نەبووە ناوی دەستبەسەرداگرتن بووبێت، لە لایەکی دیکەوە ئەگەر وا دابنێین ئەوە راستە، ئایا شاری نەسیبین کەوتۆتە سەر رێگەی نێوان شاری مەکە و قودسی پیرۆزەوە- تا پەیامبەری شاد کردبێ؟!

هەروەها سەرکردە عەیازی کوڕی غەنەم باقەردی و بازیدی وەکو شاری رەها گرت، دواتر رێگەی زۆزانی گرت و لەگەڵ ئەوانیش رێککەوت کە باج و سەرانە بدەنە موسڵمانەکان، دواتر رووی کردە ئەرزن و ئەویشی گرت و لەگەڵیان رێککەوت وەکو ئەوانی دیکە، ئەمانەش لە ساڵی (١٩ك/٦٣٩ز) لە رۆژانی مانگی موحەڕەم لە ساڵی ٢٠ك/٦٤٠ز([1])بوو.

بەو شێوەیە بەردەوام بوو هەتا گەیشتە بەدلیس و ئەوی تێپەڕکرد هەتا ئەخلات، لەگەڵ ئەوانیش بەهەمان شێوە رێککەوت، هەتا گەیشتە ئەرمینیا و لەوێ تێپەڕی نەدا، دوای ئەوە گەڕایەوە و دەستی کرد بە کۆکردنەوەی باج و سەرانە لە بەدلیس و ئەخلات لەسە رێگەی خۆیان وەکو ئەوەی لەسەری رێککەوتبوون کە پابەندبن بەرامبەر بە موسڵمانەکان.([2])

بەڵام شاری عەین وەردە، لەسەرەتادا رازی نەبوون بەو پرسە لەگەڵ عەمیری کوڕی سەعدی سەرکردەی موسڵمانان، بەڵام دوای شەڕ و کوشتار، دواتر دەستیان بەسەردا گرت و رێککەوتن،([3]) هەروەها شاری سەرێ کانی (راس العین) رێگەیان نەدا بە عەیازی کوڕی غەنەم بچێتە شارەکەیانەوە، بۆیە عەمیری کوڕی سەعد گرتی کە والی جەزیرە بوو، دوای خەڵکەکەی بەرگریان کرد دژ بە موسڵمانەکان، بەڵام موسڵمانەکان بە زۆری چوونە نێو شارەکە و، دواتر لەگەڵیان رێککەوتن کە زەوی بۆ ئەوان بێت، لە

١ - هەمان سەرچاوە، ل١٨١-١٨٢.

٢ - هەمان سەرچاوە، ل١٧٨.

٣ - مختلر کتاب البلدان، ل١٢٦. ئیبن ئەسیریش دەڵێ ئەو شارە لە ساڵی ٢٠ کۆچی بەرامبەر بە ٦٤٠ زاینی لەسەر دەستی سەرکردە عوتبەی کوڕی فەرقەدی سەلمی ئازاد کراوە. الکامل، ج٢، ل٥٢٤.

بەرانبەردا پارە و سەرانەیان بەسەردا سەپاندن، بەسەر هەر کەسێك چوار دینار بەڵام ئەمە ئافرەت و منداڵی نەدەگرتەوە.([1])

لە گێڕانەوەیەکدا کە بەلاًزری بۆمان دەگێڕێتەوە و ئەویش لە شێخەکانی شاری رەئسوالعەینی گواستۆتەوە کە خەلکی شارەکە ئەگەرچی بەرگری موسڵمانیان بەتوندی کردووە کە نەهێڵن بێنە نێو شارەکەوە، بەڵام دواتر بە شێوەیەکی دۆستانە مامەڵەیان کردووە لەگەڵ موسڵمانەکان و رووبەڕووی تۆڵەیان نەکردوونەتەوە، هەروەها دەڵێن عەمیری سەرکردە نەچۆتە ناویانەوە هەتا لەگەڵیان رێککەوتووە و پێیان دەڵێت: (قەینا.. قەیناکە.. لەسەر من، لەسەر من).([2]) ئەوەش بۆ ئەوە بووە کە هەست بە ئەمن و ئاسایش بکەن و سەقامگیری بخاتە دەروونیانەوە.

بەڵام کاتێ دانیشتووانەکەی سەرپشك دەکەن لە مانەوە یان کۆچکردن، ئەوا هەندێکیان کۆچ دەکەن و هەندێکی دیکەش لە شارەکەدا دەمێننەوە.([3])

وەکو بەلازری باس دەکات عەمیری سەرکردە لە ماوەی ویلایەتەکەیدا لە جەزیرە لەبەر گرینگی شارەکە مزگەوتی تێدا دروستکردووە.([4]) لەبەرئەوەی مزگەوت نیشانەی (یەکبوون) بووە بۆ کۆکردنەوەی موسڵمانان و بەیەك گەیشتنیان.

شاری شەنگالێش بە ئاشتی گیراوە دوای ئەوەی سەرکردە عەیازی کوڕی غەنەم لە شاری ئەخلاتەوە گەڕاوەتەوە.([5])

ئیبن فەقیێ جەخت لەوە دەکاتەوە و لە کەسێك بەناوی زەهری گواستوویەتیەوە کە (هیچ شتێك لە جەزیرە نەمایەوە بەناوی بابەتی چوونە ناوی، تەنیا لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب نەبێت و لەسەر دەستی عەیازی کوڕی غەنەم: شارەکانی حەران

---

١ - عوتبەی کوڕی فەرقەدی سەلمی: یەکێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەری مەزن، لە ساڵی حەوتەمی کۆچی مووسڵمان بووە، جەنگی خەیبەر و جەنگەکانی دیکەی دیووە، بەشداری لە جەنگی کۆچی دوایی پێغەمبەر کردووە لە دژی ئەوانەی هەڵگەڕانەوە، پۆستی میرنشینی مووسڵی وەرگرتووە بۆ کۆکردنەوەی باج و خەراج لە ساڵی ١٧ک/٦٣٨ز. بڕوانە: ابن سعد، المصادر نفسة، ج٤، ل٢٧٥. ابن الاثير، اسد الغابة، ج٣، ل٣٦٥.

٢ - هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە. هەروەها، ابن شداد، المصادر نفسة، ل٢٧٨-٢٨٠.

٣ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٧٦. ياقوت، معجم البلدان، ج٧، ل١٩٤.

٤ - مختلر كتاب البلدان، ل١٢٦.

٥ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٧٦. قدامة، المصادر نفسة، ل٣١٤.

و رقه و قرميسيا و نەسيبين و شەنگالْ و ميافارقين و کەفرتوتا و تورعەبيدن و قەلاّی ماردين و دارا و قردی و بازيدی و ئەرزن... دەستيان بەسەردا گيرا.[1]

دەستبەسەرداگرتنی مووسلْ و باجرمی و شارەزوور:

بەلازری چەندان گێڕانەوەی کردووە بۆ دەستبەسەرداگرتنی مووسلْ، لە هەموويان پەسندتر لە دوای يان لەسەردەمی خەليفە عومەری کوڕی خەتاب (ر.خ) لە سالّی (٢٠ك/٦٤٠ز) کە لەسەر دەستی سەرکردە عوتبەی کوڕی فەرقەدی سەلمی بووە.[2] عوتبە دوای کوشتارێکی زۆر لە خەڵکی نەينەوا، ئينجا توانيويەتی دەست بگرێت بەسەر قەلاّی ڕۆژهەلاّتی شارەکەدا، دواتر لە رووباری ديجلە پەڕيوەتەوە، دواتر لەگەلْ کەسانی ڕۆژئاوای قوللەکە رێککەوتنی کردووە و بەهەمان شێوەی جاران ئەوان سەرانەو باج بدەنە موسلّمانەکان و ئازادن لەوەی بمێننەوە يان رەوبکەن، ئەوەی جێگەی باسکردنە سەرکردە عوتبە لەگەلْ مالّەکانی خەڵکی مووسلْ رێککەوتووە لەسەر ئەوەی ئەوان سەرانە بدەن، دواتر دەستی گرتووە بەسەر (مەرج و قەرا و باعەدرێ و باهەدری و حەبتون و حەيانە و مەعەلە و داسير و سەرجەم پێگەکانی کورد، دواتر بانعاسا لە حەززە ئەويشی گرتووە، لە دواييدا گردی شەهارجە و سەلقی گرتووە کە ناسراوە بە بەنی گرين، سالّح کوڕی عەبادەی هەمەدانی خاوەن تەکيەی مووسلْ و زالْ بووە بەسەر ئەمانەدا و دەستی بەسەردا گرتوون.[3]

بەلازری باسی سەرکردە عوتبەی کورشی فەرقەدی سەلمی دەکات دوای دەستی گرتووە بەسەر هەردوو شاری تيرهان و تکريت، ئەمن و ئاسايشی بەخەڵکی قەلاّی تکريت بەخشيوە کە مالْ و سامانيان پارێزراو بێت، دواتر چۆتە شاری باجورمی

---

١ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە. ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٢٤١.

٢ - عەمير کوڕی سەعدی ئەنساری ئەوسی، لە گەورە ياوەران و گێڕەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر و يەکێك بوو لە ياوەرانی فەتوا، فەتحی شامی بينيوە لە لايەن عومەری کوڕی خەتاب (ر.خ) والی جەزيرەی پێسپێردراوە، دواتر بۆتە والی حەمل و قەنسرين و بە دريژايی سەردەمی عومەر والی بووە، لە سەردەمی خەليفە عوسمانی کوڕی عەفان (ر.خ) مردووە، لە دەوروبەری سالّی (٣١ھ/٦٥١ز) بڕوانە: ابن سعد، الطباقت الكبرى، (بيروت: د/ت) ابن حجر العسقلاني، ج٧، ل٤٠٢.

٣ -فتوح البلدان، ل٣٢٣. ابن الفقيه الهمداني، المصادر نفسة، ل١٢٣. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٨١.

(کەرکوکی ئێستە) لە دواییدا چۆتە شارەزوور.([1]) لە یەکێك لە کەسانی شارەزووری دەگێڕنەوە کە گێڕانەوەکەی بەسوودە و دەڵێت: دوای سەرنەکەوتنی عەروەی کوڕی قەیسی والی حەران، لە گرتنی شارەزوور، ئەوا عوتبەی کوڕی فەرقەد هاتووە و شەڕی کردووە و شارەکەی گرتووە، دوای شەڕ رێککەوتنی لەگەڵ ئەنجام داون، وەکو ئەوەی رێکەوتووە لەگەڵ حەلوان، بەڵام دووپشکە بەناوبانگەکانی ناوچەی شارەزوور زۆرێك لە موسڵمانەکانی لەناوبرد، وەکو دەردەکەوێت خەڵکی سامگان و دراباز لەگەڵ عوتبە رێککەوتوون لەسەر ئەوەی سەرانە بدەن و شەڕ نەکەن، بەڵام ئەوان ئازاد بن لە هاتوچۆ بۆ هەر شوێنێك بیانەوێت.([2])

لە گێڕانەوەیەکی دیکە بەلاَزری بۆمان باس دەکات کە کوشتار لە نێوان کورد و شارەکانی شارەزوور و دراباز و سامگان و سوپای موسڵمانەکاندا روویداوە.([3])

بەڵام گێڕانەوەی یەکەم پەسندترە، لەبەرئەوەی لە کەسێکی شارەزوورییەوە گواستراوەتەوە، چونکە ئەبا دەلفی گەڕیدە جەخت لەوە دەکاتەوە بەهۆی قەدەخەکردنی چوونیان بۆ نێو شاری دزدانی سەر بە شارەزوور و بەرگری خەڵکەکەی، ئەوا مسوڵمانەکان نەیانتوانیوە دەست بەسەر شارەکەدا بگرن، بەڵام خەڵکەکەی دوای بوونەتە ئیسلام ملکەچی ئەوان بوونە،([4]) دواتر ئیسلام لەنێو دانیشتووانی شاری (بیر)ی سەر بە شارەزوور بڵاوبۆتەوە ئەوەش لەسەر دەستی ئیمام زەیدی کوڕی عەلی بووە، واتە ئیسلامبوونیان دواکەتووە و، ئەمەش وای کردووە ببنە شیعەی ساڵحی زەیدی.([5])

هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی و وڵاتناسی ئاماژە بە ساڵی دەستبەسەرداگرتنی شارەزوور ناکات، بەڵام بەوەندە دەوەستن کە دەستبەسەرداگرتنەی لەدوای شاری مووسڵەوە بووە، بەڵام راستتر دەستبەسەرداگرتنی شارەزوور لە دەوروبەری ساڵی (٢٠ك/٦٤١ز) بووە.

---

١ - فتوح البلدان، ل٣٢٣. ابن الفقيه الهمداني، المصادر نفسة، ل١٢٤.

٢ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٣٢٥. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٨٣.

٣ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٣٢٥. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٨٣.

٤ - الرسالة الثانية، ل٢٩.

٥ - هەمان سەرچاوە، ل١٩. ياقوت، معجم البلدان، ج٥، ل١٦٥. هەروەها بڕوانە: ل١٥ی پەراوێزی (٤) لەو بەشە بکە.

ب- دەستبەسەرداگرتنی جەلەولا و بەندینجین و خانەقین:

رووداوی جەلەولا لە کۆتایی ساڵی (١٦ك/٦٣٧ز)([1]) بووە، کە یەکێك بووە لە رووداوە یەکلاییکەرەوەکانی فتوحاتی ئیسلامی. دوای سەرکەوتنی ئیسلامەکان لە شاری مەدائن لە هەمان ساڵی ناوبرا و، هەواڵێکیان بۆ هات کە پاشای ساسانییەکان یەزدەگورد کوڕی شەهریار([2]) هێزێکی زۆری کۆکردووەتەوە لە جەلەولا بە ئامانجی ئەوەی هێرش بکاتە سەر موسڵمانەکان، بۆیە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس هێزێکی دوازدە هەزار کەسی کۆدەکاتەوە بە سەرۆکایەتیی سەرکردە هاشم کوڕی عوتبە.([3]) هەروەها سەرکردەی عەجەمەکانیش بە سەرۆکایەتی گەرزاد برای رۆستەم بووە و خۆیان قایم کردووە لە دۆڵەکاندا، هەروەها مەڵبەندی گواستنەوەیان لە خانەقین بووە، زۆر

---

١ - یەعقوبی دەڵێت: لە ساڵی ٢٠ کۆچی، ٦٤٠ زاینی روویداوە. البلدان، ل٣٩. بۆ زیاتر لەبارەی ئەو رووداوە بڕوانە: الطبري، المصادر نفسة، ج٤، ل٢٤-٣٣. ابن الاعثم الكوفي، المصادر نفسة، ل٢٧١-٢٧٣.

٢ - ئەوە یەزدەگوردی دوا پاشای ساسانییەکانە، کە ئەو میرەش لە ڕەچەڵەکی کیسرا پەرویز بووە، کە بە نهێنی لە شاری ئەستەخر چیاوە، کە لەو شارەدا ساسانییەکان دروست بوونە، هەر لەوێوە پەرەیان سەندووە و دەستیان بەسەر مەدائندا گرتووە و پاشای ئەو شوێنە کە ناوی فرۆخزاد خەسرەو بووە کوشتوویانە، دواجار هەموو دەسەڵاتی ئەو مەملەکەتە لەژێر دەستی یەزدەگوردا بووە، بەڵام دواتر لە بەرامبەر مووسڵمانەکاندا لە جەنگی مەدائن هەرەسی هێناوە لە ساڵی ١٦کۆچی بەرامبەر بە ٦٣٧ زواینی، دواتر ئەو هەڵاتووە و ئیمپراتۆرییەتەکەی رووخاوە. ارثر کریستنسن ابرن في عهد الساسانيين، ترجمة: يحيى الخشاب، (بيروت:١٩٨٢) ل٤٨٦-٤٨٩.

٣ - هاشم کوڕی عوتبە کوڕی ئەبی وەقاس ی زەهری: یەکێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر، رۆژی فەتحی مەکە لە ساڵی ٨کۆچی/٦٢٩ز، لە دایك بووە، جەنگی حەنین و بەشداری لە کوشتاری بنەماڵەی رەدە کردووە، هاوڕێیەتی خالیدی کوڕی وەلیدی کردووە لە فەتحی عێراق و شامدا، لە کوفە گیرساوەتەوە، بەشداری جەنگی سەفینی لە ساڵی ٣٧کۆچی/٦٥٧زاینی، کردووە شانبەشانی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی تالیب(ر.خ) کە لەو جەنگەدا ئەو عەماری کوڕی یاسر تێدا کوژراون لە رۆژی یەکشەممە. ابن حجر عەسقەلانی، الابة، ج٦، ل٢٧٥.الطبري، المصادر نفسة، ج٤، ل٢٤-٢٥-٢٥٢-٤٩٩.

سووربوونە لەسەر ئەوەی کە نەکشێنەوە دواوە چەندە قوربانیش بدەن، هەروەها هێڵی یارمەتیشیان دەگەیشتە حەلوان و چیاکانەوە.([1])

ئەوەی جێگەی ئاماژە بۆکردنە بێژەی (عەجەم) وەکو بەلازری بەکاری هێناوە بە واتای ئەوەی ئەو هێزەی پێکهێنراوە لە فارس و چەندانی دیکە بووە، لەوانەش خەڵکی ناوچەی کوردەکان.

موسڵمانەکان بینیان واباشترە هێزێکی گەورە بەرێ بخەن بۆ شارەکە و رزگار بن لەو هێزە زۆرەی کۆکراوەتەوە پێش ئەوەی یارمەتییەکان لەسەرباز و پێداویستیەکانەوە پێیان بگات.

ئەوەش بە کردار روویدا، دوای شەڕێکی توند سەرکەوتن بۆ هاوپەیمانی موسڵمانەکان بوو، ئەمەش یەزدەگوردی ناچار کرد رابکات،([2]) لە دوای ئەو شەڕە موسڵمانەکان دەستیان بە پێشڕەوی کرد بۆ شارەکانی عێراق لە رووی ڕۆژهەڵاتی رووباری دیجلە هەتا گەیشتنە شاری بنددینجین، خەڵکەکەی داوای ئەمن و ئاسایشیان کرد لەبەرامبەردا ئەوان سەرانەو باج بدەن.([3]) بۆیە موسڵمانەکان بە سەرکردایەتی هاشمی کوڕی عوتبە و جێگرەکەی ئەشعەسی کوڕی قەیسی کندی گەیشتنە شاری داقوقا و خانیجار، بەو شێوەیە هەموو شارەکانی باجورمیٚ کەوتنە دەست موسڵمانەکان، لەوێشەوە گەیشتنە سن بارما و بوازیج([4]) هەتا سنووری شارەزوور.([5])

ت- گرتنی حەلوان و ماسبزان و میهرجانقدق و نەهاوەند:

حەلوان شوێنێکی جوگرافی گرینگی هەبوو، کە لە دواوە چیای سەخت هەبوو، بۆیە گرتنی بۆ موسڵمانەکان یارمەتی دەرێکی باش بۆ ئەوەی ئەمە زنجیرەیەك

---

١ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٢٦٠.

٢ - بۆ زیاتر بڕوانە: الطبري، المصادر نفسة، ج٤، ل١٦٨-١٧٣. ابن الاعثم الكوفي، المصادر نفسة، ل٢٧٨-٢٨٢. بكة.

٣ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٢٥٩-٢٦٠. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٧٠.

٤ - بوازیج (بوازیجی مەلیك) شارێکە کەوتۆتە نێزیك ترکریت لەسەر دەروازەی زێی بچووك کە دەڕژێتە رووباری دیجلەوە، کە یەکێك بووە لە شارۆچکەکانی مووسڵ. معجم البلدان، ج٢، ل٣٩٦.

٥ - البلاذرين المصادر نفسة، ل٢٦١.

دەستبەسەرداگرتن بەدوای خۆیدا بێنێت، بۆیە موسڵمانەکان سووربوون لەسەر ئەوەی کە دەبێت بە زووترین کات بچنە نێو ئەو شارەوە، لە بەرامبەریشدا فارسەکان ئەگەر دەستبەرداری ئەو ناوچەیە بن واتا کلیلی چیاکان لە دەستی ئەوانە دەکەوتە دەست دوژمنەکەیان، بۆیە سووربوون لەسەر پاراستنی ئەو ناوچەیە.[1]

مێژوونووسەکان ناکۆکییەکیان هەیە لەسەر زۆرینەی رووداوەکان، بە تایبەتی ئەوەی پێوەندیی بە چالاکییە سەربازییەکانەوە هەیە، سەبارەت بە چۆنییەتی گرتنی حەلوان و مێژووی ئەو دەستبەسەرداگرتنە و لەسەردەستی کێش ئەو گرتنە روویدا.[2]

بەلازری وڵاتناس لەو بارەیەوە دەگەڕێتەوە بۆ کەسانی دیکەی پسپۆر لەبارەی کاروباری دەستبەسەرداگرتن و گواستنەوەی دەقی زۆرێك لە سەرچاوەکانی پێش خۆی.

کورتەی ئەوەی باسی کردووە، دوای تەواو بووەنی شەڕی جەلەولا لە بەرژەوەندی موسڵمانەکان، هاشمی کوڕی عوتبەی ئەبی وەقاس کە سەرکردەی مەیدانی بوو هاتە یارمەتیدانی ئەبا عەبدوڵا جەریری کوڕی عەبدوڵای بەجلی[3] بە ژمارەیەك سوارچاکەوە، داوای لێکرد لە جەلەولا بمێنێتەوە، بوون و مانەوەی لەو شوێنە دابڕانێك بوو لە نێوان موسڵمانەکان و دوژمنەکەیان، لە لایەکی دیکەوە سەرکردەی گشتی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس هەستا بەناردنی هێزێکی زیادە کە نێزیکەی سێ هەزار سەرباز دەبوون بۆ ئەوەی پاڵپشتی هێزەکەی جەلەولا بکەن بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر حەلوان، بۆیە کاتێ هێزەکەی موسڵمانان لە شارەکە نێزیك دەبوونەوە، یەزدەگوردی سەرکردەی فارسەکان رای کرد بۆ ئەسفەهان، بۆیە جەریری کوڕی عەبدوڵا حەلوانی گرت و رێکەوتنی لەگەڵ کردن کە ئەوان ئەمن و ئاسایشیان بپارێزن و ئازاد بن لە

---

١ - احمد میرزا، المصادر نفسة، ل٧٩.

٢ - بڕوانە: خليفة بن خياط، تاريخ، تحقيق: اكرم ضياء العمري (بيروت:١٩٧٧) ل٧٦٩. الطبري، المصادر نفسة، ج٤، ل٣٤. البلاذري، المصادر نفسة، ل٢٩٥.

٣ - جەریر کوڕی عەبدولای بەجیلی: بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە قەبیلەکانی ئەمەن، رای جیاواز هەیە لەبارەی ئیسلامبوونیەوە، بەلاّم دروستتر پێش ساڵی دەی کۆچی بووە، بەشداری لە کوشتاری بنەماڵەی رەدە کردووە، لەسەر دەستی ئەو چەندان شاری کوردی فەتح کراوە وەکو خانەقین و حەلوان و قرمیسین و هەمەدان، لە ساڵی ٥١کۆچی ٦٧١زایینی کۆچی دوایی کردووە. ابن سعد، المصادر نفسة، ج١، ل٣٣٧. ابن الاثير، اسد الغابة، ج١، ل٢٧٩. العسقلاني، الالابة، ج١، ل٢٤٢.

هاتوچۆ.([1]) ئەوەش لەساڵی (١٦ك/٦٣٧ز) روویدا، لە گێڕانەوەیەکی دیکە دەڵێ لە ساڵی (١٩ك/٦٤٠ز) روویداوە.([2])

دیارە گرینگی ئەو سەرکەوتنە لەوەدایە، ئەوە بووە دروستکردنی یەکەم پێوەندیی لە نێوان کورد و موسڵمانەکاندا، ئەمە سەرەڕای بوونی هەندێ ریوایەتی دیکە کە ئەو پێوەندییە بۆ سەردەمی پێغەمبەر(د.خ) دەگێڕنەوە.([3])

دوای ئەوەی کورد پێوەندیی بە ئیسلامەوە دەکات، بۆیە بۆخۆیانی کێش دەکات و بەرە بەرە بەتایبەتی دوای ئەوەی هەندێ لە پرەنسیپەکانی ئیسلام گونجاو بوو لەگەڵ بۆماوەی ئەوان، بۆیە هەر هەموویان وەرگرت، بەرەبەرە هاتنە نێو ئیسلام، وەکو یەکێك لە مێژوونووسە کوردەکان ئەوە لە مارك سایکس دەگوازێتەوە.([4])

لەکاتی گرتنی شاری حەلوان عوتبەی کوڕی هاشم لەوێدا جەریری کوڕی عەبدولاّ و عەزرەتی کوڕی قەیسی بەجلی جێ دێڵێت، ئەویش رووداکاتە دەینور، بەلاّم ناتوانێ بیگرێت، دوایی قرمیسین دەگرێت بە شێوەی رێکەوتنی حەلوان.([5])

بەلاّم گرتنی شاری دەینور لەسەر دەستی سەرکردە ئەبی موسای ئەشعەری،([6]) بووە، واتە دوای ئەوەی بەوێدا گوزەری کردووە بۆ نەهاوەند، پێنج رۆژ لەوێ ماوەتەوە، یەك رۆژ بەرگریان کردووە، دوای رێککەوتن لە نێوان خەڵکەکەیی و ئەواندا بووە، رێککەوتوون ئەوان لەسەر ئاینی خۆیان بمێننەوە، بەلاّم باج و سەرانە بدەنە موسڵمانەکان، دوای ئەوەی کە ئەشعەری سەرکردە گیان و ماڵ و منداڵیان بپارێزێت،

---

١ - فتوح البلدان، ل٢٩٥. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٧٠.

٢ - ياقوت، معجم البلدان، ج٣، ل٣٧٣.

٣ - العسقلاني، الالابة، ج١، ل٤٢٩. البدليس، المصادر نفسة، ل٥٧-٥٨. محمد امين زكى، المصادر نفسه، ل٩٠-٩١.

٤ - محمد ئەمین زەکی، المصادر نفسه، ل٩٠.

٥ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٢٩٥. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٧٣.

٦ - دواتر گێڕانەوەیەکی دیکە هەیە دەڵێ گرتنی شارەکە لەسەر دەستی سەرکردە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس بووە، بڕوانە: خليفة بن خياط، المصادر نفسة، ل١٥٠.

لەوێدا والیەك و ژمارەیەك سوارچاك لەوێ بەجێ دێڵێت، دوای ئەوە رووده‌کاتە ماسبزان، بەڵام خەڵکەکەی شەڕیان لەگەڵ ناکەن.[1]

بەڵام یاقوت رایەکی دیکەی هەیە، باس دەکات دوای گرتنی حەلوان، یەکێك لە پیاوە گەورەکانی فارس کە ناوی (ئاژین) بووە سوپایەك کۆدەکاتەوە و لە چیاکانەوە بەرەو پێدەشتەکان دێت، ئەو هەواڵە دەگاتە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس لە شاری مەدائن، ئەویش سوپایەك بە سەرکردایەتی زەراری کوڕی خەتاب دەنێرێت بۆ ئەوەی رووبەڕوویان ببێتەوە، ئەویش ئاژینی سەکردەی فارسەکان دەکوژێت و دەست دەگرێت بەسەر شاری ماسبزان، ئەوەش لە ساڵی (١٦ك/٦٣٧ز) بووە،[2] بەڵام راستتر گرتنەکەی لە نێوان ساڵانی (١٩-٢٠ك) بووە.

بەڵام شاری سیروان خەڵکەکەی کەوتنە رێککەوتن لەگەڵ ئەبی موسای ئەشعەری وەکو رێککەوتنەکەی دەینور، بەڵام بەلازری ریوایەتێکی دیکە دەگێڕێتەوە کە ئەبا موسای ئەشعەری شاری ماسبزانی گرتووە پێش شەڕی نەهاوەند.[3]

ئەو زاواکەی خۆی سائیبی کوڕی ئەقرەعی سەقەفی ناردووە بۆ مهرجانەقزەق، دوای شارۆچکەی سەمێرەی گرتووە بە شێوەی رێککەوتن، دواتر سەرجەم ناوچەکانی مهرجانەقزەق بە رێککەوتن گرتووە، بە مەرجێك خەڵکەکەی باج و سەرانە بدەن لەبەرامبەر سەلامەتی ماڵ و منداڵ و کەس دەست نەخاتە ژیانیانەوە، وەکو بەلازری جەخت لەوە دەکاتەوە کە رووکردنە مهرجانەقزەق لە رێگەی ئەهوازەوە بووە، نەك لە رێگەی شاری ماسبزانەوە وەکو دەڵێت "هەواڵەکە دەیسلەمێنی کە سائیب لە ئەهوازەوە رووی کردۆتە شارەکە و گرتوویەتی."[4]

سەبارەت بە گرتنی نەهاوەند کە بە (فتح الفتوح) ناوی دەبەن، لەبەر گەورەیی و گرینگی قەبارەی بەشداربووان لە شەڕەکە و، لەبەر پێگەی ستراتیژی و گەرمی جەنگەکە

---

١ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٣٠٠. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٧٢.

٢ - معجم البلدان، ج٧، ل١٩٥.

٣ - فتوح البلدان، ل٣٠٠-٣٠١.

٤ - فتوح البلدان، ل٣٠٠. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٧٠-٣٧١.

و ئەو شوێنەوارەی بەجێی هێشت([1]) بەلازری بۆمان باس دەکات کە چەندان ریوایەت هەیە لەوەی هەردوو لا چۆن خۆیان بۆ جەنگەکە ئامادە کردووە، لەبارەی سەرکردەکانی بەشداربوو، هەروەها مەجرای شەڕەکە کە لە بەرژەوەندی موسڵمانەکان تەواو بوو، ئەو ئاماژە بە سێ ریوایەت دەکات لەبارەی مێژووی شەڕکەو گرتنەکەی لەوانە (ئیبن کەلبی لە ئەبی مەحنەف دەڵێت.. گرتنی نەهاوەند لە ساڵی نۆزدەی کۆچی رۆژی چوارشەممە بووە، هەروەها دەڵێت لە ساڵی بیست بووە، رەفاعیش قسەمان بۆ دەکات و دەڵێت کە عەبقەری لەبارەی ئەبی بەکری هەزەلی لەبارەی حەسەن و محەمەد گوتیانە: (شەڕی نەهاوەند ساڵی بیست و یەکی کۆچی بووە).[2] بەڵام ئەو دوو ریوایەتە یەکیان لەوەی دیکە پەسندترە، لە کاتێکدا یەعقوبی هیچ ساڵێکی دیاری نەکردووە تەنیا ساڵی (٢١ك/٦٤١ز)[3] نەبێت، بەڵام ئیبن فەقێی هەمەدانی هەردوو ریوایەتی گێڕاوەتەوە یەکێك لەوانە ئاماژە بۆ ساڵی (١٩ك/٦٣٩ز) و ئەوەی دیکە لە ساڵی (٣٠ك/٦٤٠ز)دەکات. دیارە ریوایەتی یەکەم راستترە.[4] یاقوتی حەمەویش هەمان شتی گوتووە.[5]

ئەوە شتێکی ئاساییە کە جیاوازی لەسەر گێڕانەوە و رووداوە مێژووییەکان هەبێت لەبارەی بەروار و چۆنییەتی کەوتنەوەی رووداوەکان بە تایبەتی هەواڵی گرتن و دەستبەسەرداگرتنی شارەکان و ناوچە و وڵاتەکان، چونکە ئەم رووداوانە نەنووسراونەتەوە تەنیا دوای دوو سەدە یان زیاتر، بۆیە گەیشتن بە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر شتێکی هەروا ئاسان نییە.

بۆیە کاتی سەرنج لە کۆی ئەو هەموو شتانە دەدەین کە لە پەڕتووکە مێژوویی و وڵاتناسییەکاندا هاتووە لەبارەی بابەتی گرتنی نەهاوەند، ئەوە لە هەموو بابەتەکان

---

١ - بۆ زیاتر بڕوانە: ابن الاعثم الكوفي، المصادر نفسة، ل٣١-٣٢. الطبري، المصادر نفسة، ج٤، ل١١٥-١٣٧ز یاقوت، معجم البلدان، ج٨، ل٤٠٩. ابن الاثير، المصادر نفسة، ج٣، ل٢-٦. بكة.

٢ - فتوح البلدان، ل٢٩٨. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٧١.

٣ - البلدان، ل٤١.

٤ - مختلر كتاب البلدان، ل٢٣٧.

٥ - معجم البلدان، ج٤، ل٤٩٠. هەروەها، الطبري، المصادر نفسة، ج٢، ل١١٤.

زیاتر قووڵترە، کە باسیان کردووە، ئەوەش لەبەر گرینگی و کاریگەرییە پڕ مەترسییەکانی.

شاری هەمەدان دوا شاری گەورەی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکانە کە باسی هەواڵی گرتنەکەی کراوە لە هەندێ پەڕتووکی وڵاتناسیدا، دیارە دوای ئەوەی سەرجەم فارسەکان ڕووبەڕووی شکست دەبنەوە، پاشماوەی ئەو هێزانە ڕوودەکەنە هەمەدان، هەروەها پێویست بووە مسوڵمانەکان سەرکەوتنی کۆتایی بەدەست بهێنن بە کۆتایی هێنان بەو هێزانەی ماونەتەوە، بەڵام بەهەمان شێوەی شارە گیراوەکان، لێرەدا دیسان جیاوازی هەیە لەبارەی چۆنییەتی گرتنەکە و مێژوو و بەروار و سەرکردەی پرۆسەکە، دیارە بەرواری گرتنەکە لە نێوان ساڵانی (١٧-٢٤ك/٦٣٨-٦٤٤ز) بووە، بە پێی گێڕانەوە جیاوازەکان، بەڵام بەلازری پێی وایە لە کۆتاییەکانی ساڵی (٢٣ك/٦٤٣ز) بووە، کە جەریری کوڕی عەبدوڵا گرتی، وەکو شاری نەهاوەند ڕێککەوتنی لەگەڵ کردن، دوای شەڕێك کە جەریر چاوێکی تێدا پێکرا، کە ئەوەش بە بڕیاری موغەیەرەی کوڕی شوعەیبە، کە ئەو کات والی کوفە بوو لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا(ر.خ)([١])

بەرئەنجامی هەواڵی گرتن و دەستبەسەرداگرتنی جەزیرە و ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان، وەکو لە پەڕتووکەکانی وڵاتناسیدا هاتووە، سەرجەم نیشتمانی کوردستان بە پێی ڕێککەوتن گیراوە بەبێ ئەوەی ڕووداوی شەڕی لێکەوتبێتەوە، یان شەڕ بووە لە دەرەوەی شارەکە، بەڵام هەر زوو خەڵکەکەی داوای ڕێککەوتنیان کردووە لەبەرامبەر پاراستنی سەر وماڵیان، بۆیە وەڵامی موسڵمانەکان بۆ ئاشتی و ڕێککەوتن بە خێرایی بووە، بۆیە لە دووتوێ گێڕانەوەی سەربردەکانی وڵاتناسان نابینین کە شارە کوردییەکان ڕووبەڕووی وێرانکردن یان دانیشتووانەکەی ڕووبەڕووی کوشتن و دیلکردن یان ماڵ و سامانیان تووشی تاڵان وبرۆیی بووبێت، بۆیە سەرجەم ریوایەتەکان ئاماژە بە بەدەستهێنانی ئەمن و ئاسایش دەکەن بۆ پاراستنی سەر و ماڵ و سامانیان بەرامبەر پێدانی سەرانە و باج، بۆیە دەکرێ بڵێین شار و ناوچە کوردییەکان بەبێ ئاستەنگی گەورە و زیانی زۆر گیراوە، ئەگەر بەراورد بکرێت بە گرتنی هەرێمەکانی دیکەی وەکو فارس و کرمان و سجستان و کابل و سەند و مەغریب و ئەفریقیا.

---

١ - البلاذري، فتوح البلدان، ل٣٠٢. ابن الفقيه الهمذاني، مختلر كتاب البلدان، ل٣٠١.

وەکو تێبینی دەکەین گرتنی جەزیرە زۆر ئاسانتر بووە لە گرتنی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان، بگرە ئاسانترین وڵات بووە لە دەستبەسەرداگرتندا، چونکە خەڵکەکەی بینیویەتی ئەوان لە نێوان شام و عێراقن، هەردووکیان لەژێر دەسەڵاتی حوکمی ئیسلامن، بۆیە ملکەچی و ڕێککەوتن کاریگەرتر بووە بەسەر شەڕدا.(1) بۆیە ئیسلام لەنێو خەڵکی جەزیرە هەر لەسەردەمێکی زووەوە بڵاوبۆتەوە، هەتا ژمارەیەك لەوانە بەشداری پرۆسەکانی گرتنی شارەکانیشیان کردووە.(2) کاتی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان نامەیەك بۆ سەرکردە حەبیبی کوڕی سەلمەی فەهری دەنێرێ و پێی رادەسپێرێ کە وڵاتی ئەرمینیا داگیر بکات (شەش هەزار کەس بۆی هەستانەوە، دەڵێن هەشت هەزاری لە خەڵکی شام و جەزیرە بوون).(3)

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا دوای ئەوەی حەبیبی کوڕی سەلمەی فەهری ئەرمینیا دەگرێت و چەند مانگێك لەوێ دەمێنێتەوە، هەواڵێکی بۆ دێت کە بەتریکی ئەرمینیا سەربازێکی زۆری کۆکردووەتەوە لە خەزەریەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانەکان، عوسمان نامەیەك دەنووسێت و داوای یارمەتی لە والی شام دەکات کە لە خەڵکی شام و جەزیرە خەڵکی کۆبکاتەوە و بۆی بنێرێ، (ئەوەی ئارەزووی لە خۆبەخشین و دەسکەوت دەکات، بۆیە معاویە هەزار پیاو لە دانیشتووانی قالیقەلای بۆ دەنێرێ(4) بە بڕینەوە دەیانبڕێتەوە).(5)

بەڵام لەبارەی بەشداری خەڵکی چیاکان لە پرۆسەی گرتندا ئەستەخری بۆمان باس دەکات کە (کۆسپی هێشتنەوەی ڕۆمەکان لە ئەرمینیا قالیقەلا بوو، لەوێدا خەڵکی ئازەربایجان و چیاکان و شاری ڕەی بوون).(6) بێگومان چەندان کەس لەو بەشداربووانە لە

---

١ - بڕوانە: البلاذري، فتوح البلدان، ل١٩٦. بکة.

٢ - بەلازری دەڵێت کوردەکانی شەهاریجە یارمەتی مووسڵمانەکانیان داوە لە کاتی پرۆسەی گرتنی شاری تکریت. تاریخ المووسڵ، ل٢٠٨.

٣ - فتوح البلدان، ل١٩٦.

٤ - قالقیلا: یەکێك بووە لە ناحیەکانی ئەخلات لە ئەرمینیای گەورە. یاقوت، معجم البلدان، ج٧، ل١٣.

٥ - البلاذري، المصادر نفسة، ل١٩٦-١٩٧.

٦ - المسالك والممالك، ل١١١.

کوردەکان بوون، ئەوانەی هاتبوونە ریزی ئیسلامەوە، کە ئەمەش رێژەیەکی گەورەی لە دانیشتووانی هەرێمی چیاکان پێك دەهێنا وەکو دەزانین.

بەڵام سەبارەت بە هەرێمەکانی دیکەوە ئەوانەی کوردیان تێدا دەژیا بە شێوەی جیاجیا بوو، وەکو باس دەکەن لەسەردەمی ئەنجامدانی پرۆسەکانی دەستبەسەرداگرتندا، وەکو دەستبەسەرداگرتنی ئازەربایجان بووە، واتە پاراستنی سەر و ماڵیان و کەس دەست نەخاتە کاروباریانەوە یەکێك لە بەندەکانی رێککەوتنیان بووە وەکو مەرزەبانی ئازەربایجان داوا لە حەزیفەی کوڕی ئەلیەمان دەکات، دوای ئەوەی لە جاری یەکەم بەرگری دەکەن و سەرکەوتوو نابن لە رووبەڕووبوونەوەی سوپای موسڵمانان، وەکو بەلازری باس دەکات (مەرزەبان لەگەڵ حەزیفە رێککەوت لەجیاتی هەموو خەڵکی ئازەربایجان بە هەشت سەد هەزار درهەم). (کە هیچ کەسێکیان لێ نەکوژرێت و نەبڕێت و ئاتەشگە و پەرستگەکانیان وێران نەکرێت و هیچ کوردێکی بەلاسجان و سوبلان و ساترودان دەستیان بۆ نەبرێت و، هەروەها خەڵکی شیز بە تایبەتی لە سازکردنی ئاهەنگ و خۆدەرخستنیان لە جەژن و بۆنەکانیان قەدەخەیان نەکەن).([1])

بەڵام سەبارەت بە کوردەکانی بیلاسجان، ئەویش وەکو سەرنج دەدەین لەسەردەمی خەلیفە عوسمان (٢٣-٣٥ك/٦٤٣-٦٥٥ز) لەدوای ئەوەی سەرکردە سەلمانی کوڕی رەبیعەی باهلی شار و ناوچەکانی ئاران دەگرێت([2]) بە رێککەوتن و ئاشتی، داوا لە کوردەکانی بیلاسجان دەکات بێنە ریزی ئیسلامەوە، بەڵام ئەوان رەتی دەکەنەوە، ئەویش شەڕیان لەگەڵ دەکات، بەڵام سەلمان بەسەریاندا سەردەکەوێت و هەندێکیان ناچار دەبن ملکەچ و قبووڵی رێککەوتن بن و، لەبری مانەوە لەسەر ئۆل و باوەڕی خۆیان، باج و سەرانە بدەن، لە کاتێکدا بەشێکی دیکە- ئەویش بەشێکی کەم- هاتوونەتە ریزی ئیسلام و رازی بوونە کە زەکات بدەن.([3]) لە کاتێکدا ئەو خەڵکانە ئەرکێکیان گەورە

---

١ - فتوح البلدان، ل٣١٧. قدامة، المصادر نفسة، ل٣٧٨. یاقوت، معجم البلدان، ج١، ل١٠٩.

٢ - ئاران: وشەیەکی کوردییە، واتای خاکێکی دەشتایی بچووك، یان قەرسیل، محمد ئەمین زەکی، قاموسی زمانی کوردی (بەغدا:١٩٧٧) ج١، ل١٣.

٣ - البلاذري، المصادر نفسة، ل٢٠٢. الهمذاني، المصادر نفسة، ل٢٦٨.

بووه پێش ئیسلام، که ئەردەشێری پاشایان به پێی حوکمەکەی بڕیاری داوه که ئەوان مولْکی ئەوون.[1]

وەکو باسی کوردەکان کراوه له دووتۆی قسەکانی بەلازری و قودامه لەبارەی گرتنی ناوچه و شارەکانی ئەهواز، که ئەوان ئاماژه بۆ کۆبوونەوەی خێڵ و هۆزه کوردەکان دەکات بۆ خەڵکی زەت و سەبیل (که عەبدوڵای کوڕی عامر، زەت و سەبیل دەگرێت، خەڵکەکەی کافر بوونه، دەستەیەك له کوردەکان له دەورەی کۆبوونەتەوه و شاری ئایزج لەدوای کوشتارێکی زۆر ئینجا گیراوه.[2] هەروەها گرتنی هەندێ ناوچه و شارۆکەی ئەهواز به ڕێگەی ئاشتی و هەندێکی دیکه له ڕێگەی شەڕەوه بووه.[3] له گێڕانەوەی حەوتەمدا دەردەکەوێت که شاری ئایزج کوردی لووڕی تێدا نیشتەجێ بووه و به شەڕ گیراوه.

بەڵام لەبارەی هەرێمی فارسەوه له دووتۆی چیرۆکەکانی دەستبەسەرداگرتندا، وەکو له دەقێکدا هاتووه که گروپێك له کوردەکان یەکێك لەسەرکردەکانی موسڵمانیان کوشتووه، دوای ئەوەی له هاوڕێکانی دابڕاوه له ناوچەی عەقەبه له نێوان جەره و شیرازدا، بۆیه ناوی عەقەبه له دوای کوشتنی ئەو سەرکردەیه لەو شوێنه ئەو ناوەی بەسەردا براوه، وەکو له دەقەکەدا هاتووه: (عومەری کوڕی خەتاب بڕیاریدا که سەرکردە جارودی عەبدی ساڵی بیست و دووی کۆچی بەرەو قەڵای فارس بڕوات، که کەوتۆته نێوان جەره و شیرازەوه، بۆیه له هاوەڵەکانی دادەبڕێت له ناوچەی عەقەبه، لێرەدا گەرکیەتی خۆی تێربکات که پێداویستی خۆی پێبووه، گروپێك له کوردەکان تووشی دەبن و دەیکوژن، بۆیه ئەو شوێنه ناونراوه عەقەبەی جارود).[4]

---

١ - ابن خرداذبة، المسالك والممالك، ل٣٠.

٢ - فتوح البلدان، ل٣٧١. قدامةن المصادر نفسة، ل٣٨٥.

٣ - فتوح البلدان، ل٣٧١. قدامةن المصادر نفسة، ل٣٨٤-٣٨٥.

٤ - فتوح البلدان، ل٣٧٧.

## دووەم: ڕواڵەتە ڕامیارییەکان:

وەکو دەزانین لە ڕووی مێژووییەوە کورد هەمیشە سەربەخۆبووە و ژیانی ژێردەستی و ملکەچی ڕەتکردووەتەوە، ئەمە بە شێوەیەکی گشتی جێبەجێ دەبێت بەسەر هەموو هۆز و دەستە و خێڵێکی کوردی نیشتەجێی ناوچەی چیاکان، ئەوەش لێرەدا بەدیار دەکەوێت کە ئەوان چەندان قەڵا و قوللە و سەنگەرییان بنیاتناوە لە پێناوی پاراستنی شار و سەقامگیری مەڵبەندەکەیان، بۆیە سەرهەڵدانی چەندان قەوارەی ڕامیاری کە خۆی لە میرنشینی کوردستان دەنواند بوونی هەبووە، هەروەها لە هەردوو سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچی بوونی ئەوانە جەختی لێکراوەتەوە.[1]

ژمارەیەك لە وڵاتناسان و گەڕیدە مسوڵمانەکان تێبینی ئەو دیاردەیەیان کردووە و، بە ئاماژە و سەرنجی کەم تیشکێکیان خستووەتەسەر، بەڵام بە سوودە، لەوانەش شارەزوور و سەهرورد، ئەمە سەرەڕای ئەوەی شارەزوور لەنێزیك عێراق بووە، بەڵام کوردەکان دەستیان بەسەردا گرتووە و هیچ میرێك یان فەرمانبەرێکی لێ نەبووە.[2] کە لەلایەن خەلافەتی عەباسییەوە دامەزرابێت، واتە دەسەڵاتی ڕامیاری دەوڵەتی عەباسی نەگەیشتووەتە ئەو ناوچەیە، لەبەرئەوەی خەڵکەکەی ڕێگەرییان کردووە و توندبوونە لەو بارەیەوە، (بۆیە زۆربەی میرەکان لە خۆیان بوونە).[3] ئیبن موهەلهەل باسی خەڵکی نیم ئازەری — شارۆکەیەکە لە شارەزوور- دەکات بەوەی کە (لاسارییان لەسەر سولتان کردووە و ناکۆك بوونە و ئەو لاسارییەیان چەشتووە، بەسەر خەڵکی خۆشیانەوە توندوتیژ بوونە و ڕێگەیان لێگرتوون لە پێناوی پاراستنی پێگە و دەسەڵاتیان).[4] کاتێك پاڵپشتی میرەکانی خۆیان کردووە، ئەوە هاندان و دنەدانی ڕۆڵەکانی هۆزە کوردیە کۆچەرییەکان بووە لە جەلالی و یابسان و سۆلی، ئەوانەی میرەکانی خۆیان ڕاکێشاوەتە

---

١ - lzady,op.cit. p41-43.

٢ - الاصطخري، المسالك والممالك، ل٢٠٠.

٣ - مسعر بن مهلهل، المصادر نفسة، ل١٨.

٤ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

